# داهاتووی ئازادی
## لیبرالیزم بەر لە دیموکراسی

فەرید زەکەریا

وەرگێڕانی
عەدنان حەسەنپوور

## خانەی بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **داهاتووی ئازادی** (لیبرلیزم بەر لە دیموکراسی)
- **نووسینی:** فەرید زەکەریا
- **وەرگێڕانی:** عەدنان حەسەنپوور
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **نرخ:** ٥٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٢**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی** (٨٣٨)**ی ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٦٤)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

# پێشەکیی وەرگێڕ

### ١. دیموکراسییەتی پیرۆز:

ئاقاری قودسییەت و بەپیرۆزکردن هەمیشە یەک ئاقارە؛ «پیرۆز» و «موقەدەس» تەنیا بە دیوی «ڕەهاگەری» و «زیدەڕۆیی»دا دەشکێتەوە و تەنیا دۆگما و بیری نائازاد بەرهەم دەهێنێ، ئەوەی لە دونیای موقەدەسدا نایەتە دی و قەد نابێ چاوەڕێی بکەین بیر و ئەندێشەی ئازادە. هەر شتێک کە بمانەوێ پیرۆزی بکەین و وەک کەماڵێکی تەواوی لەقەڵەم بدەین، مرۆڤێک بێت، بیرۆیەک بێت یان هەر دیاردەیەکی دەستکردی مرۆڤ، بە تەنیا یەک جادەدا دەپەڕێتەوە کە هەمان جادەی ڕەهاگەری و موتڵەقییەتە. موقەدەس دەقاودەق هاوواتای کەماڵ دێتەوە، بێگومان هیچ شتێکی زەمینی و مرۆییمان نییە تەواو و بێ کەموکورتی بێت، هەر بۆیە موتوربەکردنی قودسییەت لە دیاردەیەکی زەمینی و مرۆڤکرد مانای ئەوەی ئەو دیاردەیە بە کۆنکرێت و تەواو و بێکەماسی دەزانین. کارەساتەکانی گەورەی مێژووی مرۆڤایەتی بەرهەمی ئەو ساتەوەختانەیە کە مرۆڤ ئاقاری قودسییەت و بەپیرۆزکردنی گرتۆتەبەر.

چیرۆکی دیموکراسی گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەندێشەیەکی مرۆڤکردە کە سەرەڕای هەموو خزمەتکردنەکانی بە ڕۆنەر و پێکهێنەرەکەی، هەندێجار لە لایەن خودی ئەو ڕۆنەرەوە «پیرۆزێنراوە» و هێند زێدەڕۆیی تێدا کراوە و بە بوونێکی گشتگیر و هەمەلایەنەی ناکۆتا لەقەڵەم دراوە کە پێچەوانەی مەبەستە ڕاستەقینەکانی خۆی ئیشی کردووە و بە بارێکی جیاوازدا شکاوەتەوە. بێگومان دیموکراسی یەکێکە لە هەرەگەورەترین چەمکەکانی نێو فەلسەفەی سیاسی و هیچ چەمکێکی دیکە نەیتوانیوە بەقەدەر دیموکراسی دەرکەوتەی بابەتی و عەینیی هەبێت. دیارە دەرکەوتن و سەرهەڵدانی دیموکراسی بەقووڵی گرێدراوی چەمکی دەسەڵاتە، مرۆڤ پەنای بۆ دیموکراسی برد تاکوو خۆی لە هەڕەشە و مەترسییەکانی دەسەڵات و دەسەڵاتخوازی بپارێزێ و بە هەوساری دیموکراتیک لێڤیاتانی درنجئاسای هابز کەوی و دەستەمۆ بکات. دیموکراسی باشترین و بەکەڵکترین مۆدێلە بۆ حکوومەتکردن و بەڕێوەبردنی دەوڵەت، جیا لەم مۆدێلە هیچ سیستەمێکیتر نەیتوانیوە زۆربەی هەرەزۆری ڕەهەندە جیاواز و دژبەیەکەکانی ژیانی مرۆڤ شی بکاتەوە و لە دووتوێی پرۆسەیەکی یەکگرتوودا هاوسەنگییەکی لۆژیکاڵ لە نێوانیاندا دروست بکات. کەس ناتوانێ

حاشا له دەستکەوتە بەنرخەکانی دیموکراسی بکات، بەڵام وەک هەمــوو دیاردەیەکی دیکە دەشــێ زێدەڕۆیی لە دیموکراسیشدا هەندێ خەساری لێ بکەوێتەوە و دەرئەنجامەکان بەتەواوی بگۆڕێت.

هەرچەنـد رەنگـە باسـکردن لە چەمکێـک بەنـاوی دیموکراسـییەتی ئایـدیۆلۆژیک و بەپیرۆزکـراو شــتێکی نەکــردە و بێمانــا بنــوێنێ، بەڵام ئەم کتێــبە دەیــهەوێ لەو دیموکراســییە بکــۆڵێتەوە کە سنوورەکانی خۆی ئەبەزێنێ و دەبێتە پێوەرێک بۆ پێواندنی هەموو شتێک؛ لە سیاسەتەوە بگرە بۆ جـۆری خـواردن و خوێنـدن و جلـوبەرگ... قودسـییەتدان بە دیموکراسـی ئەبێـتە هـۆی ئەوەی ئەم چەمکە وەک بوونێکی پیرۆز و دەسەڵاتێکی ناکۆتا لەقەڵەم بدەین کە دەتوانێ هەرهەموو کێشەکانی ناو کۆمەڵگا چارەسەر بکا و ئەگەر لە ئاست هەر بابەتێکدا تووشی کێشەیەک بووین یەکسەر دەبـێ پەنا بەینە بەر دیموکراسی و بە شا دەرمانی ئەو بوونە پیرۆزە چارەسەری بکەین. ئیـدی قەت بیـر لەوە نـاکەینەوە دەشـێت دیموکراسـیش روویەکـی ناشـیرینی هەبـێ و دەشـێت بە بـاری پـێچەوانەدا وەرگەڕێ و دەرئەنجامێکی جیاوازمان پێشکەش بکات.

نووســــەری ئەم کتێــــبە هەوڵ ئەدا بە شــــیکردنەوەی رەوتــــی مێژوویــــی دەرکەوتــــن و بەرجەستەبوونەوەی ئازادی و، بە پەرینەوە بە جادەی دیموکراسییەتدا، دەلاقەیەک بۆ راڤەکردنی - چۆنییەتیی گەشـانەوە و پەرەسـەندنی «ئـازادی» و «دیموکراسـی» و ئاوێتەبوونیـان بە یەکتـر و دواجار کەوتنەوەی هەندێ پارادۆکس و خـاڵی جیـاوازی لە نێـوان ئەو دوو چەمـکەدا بکـاتەوە و لە سۆنگەی ئەو دەلاقەیەوە رێگە چارەیەک بۆ «داهاتووی ئازادی» بدۆزێتەوە. فەریـد زەکەریـا خـۆی بە دونیـای تیـۆریی رووت و مێـژووی کلاسـیکەوە نەبەسـتۆتەوە و هەڵیکوتـاوەتە سـەر مێـژووی هاوچەرخ و تەنانەت تـا دواسـاڵی نووسـینی ئەم کتێبـە (٢٠٠٢) درێـژەی بە خوێنـدنەوەکانی خـۆی داوە و هەوڵی داوە وردتـرین و بچووکترین گۆڕانکارییەکـانی بەسـتێنی دیموکراسـییەت بگێـڕێتەوە. ئەوکاتەی دەگاتە پاتۆلۆژی و دەسنیشانکردنی خەسارەکانی دیموکراسی، بۆ روونکردنەوەی نمـوونە بابەتییەکـان یەک لە دیموکراسـییە بەرجەسـتەکانی ئەورۆی دونیـای هەڵبـژاردووە کە هەم هۆکـاری زۆربەی هەرەزۆری گۆڕانکارییە دیموکراتیکەکانی دونیای هاوچەرخ بووە و هەم لە هەموو روویەکەوە خاوەن دەسەڵاتێکی هێژمۆنیکە و تەنانەت هەندێ کەس پێیان وایە داهاتووی مرۆڤایەتییە. تەنانەت ئەگەر ئەم دەربـڕینە رادیکـاڵەش قبـووڵ نەکەیـن دیسـان نـاتوانین حاشـا لەو راسـتییە بکەیـن کە «دیموکراسیی ئەمریکایی» و توخمە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای ئەمریکا ئەوەندە خاوەن هێژمۆنی و سەرنجڕاکێشن کەمتر کۆمەڵگایەک هەیە نەکەوتبێتە ژێـر کـاریگەرییە سـیحرییەکانیەوە. بەدرێژاییـی سـاڵانی سـەدەی بیسـتەم سـەرکردە سیاسـییەکان و دەسـتەبژێرە فیکرییەکـانی وڵاتـانی جیاجیـای جیهان هەریەکەو بە جۆرێک هەوڵـی بەرهەمهێنـانەوەی رەهەنـدێک لە رەهەنـدەکانی ئەو کۆمەڵگـا و

کولتوورەیان داوە؛ یەکیان ئەیویست بەرهەمهێنانی بەرفرە و فۆردیزم پێشکەش بە وڵاتەکەی بکات، ئەویتر خوازیاری سینەمایەکی هاوشێوەی هۆلیوود بوو، کەسێکیدی وەدوای لاساییکردنەوەی ئیمپراتۆریای میدیاکانی ئەمریکا کەوتبوو و... بەکورتی دونیای ئەمریکایی زۆر کەسی شەیدای خۆی کردووە، تەنانەت ئەتوانین بڵێین پەرچەکرداری دوژمنکارانەی هەندێ لە نەیاران و دژبەرانی ئەو دونیایەش هەر زادەی ئەو شەیدابوونەیە و نەزۆکبوونی هەوڵەکانیان لە بەرهەمهێنانەوەی ئەو دونیایەدا وای لێ کردوون دژکردەوەیەکی هیستریک بگرنە پێش و دونیای ئەمریکایی رەت بکەنەوە. ئالێرەوە ناسینی خاڵە باش و خراپەکان و بەتایبەت خاڵە خراپەکانی دیموکراسیی ئەمریکایی گەلێ گرنگ و پێویست ئەنوێنێ و ئەتوانێ رێگایەک بێت بۆ ئەوەی نەهێڵین وڵاتانیتر بە دەردی ئەمریکا بچن و تووشی ئەو دۆخەی ئێستای ئەمریکا بن کە بە رای فەرید زەکەریا بە هیچ شێوەیەک بارودۆخێکی باش و گونجاو نییە.

زەکەریا لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەمریکاییەکان لە دەیەی ١٩٦٠ بەملاوە بە شێوەیەکی شێتانە و زێدەڕۆیانە دەستیان داوەتە پیرۆزاندن و بەکارهێنانی شێلگیرانە و بەردەوامی دیموکراسی. ئەوان دەخوازن هەموو شتێک دیموکراتیزە بکەن و لەم کارەدا هێند زێدەڕۆییان کردووە کە جیا لە چەند دامەزراوەیەکی سوننەتی و دێرینی وەک بانکی ناوەندی و هێزە چەکدارەکان، هیچ دامەزراوە، رێکخراو، توخم و تەنانەت بەهایەکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، یاسایی و کولتووری نەماوە کە نەکەوتبێتە بەر شەپۆلی هەژێنەری دیموکراتیزاسیۆنەوە. فەرید زەکەریا پێی وایە بەکارهێنانی لەڕادەبەدەری دیموکراسی و گۆڕینی بۆ هێزێکی پیرۆز کە هەڵگر و هۆکاری دەرمانی هەموو دەردێکی مرۆیی و تەنانەت نامرۆییە، وای کردووە دیموکراسی بە لاڕێدا بچێ و رێگای کۆمەڵە ئامانجێکی جیاواز لە ئامانجە مێژوویی و راستەقینەکانی خۆی بگرێتە پێش. لە راستیدا ئەمریکاییەکان هەرکات تووشی کێشەیەک دەبوون تاقە رێگەچارەیان بە دیموکراسیی «فرەتر» دەزانی و ئەمەش بۆتە هۆی خەسارلێکەوتنی هەندێ لەو بەها و پرۆسە و دامەزراوانەی لە دیموکراسییەت و پرۆسەی بڕیاردان و بڕیارسازیی دیموکراتیکدا دەورێکی ئێجگار گەورە و ژیانبەخش دەگێڕن.

نووسەر دوای ئەم پاتۆلۆژییە گرنگە رێگەچارە و پێشنیارەکەی خۆی ئەخاتە بەردەست؛ «سەرەتا لیبرالیزم ئینجا دیموکراسی». ئەم رستەیە قەت بەو مانایە نییە کە لیبرالیزم و دیموکراسی دژایەتییان پێکەوە هەیە، بەپێچەوانەوە ئەم دووانە وەک تان و پۆ تێک ئاڵاون و جیابوونەوەیان بۆ نییە. ئەگەر دیموکراسی فۆرم و شێوازی حکوومەتکردن بێت ئەوا لیبرالیزم ناواخنی ئەو فۆرمەیە و لە نەبوونی کاراکتەرە لیبرالییەکاندا دیموکراسی هیچی پێ ناکرێ و

دوچاری دۆڕان دەبێت. پێویستە کاراکتەرە ناوەکییەکانی دیموکراسی کە زادەی ئەندێشەی لیبرالن، واتە حیزبە سیاسییەکان، دامەزراوە ناوبژیکار و ناوکۆکان، میکانیزمەکانی کۆنترۆڵ و هاوسەنگی، میدیا و چاپەمەنییەکان، دەستەبژێران و بەکورتی کۆمەڵگای مەدەنی، قەت لاواز و بێبڕست نەکەون و بە هەموو هێزیانەوە وەک بەڕێوەبەری پرۆسەی دیموکراتیک دەور بگێڕن. بەم شێوەیە هاوسەنگییەک لە نێوان ئازادی و دیموکراسیدا دێتە دی و ئیدی دەسەڵاتی دەوڵەت ناتوانێ هەڕەشەیەک بێت بەسەر ماف و ئازادیی تاکەکانەوە. زەکەریا دەڵێ ئەم هاوسەنگییە لە سیستەمی دیموکراسیی وڵاتە یەکگرتووەکاندا تێک چووە و هەر ئەمەش بۆتە هۆی بەدیهاتنی کۆمەڵێک کێشەی گەورە گەورە و ئەگەر ئاوا بڕوات و ئەو هاوسەنگییە و ڕێک نەخرێتەوە ئەوا پێدەچێ هێز و دەسەڵاتی ئەمریکا گەلێ خێراتر لەوەی ئێستا ڕوو لە کزی بکات.

ئالێرەدا پرسیارێکی زۆر گەورە و گرنگ بۆ ئێمەی جیهان سێهەمی دێتە پێشێ؛ ئەمریکا سەرەڕای ئەوەی خاوەن نەریتێکی کۆن و دەوڵەمەندی دیموکراتیکە ئاوا لە کێشەوە گلاوە، ئایا ناتوانین مەزەندەی دۆخێکی زۆر لەمەش خراپتر بۆ وڵاتانی خۆمان بکەین کە هیچ جۆرە مێژوو و نەریتێکی دیموکراتیک و لیبرالیمان نەبووە؟ ئایا نابێ لە چەواشەبوون و بەلاڕێداچوونی دیموکراسییەکانمان بترسین؟ ئەم کێشەیە هەر ئێستاش بەرۆکی پێ گرتووین، مەگەر هۆگۆ چاوێز، ئیڤۆ مۆرالێس یان مەحموودی ئەحمەدینەژاد، هەرهەموویان بەرهەمی دیموکراسی نین؟ مەگەر هەموویان لە نێو سندووقی پاندۆرای هەڵبژاردنەوە نەهاتوونەتە دەرەوە؟ کە وا بوو ئەقڵ حوکم دەکا لە ناسین و چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەدا دەست بجووڵێنینەوە. بە باوەڕی من کتێبی «داهاتووی ئازادی» دەتوانێ بۆ ئەم کارە یارمەتیدەرمان بێ، فەرید زەکەریا نەتەنیا لە گۆشەنیگایەکی خەسارناسانەوە دەلاقەیەکی نوێ بۆ خوێندنەوەی دووبارەی دیموکراسی لە بەردەمماندا والا دەکا بەڵکوو لە چەند بەشێکیشدا ئاوڕی لە وڵاتانی جیهان سێهەم و دەرەوەی ڕۆژئاوا داوەتەوە و هەندێ دیمەن و ئەگەری داهاتووی ئەم وڵاتانەی نەخشەکێش کردووە. هەروەها ئەو ڕاستییەشی لە بیر نەچووە کە دیموکراسی گەلێ ڕەنگاوڕەنگ و فرەچەشنە و خەسڵەتە لۆکاڵ و خۆماڵییەکانی وڵاتانی جۆراوجۆر بێگومان لە پێکهاتن و داڕشتنی حکوومەتدا دەور ئەگێڕن و سەرەڕای ئەوەی دیموکراسی هەڵگری زنجیرە خەسڵەتێکی گشتی و یونیڤێرساڵە لە هەمان کاتدا تایبەتمەندییە ناوەکییەکانی کۆمەڵگاکانیش کار دەکەنە سەری و هەر بۆیە زیاد لە دیموکراسییەکمان هەیە.

ئەزموونی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و زەرووەرەتی پاراستنی دیموکراسییە ساواکەی ئەو حکوومەتە هاندەری من بوو بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە. لە ڕاستیدا لەوە دەترسم گوێ بە لیبرالیزمی

یاساخواز نەدەین و کۆمەڵگای مەدەنیمان تەنیا بۆ جوانکاری و رازاندنەوە بوێت، لەم حاڵەتەدا ئەگەری ئەوە دەچێ دیموکراسییەتی کوردستان کە تا ئێستا روو لە گەشە و شایانی پیاهەڵدان و بەرگری لێکردنە بە چەواشەدا بچێ و بەرەو رووکەشیبوون و پۆپۆلیزم هەنگاو بهاوێ. بەتایبەت ئەگەر مەترسییە دەرەکییەکان و سترۆکتۆری ژیۆپۆلەتیکی ئێراق و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەروەها گرفتە پێکهاتەییەکانی خودی حکوومەتی هەرێم لە بەرچاو بگرین، ئەوکات تێدەگەین کە ئەگەری وەرسووڕانی دیموکراسیی کوردستان و گرتنەبەری ئاراستەی پۆپۆلیزمێکی پەتی و گەندەڵ گەلێ لەمەش جیدیترە. هەر بۆیە پێویستە دەستەبژێرانی کوردستان شێلگیرانە داکۆکی لەسەر ماف و ئازادییە تاکی و مەدەنییەکان و بەها لیبرالییەکان بکەن و نەهێڵن ئەزموونە تاڵەکانی دراوسێکانمان لە کوردستاندا دووبارە بێتەوە. بیرمان نەچێ سەدام حسەینیش دیموکراسیی هەبوو...

## ٢. وەرگێڕان لە دۆخی هێماییندا:

ئەم کتێبەم لە بەندیخانەدا وەرگێڕاوە، هەر بۆیە ئەم وەرگێڕانە لە هیچ روویەکەوە دۆخێکی ئاسایی نەژیاوە، چونکوو سروشتی نووسین و خوێندنەوە لە بەندیخانە زۆر جیاوازە لە نووسین و خوێندنەوە لە دونیای ئاسایی و ئازاددا. لە ناوەڕاستی سێپتامبری ٢٠٠٩دا دەستم بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە کرد و لە دوارۆژەکانی ئۆکتۆبری هەمان ساڵدا تەواوم کرد، واتە سەرجەم کەمتر لە مانگ و نیوێکی خایاند. بەڵام نووسینەوە و پیاچوونەوەی نزیکەی یەک ساڵی تەواوی پێ چوو، چونکوو دەستیان بەسەر کتێب و دەفتەر و نووسراوەکانم و یەک لەوانەش تەنیا نوسخەی وەرگێڕانەکەدا گرت و دوای تێکۆشانێکی بێوچانی شەش حەوت مانگە جا توانیم قەناعەت بە بەرپرسانی بەندیخانە بکەم کە کارێکی نایاساییم نەکردووە، کتێبێکم وەرگێڕاوە کە مۆڵەتی چاپکردنی لە لایەن وەزارەتی فەرهەنگ و ئیرشادی ئێرانەوە پێ دراوە، لە یاسای بنچینەییی ئێراندا نووسین و خوێندنەوە بە زمانی کوردی ئازادە و بە پێی یاسای زیندانەکانیش دەتوانم درێژە بە کاری نووسین و خوێندنەوە بدەم. تەنانەت لەبەر دەربڕینی نارەزایەتی بەرانبەر بەو جۆرە هەڵسوکەوتە سزایان دام و چەند رۆژێک توندی سلوولی تاکەکەسی کرام. ئەمە دووهەم جاریشە پێشەکیی بۆ دەنووسم، یەکەمینیان برد و هەر نەیاندامەوە. سەرەڕای هەموو ئەم گرفتانە و وەرگرتنەوەی کتێب و دەفتەرەکان و ئەو هەموو بەدواداچوونە، ناردنە دەرەوەی ئەم وەرگێڕانە قەدەغەیە و بەناچار ئەبێ بە قاچاخەڕێگادا هەوڵی هەناردنی بدەم. دیارە کاری فیکری لە ئاوەها دۆخێکی پڕ لەمپەر و پڕ ئێسترێسدا گەلێ سەختتر دەبێتەوە، بەڵام ئەمە تەنیا لایەنێکی کێشەکەیە و ئەسڵی گرفتەکە لە شوێنێکی دیکەدایە؛ لە وێناکردنی «زیندانیی سیاسی»دا.

وەک ئاشکرایە دوای شۆڕشی ١٩٧٩ی ئێران هیچکات زیندانەکانی ئەم وڵاتە زیندانییانی سیاسیی کوردیان لێ نەبڕاوە و ئەو کۆمەڵە مرۆڤە دیلکراوانە هەمیشە یەک لە سەرچاوە گرنگەکانی هەواڵ و چیرۆکەکانی ناو کۆمەڵگا بوون. چیرۆکە راست و درۆکانی قارەمانێتی و بەرخۆدانی ئەو مرۆڤانە دەکەوتنە سەر زاران و هەمووکەس دەیگێڕانەوە و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر ناوەرۆکێکی پڕچەماسەتتر و گەورەتریان وەردەگرت.

ئەو مرۆڤانە کە تا دوێنێ مرۆڤی ئاساییی ناو ئەم کۆمەڵگایە بوون لەپڕ دەگۆڕدران بۆ مرۆڤگەلێکی نائاساییی کە خاوەن وزەیەکی ناکۆتا و تایبەتمەندی و خەسڵەتی سەروومرۆیی بوون و شتێکیان لە بەرزە مرۆڤەکەی نیچە کەم نەبوو! بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا ئەکتەرێکی دیکە تێکەڵ بەم پرۆسەی ئوستوورەسازییە بووە و یارییەکەی هێندەیتر خێراتر و قووڵتر کردۆتەوە. ئەگەر تا دوێنێ چیرۆکی زیندانییانی سیاسی چیرۆکی زارەکی و سیمایان نادیار و شاراوە و شوێنی بەندبوونیان بزر و تەریککەوتوو بوو، ئەمڕۆ بە یارمەتیی «میدیا» و «کۆمۆنیکەیشن» وێنە رەنگاوڕەنگ و جۆراوجۆرەکانیان بەشێوەی رۆژانە و بێ برانەوە لەسەر شاشەی تێلەڤیزیۆن و لاپەڕەکانی ئینتەرنێت و رۆژنامەکان و شەپۆلی رادیۆکان بڵاو ئەکرێتەوە و هەمووکەس چیرۆکی ژیانیان دەزانێ و ئاگاداری وردەکارییەکانی چالاکی و تێکۆشانەکانیانە. ئەگەر تا دوێنێ سیمای زیندانییانی سیاسی سیمایەکی لێڵوپێڵ و شێواو بوو ئەوڕۆ هیچی شاراوەیان نەماوە و هەموو شتێکیان روون و ئاشکرایە، بەڵام بێگومان سەرەڕای هەموو روونکردنەوە و پەردەهەڵماڵینەکان هێشتا دونیای زیندانییانی سیاسی دونیایەکی سیحرئامێزی ئوستوورەییە و ئەوان هێشتا هەر هەمان قارەمانە بێوێنەکانی نەتەوەن. بە واتایەکیتر شەپۆلی میدیایی نەتەنیا سیمای ئوستوورەئامێزی زیندانییە سیاسییەکانی نەسڕیوەتەوە بەڵکوو تەنانەت کاڵیشی نەکردۆتەوە و بگرە گەلێ زیاتر لە جاران راپێچی ناو سووررپیالیزمێکی هەمەگیر و فرەڕەهەندی کردووە. لێرە بەدواوە میدیا ئیدی تەنیا راگوێزەری پەیام نییە بەڵکوو ئافرێنەری پەیام و مانایشە، بە زمانێکیتر ئەرکی[1] میدیا تەنیا گواستنەوەی هەواڵێک یان پەیامێک نییە بەڵکوو میدیا دەبێتە خاوەن سروشتێکی دیکە و راستەوخۆ دەوری خولقێنەری مانا و شوناس دەگێڕێ. هەر بۆیە سیمای قەبەکراوی پێشووی زیندانییانی سیاسی بە یارمەتیی میدیا و کۆمۆنیکەیشن هەم گەلێ مەزنتر و سیحراویتر بۆتەوە و هەم لە رووبەرێکی ئێجگار بەربڵاوتردا پەرەی سەندووە و زیاتر لە جاران سنوورەکانی دونیای ئاساییی بەزاندووە و پێی ناوەتە نێو دونیایەکی مێتافیزیکاڵی سەروو مرۆییەوە.

بێگومان هەرچی مرۆڤ گەورەتر و وزە و دەسەڵاتیشی بەرفراوانتر وێنا بکرێ چاوەڕوانی خەسڵەتی دانسقەتر و کاروکرداروگوفتاری جیاوازتر و مەزنتریشی لێ ئەکرێ. مرۆڤی چیرۆکەکەی ئێمە رێک ئاوەها

---

1. Function

بەسەرهاتێک دەژی، لە لایەکەوە شوناسێکی زۆر جیاوازتر لە شوناسی راستەقینەی خۆیی بەسەردا سەپێنراوە و لەلایەکی دیکەشەوە دەبێ هەر ئەرک و چاوەڕوانییەک ئەم شوناسە نوێیە بەرهەمی دەهێنێ، لە ناخی دەروونیەوە قبووڵی بکا و بێچەندوچوون بەڕێوەی ببات. ئەم مرۆڤە بەناوبانگە قەبەکراوە ئەگەر نەتوانێ ئەرکەکانی شوناسە تازەکەی بە باشترین شێوە و بێ کەموکووڕی راپەڕێنێ ئاوا یەکسەر تەکفیر ئەکرێ و دەیان ناو و ناتۆرەی سووکی بۆ ئەدۆزرێتەوە، بەڵام لە راستیدا ئەو «ئەرک»انەش دیار نییە چین و خاوەن چ جۆر خەسڵەت و سروشتێکن! باشترە بڵێم هەرکەسەو لە گۆشەنیگای خۆیەوە و بەپێی جۆری بیرکردنەوە و حەز و هەستەکانی خۆی کۆمەڵێ ئەرک و چاوەڕوانی بۆ ئەو مرۆڤە یەخسیرە دادەتاشێ و گەلێ سەختگیرانەش داوای بەڕێوەچوونی کامڵ و تەواویان دەکات. دیارە ئەگەر بیر لە چاوەڕوانییەکانی ئەو هەموو مرۆڤە جۆراوجۆر و لێکنەچووانە بکەینەوە تێدەگەین کۆلۆکسیۆنێکی پارادۆکسیکاڵ لە چاوەڕوانییەکان دێتە چێبوون کە هیچکەس تەنانەت پێغەمبەرانیش ناتوانن هەموویان لە خۆیاندا کۆ بکەنەوە و بەڕێوەی ببەن. هەر بۆیە مرۆڤی قەبەکراو لە هەموو لایەکەوە دەکەوێتە بەر زەخت و گوشارەوە و هەرکەسەو داوای شتێکی لێ دەکا و ئەویش دەرەقەتی یەک بە هەزاری ئەو داواکارییانە نایەت. «جارێک لە بەندیخانەی سنە کابرایەکی زیندانی داوای لە هاوڕێم یاسری گوڵی کردبوو بەشە تەلەفۆنە کورتماوەکەی خۆیی بداتێ، بەڵام ئەو پێنج دەقە کەموکورتە تەنیا بەش خودی یاسری دەکرد و نەیتوانی داواکەی جێبەجێ بکات. کابراکە پێی وتبوو تۆ چ زیندانییەکی سیاسیت ئامادە نیت بەشە تەلەفۆنەکەت بە من بدەی، دڵنیابە چوومە دەرەوە بە هەمووکەس دەڵێم یاسر ئەوە نییە کە ئێوە بیری لێ دەکەنەوە!». ئەم چیرۆکە بە باشترین شێوە حەقیقەتی ئەو قسانەی من دەسەلمێنێ کە زیندانیی سیاسی تێکەڵێکە لە حەز و نەفرەت، پشتیوانی و تەکفیر، گەورەیی و بچووکی... بە سادەترین شێوەیش دەشێ لابەلا بێتەوە و لە بەرزاییی ئاسمانەوە فڕێ بدرێتە وەیلی دۆزەخەوە.

من ئالەم دۆخە هێماییینە پڕ مەرج و سنوور و لەمپەرەدا دەستم دایە وەرگێڕانی ئەم کتێبە و دیارە بەشێکی زۆر لە وزە و تواناکانم خەرجی وەڵامدانەوە بەو هەموو چاوەڕوانی و هێرشە هاوکاتانە کردووە. هەر بۆیە بە بەراورد لەگەڵ دۆخێکی ئاساییدا زۆر کەمتر توانیومە مێشکم لەسەر ئەم کارە چڕ بکەمەوە و هەمیشە شتە لاوەکییەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان ئازاریان داوم و نەیانهێشتووە کەڵکەڵە و ژیانی راستەقینەی خۆم بژیم. ئالێرەدا ئەتوانم بڵێم زەختی کۆمەڵگا زیاتر لە زەختی دەسەڵات مرۆڤ لە خشتە دەبات.

ئەڵبەت چەن کێشەیەکی دیکەشم هەبوو، بۆ وێنە چەندساڵ زیندانیبوون مانای چەندساڵ دووربوون لە دونیای نووسین و خوێندنەوە و تەنانەت باسوخواسی جیدی، مانای بزربوون لە دونیای زانست و

بەتـایبەت مانـای بزربـوون لە فەزای نووسـینی کـوردی. تـاقە کتێبـێ بە درێژاییـی ئەم وەرگێـڕانە بـۆ تێکەڵبوونەوە بەو فەزا کوردییە یارمەتیی داوم کتێبی «ئەزموونی مۆدێڕنیتە»ی مارشاڵ بێـرمەن بـوو کە هاوڕێی دلۆڤانم مەسنوور تەیفووری وەریگێڕاوە و هەر خۆیشی بە قاچاخەڕێیەکی نهێنیدا نوسـخەیەکی بـۆ هەنـاردم. پێویسـت ناکـات بڵـێم ئەم بزربـوون و نـامۆییە دەتـوانێ چەنـد توانـای مـرۆڤ بـۆ نووسـین و وەرگێڕان کەم بکاتەوە. جیا لەمانە، ژیانکردنێکی چەندساڵە لەگەڵ مەرگی نگریسـی خـۆت و هاوڕێکانتـدا و هەروەها سنوورە سروشتییەکانی بەندیخانەش لەم بابەتەدا دەوریان گێڕاوە، بەڵام سەرەڕای هەمـوو ئەم شتانەش هەوڵم داوە هەروەک خودی کتێبەکە و لەسەر شێوە نووسینی نووسـەر، منـیش زمـانێکی سـادە و ژۆرناڵیستی بەکار بهێنم و نەهێڵم رستەکان و پاراگرافەکان لەخۆڕا قورس و درێژ ببنەوە.

ماوەتەوە بڵێم لەم نزیکەو چوار سـاڵەی زیندانیبوونمـدا هەردوو پـارێزەری زۆر بەڕێـز و خۆشەویسـتم کاک ساڵحی نیکبەخت و کـاک سـیروان هووشـمەندی زەحمەتێکـی بێئەنـدازە گەورەیـان پێـوە کێشـاوم و لەبەر من تووشی چەندەها کێشە بوون، لێرەوە بەقـووڵی سپاسـیان لـێ دەکەم و هیـوادارم لەم کۆمەڵگـا هەژارەماندا نموونەی ئەوان زۆر و زۆرتر بێت.

ع.ح

ئاگۆستی ٢٠١٠

بەندیخانەی سنە

# دەسپێک

## سەردەمی دیموکراتیک

ئێمە لە سەردەمێکی دیموکراتیکدا دەژین. لە سەدەی رابردوودا رەوتی پێشکەوتنی دیموکراسی زیاتر لە هەموو رەوتێکی تر کاری کردۆتە سەر دارِشتنی جیهان. لە ساڵی ١٩٠٠دا هیچ وڵاتێک لە جیهاندا خاوەن دیموکراسی نەبوو، تەنانەت تاکە وڵاتێکیش نەبوو خاوەنی ئەو دیموکراسییە بێت کە ئێمە لێی گەیشتووین؛ واتە دەوڵەتێکی بەسەردا زاڵ بێ کە لە رێگای هەڵبژاردنێکی ئازادەوە جڵەوی دەسەڵاتی گرتبێتە دەست و هەر هاووڵاتییەک گەشتبێتە تەمەنی یاسایی مافی دەنگدانی هەبێت. بەڵام لەمرِۆدا ١١٩ وڵاتی ئاوەهامان هەیە، واتە لە سەدا ٦٣ی کۆی وڵاتانی جیهان. ئەو میتۆدەی سەردەمانێک تەنیا لە چەند وڵاتێکی ئاتلانتیکی باکووردا پێرِەو دەکرا ئێستاکە بۆتە میتۆدی ستانداردی دەسەڵاتدارێتی لە دونیادا. ئیدی حکوومەتی پاشایەتی وەک شتێکی کۆن و سواو چاوی لێ دەکرێت و فاشیزم و کۆمۆنیزمیش بەتەواوی لە بایەخ کەوتوون. تەنانەت حکوومەتە ئایینییە ئیسلامییەکانیش تەنیا لای کۆمەڵە خەڵکانێکی کەمەژماری توندرِەو جێی بایەخن. دیموکراسی لە زۆربەی شوێنەکانی جیهاندا بۆتە تاکە سەرچاوەی شەرعییەت، تەنانەت هەندێ دیکتاتۆری وەک حوسنی موبارەک (میسر) و رۆبێرت مۆگابەیش (زیمبابوێ) هەوڵی گەورە و خەرجی فراوان دەکەن بۆ ئەوەی هەڵبژاردنێکی نەتەوەیی بەرِێوە بەرن، ئەڵبەت بە ئاسانیش لەم هەڵبژاردنانەدا سەردەکەون[٢]. تەنانەت دوژمنەکانی دیموکراسیش هۆتاف و دروشمەکانی دیموکراسی هەڵدەگرن و بە رواڵەتیش بووە نەریتەکانی بەرِێوە دەبەن، ئەمەش مانای ئەوەیە دیموکراسی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

---

٢- خوێنەری خۆشەویست ئاکاداربن کە ئەم کتێبە کاتێک وەرگێردراوەتە سەرزمانی کوردی کە هێشتا حوسنی موبارک هەرلەدەستەلاتدا بوو. (موکریانی)

به لێکدانەوەیەکی بەربڵاوتریش ئێمە لە سەردەمێکی دیموکراتیکدا دەژین. لە زمانی یۆنانیدا دیموکراسی مانای دەسەڵاتداریی خەڵک، ئەوەتا لە دونیای هاوچەرخ و لە هەموو شوێنێکدا دەسەڵات لە سەرەوەڕا دەگوێزرێتەوە بۆ خوارەوە. هەرچەند ئەم پرۆسەیە بە رادەیەکی زۆر بەستێنی سیاسەت تێدەپەڕێنێ، بەڵام من ناوی دیموکراتیزاسیۆنی لەسەر دادەنێم، چونکوو لەهەرحاڵدا شێوازی کارکردنی ئەم پرۆسەیە یەکسان و هاوشێوەیە: زنجیرە پلەکانی[3] دەسەڵات دەڕووخێنن، سیستەمە داخراوەکان دەکرێنەوە و هەنووکە گوشاری جەماوەری بۆتە سەرەکیترین بزوێنەری گۆڕانی کۆمەڵایەتی. لە راستیدا دیموکراسی گۆڕدراوە و ئیدی تەنیا میتۆدێکی دەسەڵاتداری نییە و بۆتە شێوازێکی ژیان.

بۆ وێنە با ئاوڕێک لە بەستێنی ئابووری بدەینەوە. لایەنی بایەخدار و نوێی سەرمایەداری لەوڕۆدا بریتی نییە لە بەجیهانیبوون یان تەکنۆلۆژیای زانیاری یاکوو بەسەنتەربوونی تەکنۆلۆژیا ـ ئەڵبەت لە رابردوویشدا هەر ئاوەها بوو ـ بەڵکوو بریتییە لە دیموکراتیکبوونی سەرمایەداری. لە نیو سەدەی رابردوودا پێشکەوتنی ئابووری بۆتە هۆی ئەوەی بە سەدان میلیۆن کەس لە دەسکەوتەکانی دونیای پیشەسازی بەهرەمەند بن و ببنە خاوەن پارە و سامانی ئابووری، ئەمەش بۆخۆی بۆتە هۆی ئەوەی دیاردەگەلی وەک بەکاربردن، پاشەکەوتکردن و سەرمایەگوزاری ببنە دیاردەگەلێکی گشتی و هەمەگیر، دواجار پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانیش کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەم گۆڕانکارییەوە و بە ناچار خۆیان لەگەڵ ئەم دۆخە نوێیەدا گونجاندووە. هەر بۆیە دەسەڵاتی ئابووری کە بە درێژایی چەندین سەدە لە ژێر کۆنترۆڵی چەند گرووپێکی بچووکی وەک بازرگانان، بانکداران و بۆرۆکراتەکاندا بوو، گواستراوەتەوە بۆ توێژە خوارترەکانی کۆمەڵگا. ئێستاکە زۆربەی کۆمپانیاکان و لە راستیدا زۆربەی وڵاتەکان دەیانەوێ رەزامەندی و ویستی زۆرینەی خەڵک، واتە چینی مامناوەندی[4]، بەدی بهێنن. لە راستیشدا پێویستە هەر ئەم سیاسەتە پێڕەو کەن، چونکوو کۆی سامانی پاوانکارترین گرووپی سەرمایەگوزاریش لە ئاست سامانی سندووقی خانەنشینیی کرێکاراندا سامانێکی بچووکە.

کولتووریش دیموکراتیزە کراوە. ئەڵبەت ئەوەی سەردەمانێک بە «بەرزەکولتوور» ناوزەد دەکرا هێشتا هەر زیندووە، بەڵام سنوورەکانی گەلێ بەرکورت بۆتەوە و لەوڕۆدا تەنیا بەرهەمێکی تایبەتییە بۆ ئەو مرۆڤە پیر و پەککەوتانەی ماڵئاواییان لە سەنتەری ژیانی کولتووریی کومەڵگا کردووە و ئیدی کەوتوونەتە پەراوێزەوە. ئێستە ژیانی کولتووریی کۆمەڵگا لە ژێر رکێفی مۆسیقای

3. Hierarchy
4. Middle class

پـــاپ و فـــیلمە ســـینەماییە ســـەرکەوتووەکان و پرۆگـــرامە تـــەلەڤزیـــۆنییە پڕبینەرەکانـــدایە و ئەم کاراکتەرانە بڕیاردەری راستەقینەن. ئەم سیانە پێکڕا بوونەتە بـنەچە و بنەمـای سـەردەمی نـوێ و سەرچاوەی ناسراوی کولتووری هەموانن. ئەو شۆڕشە دیموکراتیکەی کۆمەڵگای هەژاندووە پێناسەی ئێمەی بۆ کولتوور گۆڕیوە. بۆ وێنە لە رابردوودا هۆکاری ناوبانگدەرکردنی گـۆرانیبێژان دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە چ کەسانێک لایەنگریانن و کێ پەسـندی کـردوون، بەڵام لەمـڕۆدا ناوبـانگی گـۆرانیبێژ بەستراوەتەوە بە هەژماری لایەنگرانیەوە، بەم پێودانگە مادۆنا هەمیشە بەرزترە لە جێسی نـۆرمەن. چەندێتی جێی چۆنێتیی گرتۆتەوە.

ئـاخۆ چ شـتێک بـۆتە هـۆی ئاوەهـا گۆڕانکـارییەکی سـەیر و گەورە؟ وەک هەمـوو دیاردەیەکی گەورەی کۆمەڵایەتی، چەندەها هێز و هۆکاری جۆراوجۆر لە پێکهـاتنی ئەم شـەپۆلە دیمـوکراتیکەدا دەوریـان گێـڕاوە؛ شۆڕشـی تـەکنۆلۆژیـا، سـامانی روو لە فراوانیـی چینـی مامناوەنـدی و هەروەهـا داڕووخـانی ئەو سیسـتەم و ئایـدیۆلۆژیانەی وەک داڕێـژەری کۆمەڵگـا کاریـان دەکـرد. پێویسـتە هۆکارێکی تریش بە کۆی ئەم هۆکارە سیستەمیکە مەزنـانە زیـاد بکەیـن: ئـەمریکا. پەرەسـەندن و زاڵبوونی ئـەمریکا ـ ئەو وڵاتەی تێیـدا کولتـوور و سیاسـەت بەقـووڵی دیمـوکراتیکن ـ وای کـردووە دیموکراتیزاسـیۆن ببێـتە رەوتێکـی زاڵ و حاشـاهەڵنەگر. لە راسـتیدا و بەبـێ لەبەرچـاوگرتنی هۆکارەکـان، شـەپۆلی دیموکراتیـک کـاریگەریی قـووڵی پێشـبینیکراو لەسـەر هەمـوو بەسـتێن و ناوچەکان دادەنێت. شەپۆلی دیموکراتیک زنجیرە پلەکانی دەسـەڵات ئـاوەژوو دەکـاتەوە، دەسـەڵات دەبەخشێتە تاکەکان و کۆمەڵگاکان سەرەڕای سیاسەتە تایبەتییەکانیان تووشی گـۆڕان دەکـات. لە راستیدا سەرجەم رەهەندە جیاوازەکانی ئەم جیهانەی تێیدا دەژین بەرهەمی هزری دیموکراتیکە.

لە قۆناغی پڕ رووداوی نەوەدەکاندا بە بابەتێک ئاشنا بووین کە دەیـوت تـەکنۆلۆژیـا و زانیـاری دیموکراتیزە کراون، کەوایە ئەمە دیاردەیەکە تـا رادەیەک نـوێ و تـازەیە. لە رابـردوودا تەکنۆلۆژیا دەکەوتە خزمەت بەهێزکردنی چەقبەستنی دەسەڵات و زنجیرە پلەکانی دەسەڵاتەوە. بۆ وێنە دوایین شۆڕشـی گەورەی زانیـاری لە بیسـتەکانی زاییـنیـدا کە ڕادیـۆ، تـەلەڤزیـۆن، سـینەما و سـپیکەری دەگرتەوە، بە ئاراستەی چەقبەسـتنی هەرچـی زیـاتری دەسـەڵات لە کۆمەڵگـادا کـاری دەکـرد. لەم شۆڕشەدا هەرکەس یان گرووپێک تەکنۆلۆژیای ژێرچنـگ کەوتبـا دەبـووە خـاوەن هێـز و دەسـەڵات و دەیتوانی لەسەر لایەنەکانیتری کۆمەڵگا کاریگەری دابنێت. هەر بۆیە لە سـەدەی بیسـتەم و لەگەڵ کۆدەتاکان و شۆڕشەکان و لە یەکەم هەنگاودا هەوڵـی کـونترۆڵکردنی رادیـۆ یـان تـەلەڤزیـۆنی وڵات دەدرا. بەڵام شۆڕشـی زانیـاریی ئەم سـەردەمەی ئێسـتا بـۆتە هـۆی دروسـتبوونی هەزاران رێگـا و سەرچاوەی هەواڵنێری کە هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کۆنترۆڵکردنی سانتراڵ لە خشتە بچێت و

زەمینە و دەرفەتی دژایەتی و بەرخۆدانیش ئاسان بێتەوە. ئینتەرنێت خێراییەکی زۆر گەورەتری بەخشیوەتە ئەم پرۆسەیە، بە واتای «تۆماس فریدمەن»ی رۆژنامەنووس، ئینتەرنێت ئەو شوێنەیە کە تێیدا «هەموان دەبەسترێنەوە بە یەکترەوە بەڵام کەس ناکەوێتە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێرییەوە».

رەوتی دیموکراتیزاسیۆنی تەکنۆلۆژیا و زانیاری هاوواتای ئەوە دێتەوە کە بە شێوەی رێژەیی هەموو شتێک لە بەردەستی هەموو کەسێکدایە، بۆ وێنە چەکە کۆمەڵکوژەکان. هەنووکە پەردە لەسەر ئەو راستییە هەڵماڵراوە کە لە نەوەدەکاندا ئوسامە بنلادەن بە شێوەیەکی جیددی پرۆگرامی دروستکردنی چەکی مێکروبیی بەدەستەوە بوو. بەڵام ئەوەی سەرسامامان دەکات ئەویە کە هەموو ئەو زانیارییە زانستی و نامیلکانەی لەم بارەیەوە لە حەشارگەکانی ئەلقاعیدە لە کابۆلدا دۆزرانەوە هیچیان لە تاقیگە دەوڵەتییەکانەوە نەدزرابوون، بەڵکوو هەرهەموویان لە ئینتەرنێتەوە وەرگیرابوون. لەوڕۆدا بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانمان سەبارەت بە سەرچاوەکانی برینی رەش، پرۆگرامی بەرهەمهێنانی ژەهر یان شێوازەکانی بەرهەمهێنانی چەکی کیمیاوی تەنیا پێویستمان بە دۆزەرێکی بەهێزی ئینتەرنێتییە و هیچیتر. بەداخەوە ئاوەڵابوونی سەرچاوەکان وای کردووە بەم نزیکانە کەسێکیتر توانای دروستکردنی بومبێکی پیس و ناحەز بەدەست بهێنێ. ئامێرەکانی ئەم جۆرە بۆمبە ئاسانتر لە هەمووکات لە بەردەستدان، سەرەکیترین و پێویستترین لایەنی بریتییە لە زانست و زانیارییەکانی کە لە دە ساڵی رابردوودا بە شێوەیەکی بەربڵاو کەوتۆتە بەردەستی هەمووان و بڵاو کراوەتەوە. ئێستاکە تەنانەت تەکنۆلۆژیای ئەتۆمیش لە بەردەستی هەمووانداية، بیرمان نەچێ ئەم تەکنۆلۆژیا پەنجا ساڵی تەمەنە و بەشێکە لە دونیای رادیۆی ئەی ئێم و تێلەڤیزیۆنی رەش و سپی. ئەم دیاردەیەش بە دەستەواژەیەک پێناسە بکەین: دیموکراتیزاسیۆنی توندوتیژی.

دیموکراتیزاسیۆنی توندوتیژی دەستەواژەیەکی سەرنجڕاکێشەری رووت نییە، بەڵکوو یەکێکە لەو تایبەتمەندییە سەرەکی و مەترسیدارانەی دونیای ئەمڕۆ. بە درێژایی مێژوو دەوڵەتەکان تاکە سەرچاوەی رەوای بەکارهێنانی زۆر لە کۆمەڵگادا بوون. نایەکسانبوونی هێزی دەوڵەت و هاووڵاتییان تەکووزیی لێ دەکەوتەوە و یەکێک بوو لە کاراکتەرەکانی گرێدان و پێکەوەلکاندنی شارستانییەتی نوێ. بەڵام لە چەند دەیەی رابردوودا ئەم تایبەتمەندییەی دەوڵەت لاواز کەوتووە و گرووپی بچووک بچووک توانای کاری گەورە و پڕمەترسییان بەدەست هێناوە. هەرچەند تیرۆریزم گەورەترین زەبری لە ئۆتۆریتەی دەوڵەتان داوە بەڵام هاوکات دەوڵەتە ناوەندییەکان لە بۆسەی چەندەها شتی دیکەشدا بوونە. بازاڕەکانی سەرمایە، کۆمپانیا ئابوورییەکانی کەرتی تایبەت، دەوڵەتە خۆماڵییەکان و رێکخراوە نادەوڵەتییەکان بەردەوام بەهێزتر دەبنەوە و دواجار و بەرەبەرە

بوونەتە هۆی دابەزینی ئۆتۆریتەی دەوڵەتان. بۆ سەلماندنی ئەم ئیدیعایە دەتوانین ئاماژە بدەینە دیاردەگەلی وەک کۆچبەریی نایاسایی، بازرگانیی نایاساییی مادەسڕکەرەکان، چەک و چۆڵ و هەروەها پارە لە جیهانی ئەوڕۆدا. بێگومان ڕەوتی دابەشبوونی دەسەڵات درێژە پەیدا دەکات، چونکوو گۆڕانکارییە بەربڵاوە تەکنیکی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دەبنە هۆی قووڵبوونەوە و خێراییی ئەم ڕەوتە. لە دونیای دوای یازدەی ئەیلولدا دەوڵەت بۆتە خاوەن دەسەڵات و شەرعییەتێکی تازە، ئەم ڕەوتەش درێژە پەیدا دەکات. کەوابوو تایبەتمەندیی سەردەمی تیرۆر جۆرێک ململانێیە، ململانێی دەوڵەت لەگەڵ ئەو هێزانەدا کە درێژە بە ڕەوتی دیموکراتیزاسیۆنی ئۆتۆریتە دەدەن، واتە دەوڵەت دەکەوێتە جەمسەرێکەوە و ئەو هێزانەش جەمسەرەکەیتر پڕ دەکەنەوە.

ئەم باسوخواسە بە واتای ئەوە نایەتەوە کە دیموکراسی شتێکی خراپە، بێگومان دیموکراسی بەرهەمی بەنرخ و گەورەی لێ کەوتۆتەوە. کەس نییە خوازیاری گەڕانەوە بۆ رابردوویەک بێت کە تیایدا دەرفەت و ئیمکانی هەڵبژاردن بەرتەسکتر بوو و سەربەخۆیی و توانای تاکی لاوازتر. بەڵام وەک هەموو گۆڕانکارییە گەورەکانیتر، دیموکراسیش هەڵگری هەندێ لایەنی نیگەتیڤ و تاریکی تایبەت بە خۆیەتی، کەچی زۆر کەم ئاوڕمان لەم لایەنانە داوەتەوە. ئەگەر بێت و هەستین بە ئاوەها کارێک، تاوانبارمان دەکەن بەوەی لەگەڵ سەردەمدا ناجووڵینەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوەیە قەت بە شێوەیەکی ڕاستەقینە لە سەردەم ڕانەماوین. ئێمە لەم بارەیەوە بێدەنگین نەکا ئەتیکێتی «نادیموکراتیکبوون»مان لێ بدرێت، کەچی بەم شێوەیە قەت ناتوانین لەو ئەگەرە نیگەتیڤانە بگەین کە ڕەنگە لە ڕەوتی خێرای دیموکراتیزاسیۆنی ژیانماندا سەرهەڵبدەن و خەسارمان لێ بدەن، کەوایە پێویستە ئەم ڕێگایە ببڕین. وادەزانین دیموکراسی قەت تووشی هیچ کێشەیەکمان ناکات، هەربۆیە کاتێک بەرەوڕووی تەنگژەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری دەبینەوە یەکسەر ئەملاوئەولا بە تاونبار لەقەڵەم دەدەین و کێشەکان دەخەینە ئەستۆی شتگەلی دوور و ناڕاستەوە و خۆمان لە وەڵامدانەوە دەدزینەوە، بەڵام قەت ئاوڕ لەو گۆڕانکارییە سەیروسەمەرەیە نادەینەوە کە سەنتەری ژیانی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتیمانی گرتۆتەوە.

# دیموکراسی و ئازادی

دیپلۆماتی ئەمریکایی، ریچارد هالبروک، ئاوەها لە قەیرانی نەوەدەکانی یۆگۆسلاڤیا دەدوێت: «گریمان هەڵبژاردنێکی ئازاد و دادپەروەرانە بەڕێوە بچێت و کۆمەڵە کەسانێکی رەگەزپەرست و فاشیست و جودابیخواز سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، کێشەکە ئالێرەدا دەردەکەوێت». لە راستیدا کێشەیەکی لەم چەشنەمان هەیە و نەتەنیا لە یۆگۆسلاڤیای رابردوودا بگرە لە ئێستای جیهانیشدا ئامادەیە. بۆ نموونە ئاوڕێک لە کێشەی هەنووکەی دونیای ئیسلام بدەنەوە، زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی سەرکوتکارن و پێویستە دیموکراسییان تێدا سەقامگیر بکرێت. بەڵام ئەگەر هات و دیموکراسی جۆرە تیۆکراسییەکی ئیسلامی یان هاوشێوەکەیی لێ کەوتەوە ئەوکات دەبێ چی بکەین؟ ئەمە نیگەرانییەکی خەیاڵی نییە. لە سەرانسەری جیهانی سێهەمدا ئەو رژێمانەی بە شێوەیەکی دیموکراتیک هاتوونەتە سەرکار و زۆربەشیان لە رێگای ریفراندۆمەوە سەرلەنوێ هەڵدەبژێردرێنەوە یان پەسند دەکرێنەوە، بەگشتی سنووره یاساییەکانی دەسەڵات دەبەزێنن و مافە بنەڕەتییەکانی هاووڵاتییان پێشێل دەکەن. ئەمە دیاردەیەکی کوشندەیە کە لە پێرۆوە تا فەلەستین و لە گینیاوە تا ڤەنزویلای گرتۆتەوە و دەتوانین نازناوی «دیموکراسیی نالیبرالی»ی بۆ دابنێین.

لە رۆژئاوادا دیموکراسی مانای «دیموکراسیی لیبرالی»، تایبەتمەندیی ئەم سیستەمە سیاسییە تەنیا هەڵبژاردنی ئازاد و دادپەروەرانە نییە، لەپاڵ ئەم تایبەتمەندییەدا فاکتەرگەلێکی دیکەیش ئامادەن، فاکتەرگەلی وەک باڵادەستیی یاسا، سەربەخۆیی دەزگاکانی حکوومەت و پاراستنی ئازادییە بنەماییەکانی وەک ئازادیی رادەربڕین، مێتینگ و کۆبوونەوە، ئایین و موڵکداری. ئەم کۆمەڵە ئازادییە کە دەتوانین بە «لیبرالیزمی یاساخواز»[5] ناوزەدی بکەین گرێدراوییەکی هەناویی بە دیموکراسییەوە نییە و ئەم دووانە تەنانەت لە رۆژئاوایشدا هەمیشە پێکەوە نەبوون. بیرمان نەچێ ئادۆڵف هیتلێر لە رێگای هەڵبژاردنێکی ئازادەوە هاتە سەرکار. لە نیوسەدەی رابردوودا دیموکراسی و ئازادی لە رۆژئاوادا ئاوێتەی یەکدی بوونە، کەچی ئێستە لە سەرانسەری جیهاندا ئەو دوو بەشە پێکهێنەرەی دیموکراسیی لیبرالی کە لە رووبەری سترۆکتۆری سیاسیی رۆژئاوادا تەڤلی

5. Constitutional liberalism

هەڤ کراون خەریکن لێکدی دادەبڕێن. دیموکراسی روو لە گەشەیە و بەرەوپێشەوە هەنگاو دەنێت بەڵام ئازادی لە پاشەکشەدایە.

لە هەندێ شوێنی جیهاندا، بۆ وێنە لە ئاسیای ناوەڕاستدا، هەڵبژاردن بە ئاراستەی سەرهەڵدانی دەسەڵاتە دیکتاتۆرییەکاندا کاری کردووە. لە هەندێ شوێنیتری وەک یۆگۆسلاڤیا و ئەندەنۆسیادا هەڵبژاردن بۆتە هۆی هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی ئەتنیکی و ململانێی رەگەزی، ئەم دوو وڵاتە لە سەردەمی سیاسەتمەدارانی بەهێزی وەک تیتۆ و سۆهارتۆدا، گەلێ لە ئێستا کە بوونەتە خاوەن دیموکراسی، ئاسانگیرتر و سێکۆلارتر بوون. لە زۆربەی وڵاتانی نادیموکراتیکدا هەڵبژاردن ناتوانێت دۆخەکە هێند لەبارتر و گونجاوتر بکات. ئەگەر سبەینێ هەڵبژاردنێکی ئازاد لە دونیای عەرەبدا بەڕێوەبچێت رەنگە سیستەمگەلێک بێنە سەرکار کە گەلێ لەم سیستەمە دیکتاتۆرییانەی ئێستا پاشڤەڕۆتر و دەمارگرژتر بن و زیاتر دژ بە رۆژئاوا و جوولەکە بجووڵێنەوە.

لەوڕۆدا کە دونیا رۆژ لەدوای رۆژ دیموکراتیکتر دەبێتەوە، هەر رژێمێک بکەوێتە دژایەتییی ئەم رەوتەوە بێگومان تەنیا دەبێتە هۆی بەرهەمهاتنی کۆمەڵگایەکی ناکارامە و لاواز، ئەم دیاردەیە لە جیهانی عەرەبدا زەق و بەرچاوە. هاووڵاتییانی عەرەب زیاتر لە هەمیشە هەست بە نەبوونی ئازادی ئەکەن، چونکوو ئەڵتەرناتیڤەکانیان ناسیوە و لە رێگای هەندێ کەناڵی وەک سی.ئێن.ئێن و بی.بی.سی و ئەلجەزیرەوە سیمای ئەو دونیایە دەبینن. کەچی بەمەشەوە زۆرجار ئەو وڵاتانەی تازەبەتازە بوونەتە وڵاتێکی دیموکراتیک، گۆڕدراون بۆ جۆرە دیموکراسییەکی دزێو و ناشیرین کە بوونەتە هۆی بەرهەمهێنانەوەی دواکەوتوویی و شپرزەیی و توندوتیژی و، شێواز و سیمای تازەی دیکتاتۆرییەتیان لێ کەوتۆتەوە. ئاوڕێک لە ئێران و ڤەنزویلا بدەنەوە با لەم راستییە بگەن. ئەڵبەت ئەمە بەو واتایە نایەتەوە کە چیدی هەڵبژاردن بەڕێوە نەبرێت، بەڵام بێگومان ناچارمان دەکات لە هۆکارەکانی ئەم گۆڕانکارییە پرمەترسییانە رابمێنین و بیانخەینە بەر پرسیارەوە. چما زۆربەی وڵاتانی روو لە گەشە هێند گیرۆدە و دەستەوەستانن و ناتوانن کۆمەڵگایەکی سەقامگرتوو و دیموکراسییەکی راستەقینە رۆ بنێن؟ ئەگەر دەستمان دایە کێشەی هەرە گەورەی دامەزراندنی دیموکراسی لە ئێراقدا ئایا دەتوانین لە سەرکەوتنی ئەم پرۆژەیە دڵنیا بین؟

پێویستە پێش هەموو شتێ پێناسەی خۆمان بۆ چەمکی دیموکراسیی سیاسی بخەینە بەردەست. لە سەردەمی هێرۆدۆتەوە دیموکراسی بە ئاستی یەکەم بە واتای دەسەڵاتداریی خەڵک بووە. لەوڕۆدا ئەم پێناسەیە ـ واتە دامەزرانی دەوڵەت لە رێگای هەڵبژاردنەوە ـ لە لایەن توێژەرانەوە بە شێوەیەکی بەربڵاو بەکار دەهێنرێت. بیرمەندی گەورەی سیاسی، سامویل هانتینگتۆن، لە کتێبی *شەپۆلی سێیەم*دا بەم شێوەیە لە هۆکارەکانی ئەم بابەتە دەکۆڵێتەوە:

هەڵبژاردنی کراوە و ئازاد و دادپەروەرانە بنەما و رەهەندی جیانەکراوەی دیموکراسییە. ئەگەری ئەوە هەیە دەوڵەتێک کە لە رێگای هەڵبژاردنەوە دەسەڵات دەگرێتە دەست دەوڵەتێکی لاواز، ناکارامە، گەندەڵ، بەرچاوتەنگ و نابەرپرسیار بێت و بە ئاسانی بکەوێتە ژێر کاریگەریی گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکانەوە[6] و دواجار نەتوانێ سیاسەتەکان بە ئاراستەی بەرژەوەندیی گشتیدا ببزوێنێ. ئەم خەسڵەتانە دەبنە هۆی خراپبوونی دەوڵەت بەڵام نابنە هۆی نادیموکراتیکبوونی. دیموکراسی یەکێکە لە چاکە گشتییەکان بەڵام تاقە چاکەی گشتی نییە. ناتوانین لە پێوەندیی نێوان دیموکراسی و چاکە و خراپە گشتییەکانی‌تر بگەین مەگەر ئەوەی جیاکارییەکی روون و ئاشکرا بکەین لە نێوان دیموکراسی و تایبەتمەندییەکانی‌تری سیستەمە سیاسییەکاندا.

ئاوەها پێناسەیەک لەگەڵ لێکدانەوەی باوی ئەو رستەیەشدا دێتەوە. ئەگەر لە وڵاتێکدا هەڵبژاردنی رکابەرانە و چەندحیزبی بەرێوە بچێت بە وڵاتێکی«دیموکراتیک»ی لەقەڵەم دەدەین. هەرکات رێژەی بەشداریکردنی گشتی لە کاروباری سیاسیدا زیاد بکات - بۆ وێنە کاتێک کە مافی دەنگدان دەبەخشرێتە ژنان - ئەو وڵاتە بە وڵاتێکی دیموکراتیکتر دەناسرێت. ئەڵبەت پێویستە هەڵبژاردن ئازاد و دادپەروەرانە بێت کە پێداویستیی ئەمەش پاراستنی ئازادیی رادەربڕین و ئازادیی کۆڕ و کۆبوونەوەیە. بەڵام ئەگەر هات و بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەم پێداویستییە مینی‌مۆمییانە و تەنیا لەسەر بنەمای گەرەنتیکردنی کۆمەڵە مافێکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و مەزهەبی - کە هەر چاودێرێک و جۆرە پێناسەیەکی تایبەت و جیاوازی بۆیان هەیە - وڵاتێکمان بە دیموکراتیک زانی، ئەوا «دیموکراسی» دەگۆڕدرێت بۆ وشەیەکی بێمانا. زۆرکەس پێیان وایە لە سیستەمی ئابووریی سویدا مافی موڵکداریی تاکەکەسی بەرکورت و سنووردارە، یان تەلەڤزیۆنی فەرەنسا تا ئەم دواییانەش لە پاوانی دەوڵەتدا بوو و لە بریتانیادا مەزهەب شتێکی دەوڵەتییە، بەڵام بەمەشەوە هەموو ئەم وڵاتانە بە شێوەیەکی ئاشکرا و روون دیموکراتیکن. ئەگەر بە تیۆر «دیموکراسی» بە هاوواتای «دەوڵەتی باش» لێک بدەینەوە، ئەوا لەڕووی شیکارییەوە کردوومانەتە چەمکێکی سواو و بەکارنەهاتوو.

لە لایەکی‌ترەوە «لیبرالیزمی یاساخواز» هیچ پێوەندییەکی بە رەوت و نەریتەکانی هەڵبژاردنی دەوڵەتەوە نییە، بەڵکوو زیاتر لەسەر ئامانجەکانی دەوڵەت چڕ دەبێتەوە. لیبرالیزمی یاساخواز لەسەر ئەو نەریتە بنەماییەی مێژووی رۆژئاوا دەوەستێت کە هەوڵی پارێزگاریکردنی سەربەخۆیی و پێگەی تاکیی تاکەکان لە هەمبەر هەرچەشنە جەبرێکدا دەدات، بۆیشی گرنگ نییە ئەم جەبرە لە لایەن دەوڵەتەوە بێت یان کلێسا و یاکوو کۆمەڵگاوە. ئەم دەستەواژەیە دوو هزر پێکەوە

---

6. Beneficiary groups

دەبەستێتەوە کە زۆر لێکدی نزیکن. بە ئاستی یەکەم لیبراڵییە[7]، چونکوو لە میراتێکی فەلسەفییەوە سەرچاوەی گرتووە کە لە یۆنان و رۆمی کۆندا لە دایک بووە و جەخت لەسەر ئازادییە تاکییەکان دەکات. بە ئاستی دووهەم یاساخوازە، چونکوو باڵادەستیی یاسا دەخاتە چەق و سەنتەری سیاسەتەوە. لە ئەورووپای رۆژئاوا و وڵاتە یەکگرتووەکاندا لیبرالیزمی یاساخواز لە رێگای بەرگریکردنەوە لە مافە تاکییەکانی ژیان و موڵکداری و هەروەها ئازدیی رادەربڕین و ئازادیی ئایینی گەشەی سەند. بۆ ئەم مەبەستەش جەختی دەکرد لەسەر هەندێ فاکتەری وەک کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت، یەکسانبوون لە بەرانبەر یاسا و دادگادادەکردەوە... هەروەها جیاکردنەوەی کلێسا و دەوڵەت لە یەکتر. دەتوانین بڵێین هەموو جۆرەکانی لیبرالیزمی یاساخواز لەسەر ئەو باوەڕەن کە مرۆڤ هەڵگری کۆمەڵە مافێکی سروشتی (یان«زەوتنەکراو»)ی دیاریکراوە و لە پێناو پاراستنی ئەم مافانەدا پێویستە دەوڵەتەکان جۆرە یاسایەکی بنەمایی قبووڵ بکەن، ئەم یاسایە سنوور بۆ دەسەڵاتی خودی دەوڵەت دادەنێت. لەسەر ئەم بنەمایە بوو کە بارۆنە بریتانییەکان لە ١٢١٥ی زایینی و لە رانیمیددا پادشایان ناچار کرد سنوورێک بۆ ئۆتۆریتە و دەسەڵاتی خۆی دابنێت (رێکەوتننامەی ماگناکارتا). لە کۆچبەرنشینەکانی ئەمریکادا ئەم مافانە جەختیان لەسەر کرایەوە و لە ١٦٣٨دا یەکەم یاسای بنچینەییی نووسراوی جیهان لە مێژووی هاوچەرخدا لە شاری هۆرتفۆرد لەدایک بوو. لە ١٧٨٩یشدا یاسای بنچینەییی ئەمریکا چوارچێوەیەکی رەسمیی بۆ ئەو وڵاتە دەستنیشان کرد. لە ١٩٧٥دا وڵاتانی رۆژئاوا کۆمەڵە پێوەرێکیان بۆ شێوازی هەڵسوکەوتی هەموو سیستەمە سیاسییەکان، تەنانەت بۆ رژێمە نادیموکراتیکەکان، دابین کرد. ماگناکارتا، یاسا بنەماییەکانی کانتیکات، یاسای بنچینەییی ئەمریکا و رێکەوتننامەی هێلسینگی[8]، هەموویان لە هەناوی لیبرالیزمی یاساخوازەوە سەریان هەڵداوە.

---

٧. وشەی لیبرال بەو واتایە بەکار دەهێنم کە لە سەدەی نۆزدەدا بەکار دەهێنرا، واتە ئازادییە تاکییە ئابووری و سیاسی و مەزهەبییەکان کە هەندێ جار بە لیبرالیزمی کلاسیکیش لەقەڵەم دەدرێت. کەوابوو مەبەستم ئەو پێناسەیە نییە کە لە سەردەمی هاوچەرخی ئەمریکادا مەبەستە و دەبەسترێتەوە بە دەوڵەتی ئاسوودە (خۆشنوودگەرا)(welfare state) و چالاکییەکانی دژی هەڵاواردنی رەگەزی و سیاسەتەکانی ترەوە.

٨. ئەو راگەیاندننامەیە لە ١٩٧٥ و لە کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاریی ئەورووپادا (ئێستا گۆڕدراوە بۆ رێکخراوی ئاسایش و هاوکاریی ئەورووپا) راگەیەنرا. مەبەست لەم پەیماننامەیە بەهێزکردنی دیالۆگی نێوان رۆژئاوا و رۆژهەڵات بوو. بە پێی ئەم بەڵگەنامەیە پێویستە هەموو دەوڵەتێک رەچاوی کۆمەڵە یاسایەکی

له ١٩٤٥ بەدواوە زۆرجار دەوڵەتانی ڕۆژئاوا هاوکات هەم هەڵگری دیموکراسی بوونە و هەمیش نوێنەری لیبرالیزمی یاساخواز، هەر بۆیە ناتوانین ئەم دوو شتە بە ئاسانی لێکدی جیا بکەینەوە، واتە ناتوانین قاییل بە دیموکراسیی نالیبرالی یان دیکتاتۆریی لیبرالی بین. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم دوو مۆدێلە هەم لە ڕابردوو و هەم لە ئێستادا دەبینرێن. تا سەرەتای سەدەی بیستەم زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا لەژێر دەسەڵاتی حکوومەتگەلێکی دیکتاتۆرییانەی لیبرالی یان لە باشترین شێوەدا حکوومەتگەلێکی نیوە دیموکراسیدا بوون. مافی دەنگدان گەلێ بەرکورت بوو و دەزگای یاسادانانی هەڵبژێردراویش دەسەڵاتێکی کەم و سنوورداری هەبوو. لە ساڵی ١٨٣٠دا بریتانیا یەکێک بوو لە دیموکراتیکترین وڵاتانی ئەورووپا، کەچی ڕێژەی ئەو هاووڵاتییانەی دەیانتوانی لە هەڵبژاردنی یەک لە دوو پەرلەمانەکەدا بەشداری بکەن لە سەدا دووی کۆی دانیشتوانی ئەو وڵاتەی نەدەگرتەوە. ئەم دۆخە تا چلەکانی سەدەی بیستەم درێژەی هەبوو و ئەمە لە دواساڵەکانی دەیەی ١٩٤٠دا بوو کە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا بوونە دیموکراسییەکی ڕاستەقینە و مافی دەنگدان بەخشرایە هەموو ئەو هاووڵاتییانەی گەشتبوونە تەمەنی یاسایی. بەڵام سەد ساڵ بەرلەم بەرواره، واتە لە کۆتاییەکانی ١٨٤٠دا، ڕەهەندە گرنگەکانی لیبرالیزمی یاساخواز لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوادا قبووڵ کرابوو کە بریتی بوون لە باڵادەستیی یاسا، مافی موڵکداریی تاکی و لە ڕەوتێکی روو لە گەشەدا جیاکردنەوەی دەزگاکانی حکوومەت لەیەکتر و ئازادیی ڕادەربڕین و کۆڕ و کۆبوونەوە. ئەوەی لە زۆربەی ساتەکانی مێژووی هاوچەرخدا خاڵی جیاکەرەوەی دەوڵەتانی ئەورووپا و ئەمریکای باکوور بوو لە دەوڵەتانیتری جیهان، دیموکراسی نەبوو بەڵکوو لیبرالیزمی یاساخواز بوو. بەرجەستەترین هێمای «مۆدێلی دەوڵەتی ڕۆژئاوایی» ریفراندۆمە گشتییەکان نییە بەڵکوو دادوەریی بێلایەنە.

دوورگەی بچووکی هۆنگکۆنگ هەرچەند نموونەیەکی بچووکە بەڵام بە درێژاییی چەندین دەیە ئەو ڕاستییەی بۆ دەرخستین کە ئازادی گرێدراوی دیموکراسی نییە. هۆنگکۆنگ خاوەنی یەک لە بەرزترین ئاستەکانی لیبرالیزمی یاساخواز بوو لە جیهاندا، بەڵام لەهەمانکاتدا قەت ناوچەیەکی دیموکراسییانە نەبوو. لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا هەرچی زیاتر لە وادەی پەیوەستبوونەوەی هۆنگکۆنگ بە چین نزیک دەبووینەوە زۆرێک لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ڕۆژئاوا لە مەترسییەکانی ئەم پەیوەستبوونەوە بۆ دیموکراسیی هۆنگکۆنگ دەدوان، بەڵام ئەم باسوخواسە بێبنەما بوو، چونکوو لە بنەڕەتدا ئەم دوورگەیە دیموکراتیک نەبوو. لە ڕاستیدا نەریتی ئازادی و باڵادەستیی یاسا لە بەردەم هەڕەشە و مەترسییدا بوون نەک دیموکراسی، ئێمە تا ئێستایش نەمانتوانیوە

---

دیاریکراو بکات، بۆ نموونە: ڕێزگرتن لە سەربەخۆیی وڵاتەکان، بەکارنەهێنانی زۆر، قەدەغە کردنی دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی وڵاتاندا و ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ. و.ف

جیاکاری لە نێوان ئەم دوو چەمکەدا بکەین. زۆرجار سیاسەتمەدارانی ئـەمریکا و ئیسـراییل رەخـنە لە نەبوونی دیموکراسی لە دەوڵەتی خودموختاری فەلەستیندا دەگرن، ئەمە لەحاڵێکدایە کە یاسر عەرەفات تاکە سەرکردەی دنیای عەرەبە کە لە هەڵبژاردنێکی نیوەئازاددا دەسەڵاتی گرتۆتە دەست. کێشـەی دەوڵەتـی خودموختـاری فەلەسـتین دیموکراسـی نیـیە - چونکـوو هەرچەنـد خـاوەن دیموکراسییەکی زێدە لاوازە بەڵام لانیکەم تـا رادەیەک ئەرکەکـانی خـۆی بەڕێـوە بـردووە - بەڵکـوو کێشەی ئەم سیستەمە هەڵدەگەڕێتەوە بـۆ لیبرالیزمـی یاسـاخواز یـان لە راسـتیدا بـۆ نەبـوونی ئەو لیبرالیزمە.

ئەمریکاییەکان - بەتایبەتی - نەیانتوانیوە لە ئەگەرەکانی ململانێی نێوان دیموکراسـی و ئـازادی تێـبگەن، چونکـوو لە نـاواخنی مێـژووی ئـێمەدا ئاوەهـا ململانێـیەک رووی نەداوە. ئەڵـبەت دەبـێ نمـوونەیەکی گەورە و ئاوارتەمـان بیـر نەچـێ؛ کـۆیلەداری و جیـاکردنەوەی رەگەزی لە باشـووری ئەمریکادا لە رێگـای سیسـتەمی دیموکراسـییەوە خـۆی چەسـپاند. لە هەمـان دەسـپێکی دامەزرانـی سیسـتەمی کۆمـارییەوە هەمـوو ئەو ئـەمریکاییانەی رقیـان لە کـۆیلەداری بـوو لەگەڵ کێشـەیەکی گەورەدا بەرەورووو بـوونەوە، ئەویـش ئەوە بـوو کە زۆربەی دەنگـدەرانی باشـووری وڵات بە هەمـوو هێزیـانەوە بەرگرییـان لە کـۆیلەداری دەکـرد. دواجـار کـۆیلەداری لە رێگـای ریفرانـدۆمەوە هەڵنەوەشـایەوە بەڵکـوو دوای گوشارخستنەسـەر باشـوور و وردوخاشـکردنی ئەو نـاوچەیە هەڵوەشایەوە. لە ئاکامدا یاسای جیاکردنەوەی رەگەزی کە لە باشووردا لەباتیی کۆیلەداری پێڕەو ئەکـرا، لە پەنجـا و شەسـتەکاندا سـەرەڕای ئامـادەبوونی دیموکراسـی، لە رێگـای دیموکراسـییەوە هەڵنەوەشایەوە. هەرچەند کۆنگرێس یاسای کۆتاییی رزگارکردنی کۆیلەکانی دارشت و پەسندی کرد - یاسای مافە مەدەنییەکـانی ١٩٦٤ - بەڵام هەمـوو هەنگاوەکـان و پێشـکەوتنەکانی پێشـتر یـان بە دەستی دەوڵەت بەڕێوە برابوو - وەک لابردنی جیـاکردنەوەی رەگەزی لە هێـزە چەکدارەکانـدا - یـان بەرهەمـی یاسـاکانی دیـوانی بـاڵا بـوو - وەک لابردنـی هەڵاواردنـی رەگەزی لە قوتابخانەکانـدا. لە دووتوێی گەورەترین تراژێدیای مێژووی ئەمریکادا زۆرجار ئازادی و دیموکراسی دەکەوتـنە دژایەتیـی یەکترەوە.

# مۆدێلی ئەمریکایی

لە نەوەدەکاندا تـوێژەرێکی ئـەمریکایی لە لایەن دەوڵەتـی ئـەمریکاوە رەوانەی قەزاقسـتان کـرا تاکوو بۆ داڕشتنی ڕەشنووسی یاسای هەڵبژاردن یارمەتیدەری پەرلەمـانی ئەو وڵاتە بێت. هاوشـانە قەزاقەکەی کە ئەنـدامێکی بـاڵای پەرلەمـان بـوو هەمـوو مۆدێـل و پێشـنیارەکانی پسـپۆڕە ئەمریکاییەکەی ڕەت کردبۆوە و بە شێوەیەکی جیددی وتبووی: «ئـێمە دەمانەوێ پەرلەمانەکەمان دەقاودەق وەک کۆنگرێسی ئەمریکا بێت». لایەنی ئەمریکایی کە واقی وڕ مابوو دواتـر بەم شـێوەیە بیرەوەرییەکانی تۆمار کردووە: «هەوڵم دەدا وشەگەلێکی جیاواز لەو چەند وشەیە بهێنمە زمان کە دوابەدوای ئەو داخـوازییە کەوتـنە مێشـکمەوە: نـا، ئـاوا شـتێکتان نەوێـت!». ئەم ڕوانـگەیە لە ئـەمریکادا نـامۆ نـیـیە، ئـەمریکاییەکان پێیـان وایە پرسـە پێوەندیـدارەکان بە دیموکراسـییەوە لە سیسـتەمی سیاسـیی وڵاتەکەیانـدا هێنـد ئـاڵۆز و نالەبـارە بـۆ ئەوە ناشـێت هـیچ وڵاتێکیتـر خـۆی گیـرۆدەی بکـات. لە ڕاسـتیدا فەلسـەفەی یاسـای بنچینەیـی ئـەمریکا جـۆرە ترسـێکی بەرانـبەر دەسـەڵاتی کەڵەکەکـراو هەبـوو کە ئێسـتاکەش بە هەمـان ڕێـژەی ١٧٨٩ ئامـادە و زینـدووە. لە ڕاستیشـدا پەرلەمـانێکی بەدەسـەڵاتی وەک کۆنگرێسـی ئـەمریکا کە لە هەمـبەر حەز و ویسـتی نەبڕاوەی سەرۆککۆماردا دەوەسـتێت، بە دڵنیـاییەوە بـۆ قەزاقسـتان دەشـێت و بەکەڵکـی ئەو وڵاتە دێت.

زۆر سـەیرە کە ئـەمریکا زۆرجـار لە دەرەوی سـنوورە جوگرافییەکـانی خۆیـدا پشـتیوانی لە دیموکراسـییەکی بـێمەرج و سـنوور دەکـات. ڕێـژەی دیموکراتیکبـوونی سیسـتەمی ئـەمریکا بەرجەستەترین ڕەهەنـدی ئەو سیسـتەمە نـیـیە، بەڵکـوو ئەگەر سـەرنج بـدینە ئەو هەمـوو سـنوور و لەمپەرە جۆراوجۆرانەی دەیخاتە بەردەم پارتی زۆرینـەوە تێـدەگەین کە ڕەهەنـدی بەرجەسـتەی ئەم سیستەمە بریتییە لە ڕێژەی نادیموکراتیکبوونی. بیرمان نەچێ «ڕاگەیەنراوی دە مادەییی مافەکانی هاووڵاتییان» پێڕستێکی ئەو کارانەیە کە دەوڵەتی ئەمریکا، بەبێ لەبەرچاوگرتنی خواستی زۆرینـە، نابێ ئەنجامیان بدات. لە کۆی سێ دەزگاکەی دەوڵەتی ئەمریکا دیوانی باڵا بەرزترین دەزگـایە، ئەو ٩ کەسـەی سـەرکردایەتیی ئەم دەزگـایە دەکەن هیچیـان بە هەڵبـژاردن نەهـاتوونەتە سـەرکار و پۆستەکەیشـیان هەمیشـەییە. لە نـاو پەرلەمانەکـانی جیهانـدا کەمتـرین ڕێـژەی هەڵبـژاردن (بـۆ سازکردنی پەرلەمان) هـی سـێنای ئـەمریکایە، ئەڵـبەت ئەنجومەنی لۆردەکـانی بریتانیاشـمان هەیە بەڵام ئەم ئەنجومەنە دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نییە و لە حاڵی گۆڕانیشدایە. لە هەڵبژاردنی ئەنجـومەنی

سێنادا ڕێژەی دانیشتووانی ویلایەتەکان لەبەرچاو ناگیرێت و هەموو ئەیالەتەکان بە شێوەیەکی یەکسان دوو نوێنەریان دەکەوێت، بەم پێیە کالیفۆرنیا بە حەشیمەتێکی ٣٠ ملیۆنییەوە بە هەمان ئەندازەی حەشیمەتی ٣/٧ میلیۆن کەسیی ئاریزۆنای دەکەوێت، بێگومان ئەمەش قەت بە مانای «هەرکەسەو دەنگێک» ناکەوێتەوە[٩]. بەرجەستەترین لایەنی پەرلەمانە ولایەتی و هەرێمییەکانی سەرانسەری ئەمریکا بریتی نییە لە دەسەڵاتی ئەو پارتەی کە زۆرینەیە، بەڵکوو بریتییە لەو پشتیوانی و پاراستنانەی لە حیزبی کەمینە یان زۆرجار لە تاقە پەرلەمانتارێک دەکرێت. لایەنێکیتری ژیانی کۆمەڵایەتی لە ئەمریکادا بریتییە لە کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەت و گرووپە نادەوڵەتییەکانیتر کە ئەلێکسی دۆتۆکڤیل ناوی «دامەزراوە ناوکۆییەکان[١٠]»ی لەسەر داناون. پێکهاتەی دەوڵەمەندی کۆڵگای مەدنی لە ڕەوتی دارشتنی دیموکراسیی ئەمریکادا دەورێکی بەرچاو و ژیانبەخشی گێڕاوە.

بەڵام ئەم پێکهاتەیە بەرەو سوان دەچێت و خەریکە مۆدێلێکی تایبەتی ئەمریکایی لە دیموکراسیی نالیبرالی بەرهەم دەهێنێ. ڕاستە گرفتەکانی هەنووکەی ئەمریکا گەلێ جیاوازتر و بچووکترە لە گرفتەکانی جیهانی سێهەم، بەڵام پێوەندیگەلێکیشیان پێکەوە هەیە. یاسا و ماف بەقووڵی ڕۆ چوونەتە نێو کۆمەڵگای ئەمریکاییەوە، بەڵام کۆمەڵە مەرجە کەمتر ڕەسمییەکان کە ناوەڕۆکی دیموکراسیی لیبرالی پێک دەهێنن، بەرەو نەمان دەچن. بەشێکی زۆری ئەم دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییانە، وەک پارتە سیاسییەکان، سەندیکاکان، کلووپەکان و ئەنجومەنەکان، پێکهاتەیەکی نادیموکراتییانەیان هەیە. هەموو ئەم دامەزراوانە لە بەردەم هەڕەشەی ئایدیۆلۆژیایەکی دیموکراتیکدان، ئەم ئایدیۆلۆژیایە بۆ نرخاندنی بەها و نرخی هەموو هزر و دامەزراوەیەک تاقیکارییەکی زۆر سانا و سادە بەڕێوە دەبات: ئایا دەسەڵات بە باشترین شێوە بڵاو بۆتەوە؟ بە واتایەکیتر ئایا بەو شێوەیەی شیاوە دیموکراتیکن؟ کۆنگرێسی ئەمریکا دیموکراتیکە بەڵام پێشتر بەم شێوەیە نەبوو، لە ڕابردوودا کۆنگرێس لەسەر بنەمای ڕەوتێکی زنجیرە پلەیی و داخراو کاری دەکرد و نەدەکەوتە ژێر گوشاری ڕای گشتییەوە. ئەوڕۆ کۆنگرێس گۆڕدراوە بۆ دەزگایەکی روون و

---

٩ . ئەم ڕەهەندە تایبەتییەی دیموکراسیی ئەمریکا زۆرجار ئاسەواری تۆقینەری لێ کەوتۆتەوە و بۆتە هۆی ئەوەی ویلایەتە کەم حەشیمەتەکان ببنە خاوەن نفووزی سیاسیی گەورە و سوبسیدی مەزن و بەرچاویان پێ بگات. بەڵام بەمەشەوە دیموکراسیی ئەمریکایی لە زۆربەی هەرەزۆری تایبەتمەندییە «نادیموکراتیکەکان» ی سوود و خێری زۆری بەرکەوتووە.

10. Interagent institutes

شەفاف و بەتەواوی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی گوشار و روانگە و بۆچوونی دەنگدەرانەوە. کۆنگرێس ئێستا دەزگایەکی وەلامدەرتر و دیموکراتیکترە بەلام لە هەمان کاتدا ناکارامەترە لە جاران.

با سەیرێکی پارتە سیاسییەکانی ئەمریکایش بکەین کە روالەتی جوانیان مرۆڤ بە لارێدا دەبات. حیزبەکان رۆلی مێژوویی خۆیان لە دەست داوە و ئیدی وەک جاران لە پرۆسەی هەلبژاردنەکاندا دەوری دیاریکەری سەرەکی و دوایین سەرچاوەی هەلبژاردنی کاندیداتۆرەکان ناگێڕن. زالبوونی راپرسییەکان و هەلبژاردنە سەرەتاییەکان[١١] وای کردووە حیزبەکان ببنە ئامێرێکی بۆش و خالی کە بۆچوونە کاتییەکانی رای گشتی پڕیان دەکەنەوە؛ گرنگیش نییە ئەو بۆچوونە نیولیبرال بێت یان کۆنسێرڤاتیست یان هەر بۆچوونێکیتر. ئەم کێشەیە رووبەری دەستەبژێرانی پرۆفیشنالی ئەمریکایشی گرتۆتەوە کە دیارترینیان پارێزەرانی یاساییین. پارێزەران سەردەمانێک جۆرە ئاریستۆکراسییەکی لۆکالیان پێک دەهێنا و لە ئاست شارەکانی خۆیاندا کۆمەلە بەرپرسایەتییەکیان دەگرتە ئەستۆ، کەچی لەمڕۆدا نەتەنیا پێگە و ئامانجە کۆمەلایەتییەکانیان لەدەست داوە بەلکوو گۆڕدراون بۆ کۆمەلە مرۆڤێکی ساختەچی و چاوبرسی کە بە هیچ تێر نابن. پزیشکی و ژمێریاری و بانکداریش تووشی ئەم خەسارە هاتوون و بەم شێوەیە ئەو هێزانەی سەردەمانێک رێپیشاندەری دیموکراسی بوون بە خێرایی بەرەو رووخان و توانەوە دەچن.

راپرسی جێی ئەم هێزانەی گرتۆتەوە. بێگومان کاتێک لە داهاتوودا مێژوونووسان رووداوەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە دەنووسنەوە سەرسام دەبن بەو هەموو هەول و تەقالا فراوان و نەبڕاوانەی بۆ ناسینی رای گشتی ئەنجاممان داون. سیاسەتمەداران، کۆمپانیا گەورەکان و رۆژنامەنووسان پارەی فراوان و هێزی گەورە و زەمەنێکی ناکۆتایان تەرخان کردووە بۆ پێشبینیکردنی تێڕوانینی رای گشتی سەبارەت بە دیاردە و بابەتە جۆراوجۆرەکان، لە بیمەی دابینکردنی کۆمەلایەتییەوە بگرە بۆ ژیانی دوای مەرگ و خواردنەوەی کەربۆندار. لە راستیدا ئەمە هەولێکە بۆ بەدەستهێنانی پلەی یەکەم لە کێبەرکێی تەسلیمبوون و ملکەچکردندا بۆ رای گشتی. راپرسیکەران بوونەتە غەیببێژانی مۆدێرن و بە هەمان شێلگیری و جیددیبوونی باپیرانی فالگیریانەوە دەکەونە راڤە و شیکردنەوەی ئاکامی راپرسییەکان. ئەلبەت هەر وەک چۆن خەتەکانی ناودەست خەتگەلێکی لێل و ئالۆزن دەشێت راپرسییەکانیش لێل و ئالۆز بن یان رەنگە بیروبۆچوونی خەلک گۆڕانی بەسەردا بێت کە هەندێ جاریش ئەو ئالوگۆڕە دەقەومێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بە شێوەیەکی کوێرانە و ناشارەزایانە هەموان بۆچوونی تازە قبوول بکەن و بەگەرمی لە ئامێزی بگرن. بۆ وێنە ئەو

---

١١ . ئەو هەلبژاردنانەی کە هەندێ لەوانەی مافی دەنگدانیان هەیە پالێوراوەکانی حیزب بۆ بەدەستەوەگرتنی پۆستێک یان بەشداریکردن لە هەلبژاردنی گشتیدا دیاری دەکەن. و.ف

بازرگانانەی ساڵی۲۰۰۰ ستایش دەکران و بە دەستەبژێر لەقەڵەم دەدران، ساڵی ۲۰۰۲ بە ساختەچی و فریوکار ناوزەد کران. نیوت گینگریچ لە هەڵبژاردنی سەرکۆماریی ۱۹۹٤دا هۆکاری یەکەمی سەرکەوتنی دیموکراتەکان بوو کەچی ساڵێک دواتر گۆڕدرا بۆ مرۆڤێکی توندڕەو و گەمژە. سیمای بیل کلینتۆن لە سەردەمی سەرۆککۆماریدا بە شێوەی حەفتانە و بەردەوام لە ڕێبەرێکی ئەفسانەییەوە دەگۆڕدرا بۆ خوێڕییەکی هیچوپووچ. تاکە بابەتی نەگۆڕ و هەمیشەیی لەم یارییە گاڵتەجاڕەدا ستایشکردنی بەردەوامی خەڵکی ئەمریکایە. سیاسەتمەداران بەردەوام ئەو ڕستەیە دووپات دەکەنەوە: «خەڵکی ئەمریکا گەمژە نین»، تەنانەت ئەو کاتانەش کە دان بەو ڕاستییەدا دەنین کە خەڵکی ئەمریکا هەمیشە و هەمووکات خوازیاری کەمکردنەوەی ڕێژەی پیتاک و زۆرکردنی خزمەتگوزارییە دەوڵەتییەکانن، دیسان هەر ئەم ڕستەیە دەڵێنەوە. کە سیاسەتمەدارێک دەیەوێ پرسیارێک ئاراستە بکات دەڵێ: «خەڵکی ئەمریکا دەیانەوێ بزانن»، ئەڵبەت لە ڕاستیدا خودی ئەو سیاسەتمەدارە و ڕەنگە تەنیا خۆی خوازیاری تێگەیشتن بێت. سیاسەتمەدارێکیتر دەڵێت: «ئێمە لە خەڵکی ئەمریکامان بیستووە»، وەک ئەوەی بڵێت لە خودای بیستووە. لەمڕۆدا ئەگەر بابەتێکی بێبایەخ بە زمانی خەڵکی ئەمریکاوە بێتە گوتن یەکسەر وەک ئایەتەکانی ئینجیل دەبێتە خاوەن هێز و بایەخێکی گەورە.[١٢]

## ئازادی و سنوورەکانی

لەلایەکیترەوە خەڵک هەست بە کێشەیەک دەکەن. خەڵکی ئەمریکا زیاتر لە هەمیشە بەرانبەر سیستەمی سیاسیی وڵاتەکەیان کەمتەرخەمن. لەم کێشەیەدا ئەمریکاییەکان تەنیا نین و زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا لەم کێشەیەوە گلاون و کەمتەرخەمییەکی[١٣] مێژوویی لە ئاست سیاسەتی ئەو وڵاتانەدا دەبینرێت. لە ڕاستیدا گەشەسەندنی پۆپۆلیزمی دژەدەسەڵات لە هەموو وڵاتانی ئەوروپاییدا نیشاندەری ئەوەیە کە ئاوەها بۆچوونگەلێک هەر ئێستاش بەهێزە. ڕەوتی ڕوو لە

١٢ . تۆکڤیل، وەک هەموو بابەتەکانیتری دەربارەی ئەمریکا، پێش هەموان و باشتر لە هەموان ئەم بابەتەی شی کردۆتەوە: «لە سەردەمی پاشایەتیی پێشوودا فەرەنسییەکان پێیان وابوو پاشا قەت تووشی هەڵە نابێت، ئەگەریش تووشی بێت ئەوا بێگومان خەتای ڕاوێژکارانیەتی... ئەمریکاییەکان ئاوەها بۆچوونێکیان دەربارەی زۆرینە هەیە». بە هەمان شێوە مایکڵ کینزلی کاتێک یادداشتە ڕۆژانەکانی ڕۆژنامەکەیی لە دووتوێی کتێبێکدا بڵاو کردەوە ناوی منداڵە گەورەکانی لەسەر دانا کە جۆرە ئاگادارکردنەوە و هۆشدارییەکی تێدایە و لە ڕاستیدا نازناوێکە بەخشیویەتە خەڵکی ئەمریکا.

13. Inattention

گەشەی تووڕەیی و ناڕەزایەتی بەرانبەر سیستەمە سیاسییەکان لە سەردەمێکی زۆر نەگونجاودا رووی داوە. دیموکراسییەکانی رۆژئاوا کەوتوونەتە ژێر گوشاری هەندێ هەڕەشەی جیددی و تازەوە، هەڕەشەی وەک تیرۆریزم، ئاڵوگۆڕی پێکهاتەی دانیشتوان، پەنابەری و ململانێی کولتووری. دەوڵەت دەبێ لە بەرانبەر ئەم هەڕەشە نوێیانەدا پارێزگاری لە کۆمەڵگا بکات، چاکسازی لە پێکهاتەی رێکخستنی ئاسوودەیی کۆمەڵایەتیدا بکات و لەهەمانکاتدا کە بەر بە ئەگەری شەڕی کولتووری دەگرێت بانگەشە بۆ کۆچبەری بکات. ئەمانە لە هەموو سەردەمێکدا کۆمەڵە ئامانجێکی دوور و گرانن. کەچی لەولاشەوە قەت سیستەمی سیاسی بەم ئاستەی هەنووکە ناکارامە و لاواز نەکەوتووە. هەندێ فاکتەری وەک ململانێ نەبڕاوەکانی هەڵبژاردن، بەرنامەی کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ حیزبەکان، گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان و لۆبییکردن ـ کە لە ئەمریکادا بەربڵاوترە لە هەموو شوێنێک ـ بوونەتە هۆی دابەزینی متمانەی خەڵک بە سیستەمی سیاسی و ئاستی بەشداریکردنی خەڵک لە هەڵبژاردندا هێند دابەزیوە مرۆڤ نیگەران دەکات. هەرچەند دیموکراسیی رۆژئاوایی هێشتا سەرچەشنێکە بۆ هەموو جیهان، بەڵام ئایا ئەگەری ئەوە ناچێت ئەم دیموکراسییە دابڕووخێت و ناوەڕۆکی خۆی لەدەست بدات، هەر وەک چۆن ئەستێرەیەکی گەورە ئەوکاتەی دەگاتە سەر ترۆپکی رۆشنایی لە کەشکەشانێکی دووردا دادەمرکێ و دەکوژێتەوە.

هەندێ کەسیتر پێچەوانەی ئەمە بیر دەکەنەوە و پێیان وایە رەوتی روو لە گەشەی دیموکراتیزاسیۆنی کۆی کۆمەڵگا دەستکەوتێکی رووت و رەهایە و لە بەرژەوەندیماندایە. ئەوان پێیان وایە رووخانی سیستەمە کۆنەکان، بەهرەمەندبوون و لەبەردەستدابوونی هەرچی زیاتر و بەهێزبوونەوەی هەموان تەنیا و تەنیا بەختەوەریی هەرچی زیاتری تاکەکانی لێ دەکەوێتەوە. لە دوایین ساڵەکانی دەیەی پڕکێشمەکێشی ١٩٩٠دا کۆمپانیای راوێژکاریی ئەکسێنچێر بۆ دۆزینەوە و راکێشانی کڕیاران و خوازیارانی شیکارییە ورد و پێشبینییە رێکوپێکەکانی هەندێ پۆستەری چاپ و بڵاو دەکردەوە، یەک لەم پۆستەرانە بریتی بوو لە مانشێتی دروستکراوی رۆژنامەیەک و ئەمەی لەسەر نووسرابوو: «ئینتەرنێت دیموکراسی دەباتە چینەوە»، مانشێتە دووهەمەکەیش دەیوت: «*هەنووکە* سەرنجەکان رادەکێشێ». هەرچەند سەردەمی کۆمپانیا تازە هەڵتۆقیوە ئینتەرنێتییەکان بەسەرچووە بەڵام ئەویندارانی ئینتەرنێت لەسەر ئەو باوەڕەن کە هێشتا ئینتەرنێت لە سەرەتای خۆیدایە و دواجار دیموکراسی دەباتە چینەوە و بووژانەوەی ئابووریش پێشکەش بە هێندستان دەکات و وەها دۆخێک دەئافرێنێ هەموومان بتوانین ببینە بانکدار و پارێزەر و رۆژنامەوان و تەنانەت یاسادانەری خۆمان. ئەم دوایین بابەتە ـ یاسادانەری ـ هەر ئێستاش لە کالیفۆرنیادا هاتۆتە دی، لەو ویلایەتەدا ئایدیای دەوڵەت لەسەر بنەمای ریفراندۆم خەریکە دێتە دی. لە حاڵێکدا

که دوابەدوای ئەم ڕەوتە کۆمەڵە ڕەوتێکی هاوشێوەی دیکەیش بە ڕێگاوەن، ئایا دەتوانین دژی دیموکراسیی فرەتر بئاخفین؟

گریمان ئازادی بەرهەمی ئانارشیزم نەبێت و بەرهەمی ڕێژەیەکی دیاریکراوی تەکووزی و نەزم بێت، گریمان بەرهەمی دیموکراسیی ڕاستەوخۆ و بێسنوور نەبێت و بەرهەمی دیموکراسییەکی ڕێکخراو لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی بێت، ئایا لەم حاڵەشدا دەتوانین لەسەر دیموکراسیی بێسنوور و هەمەلایەنە سوور بین؟ گریمان وەک زۆربەی رووبەرەکانیتری ژیان لەم رووبەرەشدا پێویستمان بە هەندێ ڕێنوێنی و مەرج و سنوور بێت و تەنیا ئەوکاتە بتوانین ئازادی بپارێزین کە ڕەچاوی ئەم مەرج و سنوورانە بکەین، ئایا دیسان دەتوانین لەسەر هەمان ئەو بۆچوونە سوور بین؟ لەهەرحاڵدا ئەم تیۆرییە ئەڵتەرناتیڤە هەمان ئەو شتەیە کە دیموکراسیی تازە و لیبرالیی لێ کەوتۆتەوە. ئەو دیموکراسییەی لە ڕۆژئاوادا ژیاوین هەمان ئەو شتەیە ئەرەستوو ناوی نابوو «سیستەمی تێکەڵکرد». بێگومان ئەم سیستەمە خاوەن دەوڵەتێکی هەڵبژێردراو بوو بەڵام لە هەمان کاتدا هەڵگری شتیتریش بوو کە دەتوانین ئاماژە بدەینە ماف و یاسای ڕۆنراو لەسەر بنەمای یاسای بنچینەیی، دەزگای سەربەخۆی دادوەری، حیزبی سیاسیی بەهێز، کلێسا، کۆمپانیای بازرگانی، سازە و ڕێکخراوی کەرتی تایبەت و دەستەبژێرانی پرۆفیشناڵ. دیموکراسیی سیاسی یەک لە لایەنە سەرەکییەکان و لە ڕاستیدا لایەنی ژیانبەخشی ئەم سیستەمە بوو و دواجار دەسەڵات دەگەڕایەوە بۆ خەڵک، بەڵام هەموو لایەنەکانی ئەم سیستەمە ئاڵۆز و فرەلایەنە لە ژێر ڕکێفی هەڵبژاردندا نەبوون. لە ڕاستیدا ئامانجەکانی زۆربەی ئەم گرووپ و دامەزراوە نادیموکراتیکانە بریتی بوو لە دابەزاندنی کەف و کوڵی جەماوەری، پەروەردە و ڕاهێنانی هاووڵاتییان، بەرەو پێشبردنی دیموکراسی و دواجار پارێزگاریکردن لە ئازادی. کۆلیژی یاسای زانکۆی هاروارد لەکاتی پێشکەشکردنی بڕوانامەی خوێندکاراندا وەبیریان دەخاتەوە وەک «کۆمەڵێک سنوور و مەرجی ئاوەزمەند کە مرۆڤ بەرەو ئازادی دەبات». بیر لە یاسا بکەنەوە. سروودی نەتەوەییش لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەمریکا، ئەمریکا/خودا لاوازییەکانت بسڕێتەوە/ ڕۆحت بە هێمنایەتی هەرمێن بکات/ئازادیت بە یاسا.

ئەم کتێبەی بەردەستتان بانگەشەیەکە بۆ هێمنایەتی و ژیاندنەوەی هاوسەنگیی نێوان دیموکراسی و ئازادی. ئەم کتێبە دژی دیموکراسی نەنووسراوە بەڵام بانگەشەی ئەوە دەکات ڕەنگە شتێک هەبێت بتوانین ناوی بنێین «دیموکراسیی ناپێویست» ـ لایەنێکی ناپێویست لە شتێکدا کە ئاشکرایە خۆی شتێکی باشە. سیاسەتی دیموکراتیکی لیبرالی لە هەناوی خۆی و لە بنەڕەتدا هەوڵی ڕۆنانی تەکووزییەکی کۆمەڵایەتیی دەوڵەمەند و ئاڵۆز دەدات کە هیچ جۆرە هزرێکی تاقانەی

بەسەردا زاڵ نەبێت. بۆ وێنە دامەزرێنەرانی ئەمریکا لە سەردەمێکدا کە زۆربەی خەڵک پێیان وابوو پێویستە ئایدیۆلۆژیایەکی یەکگرتوو و تاقانەی ئایینی وڵات بەڕێوە ببات، بەپێچەوانەوە دەیانویست کۆمەڵگایەکی پلۆراڵ و فرەچەشنی دابمەزرێنن. دیموکراسیش ئایدیۆلۆژیایەکی یەکگرتووە و وەک هەموو ئایدیۆلۆژیایەکیتر هەڵگری کۆمەڵە سنوور و مەرجێکی تایبەت بە خۆیەتی. مەرج نییە ئەگەر شتێک بۆ پەرلەمانی یاسادانان بشێت، شیاوی کۆمپانیایەکی گەورەی بازرگانیش بێت.

گرتنەبەری ڕێگای گەڕانەوە بە مانای هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی تەکووزییەکی کۆن نییە. ئێمە هەموو گۆڕانکارییە دیموکراتیکە ئەزموونکراوەکانمان خۆش دەوێت و ڕێز لە دەستکەوتەکانیان دەگرین. ئامانجمان بەدیهێنانی دیموکراسیی لیبرالییە، ئەڵبەت نەک مۆدێلی سەدەی نۆزدەم بەڵکوو مۆدێلێکی تازە کە شیاوی سەدەی بیست و یەک بێت. کۆمەڵگا دیموکراتیکەکان پێویستیان بە یارمەتیی هەندێ ڕێنوما و ناوبژیی تازەیە کە بە گرفتەکانی سەردەمی تازە ئاشنابن. لەگەڵ ئەمەشدا بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارە پێویستە ئاوڕ لە مێژوو بدینەوە و بیکەینە خاڵی دەسپێک، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ خەبات و تێکۆشانی مرۆڤ لە پێناو ئازادی و دیموکراسیدا کە لە ڕۆژئاوادا دەستی پێکرد و ناوچەکانیتری جیهانی گرتەوە. ئەگەر دەمانەوێ گەڕانی هەرمێنمان بەدوای ژیان و ئازادی و بەختەوەریدا بژیەنینەوە، پێویستە سەرلەنوێ هەڵگەڕینەوە بۆ لای هەمان ئەو هێزانەی دەسپێکەر و ئافرێنەری ئەو شتانە بوون. بێگومان ئەگەر بمانەوێ داهاتووی ئازادی گەرەنتی بکەین پێویستە لە ڕابردووی ئازادی بگەین.

# بەشی یەکەم

## مێژووی ئازادیی مرۆڤ

هەموو شتێک لەوکاتەوە دەستی پێکرد کە قوستەنتین - ئێمپراتۆری رۆم - بڕیاری دا پایتەختی ئیمپراتۆریاکەی بگوێزێتەوە. سەرۆکی گەورەترین ئیمپراتۆریای جیهان لە ساڵی ٣٢٤ی زاییینیدا هەستا بە گواستنەوەی پایتەخت لە شاری رۆماوە بۆ بیزانس لە لێواری دەریای رەشدا کە شارێکی کۆن و جێگای دابەزینی پەنابەرانی یۆنانی بوو، دوابەدوای ئەمەش یەکسەر ناوی شارەکەی گۆڕی بۆ قوستەنتەنییە. چما ئەو پایتەختە ئەفسانەییەی بەجێهێشت؟ قوستەنتین دەیوت خودا دەستووری ئەم کارەی پێداوە. دیارە ناتوانین لەگەڵ ئاوەها لۆژیکێکدا بەشەڕبێین، هەرچەند بێگومان لووتبەرزی و فرەخوازیش لەم مەسەلەیەدا تا رادەیەک دەوری گێڕاوە. قوستەنتین زۆر حەزی دەکرد دوای خۆی میراتێکی گەورە بەجێ بهێڵێت، ئەو نەیتوانیبوو سەرکەوتنی بەرچاوی سەربازی بە ناوی خۆیەوە تۆمار بکات، هەر بۆیە باشترین رێگا ئەوە بوو پایتەختێکی نوێ بکاتەوە. ئەم گواستنەوەیە لە رووی سیاسیشەوە کارێکی ژیرانە بوو، قوستەنتەنییە بە بەراورد لەگەڵ رۆمادا لە ناوەندە گەورە کولتووری و ئابوورییەکانی ئەو سەردەمەوە - وەک ئەسینا، ستالۆنیکا و ئەنتاکییە - نزیکتر بوو (لەوکاتەدا رۆما وەک شارێکی مردوو لەقەڵەم دەدرا). هەروەها لە رووی ستراتیژیکیشەوە جێگایەکی لەبارتر بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی هەڕەشەی دوژمنان کە گرنگترینیان عەشیرەتە ژێرمەنەکان و ئارتەشی ئێران بوون. لە سەدەی چوارەمی زاییینیدا ناوەندە گەورەکانی مێژوو کەوتبوونە رۆژهەڵاتەوە.

هیچکات ئیمپراتۆرەکان سەفەرێکی سادە ناکەن و چەندەها شتی گەورە و بچووک لەگەڵ خۆیاندا دەگوێزنەوە، قوستەنتینیش لەگەڵ گواستنەوەی پایتەختدا دەیان هەزار دانیشتووی رۆمای گواستەوە و بۆ بژێوی کاروانی هاورێیانی، خواردن و خواردنەوەیەکی فراوان و بەرچاوی بە زۆر لە میسرییەکان و دانیشتووانی ئاسیای بچووک و سووریا سەند. هەروەها دەستەیەک لە پیاوانی خۆی رەوانەی سەرانسەری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای رۆم کرد و رایسپاردن بۆ رازاندنەوەی

«رۆمای تازە» بەرهەمی هونەری کۆ بکەنەوە. بەم شێوەیە وەک چۆن یاکوب بۆرکهارتی مێژوونووس وتوویەتی «گەورەترین گەنجینەی بەرهەمی هونەری لە هەرهەموو مێژوودا بە دزێوترین شێوە بەتاڵان برا»، «ئەم تاڵانکارییە لە پێناو رازاندنەوەی (قوستەنتەنییە)دا ئەنجام درا».[١] قوستەنتین هەرچی لەدەست هاتبا و هەر ئاسانکارییەک پێویست بوایە ئەنجامی دەدا بۆ ئەوەی سێناتۆرەکان و کەسایەتییە ناسراوەکانیتر راپێچی قوستەنتەنییە بکات، بۆ وێنە بۆ هەموویان خانوویەکی کردەوە دەقاودەق هاوشێوەی هەمان ئەو ماڵەی لە رۆمادا بوویان. هەرچەند قوستەنتین زۆربەی دەربارەکەی لەگەڵ خۆیدا گواستەوە، بەڵام کەسێکی بەجێهێشت: ئۆسقۆفی رۆما. جیاکردنەوەی مێژوویی دەوڵەت و کلێسا لە یەکتر گەلێ چارەنووسساز بوو و دەسکەوتی بەنرخی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی لێ کەوتەوە.

ئۆسقۆفی رۆما بە رواڵەت خاوەن پلەوپایەیەکی بەرز بوو، چوونکوو یەکەم کەسێک ئەم پێگەیەی پێبڕا حەوارییەکی بەرزی مەسیح بوو بە ناوی «پێترۆس». بەڵام رەمزی بەردەوامبوونی مەسیحییەت لەوەدا بوو کە ئایینێکی چەقنەبەستوو بوو و لە کۆمەڵە کلێسایەکی خودموختار پێک هاتبوو، بەڵام دوای ئەم رووداوە مەودایەکی گەورە کەوتە نێوان رۆما و پایتەختی ئیمپراتۆریا. پیاوە ئایینییە گەورەکانیتر، وەک ئۆسقۆفی بیزانس و کەشیشەکانی ئەنتاکیە و ئۆرشەلیم و ئەسکەندەرییە، لە قوستەنتەنییەوە نزیک بوون، هەر بۆیە هەرهەموویان کەوتنە ژێر سێبەری دەسەڵاتەوە و زۆر خێرا بوونە بەشێک لە دەوڵەت. بەڵام کلێسای رۆما دوور بوو لە سەنتەری دەسەڵات و ئەمەش وای کرد لە پیلان دوور کەوێتەوە، هەر بۆیە بووژانەوەیەکی گەورەی بەخۆوە دیت و بە توندی داکۆکیی لە سەربەخۆیی خۆی دەکرد. دواجار هێند بەهێز بوویەوە بانگەشەی سەرۆکایەتیکردنی مەعنەویی ئوممەتی مەسیحیی دەکرد. ئێرنێست بارکێر، تویژەری کلاسیکی بریتانی، پێیوایە ئەم جیابوونەوەیە بوو بە هۆی ئەوەی رۆژهەڵات (بیزانس) بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتەوە و رۆژئاوا (رۆما) دەسەڵاتی ئایینی بەسەردا زاڵ بێت. ئەگەر وردتر لەم مەسەلەیە بڕوانین لە راستیدا شەڕێکی دوورودرێژ لەسەر بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات رۆژئاوای گرتەوە؛ بەرجەستەترین رەهەندی مێژووی ئەورووپا تا ١٥٠٠ ساڵ دوای کۆچکردنی قوستەنتین بریتی بوو لە شەڕێکی بەردەوام لە نێوان دەوڵەت و کلێسادا. پزیسکەکانی ئەم ململانێیە یەکەم پشکۆکانی ئاگری ئازادیی مرۆڤیان هەڵگیرساند.

## ئازادی لە سەردەمی کۆن و نوێدا

بێگومـان مەسـەلەکەمان زۆر سـادە کـردۆتەوە ئەگەر بـۆ پێناسـەکردنی دەسـپێکی دیـاردەیەکی ئاڵۆزی مێژوویی ـ وەک پرسی ئازادیی مرۆڤ ـ تاقەرووداوێـک دەستنیشـان بکەیـن، بەڵام پێویسـتە بـۆ هەر چیرۆکێـک سـەرەتایەک بـدۆزینەوە. بە ڕای مـن سـەرهەڵدانی کلێسـای مەسـیحی یەکەم ئاخێزگەی گرنگی ئازادی بوو لە رۆژئـاوا و سـەرجەم جیهانـدا. ئەم خـاڵە نـاوەڕۆکی سـەرەکیی ئەم بەشـەی کتێبەکەمـان بـۆ روون دەکـاتەوە، واتە ئەو راسـتییەی کە ئـازادی چەنـدین سـەدە بەر لە دیموکراسـی رووی لە رۆژئـاوا کـرد، ئـازادی دیموکراسـیی پێـک هێنـا و پـێچەوانەی ئەمە درۆیە. هەروەهـا پارادۆکسـێکمان پـێ نیشـان دەدات کە سـەرلەبەری ئەم کتێـبەی گرتـۆتەوە: ئـازادی لە رۆژئـاوادا زادەی زنجیـرەیەک شـەڕ و ململانـێ بـوو لەسـەر دەسـەڵات، ئەڵـبەت کـۆمەڵە هۆکـارێکی پێکهاتەییی قووڵی دیکەیش دەوریان گێڕاوە. ئاسەوارەکانی ئەم ململانێیە ـ ململانێی نێوان دەوڵەت و کلێسا، پادشا و ئەشـراف، کاتۆلیـک و پرۆتسـتان و، بازرگـانی و دەوڵەت ـ بە پێکهـاتەی ژیـانی رۆژئاواییدا رۆچۆتە خوارێ و بووە بە هۆی گەورەبوونەوەی بەردەوامی خەبات و تێکۆشان لە پێنـاو ئازادییە تاکییەکاندا، بەتایبەت لە بریتانیا و دواتریش لە ئەمریکادا.

رەنگە هەندێ کەس ئەم پێداگربوونە لەسەر کلێسای مەسیحی بە هەڵە بزانن و بە گـوڕوتینێکی زۆرەوە بڵێن ئاخێزگەی ئازادی یۆنانی کەونارا بووە. رەنگە ئەو کەسانە کەوتبێتـنە یـادی ئاخـافتنە بەناوبانگەکەی مەراسیمی بەخاکئەسپاردنی پریکلێس لە ٤٣١ی پێش زاییندا کە سیمایەکی ئایدیاڵی بەخشیوەتە ئەسینای ئەو سەردەمە و وەک یۆتۆپیای ئـازادی و دیموکراسـی و یەکسـانی پێناسـەی کـردووە. زانکۆکـانی بریتانیـا و ئەڵمانیـا لە زۆربەی سـاڵانی سـەدەی نـۆزدەدا خوێنـدکارانیان بەو هـزرەرادەهێنـا کە بەرزتـرین و پرشـکۆترین سـەردەمی ژیـانی مـرۆڤ سـەردەمی دەوڵەت ـ شـارە یۆنانییەکانی سەدەی پێنجی پێش زایین بوو. (تا ئێستاش لە زانکۆی کەمبـریج و ئۆکسـفۆرددا ئەو خولانەی لەسەر مێژووی یۆنان و رۆمی کۆن دەکرێنەوە بە خولی فێرکـاریی «مەزنـان» ناسـراون). بەڵام ویکتۆریاییەکان کەمێک خەیاڵی لە یۆنانی کۆنیان دەڕوانی. یۆنانی کـۆن خـاوەن کولتـوورێکی دەوڵەمەنـد و سەرسـامکەر بـوو، تەژی لە فەلسـەفە و زانسـت و ئەدەبیـات، یۆنـان ئـاخێزگەی دیموکراسـی و هەنـدێ لە ئایـدیا پەیوەسـتەکانی دیموکراسـی بـوو. بەڵام هەمـوو ئەم شـتانە لە رووبەرێکی بچووکدا هـاتە بـوون و تەنیـا چەنـد دەوڵەت ـ شـارێکی بچـووکی گـرتەوە و نـزیکەی سەدساڵێک بەردەوام بوو. دوای ئەوەی مەکدۆنییەکان لە ٣٣٨ی پێش زاییندا ئەسینایان داگیر کرد

هەمــوو ئەم دەســکەوتانەش لەنــاوچوون. دوای زیــاتر لە هەزار ســاڵ، ئەزمــوونی یۆنــان بــوو بە سـەرچاوەیەک بـۆ دیموکراتەکـان، بەڵام بە درێژاییـی ئەو دە سـەدەیە هـیچ جـۆرە کـاریگەرییەکی هەستپێکراو یان دامەزراوەیی لەسەر سیاسەتی ئەورووپا نەبوو.

جیا لەمەش بەو تێگەییشتنەی ئێستامان یۆنان ئاخێزگەی ئـازادی نەبـوو. لە دونیـای مۆدێرنـدا ئازادی بەر لە هەمـوو شـتێک مانـای ئـازادبوونی تـاک لە دەسـەڵاتداریی سـەرەڕۆیانە کە لە زۆربەی قۆناغەکانی مێژوودا هاوواتای ئازادبوونن لە دەسەڵاتی رووتی دەوڵەت هاتۆتەوە. بۆ بەدیهـاتنی ئەم ئازادییە پێویستە هەندێ لە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ دابین بکرێـت: ئـازادیی رادەربـڕین، ئـازادیی کۆڕ و کۆبوونەوە، ئازادیی کاروباری ئایینی و مافی دادوەریـی دروسـت و عـادیلانە. بەڵام بە واتـای فەیلەسوفی سەردەمی رۆشنگەری، بێنجـامین کۆنسـتان، لە سـەردەمی کۆنـدا ئـازادی پێناسـەیەکی جیاواز لەمەی هەبوو: ئەوکات ئازادی مانای مافی بەشداریکردنی هەمـوو کەس (لە راسـتیدا هەمـوو پیــاوان) لە بەڕێـوەبردنی کۆمەڵگـادا. بە شـێوەی گشـتی هەمـوو هاووڵاتییــان لە ئەنجومەنەکـانی یاسـادانانـدا بەشـدارییان دەکـرد، ئەگەریـش ئەم کـارە مـومکین نەبـایە ئەوا یاسـادانەران لە رێگـای پشکخستنەوە هەڵئەبژێردران، ئەم میتۆدە ئێسـتاکەش لە ئـەمریکادا بـۆ دەستنیشـانکردنی لیـژنەی ژووری بەکـار دەبرێـت. لە یۆنـانی کۆنـدا ئەنجـومەنە خەڵکییەکـان (جەماوەرییــەکان) خــاوەن دەسەڵاتێکی بێسنوور بوون. نە بە شێوەی تیۆریک و نە لە پراکتیکدا هیچ بایەخێک بە مافی تـاکی نەئەدرا و پارێزگاریی لێ نەدەکرا. وەک کۆنستان دەڵێت دیموکراسیی یۆنانی مانای «قوربانیبوونی تاک لە بەرانبەر ئۆتـۆریتەی کۆمەڵگـادا».[٢] بـا ئاورێـک بـدەینەوە لە رووداوێکـی بەناوبـانگی ئەم وڵاتە لە سـەدەی چـوارەمی پـێش زایینـدا؛ دەڵـێن بەرجەسـتەترین و شـکۆمەندترین دەرکەوتنـی دیموکراسـی لەو سـەردەمەدا سـەری هەڵـداوە، کەچـی هەمـان ئەنجـومەنی خەڵکـی بە دەنگێکـی دیموکراتیک گەورەترین فەیلەسوفی سەردەمی، بە تاوانی بیر و هزرەکانی مەحکووم بە مەرگ کـرد. بڕیاری لەسێدارەدانی سوکرات دیموکراتیک بوو بەڵام لیبرالی نەبوو.

گەلێ شرۆڤەی ناڕاست و قەبەکراو بۆ رەگوریشەی ئـازادیی رۆژئـاوایی لە یۆنـانی کۆنـدا کـراوە، کەچی بنەما رۆمییەکانی لەبیر کراوە. مەبەسـتی هێـرۆدۆت لەو دەربـڕینەی کە دەیـوت یۆنانییەکـان «خەڵکانێکی ئازاد»ن ئەوە بوو کە یۆنانییەکـان کـۆیلەی بندەسـتی بیـانی نـین، دیـارە لە دونیـای نوێـدا ئەمە مانــای «ســەربەخۆیی نەتەوەیــی» یــان «خودموختــاری» دەگەیەنــێ. (ئەگەر ئەم پێناسـەیە بـۆ ئـازادی قبـووڵ بکەیـن دەبـێ بڵێـین خەڵکـی کۆریـای بـاکوور خەڵکـانێکی ئـازادن). تێگەییشتنی رۆمییەکان بۆ ئازادی جیاواز بوو، بە باوەڕی ئەوان ئازادی مانای یەکسانبوونی هەمـوو هاووڵاتییانـە لە بەرانـبەر یاسـادا. تێگەییشـتنی رۆمییەکـان گەلـێ نزیکتـرە لە پێناسـەی مـۆدێرنی

ڕۆژئاوا بۆ ئەم چەمکە و لە ڕاستیدا وشەی ئازادی لە زمانی ئێستاماندا لە هاووڵاتا لاتینییەکەیەوە ـ واتە libertasـ وەرگیراوە. یۆنانییەکان فەلسەفە، ئەدەبیات، شیعر و هونەریان پێشکەش بە جیهان کرد بەڵام ڕۆمییەکان دەوڵەتی سنووردار و باڵادەستیی یاسایان پێشکەشی مرۆڤایەتی کرد. خەسڵەتە تایبەتییەکانی کۆماری ڕۆما ـ دابەشبوونی دەسەڵات بەسەر سێ دەزگادا، هەڵبژاردنی بەرپرسانی دەوڵەتی بۆ ماوەیەکی کورتی دیاریکراو و یەکسانبوون لە بەرانبەر یاسادا ـ لەو سەردەمەوە تا ئێستا ڕۆمای کردۆتە مۆدێلێک بۆ دارشتنی دەوڵەت کە بەرجەستەترین ڕەنگدانەوەی لە دامەزرانی کۆماری ئەمریکادا دەبینرێت. تا ئێستایش هێشتا چەمک و دەستەواژە سیاسییەکانی ڕۆم لە سەرجەم جیهانی ڕۆژئاوادا بەکار دەهێنرێت، دەستەواژەی وەک سێنا، کۆمار، یاسای بنچینەیی و سنووردارپوونی قۆناغی دەسەڵاتداری. یاساکانی ڕۆژئاوا تەژین لە میراتەکانی ڕۆم، بە شێوەیەک کە تا سەرەتای سەدەی بیستەم دەبا هەموو یاسازانان زمانی لاتینییان زانیبا. زۆربەی یاساکانی ئێستای دونیا لە یاسا ڕۆمییەکانەوە هەڵهێنجراون، بۆ نموونە یاسای پەیماننامەکان، موڵکداری، بەرپرسایەتی، سووکایەتیکردنە سەر کەسایەتی، میرات، ماڵ و موڵک و هەروەها یاساکانی شێوازی دادوەری و سەلماندنی تاوان. هێربێرت ئەسکوییت، تویژەری ئاماتۆر و زۆر زیرەکی دونیای کۆن کە بوو بە سەرۆک وەزیرانی بریتانیایش، پێیوایە گەورەترین دیاریی ڕۆم بۆ هەموو سەردەمەکان شتێکی ناوازە بوو: ڕۆم «سیستەمی یاسای لە دونیادا ڕۆنا، گەشەی پێدا و میتۆدی بۆ دیاری کرد».[٣]

گەورەترین کەماسیی یاسای ڕۆمی ئەوە بوو کە لە کردووەودا چینی خاوەن دەسەڵاتی نەدەگرتەوە، بەتایبەت لە سەدەی یەکەمی زایینییەوە سیستەمی کۆماری گۆڕدرا بۆ سیستەمی پاشایەتی و ئەو کێشەیە زەقتر خۆی نواند. هەندێ لە ئیمپراتۆرانی وەک نیرۆن، ویتیلۆس و گالبا بەبێ دادگاییکردن بە ئاسانی حوکمی ئێعدامیان بۆ هاووڵاتییان دەردەکرد، دەکەوتنە تاڵانکردنی ماڵ و موڵکی خەڵک و کەنیسەکان، دەستدرێژییان دەکردە سەر ڕەعیەتەکانیان و دەیانکوشتن. بەو شێوەی دەیگێڕنەوە کالیگۆلا پۆستی سێناتۆریی بەخشییە ئەسپەکەی و بەم شێوەیە هەرچەند بە ئاشکرا یاساکانی سێنای پێشێل نەکرد بەڵام لانیکەم بە شێوەی پەنامەکی سووکایەتیی بە هەموو ئەو یاسا و ڕێسایانە کرد کە سەردەمانێک ڕێزیان لێ دەگیرا. نەریتە یاساییەکان کە لە سەردەمی کۆماری ڕۆمدا بە وردی ڕۆ نرابوون، لەگەڵ داڕووخانی ئیمپراتۆریاکەدا داڕووخان و هەڵوەشانەوە. ئەزموونی ڕووخانی ڕۆم وانەیەکی بۆجێهێشتین؛ بێگومان مانەوە و بەردەوامبوونی باڵادەستیی یاسا تەنیا گرێدراوی مەبەستی چاکەی دەسەڵاتداران نییە، چونکوو هەم مەبەستەکان و هەم دەسەڵاتداران گۆڕانیان بەسەردا دێت. پێویستە کۆمەڵگا خاوەن دامەزراوەی سەربەخۆ لە هێز و دەسەڵاتی دەوڵەت بێت تاکوو هاوسەنگییەک بێتە دی، ڕۆژئاوا ئەم هێزە هاوسەنگیکارەی لە کلێسای کاتۆلیکدا دۆزییەوە.

## پارادۆکسی مەزهەبی کاتۆلیک

کلێسای کاتۆلیکی رۆمی ئۆبژێکتیڤترین میراتی رۆم بوو، تۆماس هابز ـ فەیلەسوفی بریتانیایی ـ شوبهاندوویەتی بە «رۆحی ئیمپراتۆریای مردووی رۆم» کە «تاجێکی لە سەردایە و لەسەر گۆڕی ئیمپراتۆریاکە دانیشتووە».[٤] کولتووری رۆم بە کولتووری مەزهەبی کاتۆلیکدا رۆچوو. کلێسا بوو بە رێگایەک بۆ بڵاوکردنەوەی گەلێ نەریت و ئەندێشەی فراوان و هەروەها زمانی لاتینیشی پەرە پێدا، بەم شێوەیە خوێندەوارانی هەرهەموو ئەوروپا بوونە خاوەن زمانێکی هاوبەشی یەکگرتوو و ئەمەش ئەو هەستەی لا بزواندن کە کۆمەڵگایەکی یەکگرتوویان هەیە. ئەندێشە و پێکهاتەکانی کلێسای کاتۆلیک ـ باوەڕ بە رزگاریی سەرجەم مرۆڤەکان، سیستەمی زنجیرە پلەیی و پێڕەو و یاساکانی ـ تا ئێستاش زۆر لە ئیمپراتۆریای رۆم دەچێت.

رەنگە هەڵبژاردنی کلێسای کاتۆلیک وەک خاڵی دەسپێکی گێڕانەوەی چیرۆکی ئازادی، سەیر بنوێنێ. کلێسای کاتۆلیک هیچکات پێشتیوانیی لە ئازادیی بیروڕا و تەنانەت تا ئەم دواییانە لە رەنگاورەنگیی بۆچوونەکان نەکردووە. لە راستیدا کلێسا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا رۆژ لەدوای رۆژ بەهێزتر، دەمارگرژتر و سەرکوتکەرتر دەردەکەوت و پێی لەسەر رەهاگەری و گوێڕایەڵبوونی بێچەندوچوون دادەگرت و هەموو ناڕازییانی بە شێوازگەلێکی دزێوی وەک ئەنگیزاسیۆن لە خشتە دەبرد. تا ئێستایش کلێسا پێکهاتەیەکی زنجیرە پلەیی و ئۆتۆریتەخوازانەی هەیە. کلێسا قەت خۆی بە پشتیوانی ئازادییە تاکییەکان نەزانیوە بەڵام لە هەمان سەرەتاوە شێلگیرانە دژی دەسەڵاتی دەوڵەت وەستایەوە و کۆت و بەندی خستە سەر دەسەڵاتی پادشا. نەریتە کۆمەڵایەتییە گرنگەکانی وەک هاوسەرگیری و رێوڕەسمەکانی لەدایکبوون و مردن لەژێر کۆنترۆڵی کلێسادا بوون ماڵ و موڵکی کلێسا و کەشیشەکان لە یاسای وەرگرتنی پیتاک پارێزراوبوون و ئەمە شتێکی کەمبایەخ نەبوو، چونکوو کلێسا لە لووتکەی دەسەڵاتداریی خۆیدا خاوەن یەک لە سێی کۆی زەویوزارەکانی ئەوروپا بوو. کلێسای کاتۆلیک یەکەم دامەزراوەی گەورە بوو لە مێژوودا کە توانیی خۆی لەژێر سێبەری ئۆتۆریتە و دەسەڵاتداریی زەمینی رزگار بکات و سەربەخۆ بژی، ئەمەشی کردبووە رێگایەک بۆ بەکارهێنانی زۆر و دەسەڵاتی خۆی. بەم شێوەیە کلێسا درزەی کردە نێو بینای بڵندی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە و بۆشاییی تێ خست کە وردەوردە ئازادییە تاکییەکان لە نێو ئەو بۆشاییانەدا چەکەرەیان کرد و سەریان هەڵدا.

تەنیا پەنجا ساڵ دوای کۆچکردنی قوستەنتین ململانێی نێوان کلێسا و دەوڵەت دەستی پێکرد. یەک لە جێگرانی قوستەنتین بە ناوی ئیمپراتۆر تیۆدۆسیۆس لەگەڵ عەشیرەتێکی یۆنانیدا ـ ستالۆنیکا ـ تووشی کێشەیەکی قورس هاتبوو، ئەو هەموو عەشیرەتەکەی بانگهێشتی میلان کرد و

هەموو پیاو و ژن و منداڵەکانی ئەم عەشیرەتەی بەکۆمەڵ کوشت. ئۆسقۆفی مەزنی میلان کەشیشێکی پاک و ئیماندار بوو بە ناوی ئامبرۆسیۆس، ئەو گەلێ بەم جینایەتە قەڵس بوو، هەربۆیە بە ئاشکرا ئامادە نەبوو ڕێوڕەسمی عیشای ڕەبانی بۆ ئیمپراتۆر بەڕێوە ببات. ئیمپراتۆر ناڕەزایەتیی خۆی لەم ملکەچییە ڕاگەیاند و بۆ بەرگریکردن لە خۆی پەنای بردە بەر کتێبی پیرۆز. ئەو دانی بە گوناهباربوونی خۆیدا نا بەڵام دەیوت یەک لە پادشا قارەمانەکانی کتێبی پیرۆزیش - داوود - نەتەنیا مرۆڤی کوشتبوو بەڵکوو تووشی سێکسی حەرامیش (زینا) بووبوو، بەمەش دەیویست پاساوی کردەکەی بکات. ئۆسقۆفی مەزن نەرمیی نیشان نەدا و بەپێی گێڕانەوەی مێژوونووسی بەناوبانگی بریتانی، ئێدوارد گیبۆن، بە تووڕەییەوە وتی: «تۆ بۆ پاساودانەوەی جینایەتەکەت خۆت دەبەستی بە داوودەوە، کەوایە وەک ئەویش تۆبە بکە».[٥] هەموان بە بڕیارەکەی ئیمپراتۆری ڕۆم سەرسام بوون؛ بەهێزترین پیاوی جیهان هەشت مانگی ڕەبەق جارناجارێ لە بەرگی سواڵکەراندا (بە هەمان شێوەی داوود لە کتێبی پیرۆزدا) دەچووە بەر دەرکەی کلێسای سەرەکیی میلان و داوای لێبوردنی لە ئۆسقۆفی مەزن دەکرد.

ئیمپراتۆریای ڕۆم لە ڕۆژهەڵاتدا بەرەو رووخان دەچوو و لە بەرانبەردا ئۆتۆریتە و سەربەخۆییی ئۆسقۆفی ڕۆم پەرەی دەسەند. ئەو یەکەمین سەرۆکی کلێسا بوو کە نازناوی «ئیل پاپا» (باوکی پیرۆز) بڕا بە بالایدا. لە ساڵی ٨٠٠ی زایینیدا پاپا لیۆی سێهەمیان ناچار کرد تاجی ئیمپراتۆریای ڕۆم بکاتە سەر حاکمێکی عەشیرەتی فرانک کە ناوی شارلێمانی بوو. بەڵام ئەم کارەی لیۆی سێهەم بوو بە هۆی سەرهەڵدانی نەریتی «پۆشتە کردن» کە بەپێی ئەم نەریتە هەر پاشایەکی تازە هاتبا دەبا کلێسا لە ڕێوڕەسمێکی ئاییندا موبارەکی کردبا تاکوو دەسەڵاتەکەی شەرعییەتی پەیدا بکردایە. لە سەدەی دوازدەهەمەوە دەسەڵاتی پاپا گەورەتر بوویەوە و وردەوردە بوو بە یەک لە ئەکتەرە سەرەکی و ناوەندییەکانی ناو هاوکێشە سیاسییە ئاڵۆزەکانی ئەورووپا. دامودەزگای پاپا بوو بە خاوەن دەسەڵات، شەرعییەت، سامان و پارە و تەنانەت هێزی سەربازی. ئەم دامودەزگایە لە شەڕێکی هێماییی دیکەشدا لە دژی ئیمپراتۆری پیرۆزی ڕۆم، هاینریشی چوارەم، سەرکەوتنی بەدەست هێنا، هاینریش لە ساڵی ١٠٧٧دا هەوڵی دا بەر بە پەرەسەندنی دەسەڵاتی پاپا گریگۆری حەوتەم لە چوارچێوەی نەریتی «پۆشتەکردن»دا بگرێت. بەڵام ئەمە شەڕێکی دۆڕاو بوو و هاینریش دوای دۆڕانی ئەم ململانێیە بە ناچاری و بە پێخاوس لە کانوسادا لەسەر بەفر دەوەستا و داوای لێبوردنی لە باوکی پیرۆز دەکرد. ئەم چیرۆکە ڕاست بێ یان درۆ، بێگومان لە سەدەی دوازدەهەم بەدواوە دەسەڵات و مەزنایەتیی پاپا دەقاودەق هاوپلەوپایەی پادشاکانی ئەورووپا بوو و ڤاتیکان بە ئەندازەی ڕازاوەترین دەربارەکانی ئەورووپا مەزن و ڕازاوە بوو.

## جوگرافیای ئازادی

هۆکارێکی سادە بوو بە مایەی بەهێزبوونی کلێسا لە ڕۆژئاوادا: دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریای ڕۆم ئیدی قەت کلێسا ئیمپراتۆرێکی یەکگرتووی لەبەرانبەر خۆیدا نەدیتەوە. لە بەرانبەردا کلێسای کاتۆلیک توانای ئەوەی هەبوو دوو پادشای ئەورووپایی لەگەڵ یەکتر بەشەڕ بدات و لە شەڕی دەسەڵاتی ئەو سەردەمەدا خۆی خاوەن «دەنگێکی چارەنووسساز» بوو. ئەگەر پادشایەکی یەکگرتوو و تاقانە لە سەرانسەر ئەورووپا سەری هەڵدابا دەیتوانی کلێسا لە سەربەخۆیی دابماڵێت و بیگۆڕێت بۆ دەزگایەکی ملکەچ و ژێردەستەی دەوڵەت. کلێسای ئۆرتۆدۆکسی یۆنان و دواتر کلێسای ئۆرتۆدۆکسی ڕووسیا (یان باشترە بڵێین زۆربەی ئایینەکانی جیهان) ڕووبەڕووی ئاوەها چارەنووسێک بوونەتەوە. بەڵام هیچ پادشایەک نەیتوانی هەموو ئەورووپا یان تەنانەت زۆربەی ئەورووپا بگرێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. بە درێژایی چەند هەزارساڵ تەنیا چەند کەسێکی دەگمەن هەوڵی ئاوەها کارێکیان داوە ـ شارلیمانی، کارل (شارل)ی پێنجەم، ناپلیۆن، قەیسەر ویلهێڵم و هیتلەر. دواجار هیچکام لەم هەوڵانەش سەرکەوتوو نەبوون و زۆربەیان زۆر خێرا شکستیان هێنا.

هۆکاری ئەم مەسەلەیە دەگەڕێتەوە بۆ چ شتێک؟ ڕەنگە شاخەکان و چۆمەکان بووبێتن. ئەورووپا چەندەها لەمپەری سروشتیی هەیە کە فەلاتەکانیان دابەش کردووە بەسەر چەندەها دەربەندی چۆمیدا، ئەم دەربەندانە کەوتوونەتە داوێنی زنجیرە کێوەکانەوە. چۆمەکان پەیوەست دەبن بە کانداوگەلێکەوە کە کەوتوونەتە سەر هێڵە پێچاوپێچە مەدیتەرانەییەکانەوە و بۆ لێخوڕینی کەشتی دەشێن. ئەمەش نیشاندەری ئەوەیە کە دەڤەرە بچووکەکان دەتوانن سەربەخۆ لە وڵاتانی‌تر درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن و بگرە بووژانەوەیش بەخۆوە ببینن. ئەمە هەمان ڕەمزی مێژووی دووروودرێژی وڵاتانی سەربەخۆ و پرەژماری ئەورووپایە. ئەم وڵاتانە بە ئاسانی داگیر ناکرێن، وەرزێڕی تیایاندا ئاسانە و چۆم و دەریاکانیان گەلێ لەبار و ئامادەن بۆ کاروباری بازرگانی. لە بەرانبەردا ئاسیا تەژییە لە وڵاتانی بەربلاو و تەخت، ئێستێپەکانی ڕووسیا و دەشتەکانی چین لە نموونە بەرچاوەکانن. هێزی نیزامی بەبێ ئەوەی لەمپەرێکی گەورە لە بەردەم خۆیدا ببینێ دەتوانێ بەم جۆرە ناوچانەدا بپەڕێتەوە، هەر ئەمەشە وای کردووە بەدرێژایی هەزاران ساڵ ئەم دەڤەرانە لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریاگەلی چەقبەستوودا بن[١٤].

---

١٤ . لە ڕووی جوگرافییەوە ئافریقا کیشوەرێکی ئاوارتەیە. ئافریقا سەرەڕای ئەوەی دووهەم کیشوەری گەورەی جیهانە کەچی کەمترین هێڵی کەناریی هەیە و زۆربەی ئەم هێڵانەش بۆ کردنەوەی بەندەر ناشێن، چونکوو قووڵاییەکی کەمیان هەیە. هەر بۆیە بەدرێژاییی مێژوو ئافریقا بازرگانییەکی ئەوتۆی نەبووە. چۆمەکانی بۆ لێخوڕینی کەشتی ناشێن چونکوو قووڵاییان کەمە و ئەو شوێنانەش کە قووڵن چەندەها گێژاو

سروشتی ئەورووپا بە شێوەیەکە ئیمکانی پێکهاتنی کۆمەڵگای جۆراوجۆر بە قەوارەی گەورە و بچووک دەخولقێنێ - مۆدێلی جۆراوجۆری وەک دەوڵەت شار، دووکنشین، کۆمار، وڵات و ئیمپراتۆریا. لە ساڵی ١٥٠٠دا ڕێژەی وڵاتانی ئەورووپا ٥٠٠ وڵاتی دەرباز کردبوو کە زۆرێکیان بەقەدەر شارێک دەبوون. ئەم ڕەنگاوڕەنگییە دوو ئاسەواری سەیری بەجێهێشت. بە ئاستی یەکەم ئیمکانی جیاوازبوونی دەڕەخساند، ئەگەر کەسێک، هزرێک، هونەرێک یان تەنانەت تەکنۆلۆژیایەک لە ناوچەیەک پشتگوێ بخرایە زۆرجار دەڤەرێکیتری بۆ گەشەسەندن و بووژانەوە دەدۆزییەوە. بە ئاستی دووهەم، جیاوازی، بوو بە هاندەری ڕکابەرییەکی هەمیشەیی لە نێوان وڵاتەکاندا و ئەمەش مانای داهێنان و دەڵەمەندبوونەوە و کارامەیی لە ڕووبەری ڕێکخستنی سیاسی، تەکنۆلۆژیای نیزامی و سیاسەت و پلانی ئابووریدا. میتۆدە سەرکەوتووەکان دەکەوتنە بەر سەرنجەوە و میتۆدە بەکارنەهاتووەکان پشتگوێ دەخران. ڕەنگە سەرکەوتنی بەرچاوی ئابووری و سیاسیی ئەورووپا کە ئێریک جۆنز، مێژوونووسی ئابووری، ناوی «موعجیزەی ئەورووپایی»ی لەسەر داناوە، تا ڕادەیەکی زۆر بەرهەمی ئەم جوگرافیا نائاساییە بێت.[٦]

## ئەشراف و پادشاکان

تێکەڵبوونی جوگرافیا و مێژوو لە ڕەوتی دارشتنی پێکهاتەی سیاسیی ئەورووپادا یارمەتیدەر بوون. ڕووخانی ئیمپراتۆریای ڕۆم و دواکەوتوویی عەشیرەتە ژێرمەنەکان کە هۆکاری ڕووخانی ئیمپراتۆریاکە بوون، دەسەڵاتداریی چەقنەبەستووی لێ کەوتەوە؛ هیچ پادشایەک نەیتوانی ئەم جوگرافیا بەربڵاو و عەشیرەتە بێشومارە سەربەخۆیانە بگرێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. لە بەرانبەردا وڵاتانی ئاسیایی توانیبوویان جوگرافیای گەورەگەورە و میللەتانی فراوان لەژێر یەک دەسەڵاتدا کۆ بکەنەوە، بۆنموونە چین لە سەردەمی مینگ و مانچۆدا، هیندستان لە سەردەمی مەغۆلەکاندا و ئیمپراتۆریای عوسمانی - لە تەشقی دەسەڵاتی خۆیاندا - ئاوەها حکوومەتێکیان هەبوو. بەڵام لە ئەورووپادا زەمینداران (خاوەن زەوییەکان) و سەرکردە خۆماڵییەکان دەڤەری ژێر نفووزی خۆیان بەڕێوە دەبرد و پێوەندیی گەرم و نزیکیان لەگەڵ ڕەعیەتەکانیاندا دروست دەکرد. ئەمە خەسڵەتی تایبەتیی فیۆدالیزمی ئەورووپایی بوو، بە واتایەکیتر چینە گەورە زەمیندارەکان خاوەن سەربەخۆیی بوون. لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا سەدەی حەڤدەهەم بەگشتی پادشایانی ئەورووپا

---

و تاقگەیان تێ دەکەوێت (لەم ڕووەوە دیمەنی سەرنجڕاکێش زەبری گەورە لە بازرگانی دەدات). دەبێ گەرمای ئۆستوایی و نەخۆشینە ئۆستواییەکانیشی پێ زیاد کەین تاکوو لە هۆکارە پێکهاتەییەکانی ئەم دواکەوتووییە دڵتەزێنە بگەین.

بوونەوەرگەلێکی دوورەپەرێز و دابڕاو بوون و تەنیا بە ناو فەرمانڕەوای ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان بوون. بۆ وێنە پاشای فەرەنسا لە ناوچەی بێرتایندا، کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای ئەو وڵاتەوە، تەنیا حسێبی «دووک»ێکی بۆ دەکرا و بەدرێژاییی سەدان ساڵ لەم ناوچەیەدا دەسەڵاتێکی بچووک و بەرکورتی هەبوو. هەرکات پاشایەک هەستایە بە ئەنجامدانی کارێک ـ دەسپێکردنی شەڕ یان دروستکردنی قەڵایەکی نیزامی ـ دەبا بۆ دابینکردنی هێزی نیزامی یان پووڵ و پارە چاوەڕێی یارمەتیی سەرکردە خۆماڵی و ناوچەییەکان بوایە، لە بەرانبەردا هەندێ نازناوی ئەشرافییانەی وەک ئارێل، ویکۆنت و دووکی پێ دەبەخشین.

دەستەبژێرانی زەمینداری ئەورووپا بوونە چینێکی ئەشرافیی خاوەن دەسەڵات و پارە و شەرعییەت، دیارە ئەمە زۆر جیاوازە لە ئەشرافی وڵاتانی‌تری جیهان کە چینێکی ماستاوچی و ملکەچی دەربار و دەسەڵات بوون. ئەم پێوەندییەی نێوان ئەشراف و پادشاکان کە تا ڕادەیەک پێوەندییەکی یەکسان و بەرابەر بوو، کاریگەرییەکی قووڵی کردە سەر ڕەوتی ئازادی. گۆییدۆ دێ ڕۆدجێرۆ، گەورە مێژوونووسی لیبرالیزم، لەم بارەیەوە دەڵێت: «ئەگەر هەندێ لە چینە باڵادەستەکان لە هەمبەر ئیرادەی دەسەڵاتدا پێداگرانە ڕانەوەستایەن بێگومان سیستەمی پاشایەتی تەنیا توێژێکی گەورەی کۆیلەی بەرهەم دەهێنا».[٧] لە ڕاستیدا پاشای وڵاتانی‌تری جیهان دەقاودەق ئاوەها کارێکیان ئەنجام دا. لەلایەکی‌ترەوە لە ئەورووپادا هەرچی زیاتر لە سەدەکانی ناوەڕاست دوور دەکەوتینەوە، چینی ئەشراف داوایان لە پاشاکان دەکرد کۆمەڵە مافێکی دیاریکراو و گەرەنتیکراویان بۆ دابین بکەن بە شێوەیەک کە تەنانەت خودی دەزگای پاشایەتیش نەتوانێ دەستدرێژی بکاتە سەریان. هەروەها بە مەبەستی ڕاگەیاندن و بەدواداچوونی داخوازییە بەردەوامەکانیان لیژنەی نوێنەرایەتییان دامەزاند، بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بدەینە پەرلەمان لە بریتانیادا، ئەنجومەنەکانی یاسادانان لە فەرەنسا و هۆڵەندا و لیژنەکانی یاسادانەری لە سکۆتلەندا و چەند وڵاتێکی‌تردا. بنەمای چەمکی «باڵادەستیی یاسا» هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ئەم جۆرە دان و ستاندنە سەدە ناوەڕاستییانە. ئەم مافانە کە لەسەر بنەمای نەریتە ڕۆمییەکان ڕۆنرابوون لە ڕێگای دەسەڵاتی ئەشرافەکانەوە پارێزران و بەهێزکران. بە هەمان شێوەی ململانێی نێوان کلێسا و دەوڵەت، ململانێی نێوان ئەشرافییەت و سیستەمی پاشایەتیش دووهەم ململانێی گەورەی دەسەڵات بوو لە مێژووی ئەورووپادا کە دیسان نەخوازراو، بوو بە مایەی پێشکەوتنی ئازادی.

ئەشرافی بریتانیا سەربەخۆترین ئەشرافی ئەورووپا بوون. لۆردەکان نیشتەجێی موڵکی خۆیان بوون و کۆنترۆڵی ڕەعیەتەکانی خۆیان دەکرد و دەیانپاراستن. لە باتیی ئەم خزمەتگوزارییەش

پیتاکیان[15] لێ دەسەندن و بەم شێوەیە هەم دەسەڵات و هەم سەروەت و سامانیان پارێزراو بوو. وەک توێژەرێک وتوویەتی، ئەوان «ئەشرافی کرێکار» بوون: ئەوان بۆ پاراستنی پێگەوجێگەیان خۆیان لە دابونەریتە ئاڵۆزەکانی دەربارەوە نەدەگلاند، بەڵکوو لە هەموو ئاستەکاندا خۆیان تێکەڵ بە سیاسەت و دەوڵەت دەکرد.[٨] پاشاکانی بریتانیا بەر لە هەموو پاشاکانیتری ئەورووپا دەسەڵاتی خۆیان پتەو کردەوە، ئەوان باش لەو راستییە گەیشتبوون کە دەسەڵاتیان بەستراوەتەوە بە هاوکاریکردنی ئەشراف یان لانیکەم بەشێک لە ئەشرافەوە. ئەگەر پاشایەک سنوورەکانی بەزاندایە ئەوا رووبەرووی دژکردەوەی توندی ئەشراف دەبوویەوە. هێنریی دووهەم لە ١١٥٤دا هەموو بریتانیای خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و بە مەبەستی بەرێوەبردنی دەستوورەکانی، کۆمەڵێک دادوەری رەوانەی ناوچە جیاجیاکانی وڵات کرد. ئەو دەیهەویست وڵاتێکی یەکگرتوو و یاسایەکی یەکگرتووی پاشایانە دابمەزرێنێ. بۆ ئەم مەبەستە دەبا دەسەڵات و مافە تایبەتییە سەدە ناوەڕاستییەکانی ئەشرافی هەڵبوەشاندایەتەوە، ئەم پرۆژەیە تا رادەیەک سەرکەوت بەڵام نەیتوانی سەرکەوتنی تەواو مسۆگەر بکات. دوای ماوەیەکی کورت ئەشراف دەستیان دایە چەک ـ چەکی راستەقینە ـ و دوای چل ساڵ شەڕ تێگیران دواجار کوڕەکەی هێنری ـ پاشا جۆن[16] ـ لە ساڵی ١٢١٥ی زایینیدا و لە نزیک قەڵای وینزێر بە ناچاری پەیماننامەی ئاگربەستی ئیمزا کرد. ئەم بەڵگەنامەیە ـ ماگناکارتا ـ لەو سەردەمەدا وەک مانیفێستی مافە ئەشرافییەکان لەقەڵەم دەدرا و تێیدا بە چڕوپڕی مافەکانی ئەشرافی فیۆدال روون کرایەوە. هەروەها لە هەندێ خاڵی دیکەشیدا ئازادیی کلێسا و خودموختاریی شارەکان چەسپێنرا. هەروەها بە هەندێ رستەی لێڵ و ناڕوون زوڵمکردن لە تاکەتاکەی پێڕەوانی پادشا قەدەغە کرابوو. دواتر دادوەرانی بریتانی بەشێوەیەکی گونجاوتر و هەمەلایەنەتر دەستیان دایە راڤەکردنەوەی ئەم بەڵگەنامەیە و گۆڕییان بۆ یاسایەک لە شێوەی یاسایەکی بنچینەیی کە پارێزەری هەندێ لە مافە تاکییەکان بوو. ئەڵبەت ماگناکارتا لە هەمان ئەو سەردەمەشیدا بەڵگەنامەیەکی گرنگ و پڕبایەخ بوو، چونکوو یەکەم دەقی نووسراوی ئەورووپایە کە سنوور بۆ دەسەڵاتی پاشایەتی دیاری دەکات. پۆل جانسۆن پێی وایە ئەم بەڵگەنامەیە «بەراستی یەکەم یاسایە لە زنجیرە یاسا بریتانییەکانی وڵات[17] کە دەتوانین بڵێین سەرچاوەی ئازادی بووە لە بریتانیا و دواجار لە ئەمریکادا».[٩]

---

15. Tax
16. John
١٧. English statutes of the realm: زنجیرە یاسا بریتانییەکان کە پێکهێنەری «یاسای بنچینەییی زارەکی»ی ئەم وڵاتەیە.

## ڕۆم و دژایەتیکردنی ریفۆرمی ئایینی

دوای هەردوو ململانێی نێوان کلێسا و دەوڵەت و، پادشا و ئەشراف، سێهەم شەڕی گەورەی دەسەڵات - شەڕی نێوان کاتۆلیکەکان و پرۆتستانەکان - درێژخایەنترین و خوێناویترین شەڕ بوو، ئەم شەڕەیش جارێکیتر بوو بە مایەی کۆمەڵێک دەستکەوت و پێشکەوتنی نەخوازراو بەڵام شۆڕشگێڕانە و ئەمجارەش شەڕی دەسەڵات بە سوودی ئازادی شکایەوە. دەسپێشخەری دوور لە باوەڕی ئەم ململانێیە زانایەکی ئایینی ئیماندار بوو نیشتەجێی شارۆچکەیەکی بچووک و پەرتی ئەڵمانیا بە ناوی ویتێنبێرگ. لە سەرەتای سەدەی شازدەمەوە لە سەرانسەری ئەورووپادا ناڕەزایەتییەکی گەورە لە ئاست داموودەزگای بێئەندازە بەهێز و گەندەڵی پاپاییدا دروست بووبوو. دزێوترین کاری ڕۆم فرۆشتنی بەربڵاوی بەڵگەنامەی «لێبوردن» بوو، هەرکەس بەڵگەنامەکانی پاپای کڕیبا ئەوا پاک دەبوویەوە لە هەموو گوناهێک، تەنانەت لەو گوناهانەش هێشتا ئەنجامی نەداون. داهاتی ئەم کارە سەرفی خۆشگوزەرانی و هەڵەخەرجییە بێسنوورەکانی کلێسا دەکرا کە تەنانەت لەگەڵ پێوانە سەیرەکانی «سەردەمی باروک»[١٨]یشدا نەدەهاتەوە. نوێترین پرۆژەی ڕۆم بریتی بوو لە گەورەترین و ڕازاوەترین کلێسای هەموو جیهان کە هەمان کلێسای پێترۆسی حەوارییە لە ڕۆمدا. هەر ئەمڕۆش ئەگەر بچینە ڤاتیکانەوە و لەسەر حەوشە گەورە و بەربڵاوە مەڕمەڕینەکان پیاسەیەک بکەین، لەو هەموو ئاڵتون و زێڕانە ورد بینەوە، قوماشە پڕنیگارەکان و نیگارە دیوارییەکان سەیر کەین چلۆن لە دیوارێکەوە تا دیوارێکیتر و لە خوارەوە تا بنمیچەکانیان گرتۆتەوە، بەو هەموو شکۆ و جوانییە سەرسام دەبین، ئەوکات بە ئاسانی دەتوانین لە تووڕەبوونی ئیماندارنەی مارتین لووتێر بگەین.

کەسانێکیتریش بەرلە لووتێر بەدوای ریفۆرمەوە بوون، بۆ وێنە ئێراسمۆس جەختی لەسەر بەندایەتی و عیبادەتی سادەتر و دوور لە تەشریفات دەکرد، بەڵام کەس نەیدەوێرا ڕاستەوخۆ لە بەرانبەر ئۆتۆریتەی کلێسادا بوەستێت. لووتێر بە دەرکردنی بەیاننامەیەک لە نەوەد و پێنج بەندی بەڵگەداردا دەستی دایە ئەم کارە، بەوشێوەی دەیگێڕنەوە لووتێر بەیاننامەکەی لە سەرلەبەیانیی ڕۆژی سی و یەکی ئۆکتۆبری (تشرینی یەکەم) ١٥١٧دا بە دەرگای کلێسای کاستێلەی شاری ویتێنبێرگدا داکوتا. ڕەنگە حەق بە لووتێر بووبێت بەڵام لە ڕاستیدا گەلێ بەختیاریش بوو و شانسیشی هەبوو. نوێگەرییەکانی لووتێر هاوکات بوو لەگەڵ یەک لە ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی تەکنۆلۆژیادا. کلێسا نەیدەتوانی بەر بە بڵاوبوونەوەی هزرەکانی لووتێر بگرێت، چونکوو دەزگاکانی

---

١٨ . قۆناغێکی هونەری لە سەدەی حەڤدەی ئەورووپادا کە هەڵگری کۆمەڵێک ژانر و میتۆدی ئاڵۆز و توندڕەوانە بوو. و.ف

چاپ ـ کە تازەبەتازە دروست کرابوو ـ زۆر خێرا نووسراوەکانیان بە هەموو ئەورووپادا بڵاو کردەوە. بەم شێوەیە بزاڤی ریفۆرمی ئایینی لە دایک بوو و دوای سەدوپەنجا ساڵی خوێناوی نزیک بە نیوەی ئەورووپا بوونە پرۆتستان.

رەنگە ئەگەر مارتین لووتێر پرۆتستانیزمی هەنووکەی دیتبا ترس دایگرتایە، مەزهەبی پرۆتستان ئێستا مەزهەبێکی زۆر ئاسانگیرە و داواکارییەکی ئەوتۆی نییە. لووتێر لیبرال نەبوو، بەپێچەوانەوە ئەو ڤاتیکانی بەوە تاوانبار دەکرد کە زێدە ئاسانگیرە. ئەگەر بە پێوەری ئێستا ئاوڕ لە لووتێر بدەینەوە لە زۆر لایەنەوە کەسێکی بونیادگەرا بوو، ئەو داوای دەکرد لێکدانەوەیەکی وشکتر بۆ ئینجیل بکرێت. رەخنەکانی لووتێر سەبارەت بە دامودەزگای پاپا بەتەواوی هاوشێوەی ئەو رەخنانەیە کە ئیسلامییە بونیادگەراکانی ئەم سەردەمە ئاراستەی رژێمە گەندەڵ و هەڵەخەرجەکانی رۆژهەڵاتی ناوێنی دەکەن، لە هەردوولادا ئەم سیستەمانە لە رێگای راستەقینە و حەقیقەت لایان داوە. لووتێر لە سۆنگەی کۆنسێرڤاتیکترین هزریی مەزهەبییەوە هەڵیدەکوتایە سەر پاپا. بە باوەڕی هەندێکەس ململانێی نێوان مەزهەبی کاتۆلیک و مەزهەبی پرۆتستان سەلمێنەری ئەو حەقیقەتە مێژووییەیە کە ئازادیی مەزهەبی بەرهەمی دوو جۆر دەمارگرژییە کە بە یەک ئەندازە رووخێنەرن، ئەم دوو جۆرە لە دەمارگرژی یەکدی بێکاریگەر دەخەن.

زۆربەی ئەو تاقمانەی لە هەناوی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینییەوە سەریان هەڵدا لە خودی پرۆتستانیزم پاکژخوازتر و سەختگیرتر بوون. کاریگەرترینیان مەزهەبێکی زۆر سەختگیر بوو بە ناوی کالڤینیزم، لە باوەڕی ئەم مەزهەبەدا مرۆڤ بوونەوەرێکی گەندەڵ و بەدبەختە و ئەگەری رزگاربوونی گەلێ کەمە، هەندێکەسی دەگمەن و کەمی لێ بەدەر کە خوداوەند بۆ خۆی لە پێشترەوە هەڵیبژاردوون. بەڵام تاقمە جۆراوجۆرە پرۆتستانەکان بە هیچ شێوەیەک دامودەزگای پاپایان قبووڵ نییە و دژی هەرچەشنە هیرارشییەتێکی مەزهەبین، ئەمەش خاڵی هاوبەش و کۆکەرەوەیانە. ئەمانە لە خەباتی هاوبەشی دژ بە ئۆتۆریتەدا بەشدار بوون و نەخوازراو بوون بە بەشێک لە چیرۆکی ئازادی[19].

---

١٩ . لە رازاوەترین پارکی شاری ژێنێڤدا مۆنۆمێنتێک بۆ بەرزراگرتنی یادی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی کراوەتەوە، ئەم شارە لە کۆنەوە خۆی بە ئاخێزگەی مەعنەویی پرۆتستانیزم دەزانێت. ئەم مۆنۆمێنتە کە لە ساڵی ١٩٠٩دا دروست کراوە دیوارێکی زۆر گەورەیە کە بە کۆمەڵێک پەیکەر و نیگاری هەڵکەنراو رازێنراوەتەوە و هەموویان ئاماژەن بۆ میراتەکانی ئەو بزاڤە. لەم مۆنۆمێنتەدا یادی دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی بەرز راگیراوە، کەسانێ کە سەردەمانێک دوژمنی یەکتر بوون، کەسانی وەک

ئەم تاقمە بچووکانەی پرۆتستان سەرەڕای هەموو کێشە ناوخۆییەکانیان لە باکووری ئەورووپادا کۆبوونەوە و دەرفەتێکیان بۆ دۆزینەوەی تاکەکەسییانەی حەقیقەت، بەبێ دەستێوەردانی زانایانی ئایینی، رەخساند. ئەوان لە بنەڕەتدا باوەڕیان بە زانایانی ئایینی نەبوو و ئەگەر جارناجارێ قبووڵیشیان کردبا بێگومان مەبەستیان لە زانای ئایینی کەسێک بوو کە تاقمێکی مەزهەبیی خودموختار هەڵیبژاردبێت. پرۆتستانەکان کە زۆربەی کات لە کۆمەڵگادا کەمینەیەکی مەزهەبی بوون، لە پێناو مافی ئازادیی مەزهەبیدا بۆ هەموو کەمینەکان، بە هەر میتۆدێک دڵخوازی خۆیان بایە، خەباتیان دەکرد. ئەوان پێکەوە بەردی بناغەی ئازادیی مەزهەبییان لە رۆژئاوادا رۆ نا و رێخۆشکەر بوون بۆ سەرهەڵدانی هەندێ هزری مۆدێرنی وەک ئازادیی ویژدان، ئازادیی رادەربڕین و هەروەها توێژینەوەی زانستی ـ رەخنەگرانە، یەکەمجار دەقە ئایینییەکانی وەک ئینجیل کەوتنە بەر توێژینەوەی رەخنەگرانەوە و دواتر هەموو زانستە باوەکانی دیکەیشی گرتەوە. بیرمان نەچێ زانست پرۆسەیەکی هەمیشەییی خەباتکارانەیە لە دژی ئۆتۆریتەخوازی و رەهاگەری، بەم پێناسەیە زانستی مۆدێرن بەقووڵی قەرزداری دەمارگرژە مەزهەبییەکانی سەدەی شازدەمە.

پرۆتستانیزم ئاسەوارێکی خێراتریشی بەدواوە بوو؛ ئەو پاشایانەی لە پێشترەوە دەیانویست دەسەڵات لە ڤاتیکان بسێننەوە بیانوویەکی باشیان دەست کەوت، لەو سەردەمەدا ڤاتیکان رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر خۆی بە گەورە و پیرۆز لەقەڵەم دەدا. یەکەم هەوڵێک بۆ دژایەتیکردنی ڤاتیکان کەوتە گەڕ لەبەر پشتیوانیکردنی هزری پرۆتستانیزم نەبوو، بەڵکوو هەڵدەگەڕایەوە بۆ مەسەلەیەکی کەمبایەخ: پاشایەکی بێئۆقرە دەیویست میراتگرێکی هەبێت. هێنریی هەشتەم پاشای بریتانیا، داوای لە پاپا کلێمێنتی شەشەم کرد هاوسەرێتیی نێوان ئەو و کاترین هەڵبوەشێنێتەوە، چونکوو کاترین نەیتوانیبوو میراتگرێکی بۆ دروست بکات. (ئەڵبەت کاترین تەمبەڵ نەبوو، ئەو لە هەشت ساڵدا کچێک و چوار منداڵی مردووی بووبوو و دوو منداڵیشی لەبار چووبوون). پاپا ئەو داخوازەی قبووڵ نەکرد، هەر بۆیە هێنری وازی لە ڤاتیکان هێنا و خۆی بە پێشەوای کلێسای بریتانیا راگەیاند. ئەو لەڕووی باوەڕەوە هیچ کێشەیەکی لەگەڵ کلێسای کاتۆلیکدا نەبوو، تەنانەت بە نووسینی وتارێک پشتگیریی لە پاپا کرد و هێرشی کردە سەر لووتێر و بەبۆنەی ئەم کارەوە ڤاتیکان نازناوی «بەرگریکەری ئایین»ی پێ بەخشی، سەیر لەوەدایە تا ئەمڕۆیش هەموو جێگرانی هێنری ئەم نازناوەیان هەڵگرتووە. کەوابوو کلێسای تازەسەرهەڵداو و سەربەخۆی ئەنگلیکان هێشتا سەر بە مەزهەبی کاتۆلیک بوو و تاقە کێشەی لەگەڵ ڤاتیکاندا کێشەی بچووکی پاپا بوو.

---

لووتێر، ژان کالڤین و تەنانەت ئۆلیڤەر کرامۆڵ و پیۆریتەنە ئەمریکاییەکان. داڕێژەرانی بیناکە ئەوەیان لە بیرکردووە کە زۆربەی ئەم تاقمانە دوژمنی یەکتر بوون، رەنگە باشتریش وابێت کە هەر لە بیر بکرێت.

دابڕانــی بریتانییەکــان لە ڤاتیکــان یەکەمــین و بەرجەســتەترین نمــوونە بــوو لە زنجیرەیەکــی دوورودرێژی یاخیبوون و شەڕی مەزهەبــی لە دژی ڤاتیکــان کە نزیــک بە هەمــوو وڵاتــانی ئەوروپــای گرتەوە و تــا ١٥٠ ســاڵ دوای یــاخیبوونەکەی لــوتێر درێــژەی پەیــدا کــرد. ئەم زنجیــرە شــەڕانە لە ١٦٤٨دا تەواو بوون. پەیماننامەی ئاشتیی وێستفالیا کۆتاییهێنەری «شەڕی ســی ســاڵە»ی نێــوان ژێرمەنەکــان بــوو. بەپێــی ئەم پەیماننــامەیە هەمــوو مــاڵ و موڵــک و ســامانی قەیســەر و بەشــی هەرەزۆری ئەو شتانەی هی خودا (لە ڕاستیدا پاپا) بوون ڕادەستی قەیسەر کرانەوە. ئەم ئاشــتییە بووبەهۆی زیندووبوونەوەی هزرێکی ساڵی ١٥٥٥: «هەرکەسێک حاکمی شوێنێک بــوو ئایینەکەیشــی دەبێــتە ئــایینی زاڵــی ئەو شــوێنە»، بەم پێــیە مــافی دیــاریکردنی ئــایینی وڵات دەکەوتە دەســت پادشــاکان. ئەم هــزری درگــایەک بــوو بە ڕووی ئاســانگیریی ئــایینی و کۆچبەریــدا کــرایەوە. جیــابوونەوەی تەواوی کلێســا و دەوڵەت لە ســاڵی ١٦٤٨دا ڕووی نەدا بەڵام ئەم ســاڵە ســەمبولی ئاڵوگۆڕێکی گرنگی مێژووی ڕۆژئاوا بوو. وێستفالیا مانای تەواوبــوونی هزریــک کە دەیــوت ئەوروپــا کۆمەڵگــای گەورەی مەســیحییەکان یــان «ســەرزەمینی مەســیحییەت»ە و دەبــێ کلێســای کاتۆلیــک ببێــتە بەرپرســی کاروبــاری مەعنەویــی ئەم ســەرزەمینە و ئیمپراتــۆری پیــرۆز و موبــارەکی ڕۆم سەرۆکایەتیی کاروباری دونیاییی بکات[٢٠]. داهاتوو بۆ دەوڵەت بوو.

## دەوڵەتی ڕۆشنبیر

لە ســەدەی حەڤــدەدا پاشــاکان دوژمنێکیتریــان لە بەردەم خۆیانــدا بینییــەوە و ئیــدی جڵــەوی ناڕەزایەتییەکــان لەدەســتی ئایینــدا نەمــابوو، بەڵکــوو بەرپرســە خۆماڵییەکــان واتە ئەمیرەکــان، دووکەکان، بارۆنەکان و کۆنتەکان بوون بە نەیاری یەکەمی سیستەمی پاشایەتی. بەڵام بە درێژاییی ئەم سەدەیە پادشاکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنــا. ئەوان دەســەڵاتی خۆیــان بەهێزتــر لە جــاران تەیار کرد و بە دامەزراندنی سیستەمێکی ئیداریی سانتراڵ ـ دەوڵەت ـ بەسەر نەیارە ناوچەییەکانــدا سەرکەوتن. هۆکارەکانی سەرکەوتنی دەوڵەت چەند شتێک بوو: ئــاڵوگۆڕی تەکنۆلــۆژیکی، ململانێــی تونــدی نیزامــی، ســەرهەڵدانی ناســیۆنالیزم و دواجــار دروســتکردنی میکــانیزمێکی ناوەنــدی بــۆ کۆکردنەوەی پیتاک. بەڵام نابێ ئاکامێکی گرنگــی ئەم ئــاڵوگۆڕە لە بیــر بەرینــەوە؛ بەهێزبــوونەوەی دەوڵەت لە بەرژەوەنـــدیی ئازادیـــدا نەبـــوو. پاشـــاکان لەگەڵ بەهێزبوونەوەیانـــدا دەکەوتـــنە

---

٢٠ . هزری کۆمەڵگای جیهـانیی ئیمانـداران ئێسـتایش لە ئیسـلامدا هەیە کە بە ئـوممەت ناسـراوە. بەڵام لە ئیسلامدا هاوواتای کلێسای کاتۆلیک یان پاپامان نییە. (بڕوانە بەشی چوارەم).

هەڵوەشاندنەوەی زۆربەی دامەزراوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، وەک پەرلەمانەکان، شوراکان و ئەنجومەنەکانی یاسادانان. ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانانی فەرەنسا (ئێتاژێنرۆ) لە بەهاری ١٧٨٩ و لە سەروبەندی شۆڕشی مەزندا بانگهێشتی کۆبوونەوە کران، لە ڕاستیدا ئەمە یەکەم کۆبوونەوەی ئەم ئەنجومەنە بوو لەدوای ١٧٥ ساڵ! هەروەها ئەو پادشایانەی تازە بەهێز بووبوونەوە وردەوردە کەوتنە هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی چەندلایەنەی مافە ئەشرافییەکان و نەریتە ناوچەییەکان و سیستەمی پاراستنی پیشەکاران، لە بەرانبەردا سیستەمێکی یەکسان و هاوشێوەیان بۆ دابینکردنی مافەکان ڕۆ نا کە لەژێر چاودێریی پادشادا بوو. لەم بارەیەوە پەرلەمانی بریتانیا ئاوارتەیەکی گرنگ بوو کە لە ڕاستیدا دوای شۆڕشی مەزنی ١٦٨٨ لە شەڕی دژ بە دامودەزگای پاشایەتیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.[١٠]

ڕەنگە پێمان وا بێت لاوازکەوتنی چینی ئەشراف مانای پێشکەوتنی ئایدیای یەکسانبوون لەبەرانبەر یاسادا، لەو سەردەمەدا دەیانویست دەقاودەق بەم مانایەی بشوبهێنن. هاوکات لەگەڵ پێشکەوتنی بیری ڕۆشنگەریدا کە سەرجەم ئەوروپای سەدەی حەڤدەمی گرتبۆوە، بۆچوونەکانی هەندێ فەیلەسوفی وەک ڤۆڵتێر و دیدرۆ بارگاوی بوو بە هەندێ وەهم و خەیاڵ دەربارەی «بەئەقڵانیکردن» و «مۆدێرنیزاسیۆن»ی دەوڵەت. بەڵام ئەم بۆچوونانە لە مەیدانی کردەوەدا بە ئاراستەی بەهێزبوونەوەی دەوڵەتی ناوەندی و لاوازکەوتنی دەسەڵاتە ناوچەییەکاندا دەشکایەوە. ئەم ڕەوتە کە دواتر بە دەستەواژەی «دیکتاتۆرییەتی ڕۆشنبیرانە» پێناسە کرا هەڵگری کۆمەڵە تۆخمێکی پێشکەوتنخوازانە بوو. هەندێ لە دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە - بۆ وێنە فرێدریشی دووەمی پرۆسی، کاترینی دووەمی ڕووسی و یۆزێفی دووهەمی نەمسایی - بەرانبەر جیابیرانی مەزهەبی ئاسانگیر بوون، چاکسازییان لە سیستەمی یاساییدا دەکرد و یارمەتیی مادی و مەعنەویی بەرچاویان پێشکەش بە هونەرمەندان، مۆسیقاران و نووسەران دەکرد (هەر ئەمەشە وای کردووە لە زۆربەی کتێب و نووسراوەکاندا وەک کەسانێکی باش ناوزەد بکرێن). بەڵام ئەم جێگۆڕکێیە لە دەسەڵاتدا، بوو بە هۆی لاوازکەوتنی هەموو ئەو گروپانەی ناو کۆمەڵگا کە توانای کۆنترۆڵکردنی ئۆتۆریتە و سەرەڕۆیی دامودەزگای پاشایەتییان هەبوو. لێرەبەدواوە ئیدی ئازادی بەتەواوی گرێدراوی ڕێژەی دەست و دڵبازیی حاکمان بوو. تەنانەت باشترین پادشایش - هەروەها جێنشینە کەمتر باشەکانی - کاتێک بکەوتایەنە ژێر زەختێکی ناوخۆیی یان دەرەکییەوە، پرۆسەی لیبرالیزاسیۆنیان ڕادەگرت و دەکەوتنە سەرکوتکردنی ناڕازییان. لە کۆتاییی سەدەی هەژدەمدا کە شەڕ و شۆڕش و یاخیبوونی ناوخۆیی ئاسایش و هێمنایەتیی ئەوروپایان شێواندبوو، دیکتاتۆرییەتی ڕۆشنبیرانە زیاتر لەوەی بەرەو ڕۆشنبیری بڕوات بەرەو دیکتاتۆرییەت هەنگاوی هاوێشت.

دامودەزگای پاشایەتیی فەرەنسا لە سەردەمی لۆیی چواردەمدا گەیشتبووە تەشقی دەسەلاَتی خۆی. فیۆدالیزمی فەرەنسی هەمیشە جیاواز بووە لە فیۆدالیزمی بریتانی. فەرەنسا کەوتبووە نێوان چەند ولاَتێکی نەیارەوە، هەر بۆیە بەردەوام سەرقاڵی کۆکردنەوەی هێزی نیزامی و شەڕکەر بوو، ئەمەش لە خۆیدا نەیدەهێشت دەوڵەتی ناوەندی لاواز بکەوێت (لۆیی چواردەم لە کۆی پەنجاوچوار ساڵ پاشایەتی سی ساڵ لە شەڕدا بوو). دامودەزگای پاشایەتی ئەم راستییە ژیۆپۆلۆتیکانەی بە بارێکیتردا دەقۆستەوە و لە رێگایەوە چینی ئەشرافی لە پێگەی دەسەلاَتیان کە هەمان زەویوزار و موڵکەکانیان بوو، دوور دەکردەوە. لۆیی چواردەم لەبەر رۆشناییی رێنومایییەکانی کاردینال ریشیلۆی[21] بلیمەت و زانادا، وردەوردە دەوڵەتە خۆماڵییەکانی لە چنگی ئەشراف دەرهێنا و فەرمانبەرە ناوچەیییەکانی لە باتیی ئەوان دامەزراند کە وابەستەی خۆی بوون. هەروەها پێگە و بەهای شۆراکان و ئەنجومەنەکانی یاسادانانی دابەزاند. لۆیی چواردەم بە «پادشای هەتاو» ناوبانگی دەرکردبوو، ئەڵبەت پێچەوانەی بۆچوونی باو ئەم نازناوە ئاماژە نەبوو بۆ زێڕ و ئاڵتوونەکانی، بەڵکوو ئاماژە بوو بۆ پێگە و دەسەلاَتە بێوێنەکەی. هیچ کەس و هێزێک نەبوو بتوانێت شان لە شانی ئەو بدات. لۆیی چواردەم ئەشرافی فەرەنسای راپێچی پاریس کرد و بە رازاوەترین دەرباری ئەورووپا فریوی دان و بۆ هەمیشە نیشتەجێی ئەم شارەی کردن. لۆیی دەیویست بەم کارە لاوازیان بخات. دامودەزگای پاشایەتیی فەرەنسا پارە و پووڵێکی ئەفسانەییی بەکار دەهێنا بۆ مەراسیمە بێوێنەکانی سەیران، سەما و هەڵپەڕکێ، راوکردن و دابونەریتە نەبڕاوەکانی کۆشکی پاشایی، ئەمانە و گەورەیی و شکۆی کۆشکی ڤێرسای فێڵبازییەکی زیرەکانەی سیاسی بوو تا بەم شێوەیە ئەشراف بکەنە نێو قەفەسێکی ئاڵتوونەوە. ئەوان بە جلوبەرگی رازاوەی هەورێشم و کلاَوقژی پوودرلێدراو خڵەتان و وردەوردە دەسەلاَت و سەربەخۆییان لێ زەوت دەکرا.[11]

شۆڕشی ١٧٨٩ زۆر شتی گۆڕی، بەلاَم نەیتوانی بۆچوونی ناوەندخوازانە (سانترالیستی) بگۆڕێت، لە راستیدا شۆڕش ولاَتی سانترالیزەتر کردەوە. شۆڕشی فەرەنسا پێچەوانەی شۆڕشی مەزنی بریتانیا (١٦٨٨) ئەشرافی زەمینداری بەهێزتر نەکرد بەڵکوو لەخشتەی بردن. شۆڕشی فەرەنسا کلێسای بێدەسەلاَت کرد و چینی ئەشراف و دەوڵەتە بچووکەکان و بانکە خۆماڵییەکانی لاواز خست. لۆرد ئەکتۆن، توێژەر و سیاسەتمەداری گەورەی سەدەی نۆزدەم، پێی وایە شۆڕشی فەرەنسا زیاتر لەوەی هەوڵی بچووککردنەوەی دەسەلاَتی ناوەندی بدات هەر هێزێکی دیکەی دیبا

---

٢١ . سەرۆک وەزیرانی لۆیی سێزدەم لە نێوان ساڵانی ١٦٢٤ تا ١٦٤٢دا کە لایەنگری دەسەلاَتی رەهای پاشایەتی بوو. و.ف

ئەکەوتە دژایەتیکردنیەوە و بێکاریگەری دەخستن. ئەکتۆن پێی وایە فەرەنسییەکان «تیۆریی شۆڕش»یان لە ئەمریکاییەکان وەرگرت «نەک تیۆریی حکوومەت - واتە بڕین نەک دوورین».
دەسەڵاتی جەماوەری سەرجەم شکۆ و شانازی و هێزی کۆنترۆڵنەکراوی پاشایەتیی کردە موڵکی خۆی. «جەماوەر» باڵاترین و بەرزترین پێگەی پێ بڕا و «ئازادی و یەکسانی و برایەتی»ی وەک ئامانجەکانی خۆی ڕاگەیاند. ماف و ئازادییەکان کە سەردەمانێک گرێدراوی دەستودڵبازی و دڵفراوانیی پادشاکان بوو، لەمە بەدواوە کەوتە ژێر نفووزی حەز و ئارەزووی «هاووڵاتییان»ەوە، ئەڵبەت سەرکردەکانی شۆڕش نوێنەری ئەم هاووڵاتییانە بوون.

بەڵام فەیلەسوفێکی فەرەنسی مۆدێلێکی دیکەیشی بۆ ئازادی داڕشتبوو؛ مۆنتێسکیۆ وەک زۆربەی لیبراڵەکانی چاخی ڕۆشنگەری لە سەدەی هەژدەمدا، ستایشی حکوومەتی بریتانیای دەکرد. مۆنتێسکیۆ بە ستایشکردنی ڕووتەوە نەوەستا و سەرەکیترین تایبەتمەندیی سیستەمی بریتانیای دەستنیشان کرد: ئەم سیستەمە لەباتیی ئەوەی بە شێوەی تیۆریک پشتگیری لە ئازادی بکات بە کردەوە پارێزەری ئازادی بوو. هیچکام لە لایەنە پێکهێنەرەکانی دەسەڵات نەیدەتوانی دەسەڵاتێکی فرە بۆ خۆی کۆ بکاتەوە، چونکوو دەسەڵات دابەش کرابوو لە نێوان پادشا، ئەشراف (ئەنجومەنی دەوڵەمەندان) و خەڵکی ئاساییدا (ئەنجومەنی عەوام). ئەم شێوە لە «جیاکردنەوەی دەزگاکان»ی دەوڵەت [دابەشکردنی دەسەڵات]، بوو بە هۆکاری پاراستنی ئازادییە مەدەنییەکان و ئاسانگیری لەبەرانبەر جودابیرانی مەزهەبیدا. مۆنتێسکیۆ بە شێوەی کوێرانە پشتیوانیی لە میکانیزمی حکوومەت و لە یاساکان نەدەکرد، بیرمان نەچێ سەرەکیترین کتێبەکەی ناوی *ڕۆحی یاساکان* بوو.

لە ڕاستیدا دوای چەند سەدەیەک دەسەڵاتی پاشای بریتانیا هێند رووی لە کزی دا کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمەوە سەرەڕای ئەوەی ئەم وڵاتە بە فەرمی خاوەن سیستەمی پاشایەتی بوو بەڵام بە کردەوە وەک کۆمارێکی ئەشرافی وابوو کە دەستەبژێرانی زەمیندار بەڕێوەیان دەبرد. لێکدانەوەی ستایشئامێزی مۆنتێسکیۆ کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر خودی بریتانییەکانیش بەجێهێشت. ویلیام بلاکیستۆن، مافناسی بەناوبانگ و گەورەی بریتانی، کاتێک خەریکی لێکۆڵینەوەی یاساکانی بریتانیا بوو هزرەکانی مۆنتێسکیۆی وەک سەرچاوەیەک بەکار دەهێنا. جۆدییەت ئەشکلار، فەیلەسوفی سیاسیی ئەمریکایی، پێی وایە لە سەردەمی دامەزرانی کۆماری ئەمریکادا «مۆنتێسکیۆ پەیامێکی ئاسمانی بوو». جەیمز مەدیسۆن، تۆماس جێفێرسۆن، جان ئادامز و هەموو کاربەدەستانیتر هەوڵیان دەدا لە دروستکردنی سیستەمی نوێی سیاسیی ئەمریکادا هەڵگەڕێنەوە بۆ لای هزرەکانی مۆنتێسکیۆ و زیاترین ئاوڕدانەوەیان لە ناو نووسەرانی مۆدێرندا بۆ مۆنتێسکیۆ بوو (تەنیا کتێبی پیرۆز زیاتر لە مۆنتێسکیۆ کەڵکی لێ وەرگیراوە). ئەشکلار پێی وایە

مۆنتێسکیۆ هێند سەرنجڕاکێشەر بوو کە «هەم داکۆکیکەران و هەم نەیارانی یاسای تازەی بنچینەیی، بەڵگاندنەکانیان بەقووڵی گرێدراوی مۆنتێسکیۆ بوو».[١٢]

## بەرهەمەکانی سەرمایەداری

لە سەدەی هەژدەمدا کولتووری سیاسیی نائاساییی بریتانیا سەرچاوەیەکی دوایی و ژیانبەخشی دەسەڵاتی بەدەست هێنا: سەرمایەداری[٢٢]. ململانێکانی نێوان کلێسا و دەوڵەت، ئەشراف و پادشاکان و کاتۆلیک و پرۆتستان دەرگایان بە رووی ئازادیی تاکدا کردەوە، بەڵام سەرمایەداری هەموو دیوارەکانی رووخاند. سەرمایەداری زیاترین کاریگەریی لەسەر دارشتنی دونیای مۆدێرن بەجێهێشتووە و لە هەمان کاتدا هیچ شتێکیتر نەیتوانیوە وەک سەرمایەداری مۆدێلە تەمەندرێژە چەندهەزارساڵەییەکانی ژیانی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتیمان تێک بشکێنێ. سەرمایەداری لە چەند سەدەیەکدا فیۆدالیزم و سیستەمی پاشایەتیی هەڵوەشاندەوە، هەردووکی ئەمانە جەختیان لەسەر رەگەز و رەسەن دەکردەوە. سەرمایەداری چینێکی سەربەخۆی خاوەن کار و پیشەی خولقاند کە زۆر قەرزداری دەوڵەت نین و هەنووکە سەرەکیترین هێزی ناو هەموو کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی جیهانن. سەرمایەداری گۆڕان و بووژانەوەی لە باتیی تەکووزی و سوننەت وەک فەلسەفەی زاڵی دونیای مۆدێرن چەسپاند. سەرمایەداری ئافرێنەری دونیایەکی تازە بوو بە هیچجۆر لەو دونیایە ناچێت هەزاران ساڵ بەردەوام بوو، زیاترین کاریگەرییەکەیشی لەسەر بریتانیا بوو.

سەرمایەداری لە شوێنێکیتر لەدایک بوو. لە زۆربەی هەرەزۆری سەدەکانی ناوەڕاستدا بازرگانی و مامەڵەکردن رووی لە کزی دابوو، بەڵام لە سەدەی چواردەمدا کەم کەم لە هەندێ ناوچەی ئەورووپادا بووژایەوە. شۆڕشی تەکنۆلۆژیای وەرزێڕی بوو بە مایەی گەشەسەندنی رێژەی بەرهەمهێنانی دانەوێڵە و دەغڵ و دان، بە جۆرێک کە زیاتر لە پێویستیی ناوخۆیی بوو، هەر بۆیە دەبا یان بفرۆشرایە یان بە شێوەی بەرانبەر بگۆڕدرایەتەوە. چەندین شاری بازرگانی و بەندەریی وەک ئەنت ڤۆرپ[٢٣]، برۆکسێل، ڤێنیسیا و جینێڤا بوونە سەنتەری چالاکیی ئابووری. ژمێریاریی

---

٢٢. سەبارەت بە پێناسە جۆراوجۆرەکانی «سەرمایەداری» گەلێ بەرهەمی بێشومار هاتۆتە نووسین. من لە پێناسەیەکی زۆر سەرەتاییدا بە کاری دەهێنم کە لەگەڵ زۆربەی پێناسە باوەکانی ناو فەرهەنگەکانی وشەدا، بۆ وێنە لەگەڵ پێناسەی ئینسایکلۆپیدیای ئۆکسفۆرددا (١٩٩٨)، دەگونجێت: «سیستەمێک بۆ بەڕێوەبردنی ئابووری کە لەسەر بنەمای بازاڕی ئازاد دامەزراوە و ئامێرەکانی بەرهەمهێنان، دابەشکردن و گۆڕینەوە لە دەستی دەوڵەتدا نییە و خەڵک یان کۆمپانیاکان بەڕێوەیان دەبەن...».

٢٣ . شارێکی بەلجیک. و.ف

دووقات[٢٤]، بەکارهێنانی ژمارە هێندی/عەرەبییەکان و سەرهەڵدانی بانکداری، چالاکیی ئابوورییان لە کارێکی ئاماتۆرانەوە گۆڕی بۆ چالاکییەکی پرۆفیشناڵ و میتۆدیک. دوای ماوەیەک بووژانەوەی بازرگانی سنووری شارە بەندەرییەکانی تێپەڕاند و دزەی کردە ناو وڵاتەکانیشەوە، ئەم دیاردەیە سەرەتا فرۆ بوومانی گرتەوە (هۆڵەندا، بەلجیک و لۆکزامبوورگ) دواتریش بەرەو بریتانیا کشا و هەموو بەرهەمێکی وەرزێڕی، پیشەسازی، پیشەسازییە دەستییەکان و هەروەها کەرتی خزمەتگوزاریشی گرتەوە. هێشتا وەڵامێکی تەواو و تۆکمە بۆ ئەو پرسیارە نەدۆزراوەتەوە کە چما سەرمایەداری سەرەتا لەو ناوچانەدا سەری هەڵدا، بەڵام زۆربەی مێژوونووسانی ئابووری لەسەر ئەو رایەن کە یەک لە هۆکارە گرنگەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئامادەبوونی دەوڵەتێکی بەهێز کە پارێزەری موڵکداریی تاکی بوو. دوو مێژوونووسی گەورەی ئەم بوارە، داگلاس نۆرس و رۆبێرت تۆماس، دەڵێن لە هەرکوێدا سەرمایەداری پێش کەوتبا هۆکارەکەی «بە زۆری دەگەڕایەوە بۆ ئەو جۆرە مافانەی بۆ موڵکداری دابین کرابوو».[١٣] لە سەدەی شانزدەمدا وردە وردە بۆچوونێکی گشتی لە ئەورووپادا سەری هەڵدا کە پێی وابوو «سەروەت و سامان هی بنەماڵەیە و دەسەڵاتیش موڵکی پادشا و فەرمانبەرانی پادشایە». مافناسێکی ئیسپانیایی لە سەدەی پازدەمدا وتبووی «دەبێ تەنیا بەڕێوەبردنی وڵات بە پادشا بسپێردرێت نەک ئەوەی بە شێوەیەکی رەها ببێتە خاوەن هەموو شتێک».[١٤] بەڵام تەنیا لە بریتانیادا پادشایەک (چارڵزی یەکەم) بە کردەوە لەسێدارەدرا کە ئەوەش زیاتر لەبەر دیاریکردنی رێژەی پیتاک (باج) بە شێوەی سەرەڕۆیانە بوو.

پاراستنی میتۆدیکی مافی موڵکداری کۆمەڵگاکانی دوچاری ئاڵوگۆڕ کرد. ئەمە مانای ئەوەیە دەکرا تۆڕی ئاڵۆزی نەریتەکان و مافە فیۆدالییەکان وەلا بنرێن کە هەرهەموویان لەمپەرێک بوون لە بەردەم بەکارهێنانی شیاو و کاریگەری سەرمایەدا - دەستەبژێرانی زەمینداری بریتانیا لە مۆدێرنیزاسیۆنی وەرزێڕیدا گەورەترین دەوریان گێڕا. ئەوان دەستیان دایە سیستەمی پەرژینکردن[٢٥] - ئەمە پرۆسەیەکی بێڕەحمانە بوو لە پێناو چەسپاندنی مافەکانی فیۆدالاندا لەسەر ئەو دەشت و دەر و لێرەوارە گشتییانەی دەکەوتنە نێو موڵکەکانیانەوە - بەمەش رەعیەت و وەرزێڕانیان مەجبوور کرد کاری پسپۆڕانەتر و کاراتر ئەنجام بدەن، ژیانی ئەم رەعیەت و وەرزێڕانە بەتەواوی وابەستەی

---

٢٤ . جۆرە سیستەمێکی ژمێریاری کە لەسەر دوو جۆر ژماردن دامەزراوە. و.ف

٢٥ . ئەمە میتۆدی فیۆدالە بریتانییەکان بوو لە سەدەی هەژدەدا بۆ داگیرکردنی زەویوزارە بایەر و گشتییەکان. ئەوان پەرژینیان بەدەور ئەم زەوییانەدا دەکێشا و دەیانکردنە بەشێک لە موڵکە تایبەتییەکانی خۆیان. جووتیاران لەسەر ئەم زەوییانە بژێوی ژیانیان دابین دەکرد، هەربۆیە بەناچار وازیان لە وەرزێڕی هێنا و لە کارگە تازە دامەزراوەکانی رستندا دامەزران.و.ف

هەمان ئەو زەویوزارانە بوو. ئەم لێرەوارانە دواتر بۆ لەوەڕاندنی پەز بەکار هێنران کە بوو بە هۆی گەشەسەندنی بازرگانیی خوری کە گەلێ پڕ پیت و داهات بوو. چینی زەمینداری بریتانیا خۆیان لەگەڵ شۆڕشی روو لە رووداوی سەرمایەداریدا گونجاند و بەم شێوەیە دەسەڵاتی خۆیان پتەو کردەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا یارمەتیی رەوتی مۆدێرنیزاسیۆنی کۆمەڵگاشیان دەدا. بەڵام ئەشرافی فەرەنسی کۆمەڵە زەمیندارێکی بزر و غایب بوون و بەوجۆرەی شیاوە هەوڵی گۆڕینی موڵکەکانیان بۆ موڵکێکی بەرهەمهێنەرتر نەئەدا، لە هەمان حاڵدا ئەستاندنی پیتاکی قورسیان لە رەعیەتەکانیان درێژە پێدا. ئەوانیش وەک زۆربەی ئەشرافی ئەوروپایی بازرگانیکردنیان سووک دەنرخاند.

جیا لە «ئەشرافی کارداهێن» سەرمایەداری تاقمێکی دەوڵەمەند و بەهێزی نوێی دیکەیشی دروست کرد کە لە رێگای زەویوزاری پێشکەشکراوی دامودەزگای پاشایەتییەوە دەوڵەمەند نەبووبوونەوە، بەڵکوو ئەم دەوڵەمەندییەیان لە رێگای چالاکیی ئابووریی سەربەخۆی خۆیانەوە بەدەست هێنابوو. بە واتای یەک لە مێژوونووسان ئەم «وردە مالک»انەی بریتانیا کە لە وردە ئەشرافەکانەوە تا جووتیارانی داهێنەری دەگرتەوە، «تاقمێکی وردە سەرمایەداری لووتبەرز و بوێر» بوون.[١٥] ئەم تاقمە یەکەم ئەندامانی بۆرژوازی بوون - کارل مارکس ئەم چینە خاوەن سەرمایە و زەحمەتکێشە بە «خاوەنی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و خاوەنکارانی کرێکارانی کۆمەڵگا» پێناسە دەکات. مارکس بە دروستی لەوە گەشتبوو کە ئەم چینە پێشەنگ و ئاڵاهەڵگری لیبرالیزاسیۆنی سیاسییە لە ئەوروپادا. بۆرژوازی بەرژەوەندیی گەورەی خۆی لە هەندێ فاکتەری وەک سەرمایەداری، باڵادەستیی یاسا، بازاری ئازاد و سەرهەڵدانی پرۆفیشناڵیزم و شیاوسالاریدا[٢٦] دەبینێتەوە، هەر بۆیە پشتیوانی لە ریفۆرمی پلە بە پلە ئەکات، ئەم جۆرە ریفۆرمە رەوتەکە بەرەو پێشەوە دەبات. برینگتۆن مۆر، توێژەری هاروارد، کتێبێکی لەسەر زانستە کۆمەڵایەتییەکان نووسیوە کە ئێستا زۆر بەناوبانگە، تیایدا ئاوڕی داوەتەوە لە هەموو ئەو رێگایانەی دیموکراسی و دیکتاتۆری بەرهەم دەهێنن و بۆ ئەم مەبەستەش نموونە دیاردەکانی چوار گۆشەی جیهانی خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە. دواجار ئەنجامگیریی دواییی ئەم توێژینەوەیەی لە چوار وشەدا کورت کردۆتەوە: «بۆرژوازی نەبێت، دیموکراسی نییە».[١٦]

لەو کاتەوەی چالاکیی ئابووریی کارداهێنانە و ریسکخوازانە بوو بە هۆکاری سەرەکیی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، سیاسەتی بریتانیایش لە بنەوە گۆڕدرا. ئەنجومەنی عەوام کە لە سەدەی حەقدەمدا دەسەڵاتی لە پادشا سەندبۆوە و وڵاتی بەڕێوە دەبرد، پڕ بووبوو لەو بازرگانە نۆماڵانەی تازەبەتازە دەوڵەمەند بووبوونەوە. هەمیشە ئەشرافی خاوەن نازناو لە بریتانیادا زۆر کەم بوونە؛ تا

26. Meritocracy

کۆتاییی سەدەی هەژدە تەنیا ٢٠٠ کەس بوون.[١٧] بەڵام چینێکی بەربڵاوی خوارتر لەوان هەبوون کە زیاتر بە ناوی «دەوڵەمەندان (جێنتری)ی بریتانی» ناسرابوون. ئەمانە زۆرجار هەندێ پێوەندییان لەگەڵ ئەشرافدا هەبوو و هەندێ بەرپرسایەتییان لە دەوڵەتە خۆماڵییەکاندا وەردەگرت، بەڵام دواجار سەرچاوەی پلەوپایە و دەسەڵاتیان دەگەڕایەوە بۆ بازرگانی، کار و پیشەی پرۆفیشناڵ یان وەرزێریی پڕپیت و داهاتیان. زۆربەیان دەچوونە ناو دەوڵەتەوە و بە دانانی مەودایەکی گونجاو لە نێوان خۆیان و تەکووزیی کۆندا دەیانویست ریفۆرمە پێشکەوتنخوازانەکان پراکتیزە بکەن، ریفۆرمی وەک بازرگانیی ئازاد، بازاڕی ئازاد، مافە تاکییەکان و ئازادیی ئایینی.

سیان لە بەرجەستەترین سەرۆک وەزیرانی سەدەی نۆزدەی بریتانیا لەم دەوڵەمەندانە بوون: رۆبێرت پیل، ویلیام گێلادێستۆن و بێنجامین دێزراییلی. چینی تازەبەدەسەڵاتگەیشتوو رەچاوی بەشی هەرەزۆری دابونەریتی ئەشرافییان دەکرد کە دەتوانین ئاماژە بدەینە تایبەتمەندیگەلێکی وەک کۆشکی رازاوە، قاتی ئەشرافی و میوانییەکانی نێچیرڤانی، بەڵام گەلێ لەوان بگۆڕتر بوون. رێزی زۆر لە «جێنتێلمەنەکان» دەگیرا و تەنانەت لە کۆمەڵگادا زیاتر لە لۆردەکان پێشەنگ و کاریگەر بوون. لە راستیدا لە سەدەی حەڤدەمەوە «جێنتێلمەنی بریتانی» بوو بە کەسایەتییەکی ئەفسانەیی و هەموان ئاواتەخوازی وەها پلەوپایەیەک بوون. دەڵێن نێرسێک داوای لە جەیمزی یەکەم کردبوو کوڕەکەی بکاتە جێنتێلمەن، پادشا لە وەڵامدا وتبووی «من هەرگیزاوهەرگیز ناتوانم بیکەمە جێنتێلمەن، بەڵام دەتوانم بیکەمە لۆرد». کابرایەکی فەرەنسی کە سەردانێکی لەندەنی کردبوو، ئابەم شێوە گاڵتەئامێزە باسی لاساییکردنەوەی دەوڵەمەندان لە لایەن ئەشرافی بریتانیاوە دەکات: «لە لەندەندا ئەشراف وەک خزمەتکارەکانیان جلوبەرگ ئەکەنە بەریان و ژنەکانیشیان لاسایی کەنیزەکانیان دەکەنەوە».[١٨] وێناکردنی ئێستای ئێمە بۆ جێنتێلمەنی بریتانی دیمەنی پیاوێکی جلوبەرگ رازاوەی جوانخاسە کە «رۆلف لۆرێن[٢٧]» ستاتیکای ئەم پیاوە بە چوارگۆشەی جیهاندا بڵاو دەکاتەوە. بەڵام سەرهەڵدانی توێژی جێنتێلمەن بەقووڵی وابەستەی سەرهەڵدانی ئازادیی بریتانی بوو.

## ئەنگلۆ ـ ئەمریکا

هەرچەند سەرهەڵدانی سەرمایەداری، دەوڵەتی سنووردار، مافی موڵکداری و باڵادەستیی یاسا لە سەدەی هەژدەدا هەموو ئەورووپای گرتبۆوە، بەڵام بریتانیا نموونەیەکی تاقانە بوو. ئەم وڵاتە لە

---

٢٧ . کۆمپانیای بەرهەمهێنانی جلوبەرگ. و.ف

هەموو ولآتانی ئەوروپا دەوڵەمەندتر، داهێنەرتر، ئازادتر و سەقامگرتووتر بوو. لەم بارەیەوە گۆییدۆ دۆ رۆدجێرۆ دەڵێت: «ئـازادیی تـاکی، بەتـایبەتی ئاسایشـی تـاک و سـەرمایە، بە باشـترین شـێوە دەپـارێزرا. سیسـتەمی بەرێـوەبەرایەتی سـەربەخۆ و چەقنەبەسـتوو بـوو و رێکخراوەکـانی دادوەری بەتەواوی سەربەخۆ بوون لە دەوڵەت. مافە تایبەتییەکـانی دامودەزگـای پاشـایەتی زۆر بەرکـورت و سنووردار کرابوویەوە... دەسەڵاتی سیاسی لە ژێر کۆنترۆڵی پەرلەماندا بوو، ئایا ئەوروپا دەیتـوانی مۆدێلێکی هاوشێوەمان بخاتە بەردەست؟» چەندەها چاودێری دیکەی ئەو سـەردەمەش هەر ئاوەهـا ئەنجامگیرییەکیـان بەدەسـتەوە داوە و ستایشـی پێکهـاتە و کەسـایەتیی نەتەوەیـی بریتانیایـان کـردووە. هەنـدێ کەس بەتـایبەتی لەسـەر ئـابووری چـڕ دەبـوونەوە. بە رای ڤـۆلتێر «بازرگـانی، هاووڵاتییانی بریتانیای دەوڵەمەند کردەوە، لە هەمانکاتدا یارمەتیی داون کە ئازاد بژین... هاوکـات هەر ئەم ئازادییەش بوو بە هـۆی گەشەسـەندنی بازرگـانی». زانـایەکی ئـایینیی وردبـین و زیرەکـی فەرەنسی بە ناوی ئابێ کوایر دەڵێـت، دەوڵەتـی بریتانیـا دەسـتی نەدایە پیاهەڵـدان و پەرەپێـدانی حەز و ئارەزووە چەواشەکانی چینی ئەشراف بەڵکوو دەستی یارمەتیی درێژ کردەوە بەرەو «چینـی پاک و خاوێنی مامناوەندی، ئەم توێژە بەنـرخ و پـایەبەرزەی نـاو گەل».[١٩] بـازاڕی ئـازاد چینـی مامناوەندی دەوڵەمەند دەکردەوە، ئەم چینە لە پێشکەوتنی ئایدیای ئازادیدا رۆڵێکی باشی دەگێڕا. وادیارە ئەم سیکلە، سیکلێکی بەکەڵک و سوودمەند بوو.

کۆچبەرنشینەکانی ئەمریکا زیاترین لێکچوونیان لەگەڵ بریتانیـادا هەبـوو. خەڵکـی ئەم ناوچـانە کۆمەڵە دەوڵەتێکیان دامەزراندبوو کە زۆر لەو دەوڵەتانە دەچوون وا لە بریتانیای سەدەی شـازدەدا دیتبوویـان. لە سـەروبەندی یـاخیبوونی کۆچبەرنشـینەکان لە جـۆرجی سـێیەم، داخوازییەکـانی شۆڕشگێڕان گەڵاڵەیەک بوو بۆ داواکردنەوەی مافە بریتانییەکانی خۆیان. ئەوان دەیانوت پاشـایەکی ستەمکار ئازادییە بونیادییەکانمانی پێشێل کـردووە، هەر بـۆیە ناچـار بـووین سـەربەخۆیی خۆمـان رابگەیەنین. ئەم بڕیارە لە هەندێ لایەنەوە هاوشێوەی هەمان بڕیارەکەی شۆڕشی پڕشکۆی بریتانیـا بـوو کە پەرلەمـان لە بەرانـبەر پاشـایەکی دیکتـاتۆردا وەسـتا. سـەرەکیترین گونـاه و تـاوانی ئەو پادشایە بەرزکـردنەوەی سـەرەڕۆیانەی رێـژەی پیتـاک بـوو بەبـێ رەزامەنـدیی هاووڵاتییـان، یـان بە پێناسـەیەکی گونجـاوتر بەبـێ رەزامەنـدیی پیتاکـدەران. لە هەردوو شۆڕشـی ١٦٨٨ی بریتانیـا و ١٧٦٦ی ئەمریکادا دەستەبژێرانی پێشکەوتنخواز کە لایەنگری مۆدێرنیزم و خاوەن بیرێکـی کـراوە و داهێنەر بوون سەرکەوتنیان بەدەست هێنا (جـگە لە پادشـا، کۆنسێرڤاتیسـتە کۆنەکـان کە هەم لە بریتانیـای سـەدەی حەڤـدە و هەم لە ئـەمریکای سـەدەی هەژدە لەگەڵ دەسـەڵاتی پاشـایەتیدا مابوونەوە، دۆڕاوانی شۆڕش بوون).

بەڵام ئەگەر بریتانیا نموونەیەکی ئاوارتە بوو، ئەوا ئەمریکا نموونەیەکی تایبەتی بوو لە نموونەیەکی تایبەتی؛ ئەمریکا هەمان بریتانیا بوو بەبێ فیۆدالیزم. ئەڵبەت لە ئەمریکایشدا بنەماڵەی زەمیندار و دەوڵەمەند زۆر بوون، بەڵام هەڵگری هیچ جۆرە نازناو و مافێکی میراتگرانە نەبوون و بەبەراورد لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی لۆردەکانی بریتانیادا هیچ دەسەڵاتێکی سیاسیشیان بەدەستەوە نەبوو. ریچارد هۆفستاتێری مێژوونووس پێیوایە بۆ تێگەییشتن لە ئەمریکای سەدەی هەژدە پێویستە تایبەتمەندییەکی ناوازە لەبەرچاو بگرین: «دونیایەک کە تەنیا چینی مامناوەندیی تێدایە».[٢٠] هەرچەند هەندێ توخمی ئەشرافی ئامادی رووبەرە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان بوون بەڵام زۆر بە دەگمەن رووی دەدا زاڵ بوونایە و دەسەڵاتیان کەوتایەتە دەست. لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەوە وردەوردە ئەم توخم و هۆکارانە لە باکووری ئەمریکادا بەرەو لاوازی چوون. گۆردۆن وودی مێژوونووس دەڵێت: «لە سالانی ١٧٨٠[ی ئەمریکا]دا دەمانتوانی بە روونی وێنای کۆمەڵگایەک بکەین کە قۆناخی پێش مودێرن دەرباز دەکات و بەرەو کۆمەڵگایەکی مۆدێرن هەنگاو دەنێت، کۆمەڵگایەک وردە وردە بەرژەوەندیی بازرگانی و شێوەڕوانینی خەڵکی ئاسایی بۆ بەکارهێنان دەبێتە مۆدێلی زاڵ». شۆڕشی ئەمریکا کە وود وتەنی بوو بە هۆی «پەرەسەندنی تەقینەوەئاسای هێزی کاردا‌هێن» مەودای نێوان ئەورووپا و ئەمریکای قووڵتر کردەوە.[٢١] لەمە بەدواوە ئیدی ئەمریکا بەتەواوی گۆڕدرا بۆ کۆمەڵگایەکی بۆرژوایی و شانازیی بەم گۆڕانەوە دەکرد. تۆکڤیل چەند رۆژ دوای ئەوەی لە ١٨٣١دا گەیشتە ئەمریکا لە دووتوێی بیرەوەرییەکانیدا نووسیویەتی، لە ئەمریکادا «مرۆڤ وا هەست دەکات وردە هەموو کۆمەڵگا لە ناو چینێکی مامناوەندیدا تواوەتەوە».

رێگاکەی ئەمریکا بەرەو دیموکراسیی لیبرالی رێگایەکی تاقانە و ئاوارتە بوو. کەمتر وڵاتێکمان هەیە بەبێ هیچ جۆرە مێژوو و رابردوویەکی فیۆدالی توانیبێتی ببێتە کۆمەڵگایەکی مودێرن. ئەمریکاییەکان خاوەن رابردوویەکی چەندسەد ساڵەی پاشایەتی و ئەشرافییەت نەبوون، هەر بۆیە پێویست نەبوو بۆ رووخاندنی تەکووزیی کۆن دەوڵەتێکی بەهێزی ناوەندی دابمەزرێنن یاکوو شۆڕشێکی توندوتیژی کۆمەڵایەتی رێ بخەن. لیبراڵەکانی ئەورووپا هەرچەند لە دەسەڵاتی دەوڵەت دەترسان بەڵام لە هەمان کاتدا بە ئاواتیشیەوە بوون. ئەوان دەیانویست دەسەڵاتی دەوڵەت کەم بکەنەوە و سنووری بۆ دابنێن، بەڵام بۆ مۆدێرنیزاسیۆنی کۆمەڵگا هەستیان بە زەروورەتی دەوڵەت دەکرد. تۆکڤیل لەم بارەیەوە دەڵێت: «گەورەترین دەستکەوتی ئەمریکاییەکان لەوەدایە کە بەبێ ئەنجامدانی شۆڕشێکی دیموکراتیک دیموکراسییان بەدەست هێنا... ئەوان یەکسان لە دایک دەبن و پێویست نییە یەکسان بکرێن».

له سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە لە بریتانیا و زۆربەی ناوچەکانی ئەمریکادا ئازادییە تاکییەکان و یەکسانبوون لە بەرانبەر یاسادا بەتەواوی چەسپابوو، بەڵام هیچکامیان دیموکراسی نەبوون. بەر لە یاسای ریفۆرمی ساڵی ١٨٣٢ تەنیا لە سەدا ١/٨ی کۆی حەشیمەتی بەتەمەنی بریتانیا مافی دەنگدانیان هەبوو، دوای پەسندکردنی ئەو یاسایە ڕێژەی دەنگدەران گەیشتە لە سەدا ٢/٧. ساڵی ١٨٦٧ بۆ جارێکیتر پیاچوونەوە بەو یاسایەدا کرایەوە و ڕێژەکە گۆڕدرا بۆ لە سەدا ٦/٤ و لە دوای ١٨٤٤ گەیشتە لە سەدا ١٢/١.[٢٢] دواجار بریتانیا لە ١٩٣٠دا و دوابەدوای پەسندکردنی مافی دەنگدان بۆ هەموو ژنان بوو بە دیموکراسییەکی تەواو کە هاوواتای پێناسەی ئەمڕۆیە بۆ دیموکراسی؛ واتە مافی دەنگدان بۆ هەموو ئەوانەی گەشتوونەتە تەمەنی یاسایی. کەچی بەمەشەوە بەگشتی بریتانیا هەمیشە وەک نموونەی وڵاتێکی لیبرالی یاساخواز لەقەڵەم دەدرا، بریتانیا وڵاتێک بوو کە ماف و ئازادییەکانی دەپاراست و یاسای بەسەردا زاڵ بوو.

ئەمریکا لە بریتانیا دیموکراتیکتر بوو، بەڵام بەو ڕێژەیەش نەبوو کە خەڵک وادەزانن. لە چەند دەیەی دەستپێکی دامەزرانی ئەمریکادا تەنیا پیاوانی سپیپێست و خاوەن موڵک مافی دەنگدانیان هەبوو ـ ئەمە بەتەواوی هاوشێوەی سیستەمی هەمان ئەو وڵاتە بوو کە ئەمریکا تازەبەتازە خۆی لێ ڕزگار کردبوو. لە ١٨٢٤دا، واتە ٨ ساڵ دوای سەربەخۆیی، تەنیا لە سەدا ٥ی گەورەساڵانی ئەمریکا لە هەڵبژاردنی سەرۆککۆماریدا بەشدارییان کرد. ئەم ڕێژەیە دوای شۆڕشی جەکسۆنی[٢٨] و لابردنی زۆربەی مەرجەکانی پەیوەست بە ماڵ و موڵکەوە، بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کرد، بەڵام تا پێش شەڕی ناوخۆیی (١٨٦١) هێشتا هەموو پیاوانی سپیپێستیش مافی دەنگدانیان بەدەست نەهێنابوو. هەرچەند ڕەشپێستان لە ١٨٧٠دا مافی دەنگدانیان بە شێوەی تیۆری بەدەست هێنا، بەڵام لە باشووری ئەمریکادا تا سەدەیەک دواتریش ئەم یاسایە بەڕێوە نەبرا. ژنانیش لە ١٩٢٠دا مافی دەنگدانیان بەدەست هێنا. سەرەڕای ناکامڵبوونی دیموکراسی لە ئەمریکادا، کەچی لە زۆربەی ساڵانی سەدەی نۆزدەدا دونیا ئیرەیی بەم وڵاتە و سیستەمی ماف و یاساکانی دەبرد. بەرەبەرە لیبرالیزمی یاساخواز دیموکراسیی لێ کەوتەوە و دیموکراسیش ئازادیی پەرە پێ دا و ئەم سیکلە هەر بەردەوام بوو.

وڵاتە ئەوروپییەکانیتر لە ڕەوتی بەدیهێنانی دیموکراسیی لیبرالیدا ڕێگایەکی ئاڵۆزتر لە ڕێگاکەی ئەمریکا و بریتانیایان پێوا، بەڵام دواجار بەدەستیان هێنا. گۆڕانکارییەکانی ئەو دوو وڵاتە هێواش و (زۆرجار) ئاشتیخوازانە و هێمنانە بوو، بەڵام لە وڵاتانیتری ئەوروپادا شێوازێکی پڕئاژاوە و خوێناویی گرتەبەر (کە لە بەشی دووەمدا دەیخەینە بەرباس). بەڵام زۆربەی ئەم وڵاتانە تا کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٤٠ دیموکراسیی لیبرالییان بەدەست هێنا، ئەوانەش کە مابوونەوە لە ١٩٨٩

٢٨ . سەرۆککۆماری ئەمریکا لە نێوان ساڵانی ١٨٢٨ تا ١٨٣٦دا. و.ف

بەدواوە هەمان ڕێچکەیان گرتەبەر و ڕەوتی سەقامگیرکردنی دیموکراسیی لیبرالی بە خێرایی و جیدییەتێکی کەموێنەوە بەرەو پێشەوە هەنگاوی نا. هۆکارەکەی ڕوون و ئاشکرایە: هەموو وڵاتانی ڕۆژئاوا خاوەن ڕابردوویەکی هاوبەشن کە سەرەڕای هەموو جیاوازییە وردەکان، ئەم ڕابردووە گەورەترین دەوری هەبوو لە ڕۆنانی نەریتێکی لیبرالیزمی یاساخوازدا. لێکۆڵەران مۆدێلی بریتانیایان بە «مۆدێلی ئایدیال» ناوزەد کردووە، هەر بۆیە بەرجەستەکردنەوە و وردبوونەوە لەم مۆدێلە گەلێ سوودی تێدایە. بەڵام لە سەدەی هەژدە بەدواوە تەنانەت دواکەوتووترین دەسەڵاتی ئەورووپایش بە بەراورد لەگەڵ نموونە هاوشێوەکانی لە ئاسیا و ئافریقادا خاوەن سیستەمی لیبرالی بوو. هاووڵاتییان خاوەنی گەلێ ماف و دەسەڵاتی ڕوون و پەسندکراو بوون کە هیچ تاکێکی دەرەوەی ڕۆژئاوا تەنانەت نەیدەتوانی بیری لێ بکاتەوە. یاسا و نەریتەکان سنووریان بۆ پادشا دیاری ئەکرد. بەبێ ئەوەی دەوڵەت دەستێوەردانێکی ئەوتۆی تێدا بکات، کۆمەڵگایەکی مەدنی لە دایکبوو کە پێک هاتبوو لە کۆمپانیا ئابوورییەکانی کەرتی تایبەت، کلێساکان، زانکۆکان، سەندیکاکان و ئەنجومەنەکان. پارێزگاری لە مافی موڵکداریی تایبەتی دەکرا و کار و کەسابەتی ئازاد گەشەی سەندبوو. ئەڵبەت ئەم ئازادییانە ئەوەندەی لە تیۆریدا دەپارێزران لە مەیدانی کردەوەدا نەدەپارێزران، چونکوو پادشایانی دیکتاتۆر هەڕەشەیەک بوون بۆسەر ئەم ئازادییانە. بەڵام بە بەراورد لەگەڵ شوێنەکانیتری جیهاندا، بێگومان ڕۆژئاوا سەرزەمین و مەکۆی ئازادی بوو.

## کولتوور وەک قەدەر

ڕەنگە نەتوانین ئەم گێڕانەوە کورتە بۆ مێژووی ئازادی وەک مانیفێستێک چاو لێ بکەین. بەپێی ئەم کورتە مێژووە مرۆڤ وا هەست دەکات هەر وڵاتێ بیەوێ ببێتە دیموکراسییەکی لیبرالی، پێویستە بیگوێزرێتەوە بۆ ڕۆژئاوا. بێگومان ئەگەر وڵاتێک کەوتبێتە ناو دونیای ڕۆژئاواوە یان تەنانەت کەوتبێتە پەراوێز و دەوروبەری ئەم جیهانەوە، ئیمتیازێکی سیاسیی بەدەست هێناوە. لە ڕەوتی بەدەستهێنانی دیموکراسیی لیبرالیدا، لە کۆی ئەو وڵاتانەی دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریای سۆڤییەت سەربەخۆییان وەرگرت، ئەوانەیان سەرکەوتووتر بوون کە لە «ئەزموونی ڕۆژئاوایی»دا بەشدار بوون، کە بریتییە لەو وڵاتانەی پێشتر لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریاکانی نەمسا و ئەڵمانیادا بوون. هەمان ئەو هێڵەی لە ١٥٠٠ی زایینیدا وڵاتانی مەسیحیی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای لێکدی جیا دەکردەوە، ئێستاکە سیستەمە لیبرالییە سەرکەوتووەکان و سیستەمە نالیبراڵە سەرنەکەوتووەکان لێکدی جیا دەکاتەوە. بێگومان پۆڵەندا و هەنگاریا و کۆماری چیک بەشێک بوون لە ئەورووپا، ئەم وڵاتانە لە ڕەوتی سەقامگیرکردنی دیموکراسیدا زیاتر لە وڵاتانی دیکە سەرکەوتنیان مسۆگەر کردووە، وڵاتانی لێواری دەریای باڵتیک لە

ریزی دووەمی پرۆسەکەدان. تەنانەت لە ناوچەی باڵکاندا ئۆسلۆوانی و کۆرۆواسی کە دەکەونە سەر هێڵی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوای ئەم ناوچەیەوە گەلێ سەرکەوتووتر بوون، بەڵام سربستان و ئالبانی کە دەکەونە رۆژهەڵاتەوە، گەلێ ئەستەمتر و سەختتر سەرقاڵی تێپەڕاندنی ئەم قۆناغەن.

ئایا ئەمە بەو مانایە دێتەوە کە کولتوور وەک قەدەرێک وایە؟ چەندەها بیرمەندی گەورە، لە ماکس ڤێبێرەوە بگرە تا دەگاتە ساموێل هانتینگتۆن، ئاوەها بەڵگاندنێکی بەهێزیان خستۆتە بەردەست. هەنووکە ئەم بۆچوونە بۆتە مۆدی رۆژ. زۆرکەس، لە راوێژکارانی بازرگانییەوە بگرە بۆ ستراتیژیستە نیزامییەکان، بە شێوەیەک باسی کولتوور دەکەن وەک بڵێی کولتوور مانای لێکدانەوەیەکی سادە بۆ زۆربەی بابەتە ئاڵۆز و دژوارەکانە. چما لەم بیست ساڵەی رابردوودا ئابووریی ئەمریکا ئاوەها پێشکەوتنێکی گەورە و سەرسامکەر ژیاوە؟ وەڵامەکەی ئاشکرایە؛ لەبەر ئامادەبوونی کولتووری دانسقەی کارداهێن لەم وڵاتەدا. چما رووسیا نەیتوانیوە خۆی لەگەڵ سەرمایەداریدا بگونجێنێ؟ وەڵامی ئەمەش دیار و ئاشکرایە؛ لەبەر ئامادەبوونی کولتووری فیۆدالی و دژەبازاڕ لەم وڵاتەدا. چما ئافریقا گیرۆدەی هەژارییە و چما دونیای عەرەب تیرۆریستپەروەرە؟ وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانەش یەک وشەیە: کولتوور.

بەڵام ئەم جۆرە وەڵامانە گەلێ ساویلکانە و کاڵفامانەن. بیرمان نەچێ قەیرانی ئاوسان[29] و قەیرانی گەورە[30] لە ناو دڵی هەمان ئەو کولتوورە ئەمریکاییەوە لە دایکبوو. لەلایەکیترەوە کولتووری ژاپۆنی و ئەڵمانی سەردەمانێک فیۆدالی بوون کەچی بە باشترین شێوە خۆیان لەگەڵ سەرمایەداریدا گونجاندووە و بوونەتە دووەمین و سێیەمین وڵاتانی دەوڵەمەندی جیهان. رەنگە هەر وڵاتێک لە سەردەمی جیاجیادا و هەندێ جار تەنیا لە چەند دەیەیەکدا، سەرکەوتن بەدەست بهێنێ و دواتر دوچاری دۆڕانیش بێت، ئەمە نیشاندەری ئەوەیە هۆکارێکی دیکەیش جیا لە کولتوور ـ کە زۆربەی کات هۆکارێکی هەمیشەیی و نەگۆڕە ـ ئامادەیە و دەور دەگێڕێت.

گەورەدامەزرێنەری سەنگاپوور، لی کوانیوو[31]، لە دیدارێکدا پێی وتم ئەگەر دەتەوێ لە کاریگەرییەکانی کولتوور بگەیت ئاورێک بدەرەوە لە شێوازی کارکردنی کرێکارانی ئەڵمانی و زامبیایی

29. Inflation

٣٠ . قەیرانی گەورەی دە ساڵەی ئابووریی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٢٩دا. و.ف

٣١ . سەرۆکوەزیرانی سەنگاپوور لە نێوان ساڵانی ١٩٥٩ تا ١٩٩٠دا. ئەو یەکێک بوو لە خەباتکارانی ئەم وڵاتە کە دژی داگیرکاریی بریتانیا و لە پێناو سەربەخۆیی وڵاتەکەیدا خەباتی کرد و چاکسازییەکی زۆری لە سەنگاپووردا ئەنجام دا کە ئەو ریفۆرمانە بوونە هۆی ئەوەی سەنگاپوور ببێتە وڵاتێکی پیشەسازی. حکوومەتی یوو حکوومەتێکی دیکتاتۆرئاسا بوو و هەندێ جار ئازادییە مەدەنییەکانی پێشێل دەکرد.و.ف

له هەموو شوێنێکی جیهاندا و بەراوردیان بکە بە یەکتر. زۆر خێرا دەگەیتە ئەو ئەنجامگیرییە کە بێگومان ئەو دوو کولتووره جیاوازییەکی بنەڕەتییان پێکەوە هەیە کە ئەو جیاوازییە هۆکاری ئەو لێکنەچوونەمان بۆ روون دەکاتەوە. لێکۆڵەران هەندێ بەڵگاندنی هاوشێوەی ئەمەیان خستۆتە بەردەست: جوێل کاتکین کتێبێکی سەرنجڕاکێشەری هەیە بە ناوی «عەشیرەتەکان»، لەوێدا دەڵێت ئەگەر دەتەوێ لە دونیای مۆدێرندا سەرکەوتنی ئابووری مسۆگەر بکەیت رێگایەکی سادە و ساکارت لە بەردەمدایە ـ جوولەکە بیت، هیندی بیت یان لەوانەش گونجاوتر، چینی بیت.

قسەکەی لی و کاتکین بەتەواوی دروستە، هەندێ تاقمی وەک چینییەکان و هێندییەکان و جوولەکەکان لە هەموو بارودۆخێکدا زۆر باش هەڵدەسووڕێن (لە راستیدا ئەم جۆرە لێکدانەوەیە بۆ تیۆریی کولتوور زۆر سەرنجم رادەکێشێ، چونکوو من بە رەگەز هیندیم). بەم پێیە تەنیا ئەگەر هیندی بین ئیدی لە کاروباری ئابووریدا سەرکەوتنمان مسۆگەرە، ئەگەر وایە ئەی چ وەڵامێکمان بۆ ئەو پرسیارە هەیە کە لەبەرچی ئابووریی هیندستان لە چل ساڵی یەکەمی سەربەخۆییدا (١٩٤٧) و تەنانەت سەدان ساڵ پێش ئەو بەروارەش لاواز و سەرنەکەوتوو بوو؟ منێک کە لە هیندستان گەورە بووم قەت لەسەر ئەو باوەڕە نیم کە هێندییەکان لە رووی ئابوورییەوە سەرکەوتوون. زۆرجار بیری ئەو رۆژە دەکەومەوە کە یەک لە ئەندامانی زۆر بەناوبانگی پەرلەمانی هیندستان، پیلۆمۆدی، ئەم پرسیارەی ئاراستەی ئیندیرا گاندی کرد: «ئایا سەرۆکوەزیر دەتوانێ بۆم روون بکاتەوە چما هیندییەکان لە ناو هەموو حکوومەتەکانی جیهاندا کەسانێکی سەرکەوتوون بەڵام لە ناو حکوومەتەکەی خۆیاندا سەرکەوتوو نین؟».

دەتوانین هاوشێوەی ئەم پرسیارەش ئاراستەی چین بکەین، ئەم وڵاتەش بە درێژایی سەدان ساڵ و تا بیست ساڵ لەمەوپێش ئابوورییەکی زۆر لاوازی هەبوو. ئەگەر تاقە پێداویستی بۆ پێشکەوتنی ئابووری بریتییە لە مرۆڤی چینی، خۆ چین بە سەدان میلیۆن مرۆڤی ئاوەهای هەیە. جوولەکەیش دۆخێکی هاوشێوە دەژین؛ ئەوان لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا کەسانێکی سەرکەوتوون کەچی لە تەنیا وڵاتێکدا کە زۆرینەیان پێیە، واتە ئیسراییل، تا ئەم دواییانەش بارودۆخێکی خراپی ئابوورییان هەبوو. سەیر لەوەدایە لە نزیکەی هەشتاکانەوە هەرسێ وڵاتەکە (هیندستان، چین و ئیسراییل) بارودۆخی ئابوورییان پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە. ئەمەش نە لەبەر ئەوەی کولتوورەکەیان گۆڕدرابێت، بەڵکوو لەبەر ئەوەی حکوومەتی ئەم وڵاتانە وازیان لە هەندێ لە سیاسەتەکانیان هێنا و جۆرە سیستەمێکیان رۆ نا کە لەگەڵ بازاڕدا زیاتر دەگونجا. ئێستە پێشکەوتنی چین لە هیندستان زیاترە، ئەمەش زیاتر لەبەر ئەوەیە کە چین زیاتر

لە هیندستان ریفۆرم لە ئابووریی خۆیدا دەکات، کە وابوو ئەم پێشکەوتنە قەت بەو مانایە نایەتەوە کە ئەخلاقی کۆنفۆسیۆسی بەرزترە لە بیری هیندوویی.

سەیرە چما لی کوانیوو بەم شێوەیە پێ لەسەر هۆکاری کولتووری دادەگرێت، لە رووی کولتوورییەوە سەنگاپوور جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ مالیزیای دراوسێیدا نییە. سەنگاپوور زیاتر لە چین دەچێت و کەمتر لە مالیزیا دەچێت، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانیتری جیهاندا ئەم دوو وڵاتە دراوسێیە خاڵی هاوبەشیان زۆرە. بەڵام دەوڵەتی سەنگاپوور زۆر کارامەترە لە دەوڵەتانی دراوسێی و سیاسەتێکی ئابووریی وشیارانە و ئاقڵانەی بەڕێوە بردووە. بە دڵنیاییەوە رەمزی سەرکەوتنی سەنگاپوور زیاتر لەوەی پێوەندیی بە جیاوازیی زاتییە کولتوورییەکانەوە بێت هەڵدەگەڕێتەوە بۆ فاکتەری دەوڵەت. بە واتایەکیتر رەمزی سەرکەوتنی سەنگاپوور «لی کوان یوو» بوو نەک «کۆنفۆسیۆس». من ناڵێم کولتوور بێبایەخە، بەپێچەوانەوە زۆر بە گرنگیشی دەزانم، بەڵام بۆی هەیە کولتوور گۆڕانی بەسەردا بێت. کولتووری ئەڵمانیا لە ١٩٣٩دا گەلێ جیاواز بوو لە ١٩٥٩، ئەم گۆڕانکارییە تەنیا بیست ساڵی خایاند. سەردەمانێک ئەورووپا مەکۆی ناسیۆنالیزمی رادیکاڵ بوو بەڵام ئێستا قۆناغی ناسیۆنالیزمی دەرباز کردووە، دەوڵەتانی ئەورووپا هێند خۆکرد و بە دڵخوازی خۆیان لە دەسەڵاتی خۆیان کەم دەکەنەوە و دەیسپێرنە دەست رێکخراوە نێونەتەوەییەکان کە ئەمریکاییەکان ناتوانن تەنانەت بیریشی لێ بکەنەوە. سەردەمانێک کۆماری ئەمریکا دوورەپەرێز لە دونیا دەوستا و بەرانبەر ئارتەشی هەمیشەیی زێدە بەدگومان بوو، کەچی ئێستا گەورەترین دەسەڵاتی دونیایە و لە هەرهەموو دونیادا کامپی نیزامیی هەیە. سەردەمانێک چینییەکان وەرزێرانی دواکەوتوو بوون، کەچی ئێستا بازرگانانی زیرەک و بلیمەتن. قەیرانی ئابووری، شەڕوشۆڕ، سەرکردایەتیی سیاسی و دەیان کاراکتەری لەم چەشنە، دەبنە هۆی گۆڕانی کولتووری.

سەدساڵ لەمەوپێش واماندەزانی رۆژهەڵاتی ئاسیا بۆ تاهەتایە گیرۆدەی هەژارییەکی ئەبەدی بووە، زۆربەی تووێژەران و لە هەموویان بەناوبانگتر ماکس ڤێبێر، دەیانوت کولتوورە کۆنفۆسیۆسییەکان لەمپەرێکن لە بەردەم هەموو پێداویستییەکانی سەرکەوتنی سەرمایەداریدا.[٢٣] لە دەساڵ لەمەوپێشەوە و هاوکات لەگەڵ بووژانەوەی رۆژهەڵاتی ئاسیادا تووێژەران ئەم بۆچوونەیان ئاوەژوو کردەوە و دەڵێن لەراستیدا کولتووری کۆنفۆسیۆسی لەسەر ئەو تایبەتمەندییانە دەوەستێت کە لە بووژانەوەی ئابووریدا خاوەن رۆڵن. ئێستە ئەم شرۆڤەیە دیسان ئاوەژوو کراوەتەوە و زۆرکەس پێیان وایە «بەها ئاسیاییەکان» هەڵگری هەموو توخمەکانی «سەرمایەداریی رانتی»یە. ڤێبێر لە شیکارییەکانیدا پێشکەوتنی ئابووریی باکووری ئەورووپای

دەگەڕاندەوە بۆ ئامادەبوونی «ئەخلاقی پرۆتستانی» و لە پێشبینییەکانیدا دەیوت باشووری کاتۆلیک لە هەژاریدا دەمێنێتەوە. کەچی بەپێچەوانەوە لە نیو سەدەی رابردوودا ئیتالیا و فەرەنسا خێراتر لە ئەورووپای پرۆتستان گەشەیان کردووە. رەنگە کەسانێک لاوازبوونی هەندێ لە وڵاتان هەڵگەڕێننەوە بۆ بەڵگاندنی کلێشەییی دووڕووبوونی لاتینییەکان و ئامادەبوونی ئەخلاقی «دواخستنی کارەکان» لە ناو ئەو کولتوورانەدا، جا ئەگەر وایە دەبێ بە چ پێوەرێک بارودۆخی شیلی بپێوین؟ ئابووریی شیلی بەقەدەر بەهێزترین ئابوورییەکانی «پڵنگەکان»ی ئاسیا پتەو و بەهێزە. زۆرجار ئەم سەرکەوتنە دەبەستنەوە بە کۆمەڵە بەهایەکی لاتینیی دیکەوە: بنەماڵەی پتەو، بەها مەزهەبییەکان و ئیرادەی پۆڵایین.

لە راستیدا ناتوانین وەڵامێکی سادە بۆ تێگەییشتن لە هۆکاری سەرکەوتنی هەندێ کۆمەڵگای تایبەت لە هەندێ سەردەمی تایبەتدا بدۆزینەوە. وادیارە بۆ تێگەییشتن لە هۆکاری سەرکەوتنی کۆمەڵگایەکی تایبەت پێویستە ئاوڕێک لە رابردووی ئەو وڵاتە بدەینەوە. بەم لۆژیکە سەرەتا کۆمەڵگاکە بە سەرکەوتوو لەقەڵەم دەدەین ئینجا لە کولتووری ئەو وڵاتەدا بەدوای هۆکارەکانی ئەم سەرکەوتنەدا دەگەڕێین. بەڵام کولتوورەکان گەلێک ئاڵۆزن: هەرکەس لە هەر کولتوورێکدا بەدوای هەر شتێکدا بگەڕێت بێگومان دەیدۆزێتەوە؛ ئەگەر کەسێک بەدوای خەسڵەتگەلێکی کولتووری لە چەشنی پێداگری و دەسپێوەگرتن لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیادا بگەڕێت، زۆر بە ئاسانی دەتوانێ لە ناو کولتووری ئەو وڵاتانەدا بیاندۆزێتەوە، بەپێچەوانەش ئەگەر مەبەستی دۆزینەوەی خەسڵەتگەلێکی وەک گوێڕایەڵی و ملکەچبوونی کوێرانە و خزمگەرایی بێت، ئەوانەش هەر بە ئاسانی لەو کولتوورانەدا دەدۆزێتەوە. ئەگەر ورد بڕوانین ئەم خەسڵەتانە لە زۆربەی کولتوورەکاندا دەبینینەوە.

کولتوور شتێکی گرنگە. کولتوور دەتوانێت هەم بزوێنەر بێت هەم لەمپەر، هەم رەوتی گۆڕانکارییەکان خێرا بکاتەوە هەم لە خێراییان کەم بکاتەوە. کولتوور دەتوانێ بە دامەزراوەکان و وەرزشەکاندا رۆ بچێت ، ئەو دامەزراوە و وەرزشانەی زۆرجار لەمپەرێکی راستەقینەن لە بەردەم سەرکەوتندا. رەنگە کولتووری هیندی زەبر لە پێشکەوتنی ئابووریی هیندستان بدات یان نەیدات، بەڵام بێگومان بۆرۆکراسیی هیندی زەبری لێ دەدات. گەورەترین تایبەتمەندیی راستەقینەی رۆژئاوا ئەوەیە کە لە هەناوی مێژووی رۆژئاواییەوە کۆمەڵێک دامەزراوە و وەرزش لە دایکبوون، هەرچەند ئەم شتانە هیچ پێوەندییەکیان بە ژێنێتیکی رۆژئاواییەوە نییە بەڵام ئەگەر بمانەوێ لە کۆمەڵگاکانیتردا لە سفرەوە دەست بدەینە چێکردنیان، بێگومان رووبەڕووی کارێکی سەخت و ئەستەم بووینەتەوە، ئەڵبەت قەت کارێکی نامومکین نییە.

## مۆدێلی رۆژهەڵاتی ئاسیا

ئەگەر ئاوڕێک لەو وڵاتە غەیرە رۆژئاواییانە بدەینەوە کە لەم سی ساڵەی دواییدا قۆناغی دیموکراسیی لیبرالییان تێپەڕاندوە، لەو راستییە دەگەین کە ئەوانەی زیاتر پێش کەوتوون ئەو وڵاتانەن کە مۆدێلێکی هاوشێوەی مۆدێلی رۆژئاوایان هەڵبژاردووە: سەرەتا سەرمایەداری و باڵادەستیی یاسا و ئینجا دیموکراسی. بە درێژاییی چەندین دەیە رژێمگەلی تاکحیزبی یان تاقمی نیزامی جڵەوەی دەسەڵاتیان لە کۆریای باشوور، تایوان، تایلەند و مالیزیادا بەدەستەوە بوو. ئەم رژێمانە سەرەتا ئابووری، سیستەمی یاسایی، مافە مەزهەبییەکان و گەشتوگوزاریان لیبرالیزە کرد، ئینجا دوای چەندین دەیە هەڵبژاردنی ئازادیان بەڕێوە برد. رەنگە ئەم وڵاتانە بە رێکەوت بووبن بە خاوەن دووان لە خەسڵەتە بنەماییەکانی دەوڵەتی باش، ئەو خەسڵەتانەی کە جەیمز مەدیسۆن[٣٢] چوارچێوە گشتییەکەی لە «فێدراڵیست پایپێرز»دا دارشت. دەوڵەت بە ئاستی یەکەم دەبێ توانای کۆنترۆڵکردنی هاووڵاتییانی خۆی هەبێت و بە ئاستی دووەمیش بتوانێت خۆی کۆنترۆڵ بکات، واتە (سەقامگیرکردنی) تەکووزی لەگەڵ (دابینکردنی) ئازادیدا. ئەم دوو توانستە لە درێژخایەندا دەوڵەتی رەوا، بووژانەوەی ئابووری و دیموکراسیی لیبرالیی لێ دەکەوێتەوە. ئەڵبەت ئەم کارە بە قسە ئاسانە بەڵام بە کردەوە سەخت و گرانە.

لە پەنجا و شەستەکاندا زۆربەی رۆشنبیرانی رۆژئاوا رژێمەکانی رۆژهەڵاتی ئاسیایان بە رژێمگەلێکی پاشڤەڕۆ و کۆنەپەرست ناوزەد دەکرد و تانە و لۆمەیان لێ دەدان، لە بەرانبەردا پێشوازییەکی زۆر گەرمیان لەو سەرکردە جەماوەرییانەی ئاسیا و ئافریقا دەکرد کە هەڵبژاردنیان بەڕێوە دەبرد و وەفاداریی خۆیان بە خەڵک رادەگەیاند ـ بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بە غەنا و تانزانیا و کینیا بکەین. زۆربەی ئەو وڵاتانە بوونە دیکتاتۆری، ئەمە لە حاڵێکدا بوو کە رۆژهەڵاتی ئاسیا دەقاودەق پێچەوانەی ئەوان هەنگاوی نا. بێگومان راستییەک هەیە کە دەبێتە هۆی سەرلێشێواویی توێژەران و رۆشنبیران، ئەویش ئەوەیە کە پتەوترین دیموکراسییەکانی ئەمریکای لاتین و رۆژهەڵاتی ئاسیا ـ شیلی، کۆریای باشوور و تایوان ـ ماوەیەکی دووردرێژ لە ژێر دەسەڵاتی تاقمە نیزامییەکاندا بوون. بە هەمان شێوەی ئەوروپای رۆژئاوا لە رۆژهەڵاتی ئاسیایشدا ئەو رژێمە دیکتاتۆر و تۆتالیتارانەی رێگای لیبرالیزاسیۆنیان گرتەبەر زەمینەی سەقامگیربوونی دیموکراسیی لیبرالییان خۆش کرد.

---

٣٢ . لە دامەزرێنەرانی دەستوری ئەمریکا و چوارەمین سەرۆککۆماری ئەم وڵاتە. و.ف

دەتــوانین بڵێــین لە هەمــوو ئەم وڵاتــانەدا رژێــمە دیکتاتۆرەکــان وردەوردە و بەش بە بەش دەرگاکــانی ئابووریــان کــردەوە، بەڵام ئەم پرۆســەیە رۆژ لە دوای رۆژ زیــاتر دەوڵەتــی لیبرالیــزە دەکرد. توێژەری گەورەی رۆژهەڵاتی ئاسیا، مینکسین پی، دەڵێت:

لە جــەنگی جیهــانیی دووەم بەدواوە تایبەتمەنــدییەک لە رۆژهەڵاتــی ئاســیادا جێگیــر بــوو کە بــریتییە لە پرۆســەی وردەوردەی ســازکردنی ئۆتۆریتەخــوازانەی دامەزراوەکــان... لە ناوەنــدی ئەم پرۆسەیەدا سەرهەڵدانی وردە وردە و لەسەرخۆی دامەزراوە سیاســییە مۆدێرنەکان دەبینــین کە لە رێگــای حیــزبە دەســەڵاتدارەکان، بۆرۆکراســی و هەڵبــژاردنە نیــوە ئازادەکــانەوە هێــزی رەســمی و نارەســمیی خۆیــان بە ئاراســتەی بەرکــورتکردنەوە [ی دەســەڵات]دا دەخســتە گەڕ. هەروەهــا ئاکــامێکیتری ئەم پرۆســەیە دروســتبوونی وردەوردەی سیســتەمی دادوەری بــوو کە بەردەوام بەرەو سەربەخۆیی زیاتر هەنگاوی دەنا. ئەم پرۆســەیە دوو ئاکامی بەکەڵک و پــۆزەتیڤی لــێ کەوتەوە: سەقامگیریی زیاتر و پاراستنی مافی موڵکداری (کە هۆکارەکەی دەگەڕایەوە بۆ ئەو کۆت و بەنــد و ســـنوورە بەردەوامـــانەی بە رێگـــای بـــازاڕ و پێـــوەرە سیاســـییە تازەکانـــدا دەخـــرایە ســـەر دەسەڵاتداران).[٢٤]

تا ئێستاش هێشتا کێشەی گەندەڵی، خزمگەرایی و خڵەتاندنی دەنگدەران لە رۆژهەڵاتــی ئاســیا نەبراوە، بەڵام تا پەنجا ساڵ لەمەوپــێش تەنــانەت زۆربەی دیموکراسییەکانی رۆژئــاوایش گیــرۆدەی ئەم کێشانە بوون. هەڵبژاردنی ئێستای تایوان هەڵبژاردنێکی تەواو و بێکەماسی نییە، بەڵام رەنــگە بە بەراورد لەگەڵ باشــووری ئــەمریکا لە پەنجاکانــدا (یــان شــیکاگۆی شەســتەکان) هەڵبژاردنێکــی ئــازادانەتر و دادپەروەرانەتــر بێــت. ئەمــڕۆکە کۆمپانیــا زەبەلاحەکــان ئاســەواری نیگەتیــڤ لەســەر سیاسەتی کۆریای باشوور دادەنێن، بەڵام سەدەیەک لەمەوپــێش دەقــاودەق ئاوەهــا کاریگەرییەکیــان لەســەر ئەورووپا و ئــەمریکایش دادەنــا. رەنــگە کۆمپانیاکــانی هێڵــی ئاســن، پــۆڵا، کەشــتیسازی و هەروەها سەرمایەگوزارەکانی ئەوسا گەلێ بەهێزتر لە هەرهەموو پیشەســازە زەبەلاحەکــانی ئێســتای رۆژهەڵاتی ئاسیا بووبێتن (ئایا تەنانەت نــاوی ئەو سیاســەتمەدارانەتان بیــر مــاوە کە لە ســەردەمی سەرمایەدارانی گەورەی وەک جی.پی. مۆرگان، ئــی.ئێچ.هەریمەن و جــان دی.راکفلێــردا دەســەڵاتدار بوون؟)[٣٣]. ناتوانین بــۆ نرخانــدن و تــاقیکردنەوەی دیموکراســییە تازەکــان جــۆرە پێوەرێــک بە کــار بهێنین کە ئەگەر بیکەینە پێوەرێک بۆ نرخاندنی رابردووی زۆربەی وڵاتانی رۆژئاوا ـ تەنانەت تا سی ســاڵ لەمەوپــێش ـ هیچیــان دەرنــاچن. هەنــووکە رۆژهەڵاتــی ئاســیا تێکەڵکردێکــی لیبرالیــزم،

٣٣ . گەورە سەرمایەداران و خاوەن پیشەسازییە گەورەکانی ئەمریکا لە سەدەی نۆزدەدا. و.ف

ئۆلیگارشی، دیموکراسی، سەرمایەداری و گەندەڵییە، ئەمە دیمەنێکە زۆر لە رابردووی رۆژئاوا دەچێت، بۆ وێنە لە رۆژئاوای ١٩٠٠. بەڵام بەمەشەوە زۆربەی وڵاتانی ئاسیای رۆژهەڵات زۆر لیبراڵتر و دیموکراتیکترن لە زۆربەی وڵاتە غەیرە رۆژئاواییەکانیتر.

ماینێر واینێر، هزرڤانی زانستە سیاسییەکان، لە ساڵی ١٩٨٣دا بەڵگەیەکی سەیرتری خستە روو کە دەیسەلماند رابردوویەکی لیبرالیی یاساخواز دەتوانێ بەرهەمهێنەری ئێستایەکی لیبرالیی دیموکراتیک بێت. بەپێی ئەو بەڵگەیە تا ئەوکاتە «دانەبەدانەی ئەو وڵاتە جیهان سێیەمییانەی رێژەی حەشیمەتیان لە سەرووی یەک ملیۆن کەسەوەیە (هەروەها نزیک بە هەموو کۆلۆنییە بچووکترەکانیش) کە دوای جەنگی جیهانیی دووەم سەربەخۆییان وەرگرتووە و خاوەن ئەزموونی دیموکراتیکی بەردەوامن، پێشتر کۆلۆنیی بریتانیا بوون».[٢٥] دەسەڵاتداریی بریتانیا مانای نەبوونی دیموکراسی ـ بە شێوەی رێژەیی کۆلۆنیالیزم لە جەوهەری خۆیدا نادیموکراتە ـ بەڵام لە هەمان حاڵدا مانای لیبرالیزمی یاساخواز و سەرمایەداریی بەرکورت. ئێستە لە جیهانی سێیەمدا هەندێ دیموکراسیی دیکەیش دەبینین بەڵام بەگشتی ئەو بۆچوونەی واینێر هێشتاکوو دروستە. ئەم دەربڕینە بە واتای پشتیوانیکردن لە کۆلۆنیالیزم نییە، بۆخۆم لە وڵاتێکدا گەورە بووم کە لە ژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمدا بووە (هیندستان) هەر بۆیە بەتەواوی سیمای دزێو و ناحەزی رەگەزپەرستیی دامەزراو و بەکارهێنانی نادروستی دەسەڵات ـ کە بەشێک بوون لە میراتەکانی ئیمپراتۆریای بریتانیا ـ دەناسم و پێویست نییە کەس بیرم بخاتەوە. بەڵام کەس ناتوانێ حاشا لەو حەقیقەتە بکات کە ئیمپراتۆریای بریتانیا لەدوای خۆی میراتێکی بەنرخی سەرمایەداری و یاسای بەجێهێشت کە لە زۆربەی وڵاتانی داگیرکراوی پێشوودا ـ نەک هەموویان ـ یارمەتیدەری هێزە لیبراڵ دیموکراتەکان بوو[٣٤]. بەپێچەوانەی بریتانیا، فەرەنسا هەوڵێکی ئەوتۆی بۆ پەرەپێدانی بازاڕی ئازاد یان چەسپاندنی دەسەڵاتی یاسا لە کۆلۆنییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا نەدا، بەڵام مافی دەنگدانی

---

٣٤ . بریتانیا هەنگاوێکی پۆزەتیڤی ئەوتۆی بە ئاراستەی سازکردنی دامەزراوەکان و باڵادەستکردنی یاسادا، لەو وڵاتانەدا کە لە دواساڵەکانی داگیرکاریدا خستبوونیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و لەدوای چەند دەیە وازی لێ هێنان، هەڵنەگرت کە دەتوانین ئاماژە بە هەندێ ناوچەی ئافریقا و رۆژهەڵاتی ناوین بکەین. بەپێچەوانەوە لەبەر ئەو سنوورە دەستکرد و نەگونجاوانەی بۆی دیاری کردن، لە هەمان سەرەتای سەربەخۆییەوە ئەم وڵاتانەی تووشی چەندەها کێشەی ئەتنیکی و مەزهەبی کرد. بەڵام بێگومان ناتوانین حاشا لە پێوەندیی نێوان دەسەڵاتداریی بریتانیا و دیموکراسی بکەین لە هەندێ ناوچەی وەک باشووری ئاسیا و لێوارەکانی دەریای کاراییب و هەروەها ئەو کۆلۆنییانەی بریتانییەکان تێیدا نیشتەجێ بوون (کەنادا،نیوزلەندا و ئوسترالیا).

بەخشییە هەندێ لە دانیشتووانی وڵاتانی داگیرکراوی خۆی لە باکووری ئافریقادا. لە هەموو ئەو وڵاتانەدا دیموکراسیی پێشوەخت یەک بەرهەمی لێ کەوتەوە: حکوومەتی دیکتاتۆری.

گرتنەبەری میکانیزمی رۆژئاوایی بۆتە هۆی سەرهەڵدانی دیموکراسیی لیبرالی لە هەندێ وڵاتدا کە زۆر لە رۆژئاوا دوورن. بەڵام گرنگ ساتەوەخت و شێوازی دیموکراتیزاسیۆنە. زۆربەی ئەو وڵاتە جیهان سێیەمییانەی کە دوابەدوای بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و لە ناو هەژاری و شێواویدا دەستیان دایە دیموکراتیزاسیۆن، لەیەک دەیەدا بەرەو دیکتاتۆری گەڕانەوە. گەورە تویژەری دیموکراسی لە زانکۆی کۆلۆمبیا، جۆوانی سارتۆری، سەبارەت بە شێوازی تێپەرین لە لیبرالیزمی یاساخوازەوە بۆ دیموکراسی دەڵێت: «ناتوانین ئەم رێگایە بە باری پێچەوانەدا ببڕین». تەنانەت ئەو وڵاتە ئەوروپییانەی مۆدێلێکی جیاواز لە مۆدێلی ئەنگلۆ ـ ئەمریکاییان گرتە پێش ـ واتە سەرەتا باڵادەستیی یاسا و سەرمایەداری ، ئینجا دیموکراسی ـ زۆر کەمتر توانیویانە لە دامەزراندنی دیموکراسیی لیبرالیدا سەرکەوتووبن. بۆ تێگەیشتن لە کێشەکانی دیموکراتیزاسیۆنی پێشوەخت باشتر وایە ئاوڕێک بدەینەوە لە دڵی ئەورووپا لە سەدەی بیستەمدا.

## بەشی دووەم

## ڕێگای پڕ هەوراز و نشێو

لە سەروبەندی سەدەی بیستەمدا ڤیەنا مێترۆپۆلێکی ڕووناک بوو و سیمایەکی جیهانیی لێ نیشتبوو، لە هونەردا پێشەنگ بوو و لە سیاسەتدا پڕ جەسارەت. لەم تاکە شارەدا ریشار شتراوس و گۆستاڤ مالێر مۆسیقایان بەرهەم دەهێنا، گۆستاڤ کلێمت و ئێگان شیلە نیگاریان دەکێشا، ڕۆبێرت مۆزیل و ئارتۆر ئێشنیتلێر چیرۆکیان دەنووسی، تیۆدۆر هێرتسێڵ لە ڕۆژنامەکاندا وتاری ئەنووسی، زیگمۆند فرۆید دەروونشیکاریی دەکرد و لیۆن ترۆتسکی لە کافتریاکاندا سەرقاڵی ئاخافتن بوو. ڤیەنا بە کافتریاکانیەوە ناسرابوو، ڕۆشنبیرانی ئەورووپای ناوەندی لەوێدا لە دەوری یەکدی کۆ دەبوونەوە، جگەرەیان دەکێشا، دەیانخواردەوە و دەکەوتنە دیالۆگەوە. لە بەهاری ١٨٩٥ و لە یەکێک لە کافتریاکاندا ـ ڕەنگە لانتمان ـ زیگمۆند فرۆید جگەرەیەکی داگیرساند. هەروەک چۆن لە فرۆید چاوەڕوان دەکرێت ئەم جگەرەیە سەرووتر لە جگەرەیەکی ڕووت بوو. ئەم جگەرەیە مانای بەرزڕاگرتنی ئازادی، ئازادی لە بەرانبەر دیموکراسیدا.[١]

لە هەڵبژاردنەکانی مارسی ئەو ساڵەدا خەڵکی ڤیەنا ناسیۆنالیستێکی توندڕەویان بە ناوی کارل لوتگێر بۆ پۆستی شارەوانی هەڵبژاردبوو، بیروبۆچوونی سیاسیی ئەو پیاوە گەلێ ناشیرین و پڕمەترسی بوو. لوتگێر زۆرجار جوولەکەی بە کولە دەشوبهاند و دەیوت دەبێ وەکوو کوود ئاوێتەی خاکیان بکەین، یاکوو بیانکەینە کەشتییەکەوە و لە دەریادا بیانخنکێنین. ئیمپراتۆر فرانتس یۆزێفی یەکەم پێی وابوو هەڵبژێردرانی لوتگێر هەڕەشەیەکی جیدییە بۆ ئازادییە مەدەنییەکانی ڤیەنا، هەر بۆیە لە بڕیارێکی بێوێنەدا ئامادە نەبوو حوکمی دامەزرانی ئیمزا بکات. کلێسای کاتۆلیک کە کۆنە دامەزراوەی ئۆتۆریتەخوازی نەمسا بوو پشتیوانیی لەم هەڵوێستە کرد. ڕۆشنبیرانی ڤیەنا کەوتنە سەر دووڕیانێکی ناخۆش، ئەوان بە شێوەی سوننەتی دژ بە دامودەزگای پاشایەتی و کلێسا بوون، هەر بۆیە سەخت بوو پاڵپشتی لە کلێسا و پادشا بکەن و لە بەرانبەر خەڵکدا بوەستن. فرۆید

دەیویست لە بەردەم جەماوەردا ستایشی بڕیارەکەی ئیمپراتۆر بکات، هەر بۆیە جگەرەیەکی هەڵکرد، هەڵکردنی جگەرە هێمای سوننەتیی بەرزڕاگرتن و ئاهەنگگێڕان بوو.

کەس لوتگێری بە کەسایەتییەکی دیموکرات نەدەزانی، بەڵام ئەو راستەوخۆ لە ئاکامی پەرەسەندنی دیموکراسیی نەمسادا دەسەڵاتی گرتە دەست. لە نەمسای ١٨٦٠ و ١٨٧٠دا تەنیا دەوڵەمەندان و خوێندەوارانی چینی مامناوەندی مافی دەنگدانیان هەبوو، گەورەترین ئایدیالەکانی ئەم تاقمە بریتی بوو لە ئازادیی رادەربڕین، بالادەستبوونی یاسا و لیبرالیزمی ئابووری. تایبەتمەندیی جیهانیبوون و پێشەنگایەتیی ڤیەنا بەرهەمی مافی سنووورداری دەنگدان بوو. لە ١٨٨٠ و ١٨٩٠دا مافی دەنگدان رووبەرێکی بەربلاوتری گرتەوە و سەیر لەوەدایە لیبرالەکان لەسەر ئەم بابەتە پێداگر بوون، زۆرینەی پیاوانی گەورەساڵ (بالغ) ئەم مافەیان بەدەست هێنا و بەم شێوەیە کەشوهەوای نەمسا گۆڕانی بەسەردا هات. کرێکاران و وەرزێڕانی نۆدەسەڵات حەزیان لە ریفۆرمە مەدەنییە بۆرژواییەکان نەدەکرد و زۆر ئاسان دەکەوتنە ژێر کاریگەریی دروشمە توندوتیژەکانی دوو تویژەوە؛ سۆسیالیستەکان (کە خۆیان دەبەست بە کرێکارانەوە) و ناسیۆنالیستە توندرەوەکان (کە خۆیان دەبەست بە وەرزێڕانەوە). لوتگێر بە میتۆدێکی ژیرانە گەڵاڵەیەکی دارشت و هەردووک هزری ناسیۆنالیستی و کۆمۆنیستیی ئاوێتەی یەکتر کرد و ناوی سۆسیالیزمی مەسیحیی بۆ هەڵبژارد. ئادۆڵف هیتلەر لە تەشقی دەسەڵاتی لوتگێردا دانیشتووی ڤیەنا بوو و دواتر لە کتێبی *خەباتی من*دا ستایشی ئەو پیاوەی کرد، جێی سەرنجە کە لێکچوونێکی ئاشکرا و روون لە نێوان حیزبی ناسیۆنال سۆسیالیزمی هیتلەر و سۆسیال مەسیحیی لوتگێردا دەبینرێت.

خودی هیتلەریش بە رێگای هەمان ئەو دینامیزمە دیموکراتیکەدا هاتە سەر کار کە یارمەتیدەری لوتگێر بوو. هەندێجار دەڵێن سەرکەوتنی نازییەکان بەرهەمی بەختێکی کراوە یان کۆدێتایەکی نهێنی بوو. بەڵام لە راستیدا حیزبی نازی لە ١٩٣٠دا، واتە تەنیا یازدە مانگ دوای دامەزراندنی، لە مەیدانێکی سیاسیی قەرەباڵغدا لە سەدا ١٨ی دەنگەکان و بەمەش پلەی دووەمی بەدەست هێنا. لە ١٩٣٢دا دوو هەڵبژاردنی نەتەوەیی لە ئەڵمانیادا بەڕێوە چوو و ئەم حیزبە لە سەدا ٣٧ و ٣٣ی کۆی دەنگەکانی قۆستەوە بۆ خۆی و هەردووجار پلەی یەکەمی بەدەست هێنا (حیزبی سۆسیال دیموکرات بە پلەی دووەم لە سەدا ٢٠ و ٢١ی دەنگەکانی بەدەست هێنا). لە هەڵبژاردنە بەناوبانگەکەی ١٩٣٣دا حیزبی نازی لە سەدا ٤٤ی دەنگەکانی بەدەست هێنا، واتە بەقەدەر کۆی دەنگەکانی هەر سێ حیزبەکەی دوای خۆی، بەم شێوەیە بوو بە بەرپرسی دروستکردنی دەوڵەت.[٢] کۆماری وایمار کە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیلە ئەڵمانیادا رۆ نرابوو،

سیستەمێکی دیموکراتیکی ژیرانە بوو کە لەگەڵ ئازادیی چاپەمەنییەکان و هەڵبژاردنی دادپەروەرانەدا تەبا دەهاتەوە. حیزبی نازی ئەم پرۆسە دیموکراتیکەی بە ئاراستەی خۆڕێکخستن لە شار و شارۆچکەکاندا خستە گەڕ و کەڵکی زۆری لێ وەرگرت. هاوکات لەگەڵ قەیرانە یەک لەدوای یەکەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠دا کە ئەڵمانیای شپرزە کردبوو، دامەزراوە سوننەتییەکانی دەسەڵاتیش تووشی قەیرانی شەرعییەت هاتبوون. هێندە رووداوەکان تاڵ و نائومێدکەر بوون کە لیبرالیزم و بالادەستیی یاسا وەک کۆمەڵە چەمکێکی بێمانا و بێبایەخ دەکەوتنە بەرچاو. قەیرانە ئابوورییەکانی دەیەی ١٩٣٠ و ئاوسانی لەڕادەبەدەری ئابووری، جەماوەری ئەو وڵاتە و چینی مامناوەندییان تەنگاو خستبوو، هەر بۆیە بەتەواوی خۆیان سپاردە دەست بەڵێنەکانی هیتلەر کە بانگەشەی سەرکردایەتییەکی بوێرانە و ئاوەدانکردنەوەی سەرلەنوێی وڵاتی دەکرد. هەرچی دروشمەکانی هیتلەر رادیکاڵتر دەبوویەوە زیاتر لای خەڵک خۆشەویست دەبوو. جەک سنایدەر، بیرمەندی زانستە سیاسییەکان، لە توێژینەوە بەپێز و وردکارانەکەیدا لەسەر دیموکراتیزاسیۆن، ئاوەها ئەنجامگیرییەک ئەدا بەدەستەوەدەدا: «ناتوانین بڵێین سەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی ئۆتۆریتەخوازانەی رەگەزپەرستانە لە دواساڵەکانی کۆماری وایماردا سەرەڕای دیموکراتیزاسیۆنی ژیانی سیاسی هاتۆتە دی، بەڵکوو هۆکاری ئەم سەرکەوتنە دەقاودەق خودی ئەم دیموکراتیزاسیۆنە بوو».[٣]

پێکەوەنەگونجانی ئازادی و دیموکراسی ئەزموونێکی تاقانەی تایبەت بە ڤیەنا و وایمار نەبوو. لە کۆتاییی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا هەموو ئەورووپا بە سیاسەتی جەماوەری بارگاوی بوو و زۆرجاریش ئەم سیاسەتە سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا. ئیمپراتۆر فرانتس یۆزێف تەنیا دوو ساڵ توانیی لە بەرانبەر لوتگێردا بوەستێت، دواجار و دوای هەڵبژێردرانی بۆ چوارەم جار لە ١٨٩٧دا بە ناچاری و نابەدڵی حوکمی دەستبەکاربوونی لوتگێری ئیمزا کرد و لە رێورەسمێکدا وەک شارەوانی ڤیەنا رایگەیاند. نەریتی لیبرالیزمی دژەپاشایەتی (کۆماریخوازی) بەتایبەت دوای ١٨٧١ لە فەرەنسادا پەرەی سەندبوو، بەڵام لە دوو لایەنەوە کەوتە بەر هێرشی بێوچانەوە، هەم لە لایەن چەپەکانەوە (سۆسیالیستەکان) و هەم لە لایەن راستەکانەوە (پاشایەتیخوازان، ئەشراف و کڵێسا). چەند دەیە دواتر ئەم کێشەیە بەرۆکی بریتانیاشی گرتەوە، بریتانیایەک کە ئاخێزگە و مەڵبەندی سەرەکیی سیاسەتی مۆدێرنی لیبرالی بوو کەوتە بەر ئەو شەپۆلە و پارتی لیبرال کە سەردەمانێک حیزبێکی گەورە بوو لە ژێر گوشارەکانی حیزبی توندڕەوتری کرێکار و حیزبی سوننەتیتری پارێزگاریخوازدا کەوتە پەراوێزەوە و هەموو دەسەڵاتێکی لەدەست دا.[٤] هەرچی دیموکراسی زیاتر پەرەی دەسەند پرۆژەی لیبرالیانەی میانەڕەوانەی وەک مافە تاکییەکان،

ئابووریی بازاڕی ئازاد و باڵادەستیی یاسا زیاتر لە بەرانبەر هێزی راکێشەری کۆمۆنیزم، مەزهەب و ناسیۆنالیزمدا پاشەکشەی دەکرد و بەرەو سڕانەوە دەچوو.

سۆسیالیستەکان و ناسیۆنالیستانی تۆندڕەو تاکە بزوێنەری سۆزە پۆپۆلیستییەکان نەبوون. سەدری ئەعزەمی (راوێژکار) ئەفسانەییی ئەڵمانیا، ئۆتۆفۆن بیسمارک، لە ١٨٧١دا گەڵاڵەی مافی دەنگدانی بۆ هەموو پیاوان لە ئەڵمانیای تازە یەکگرتوودا خستە بەردەست، ئەو پیی وابوو بەرکورتکردنەوەی مافی دەنگدان مانای هەڵبژێردرانی لیبراڵە شارییەکان، واتە ئەو کەسانەی کە رەخنەگری دەسەڵاتی پاشایەتی بوون. بیسمارک دەیوت جەماوەر هەمیشە دەنگ بۆ پارێزگاریخوازانی لایەنگری پاشایەتی دەدەن، بۆچوونەکەی ئەو زۆر دروست بوو. هاوپەیمانی پارێزگاریخوازی بیسمارک لە بریتانیادا، پێنجەمین دیزراییلی، بە میتۆدێکی هاوشێوەی بیسمارک کۆنسێرڤاتیستەکانی رازی کرد پشتیوانی لە یاسای دووەمی ریفۆرم (١٨٨٣) بکەن، بەپێی ئەم یاسایە مافی دەنگدان دەبەخشرایە زۆرینەی پیاوانی گەورەساڵ (باڵغ)ی بریتانیا. ئەڵبەت دەستەبژێرانی کۆنسێرڤاتیست بۆ بەدەستهێنانی دەنگی چینی کرێکار و رەعیەتە نۆدەسەڵاتەکان دەبا سەرنج و دڵیان بۆ لای خۆیان رابکێشایە.

لەمەوبەدوا بیسمارک و جێنشینانی لە هەموو هەڵبژاردنەکاندا هێزی کاریگەری ناسیۆنالیزم و هەموو هێما نەتەوەییەکانیان بەکار دەهێنا. ئەم میتۆدە سەرکەوتنی مسۆگەر کردن: ئەوان هەموو هەڵبژاردنەکانیان بردەوە. لە راستیدا چینی مامناوەندیش تووشی دوودەستەیی هاتبوو، هەندێکیان بوونە هاوپەیمانی ئەو کۆنسێرڤاتیستانەی بە شانازییەوە خەڵکیان بانگهێشتی وڵاتی باوکی دەکرد و هەندێکی دیکەشیان لەسەر هزری لیبراڵیی خۆیان وەفادار مانەوە. دەستەبژێرانی سیاسیی ئەڵمانیا لە پێناو کۆکردنەوەی دەنگی ئەم تازە دەنگدەرانەدا رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر تاکتیکی ترساندن و تۆقاندن و سیاسەتی دووبەرەکیخستنیان بە کار دەهێنا. سیمای سۆسیالیستەکان و کاتۆلیکەکان و هەموو «دوژمنانی رایش» دەگۆڕدرا بۆ سیمایەکی تۆقێنەر و دەکەوتنە ژێر زەخت و گوشار و دەستگیرکردنەوە. پێداویستیی ئەم ستراتیژە دیاریکردن و چۆنیەک لەقەڵەمدانی دوژمنانی دەرەکی و ناوخۆیی بوو. سیاسەتمەداران بە پێویستیان دەزانی پاڵپشتیی لۆبییە دەسڕۆیشتووەکان، بۆ نموونە لۆبییەکی وەک سەندیکای هێزی دەریایی، بۆ خۆیان رابکێشن، هەر بۆیە بەردەوام بەرەو میلیتاریزم و دروستکردنی چەک و چۆڵی هێرشبەرانە هەنگاویان دەنا و بەرژەوەندیی نەتەوەییان گرێ دەدا بە میتۆدگەلی پەرەپێدەرانە و هێرشبەرانەوە. ئەم رەوتە دواجار بوو بە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵە سیاسەتێکی نابەرپرسیارانە کە لە ناوخۆی وڵاتدا بەگەرمی پێشوازییان لێ دەکرا و تا رادەیەک هۆکاری تێوەگلانی ئەورووپا بوو لە شەڕی گشتگیری ١٩١٤وە.

## بۆچی ئەڵمانیا بریتانیا نەبوو؟

لە ئەڵمانیا دیموکراسی، راستەوخۆ ئازادیی لێ نەکەوتەوە، بەڵکوو تەنیا دوای ئەوەی کەوتە بەر چەندەها هەژان و گۆڕانکاریی قووڵەوە - واتە شکستخواردن لە جەنگیدووەمی جیهانیدا و دوابەدوای ئەمەش داگیرکردنی ئەو وڵاتە و پارچەپارچەکردنەوەی و دواجاریش داسەپاندنی تەکووزییەکی نوێ لە لایەن هێزە دەرەکییەکانەوە - ئەڵمانیای رۆژئاوا گۆڕدرا بۆ کۆمەڵگایەکی لیبرال - دیموکراتیی راستەقینە و تەواو. بەڵام وەک زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا، کۆمەڵگای ئەڵمانیایش هەڵگری چەندەها توخم و هێزی بەرجەستە و دیاری لیبرال و پێشکەوتنخواز بوو، ئەم دیاردەیە بەتایبەت لە سەردەمی بیسمارک و قەیسەر ویلهێڵمی یەکەمدا دەبینرا.[٥] لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا دوو جۆر نەریت لە شەڕدا بوون: لیبرالیزم و ئۆتۆریتەخوازیی پۆپۆلیستی لە شێوەکەی هیتلەر و لوتگێر. لە نیوسەدەی یەکەمی سەدەی بیستدا لیبرالیزم لەخشتە برا و لە نیوسەدەی دووەمیشدا ئۆتۆریتەخوازیی پۆپۆلیستی تووشی داڕووخان هات و پەردەی لەسەر هەڵماڵرا. ئەم تێکهەڵچوونە بوو بە هۆی ئەوەی زۆربەی وڵاتانی ئەورووپی بە رێگایەکی پڕهەوراز و نشێو و خوێناویدا رێگای دیموکراسیی لیبرالی بپێون، ئەم رێگایە زۆرجار لە نێوان شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکان و فاشیزم و شەڕەوە تێپەڕیوە. ئەڵبەت هەندێ وڵاتی وەک دانمارک، بەلجیک، هۆڵەندا و وڵاتانی ئێسکاندینافیا لەبەر هەندێ هۆکاری هاوشێوەی بریتانیا (بۆ وێنە سەرهەڵدانی پێشوەختی سەرمایەداری) سەرچەشنێکیان گرتەبەر زۆر لە مۆدێلی بریتانییەوە نزیک بوو. بەڵام وڵاتانی گەورەی ئەوروپا - ئەڵمانیا، نەمسا، هەنگاریا و فەرەنسا - مێژوویەکی پڕئاژاوەتر ژیاون. ئەڵبەت دەتوانین خودی ئەم بابەتە بکەینە رێگایەک بۆ ناسینی کێشەکانی ئەوڕۆی دیموکراتیزاسیۆن، چونکو لە دونیای ئێستادا کەمتر وڵاتێکمان هەیە هەڵگری ئاوێتەیەک لەو تایبەتمەندییە تایبەتییانە بێت کە بەرهەمهێنەری دیموکراسیی لیبرالی بوون لە بریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکاندا. بەڵام رەنگە هەندێ لە وڵاتانی ئاسیا، ئەمریکای لاتین و ئافریقا هەڵگری بەشی هەرەزۆری ئەو تایبەتمەندییە رەنگاورەنگ و ئاڵۆزانە بن کە تا رادەیەک لە ئەوروپادا دەبینران. هەر ئێستا دەتوانین هەمان ئەو شێرزەییە لە دیموکراسییە تازەکانی جیهاندا ببینینەوە، شێرزەییەک کە تایبەتمەندیی دیار و تایبەتی بێرلین و ڤیەنای سەدەی بیستەم بوو.

توێژەران بە بەراوردکردنی بریتانیا بە وڵاتانی دیکەی ئەوروپا پرسیارێکی سانا و ساکار دەخەنە بەردەست. راڵف دارندۆرف، بیرمەندی زانستە سیاسییەکانی بریتانیا، لە ١٩٦٨دا بە

ئاشکرا ئەو پرسیارەی خستە رۆژەڤەوە: «بۆچی ئەڵمانیا بریتانیا نەبوو؟»[٦] ئەمە پرسیارێکی باش و بەکەڵکە، چونکوو رەنگە بتوانین بیکەینە دەرفەتێک بۆ تێگەییشتن لەوەی کە چۆناوچۆن لە دونیای مۆدێرن بەڵام ناکامڵدا دیموکراسیی لیبرالی دەستەبەر بکەین.

وەڵامی ئەم پرسیارە گەلێ ئاڵۆزە، بەڵام رەهەندێکی گرنگی هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستییەی کە ئەڵمانیا هەڵگری تایبەتمەندییە زۆر گرنگ و تاقانەکەی مۆدێلی بریتانیایی - واتە سەربەخۆبوونی بۆرژوازی لە رووی ئابووری و سیاسییەوە - نەبوو. بۆرژوازیی بریتانیا کە زادەی شۆڕشی پیشەسازی بوو و لە داوێنی بازرگانیی ئازاد و مافی موڵکداریدا گەورە بووبوو، لەگەڵ تەکووزیی کۆنی فیۆدالیدا کەوتە شەڕەوە و لەم شەڕەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بەم شێوەیە لەسەر بنەمای تایبەتمەندییەکانی خۆی سەرلەنوێ وڵاتی رێکخستەوە، وڵاتێکی بازرگانی، فرەخواز و برسی، پڕ جموجووڵ و کرژ و زیندوو. دەستەیەکی تازە لە دەستەبژێرانی بازرگان سەریان هەڵدابوو و ئەم وڵاتەیان گۆڕیبوو، ناپلیۆن بە زمانێکی گاڵتەجار دەیوت بریتانیا بۆتە «وڵاتی دوکانداران». لە بەرانبەردا ئەڵمانیا بە شێوەی سروشتی و خۆڕسک نەبوو بە وڵاتێکی پیشەسازی، بەڵکوو ئەمە دەوڵەت بوو کە بە سۆبسیدەکان، یاسا و رێساکان و دانانی پیتاکی گۆمرکی، وڵاتی بەرەو پیشەسازی دەبرد. هەر بۆیە بۆرژوازیی ئەڵمانیا بۆرژوازییەکی لاواز، لێکدابڕاو و گوێڕایەڵی دەوڵەت و فیۆدالە دەسەڵاتدارەکان بوو. مارکس چینی بازرگانانی ئەڵمانیای بە دەستەواژەیەکی سووک و هەرزان پێناسە دەکرد: «بۆرژوازییەک کە هیچ ئامانجێکی جیهانی و مێژوویی نییە».[٧]

ئەڵمانیا خاوەن نەریتێکی بۆرۆکراتیکی مێژوویی بوو کە ئاشکرا شانازیی پێوە دەکرد، دەوڵەتی ئەڵمانیا لە چارەسەرکردنی زۆربەی ئەو کێشانەدا کە پەیوەست بوون بە پیشەسازی و شارنشینییەوە - کێشەی وەک تەندروستی و داودەرمانی گشتی، گواستنەوە و مووچەی خانەنشینی - پێشکەوتووتر و کارامەتر لە هەموو وڵاتانی ئەورووپی جووڵابوویەوە. بەڵام ئاکامێکی خراپیشی بەدواوە بوو و توێژی کارداهێنی ئەڵمانیا لە باتیی پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان لە دەسەڵاتی دەوڵەت، بە حەزێکی زۆرەوە کەوتبوونە دوای وەرگرتنی مەدالیا و پلەوپایەی دەوڵەتی. هەر بازرگانێک نازناوی دەوڵەتیی «ئەفسەری بازرگانی»ی وەرگرتبا ئەوا شەرەفێکی گەورەی پێ برابوو. مێژوونووسێک بەم شێوەیە ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە: «خەڵک بە ئاواتی پێگە و شەرەفی چینی زەمینداراەوە نەبوون، ئەوان بەو خولیایەوە دەژیان ببنە ئەندامی ئەنجومەنی تەندروستی».

یان با ئاوڕێک لە جیاوازیی رۆڵی چاپەمەنییەکان بدەینەوە؛ لە بریتانیادا چاپەمەنییە ئازادەکان تریبۆنێکی گرنگی نارازییانی سیاسی بوون و زۆربەی رۆژنامەنووسان بە هەستێکی ئاگرینەوە سەربەخۆ لە دەوڵەت کاریان دەکرد. لە بەرانبەردا یەکەم رۆژنامەکانی پرۆس لە لایەن فرێدریشی

مەزنەوە و بە مەبەستی پڕوپاگەندەکردن بۆ دەوڵەت دامەزران. لە زۆربەی ساڵانی سەدەی نۆزدەدا چینی بازرگانی ئەڵمانیا لە باتیی ئەوەی بەدوای جێبەجێکردنی ریفۆرمە لیبرالییەکانەوە بن، لەگەڵ دەستەبژێرانی دەسەڵاتداری فیۆدالدا رێک دەکەوتن. بەم شێوەیە سەرەڕای ئەوەی ئەڵمانیا بوو بە وڵاتێکی پیشەسازی، کەچی بەمەشەوە هەر سیستەمێکی تێکەڵکرد بوو لە هەندێ توخمی کۆمەڵگای تازەسەرهەڵداوی بۆرژوازی و تەکووزیی کۆنی پێش پیشەسازی. رۆشنبیری لیبرال، فرێدریش نویمان، لە ساڵی ١٩٠٩دا سەبارەت بە «کۆمەڵگای پیشەسازیی ئەڵمانیا لە بەرگی سیاسیی دەوڵەتێکی زەمیندار»دا ئاوەهای نووسیوە: «بارودۆخی سیاسیمان تا رادەیەک لە کارگەیەکی پێشکەوتوو دەچێ کە لە بینا کۆنەکانی مەزرایەکدا ئاوا کرابێت. پێشکەوتووترین ئامێرەکان و ماشێنەکان کەوتوونەتە ژێر بنمیچێکی کۆنەوە و لقە ئاسنەکان کراونەتە نێو دیوارە قۆڕەکانەوە».

هێشتاکوو هەوساری دەسەڵات لە دەستی تەکووزیی کۆندا بوو. لە ١٨٩١دا لە سەدا ٦٢ی کۆی فەرمانبەرانی دامودەزگاکانی کاروباری ناوخۆییی پرۆس لە چینی ئەشراف بوون. لە دامودەزگاکانی پێوەندییەکانی دەرەوەدا ئەم رێژەیە گەلێ زۆرتر بوو. لە ١٩١٤دا ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەڵمانیا پێکهاتبوو لە ٨ شازادە، ٢٩ کۆنت، ٢٠ بارۆن، ٥٤ کەس لە وردە ئەشرافەکان و ١١ کەسیش لە خەڵکی ئاسایی.[٨] فەرەنساش کە خاوەن نەریتی دەوڵەتی بەهێز و کۆمەڵگای مەدەنیی لاواز بوو، لە رەوتی بەدواداچوونی دیموکراسیی لیبرالیدا رێگایەکی سەغڵەتی دووروودرێژ و پڕ هەوراز و نشێوی بڕی! ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەی بزووتنی بریتانیایان خێرا دەکردەوە لە فەرەنسادا لاواز بوون، چینی ئەشراف و بازرگانانی ئەم وڵاتە چینێکی وابەستە بوون. کتێبی *مێژووی ئابووریی ئەورووپا* (کەمبریج) بەم شێوەیە پێناسەی «تایبەتمەندییە باڵاکانی دەوڵەتی پەرلەمانیی بۆرژوازی» لە سەدەی هەژدەدا دەکات: باڵادەستبوونی یاسا، یەکسانبوون لە بەرانبەر یاسادا، موڵکداریی تاکی، کاروکاسبەتی ئازاد، ماف و ئازادییە مەدەنییەکان و هتد. ئینجا لە درێژەدا دەڵێت: «فەرەنسای پێش شۆڕش هیچکام لەم تایبەتمەندییانەی نەبوو».[٩] کەوایە ئەودەمەی، دوای شۆڕش فەرەنسا باوەشی بۆ دیموکراسی ئاوەڵا کردبوو، خاوەن نەریتێکی زیندووی لیبرالیزمی یاساخواز نەبوو، لە باتیی ئەوەی لە مەیدانی کردەوەدا ئازادی بپارێزرێت (بە جیاکردنەوەی دەزگاکان و بە هێزی دامەزراوە نادەوڵەتییەکانی وەک کۆمپانیا تایبەتییەکان، کۆمەڵگای مەدەنی و کلێسایەکی سەربەخۆ) تەنیا بە تیۆری لافی ئازادی لێ دەدرا. شۆڕشگێڕان بەتەواوی دژی ئەو بۆچوونەی مۆنتێسکیۆ بوون کە جەختی لەسەر دەوڵەتی بچووک و چەندلقی دەکردەوە. لە بەرانبەردا دەسەڵاتی رەهای پادشا بەبێ هیچ دەسکارییەک گوازرایەوە بۆ

«پەرلەمانی نەتەویی»ی تازەدامەزراو، هەر ئەم پەرلەمانە بوو کە دواتر بەهەزاران کەسی دەستگیر کرد و کوشتنی، دەستی بەسەر ماڵ و موڵکیاندا گرت و بە تاوانی بیروباوەڕی مەزهەبییان ئازاری دان و دۆسیەی بۆ کردنەوە، هەموو ئەم کارانەشی لە ژێر ناوی خەڵکدا بەڕێوە برد. هەندێ لە توێژەران بە دروستی نازناوی «دیموکراسیی تۆتالیتەری»یان بڕیوە بە بالای ڕژێمی ژاکووبێنیدا. ئەمە یەکەم نموونەی دیموکراسیی نالیبرالییە لە مێژووی مۆدێرندا.[١٠]

لە فەرەنسادا دەوڵەت بەرزتر لە کۆمەڵگا، دیموکراسی بەرزتر لە یاسامەندی و یەکسانی بەرزتر لە ئازادی دەنرخێنرا. هەر بۆیە سەرەڕای ئەوەی زۆربەی ساڵانی سەدەی نۆزدە فەرەنسا وڵاتێکی دیموکراتیک بوو و مافی دەنگدان و هەڵبژاردنی گەلێ بەربڵاو بوو، لیبرالبوونێکی ئەوتۆی پێوە نەدەبینرا. بە دڵنیاییەوە بەقەدەر بریتانیا و ئەمریکا پارێزەری ئازادیی تاکی نەبوو. ئیمپراتۆر لویی ناپلیۆن کە لە نێوان ساڵانی ١٨٤٨ تا ١٨٧٠دا دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو، هێمای سیستەمی تێکەڵکردی فەرەنسا بوو. ئەو لە ڕێگای ڕاگرتنی ڕەزامەندیی گشتی و هەڵبژاردن و ریفراندۆمەوە دەسەڵاتی بەڕێوە دەبرد، بەڵام لە هەمان کاتدا بۆ سەرکوتکردنی ئازادیی بیرکردنەوە، ڕادەربڕین و کردەوە لە میتۆدەکانی دەوڵەتی پۆلیسی کەڵکی وەردەگرت. دواجار کۆماری سێیەمی فەرەنساش وەک زۆربەی ئەزموونە لیبرالییەکانی ئەوروپا لەبەین چوو. دواجار و دوای جەنگیدووهەمی جیهانی، واتە ١٥٠ ساڵ دوای شۆڕش و تێپەڕاندنی دوو ڕژێمی پاشایەتی، دوو ئیمپراتۆری، پێنج سیستەمی کۆماری و دیکتاتۆرییەکی سەرەتاییی فاشییانە، هەم لیبرالیزمی بەدەست هێنا و هەم دیموکراسی. تەنانەت ئەمڕۆیش فەرەنسا لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتێکدایە کە شارل دۆگۆڵی دامەزرێنەری بە دەربڕینێکی ستایشئامێز ناوی نابوو دەوڵەتێکی «پاشایەتیی هەڵبژێردراو و دیموکراتیک».

## تا رادەیەک دیموکراتیک

وڵاتانی ئەوروپا تایبەتمەندییەکی دیکەشیان هەبوو کە وەک ڕەهەندی پۆزەتیڤ بۆیان لەقەڵەم دراوە، ئەمە تایبەتمەندییەک بوو کە هەڵگری تۆوی دیموکراسیی لیبرالی بوو. هەرچەند زۆرجار نەریتی لیبرالی تووشی شکست و دۆڕان دەهات بەڵام هەمیشە ئامادەی مەیدانەکە بوو، تەنانەت لە ئەڵمانیادا کە لە ساڵانی ١٩٣٠دا دوچاری چەواشەبوونێکی قووڵ هات و بە لاڕێدا چوو. لە ڕاستیدا ئەم نەریتە بەتایبەت لە ئەڵمانیادا دەژیا، لە نزیکەی ١٩٠٠دا زۆرێک لە چاودێرە بەرجەستەکان ئەڵمانیایان بە پێشکەوتووترین وڵاتی دونیا لەقەڵەم دەدا. ئەم وڵاتە خاوەن یاسای بنچینەییی مۆدێرن و نووسراو بوو، هەروەها سیستەمێکی بەڕێوەبەرایەتیی زۆر پێشکەوتووی لە هەموو ئاستەکاندا هەبوو و یەکەم دەوڵەتی ئاسوودەی دامەزراندبوو. ئەڵمانیا خاوەن کولتوورێکی سیاسیی

لیبرالی بوو و له هەندێ شاری وەک بێرلیندا جۆرە تێگەیشتنێکی هونەری و جوانیناسانەی ئاوانگارد دەبینرا. له ١٨٨٧دا یەک له توێژەرانی ناسراوی ئەمریکایی له بواری زانستی سیاسیی بەراوردکارانەدا ـ وۆدرۆ ڤیلسۆن[٣٥] ـ که ئەوکات مامۆستای زانکۆی پرینستۆن بوو، ستایشی پرۆسی دەکرد لەبەر «سیستەمە سەرنجراکێشەرەکەی... رێکوپێکترین سیستەم به کەمترین کەموکورتییەوە»، «...ئەم سیستەمە، بۆرۆکراسییە خۆبەزلزان و نابەرپرسیارەکان دەگۆڕێت و دەیانکاتە هۆکاری حکوومەتی دادپەروەرانە».[١١] (تارۆزێکی سەیری مێژوویيە که هەمان ڤیلسۆنی گەورەستایشکەری ئەڵمانیا، دواتر ئەمریکای بەرەو شەڕی ئەم وڵاتە راکێشا). لەو سەردەمەدا زۆربەی بیرمەندانی زانستە سیاسییەکان ئەڵمانیایان بەرزتر له بریتانیا دەنرخاند، چونکوو پێیان وابوو سیستەمی سیاسیی بریتانیا سیستەمێکی تەواو سانتراڵە، دەسەڵاتێکی زۆر گەورەی بەخشیوەتە ئەنجومەنی عەوام، ئەنجومەنی لۆردە سواوەکانی پڕە له لۆردی سەیروسەمەر، خاوەن یاسای بنچینەیی نووسراو نییە و نەریتە رەمزاوییەکانی بەر بە هەرچەشنە نوێگەرییەک دەگرێت.

له سەرەتای سەدەی بیستدا به رواڵەت ئەڵمانیا بۆ دەستەبەرکردنی دیموکراسی رێگایەکی دروستی هەڵبژاردبوو. پاشان جەنگی یەکەمی جیهانی قەوما و دوو ملیۆن مرۆڤی ئەڵمانی هاتنە کوشتن و وڵات وێران کرا، دواجاریش به ئاشتینامەی تەمێکارانە و سووکەسەرانەی ڤێرسای کۆتایی پێهات. ساڵەکانی دوای رێکەوتننامەی ڤێرسای یەکانگیر بوو لەگەڵ کۆڕەوی بەلێشاوی خەڵکانی به رەگەز ئەڵمانی له پۆڵۆنیا و رووسیا و وڵاتانیتری رۆژهەڵاتەوە و گەڕانەوەیان بۆ ئەڵمانیا (که ئەم کۆچکردنە بوو به هۆی سەرهەڵدانی چەندەها کێشە و ئاژاوەی کۆمەڵایەتیی گەورە گەورە)، هەروەها هاوکات بوو لەگەڵ ئاوسانی قووڵی ئابووری و دواجاریش «قەیرانی گەورە»ی ئابووری رووی دا. تایبەتمەندییە لیبرالییەکانی کۆمەڵگای ئەڵمانیا بزر بوون و له باتیی ئەوان کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی درێو و زۆر ناشیرین جێگیر بوون و تەکووزیی سیاسی داڕووخا. گرانی و ئاوسانی قووڵ پاشەکەوتە داراییەکانی چینی مامناوەندیی بەتەواوی لەناوبرد و ئەمەش بێزارییەکی گەورەی لای ئەوان بەرانبەر به کۆماری وایمار دروست کرد. نایاڵ فێرگۆسێن به دروستی ناوی ئەم ئاوسانە ئابوورییەی ناوە «شۆڕشی دژەبۆرژوازی». بەم شێوەیە و زۆر ئاسان ئەڵمانیا بوو به قوربانیی ئایدیۆلۆژیا و سەرکردە توندڕەوەکانی. زۆرجار خوێندنەوەی هەڵە بۆ مێژوو دەکرێت و ئەو گریمانەیە دەخەنە بەردەست که دەبا ئەڵمانیا هەر بەو دەردە رۆیشتبا که هیتلەر بردی و ئەمە قەدەرێک بوو به نێوچەوانی ئەو وڵاتەوە. بەڵام تەنانەت بریتانیا و ئەمریکایش

---

٣٥ . سەرۆککۆماری ئەمریکا له نێوان ساڵانی ١٩١٣ تا ١٩٢١دا. و.ف

ڕەهەنـدی درێـو و نـاحەز و دیماگۆژیسـتانی تینـووی دەسـەڵاتی تـایبەت بە خۆیـان هەبـوو کە لە سەردەمی قەیرانی گەورەدا بەردەوام بەهێزتـر و بەهێزتـر دەبـوونەوە. بگـرە ئەگەر ئەوانـیش (وەک ئەڵمانیا) ڕووبەڕووی قۆناغێکی پڕ لە شکستی بیست ساڵە، سـووکایەتیپێکردن، قەیرانـی ئـابووری، بشـێوی و تـوانەوەی چینـی مامناوەنـدی بـووایەنەوە، دواجـار هەر ئەم چارەنووسـە ژیابـان و دیماگۆژیستانی وەک هیوی لانـگ[٣٦] و ئاسـواڵد مـوزلی[٣٧] لە بـاتیی سیاسـەتمەدارانی وەک فـرانکلین ڕۆزفێلت و وینستۆن چێرچیل جڵەوی دەسەڵاتیان بگرتایەتە دەست.

جـەنگی یەکـەمی جیهـانی بـوو بە هـۆی ڕووخـانی پادشـاکان لە زۆربەی ئەورووپـادا، بەڵام لە هەمانکاتـدا وێرانکـارییەکی هێنـد گەورەی لـێ کەوتەوە کە زەمیـنەی بـۆ سـەرهەڵدانی فاشـیزم و دیکتاتۆری لە وڵاتانی ئەورووپادا خۆش کرد. لە ساڵانی ١٩٣٠دا لە هەردوو قوڵەوە هێرش کرایە سەر لیبرالیـزم، لە ڕاسـتەوە فاشیسـتەکان و لە چەپەوە کۆمۆنیسـتەکان، لەم نێـوانەدا هەنـدێکیان دیموکراسـییان کـردە پردێـک بـۆ لەنـاوبردنی لیبرالیـزم. پێویسـت بـوو جـەنگێکی دیـکە قەومابـا (جەنگیـدووهەمی جیهـانی) تـاکوو دیماگۆژیسـتان بـۆ دواجـار تێـک بشـکێنێ. دوای ١٩٤٥ و بە یارمەتیی دەست و دڵبازانەی ئەمریکا، ئەورووپا بەرەو ڕۆنانی تەکووزییەکی نوێی سیاسـی هەنگـاوی هەڵگرت و لە پەنجا ساڵدا وەها سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا لە باوەڕی کەسدا نەدەگونجا.

هەڕەشەی قۆلی ڕاست لەسەر دیموکراسیی لیبرالی ـ سەرەتا فیۆداڵەکـان و دواتـر فاشیسـتەکان ـ تـا سـاڵی ١٩٤٥ تـا ڕادەیەکـی زۆر ڕەوییـەوە (ئەڵـبەت جیـا لە نیمچـە دوورگەی ئیبریـا، بەڵام فرانسیسـکۆ فرانکۆی ئیسپانیایی و ئانتۆنیۆ سالازای پورتەگاڵی هیچکامیان بەدوای بەربڵاوکردنەوە و هەنـاردنی شـێوە دەسەڵاتی خۆیانەوە نەبوون). پاشان دیموکراسی لە لایەن حیـزبە چەپـگەرا کۆمۆنیسـتەکانەوە کەوتە بەر هەڕەشەوە کە زۆربەیـان لە ژێـر چەتـری پشـتیوانیی مۆسـکۆدا بـوون. بەڵام دواتـر هاوپەیمـانیی ئەورووپـا تـوانی بەسـەر ئەم درنـجەدا سـەرکەوێت و کـۆنترۆڵی بکـات. دوای ئەم قۆنـاغە ئـاڵوگۆڕێکی سـەیر هـاتە قەومان کە زۆر نەکەوتە بەر سـەرنجەوە. ئەورووپـای ڕۆژئـاوا کە بەدرێژاییـی دوو سـەدە بووبـووە مەیـدانی ململانێـی نێـوان لیبرالیـزم و ئایـدیۆلۆژیا تونـدڕەوەکانی چەپ و ڕاسـت، بە شـێوەیەکی هێمنـانە و بەبـێ ڕاگەیاندننامەی پڕهەراوهوریا، بەرەو سیاسەتی میانەڕەوانە و یاساخوازانە هەنگاوی هاوێشـت. مـارک لـیلا، توێژەری زانکۆی شیکاگۆ، ئەم پرۆسەیە بە «ئەو شۆڕشە مەخمەڵینەکەیتر» دەشوبهێنێ و دەڵێت:

---

٣٦ . پارێزگاری ولایەتی لوییزیانا و سێناتۆری ئەمریکایی لە سەرەتای سەدەی بیستدا کە سیاسەتمەدارێکی دیماگۆژ بوو و لوییزیانای بە میتۆدگەلی دیکتاتۆرانە بەڕێوە دەبرد. و.ف

٣٧ . سیاسەتمەداری بریتانیایی لە سەدەی بیستەمدا کە سەرۆکی یەکێتیی فاشیستانی ئەم وڵاتە بوو، ئەم تاقمە دژە جوولەکەیە لایەنگری نازییەکان بوون. و.ف

ئێستا کە ئاوڕ لە رابردوو دەدەینەوە لەو راستییە دەگەین کە چەند هۆکار و رووداوی وەک پەیماننامەی ئاشتی کە لە ژێر چاودێریی ئەمریکادا بەڕێوە برا، ئەو سەروەت و سامانەی بەرهەمی سێ دەیە گەشەی ئابووریی بێوێنە بوو و دواجار پەرەسەندنی دەوڵەتی ئاسوودە، پێکڕا بوونە هۆی رووخانی پێگەی سوننەتیی حیزبە چەپەکان لە ناو چینی کرێکاردا... ئێستە دانەبەدانەی وڵاتانی رۆژئاوای ئەورووپا بوونەتە خاوەن دەوڵەتی بچووککراوەی یاساخواز، دەزگای سەربەخۆی دادوەری، هەڵبژاردنی چەندحیزبی، مافی دەنگدانی هەموان، کۆنترۆڵکردنی ئارتەش و پۆلیس لە لایەن غەیرە نیزامییانەوە، مافی ئازادیی کۆڕ و کۆبوونەوە، ئازادیی بەندایەتی و عیبادەت، چینێکی بەربڵاوی مامناوەندی و ئابوورییەکی پێشکەوتوو لەسەر بنەمای بەکاربردن. سەرەڕای ئامادەبوونی چەندەها حیزبی ناسیۆنالیست و ناوچەگەرای تازە، سەرەڕای کڵپەسەندنی توندوتیژیی ئێتنیکی و سەرەڕای هەموو باسوخواسە پڕئاژاوەکان سەبارەت بە پەنابەری، هیچکام لە دەوڵەتانی ئەورووپای رۆژئاوا بەرەورووی قەیرانی شەرعییەت - هاوشێوەی ئەو قەیرانەی هەموو دەوڵەتە لیبرالییەکانی ١٩٢٠ی گرتبۆوە - نەبوونەتەوە.[١٢]

دواهەمین وڵاتانی ئەورووپای رۆژئاوا کە لە دەیەی ١٩٧٠دا بەتەواوی بوونە وڵاتی دیموکراتیک، سێ وڵاتی یۆنان و ئیسپانیا و پورتوگاڵ بوون. شۆڕشەکانی ١٩٨٩ دواپەردەی شانۆی لیبرالیزمی ئەورووپایی بوون. زۆربەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئەورپا لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوای ئەورووپادا پێشینەی مێژوویی هاوبەشیان هەیە، بەڵام لە بەختی رەشیان چارەنووسیان بە بارێکیتردا گەڕا و لە ١٩٤٥دا ئارتەشی سوور «ئازاد»ی کردن و توندی بەندیخانەی ئیمپراتۆریای کۆمۆنیزمی کردن. ئێستە کە ئاوڕ لە رابردوو دەدەینەوە تێدەگەین ئەو هێزانەی یارمەتیی دان دژی سۆڤییەت بجەنگن، هەمان ئەو هێزانە لە رەوتی لیبرالیزەکردنی کۆمەڵگاکەشیاندا یارمەتیدەریان بوون. هێزە ناسراوەکانی ئەم چیرۆکە بریتین لە: کلێسا و سەندیکا کرێکارییەکان لە پۆڵۆنیادا، گرووپەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە چیکۆسلۆڤاکیادا، دەستەبژێرانی ریفۆرمخواز لە هەنگاریادا و هەروەها چینێکی بچووکی مامناوەندی لە هەر سێ وڵاتەکەدا. ئەم وڵاتانە کە خۆیان لە دەستی سۆڤییەت رزگار کردبوو، زۆر خێرا بەرەو سەقامگیرکردنی دیموکراسیی لیبرالی هەنگاویان نا و ئەم هەزرەش بەقووڵی بە هەناویاندا رۆچوو. رەوتی هەنگاونانی وڵاتانی کۆمۆنیستیی پێشوو، وەک رۆمانی و بولگاریا، بەرەو دیموکراسیی لیبرالی هێشتاکوو رەوتێکی سەخت و دژوارە و بە قۆناغێکی سەغڵەتدا تێدەپەڕن، ئەڵبەت هەندێکیان لەوانیتر سەرکەوتووتر بوون. بەڵام دوای تێپەڕینی دەساڵ و وردەیەک بەسەر رووخانی کۆمۆنیزمدا، جۆرج بووشی باوک وتەنی، ئەورووپا گەشتۆتە بەردەم سنووری خولیاییەکانی «یەکگرتن و ئازادی».

## سەرمایەی نەتەوەکان

هیچ وڵاتێک ناتوانێ مێژوویەکی نوێ بۆ خۆی چێ بکات بەڵام دەتوانێ داهاتووی خۆی بگۆڕێت و دەرفەتی زیاتر بۆ بەدەستهێنانی دیموکراسیی لیبرالی بخولقێنێ. هەنووکە لە کردەوەدا گەورەترین کێشەی بەردەم وڵاتێکی روو لە گەشە و بگرە تەنانەت وڵاتێک بە داهاتی مامناوەندییەوە لە ئەمریکای لاتیندا، گەیشتنە بە دیموکراسییەکی رەسەن و راستەقینە. بۆ ناسینی باشتری ئەگەرەکانی سەرکەوتنی ئەم وڵاتانە پێویستە هەڵگەڕێینەوە بۆ مێژوو و لەو سۆنگەیەوە لەو پرسیارە را بمێنین کە هۆکارە پێکهێنەرەکانی دیموکراسیی لیبرالی کامانەن؟

ساکارترین شرۆڤە بۆ سەرکەوتنی سیاسیی دیموکراسییەکی تازەی سیاسی بریتییە لە سەرکەوتنی ئابووری، یان بە زمانێکی روونتر بەرزبوونی رێژەی داهاتی سەرانەی نەتەوەیی[38]. سیمۆر مارتین لیپێست، بیرمەندی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، لە ١٩٥٩دا خاڵێکی سادە بەڵام گرنگی دەستنیشان کرد: «هەرچی ئاستی خۆشگوزەرانی لە وڵاتێکدا بەرز بێت، زیاتر دەتوانێ دیموکراسی بپارێزێ و پتەوی بکاتەوە».[١٣] لیپێست پێی وایە هەرکات وڵاتێک لەڕووی ئابوورییەوە دەبووژێتەوە کۆمەڵگاکەیشی لە ناو خۆیدا وزە و دەرفەت بۆ بەڕێوەبردنی لیبرالییانە و دیموکراتییانەی خۆی دەخولقێنێ. ئەم تێزەی لیپێست چەندەها قوتابخانە و دژەقوتابخانەی جۆراوجۆری لێ کەوتەوە. دوای چل ساڵ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە، هەرچەند هەندێ پیاچوونەوەی تێدا کراوە و چەند مەرجێکی پێ زیاد کراوە، بەڵام خاڵی سەرەکیی ئەم تێزە هێشتا هەر وەک خۆی ماوەتەوە و زیندووە.

ئەڵبەت هەندێ لە وڵاتانی هەژاریش دیموکراسییان بەدەست هێناوە، بەڵام بەزۆری ئەو وڵاتانەی بە رێژەیەکی خوار و بچووکی گەشەسەندنەوە دیموکراسی سەقامگیر دەکەن، دیموکراسییەکەیان زۆر ناخایەنێت (چەند نموونەیەکی ئاوارتەمان هەیە، بۆ وێنە هیندستان کە دواتر بە چڕوپڕی دەیخەینە بەر باس). رێکوپێکترین توێژینەوەی ئاماری لەم بارەیەوە لە لایەن دوو بیرمەندی زانستە سیاسییەکانەوە، ئادام پرژیۆرسکی و فێرناندۆ لیمۆنگی، ئەنجام دراوە. ئەوان هەموو وڵاتانی جیهانیان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٠ تا ١٩٩٠دا خستۆتە بەر شیکارییەوە. بەپێی ئەم توێژینەوەیە ئەگەر رێژەی داهاتی سەرانەی وڵاتێکی دیموکراتیک کەمتر لە ١٥٠٠ دۆلار بێت (بە دۆلاری ئەمڕۆ) تەمەنی رژێمی ئەو وڵاتە بە شێوەی مامناوەندی[39] زیاتر لە هەشت ساڵ بڕ ناکات. ئەگەر داهاتی سەرانە بگاتە ١٥٠٠ـ٣٠٠٠ دۆلار ئەم رێژەیە بەرز دەبێتەوە بۆ هەژدە ساڵ و ئەگەر سەرتر لە ٦٠٠٠

---

38. National percapita income

39.ناوین /average

دۆلار بێت ئەوا رژێمی دەسەڵاتدار زۆر بەهێز و پتەو دەبێتەوە. ئەگەری رووخانی سیستەمی دیموکراتیک لە وڵاتێکدا کە داهاتی سەرانە لە سەرووی ٦٠٠٠ دۆلارەوەیە، یەک بە پێنسەدە. دیموکراسیی دەوڵەمەند مەرگی پێ نامۆیە. ٣٢ رژێمی دیموکراتیک کە رێژەی داهاتی سەرانەیان ٩٠٠٠ دۆلار یان کەمێک زۆرترە، لەسەریەک ٧٣٦ ساڵ ژیاون و هیچکامیان نەرووخاون. لە بەرانبەردا لە کۆی ٦٩ رژێمی دیموکراتیکی هەژارتر، ٣٩ رژێمیان رووخان، واتە رێژەی مردنی ئەم رژێمانە لە سەدا ٥٦ بووە.[١٤]

بەم پێیە دەتوانین ئاوەها ئەنجامگیرییەک بەدەستەوە بدەین کە ئەگەر رێژەی سەراپای بەرهەمی سەرانەی[40] وڵاتێک ٣٠٠٠ـ٦٠٠٠ دۆلار بێت و هەوڵی رۆنانی دیموکراسی بدات، لەم کارەدا سەردەکەوێت. ئەمە رووبەری رۆنانی دیموکراسییە و تەنانەت لە درێژاییی مێژوویشدا دەبینرێت. رێژەی سەراپای بەرهەمی سەرانەی وڵاتانی ئەوروپایی لە ١٨٢٠دا، واتە لەو سەردەمەدا کە زۆربەیان یەکەم هەنگاوەکانیان بۆ پەرەپێدانی مافی دەنگدان هەڵگرتبوو، نزیکەی ١٧٠٠ دۆلار بوو (بە پێی دۆلاری ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٠٠دا) کە لە ١٨٧٠دا بوو بە ٢٧٠٠ دۆلار و لە ١٩١٣دا ٤٨٠٠ دۆلاری گرتەوە، ئەم بەرزبوونەوانە بەر لە وێرانکارییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی بوو.[١٥] ئەم زانیاری و ژمارە مێژووییانە لەسەر بنەمای چەندەها گریمانە و ئەگەری جۆراوجۆر دامەزراون، هەرچەند ئەم رێژانە ئاستە خوارووەکانی دەپێکێت، بەڵام بێگومان دەکەوتە نێو ئەو رووبەرەوە کە بۆ رۆنانی دیموکراسی پێویستە. هەروەها دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە زۆربەی ئەم وڵاتانە تەنیا دوای ١٩٤٥، واتە دوای ئەوەی کە توانیبوویان رێژەی بەرهەمی سەرانەیان بگەیەننە ٦٠٠٠ دۆلار، سیستەمێکی لیبرال دیموکراتیکی پتەویان دامەزراند. ئەگەر ئاوڕێک لە نموونە سەرکەوتووەکانی سی ساڵی رابردوو بدەینەوە، نموونەکانی دوای ئیسپانیا و یۆنان و پورتوگاڵ، تێدەگەین کە نزیک بە هەرهەموویان لە ساتەوەختی بەدەستهێنانی دیموکراسیدا رێژەی داهاتیان گەلێ لە رێژەی لانی زۆری رووبەری سەرانە نزیک بوو. لە ناو وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئەورووپادا، لە دوای ١٩٨٩وە ئەوانەیان وا رێژەی داهاتیان گەشتبووە ئاستە بەرزەکانی ئەو رووبەرە ـ واتە پۆلۆنیا و کۆماری چیک و هەنگاریا ـ توانییان زۆر خێرا دیموکراسیی خۆیان بەهێز و پتەو بکەنەوە. ئەوانەشیان کە رێژەی داهاتیان لە خوارترین ئاستی ئەو رووبەرە و خوارترەوە بوو ـ رۆمانی و ئاڵبانی ـ پێویستە زەمەنێکی دوورودرێژتری بۆ تەرخان بکەن. کەوایە تەنانەت لە ئەورووپا و تەنانەت لە درێژاییی مێژوویشدا ئەم پێوەندییە دووقۆڵییە دەبینرێت. هیچ هۆکارێکی تاقانەمان نییە بتوانێ کۆی چیرۆکەکەمان بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی هەژماری ئەو وڵاتانەی شیکارییان بۆ کراوە ـ

40. Gross percapita product

بە سەرنجدان بەوەی کە هەرکامەیان دەکەونە کیشوەرێکەوە و چەندەها کولتووری جیاوازیان هەیە و لە قۆناغی مێژوویی جیاوازدا ژیاون - هیچ شتێکیتر نییە بتوانێ بەقەدەر ئەو هۆکارە سادەیە - واتە بەرهەمی سەرانەی ناوخۆیی - بابەتەکانمان بۆ روون بکاتەوە.

رەنگە جەختکردنی فراوانم لەسەر بەرهەمی سەرانە سەر لە خوێنەر بشێوێنێ و پێی وابێ رۆڵی سەرکرادایەتیی سیاسیم لە رەوتی خەبات لە پێناوی دیموکراسیدا بە هەند نەگرتووە، بە هیچ شێوەیەک ئەمە راست نییە. هیچ رەوتێکی سیاسی نییە بتوانێ بەبێ سەرکردە و بزاڤی ئازادیخوازی پێداگر و شێلگیر سەرکەوتن مسۆگەر بکات. کەسانی وەک واسلاو هاوێل، نێلسۆن ماندێلا، لێخ واڵسا و کیم دای جۆنگ جێگایەکی بەرز و باڵایان لە مێژووی ئازادیدا هەیە. بەڵام پێویستە بە میتۆدی زانستی شرۆڤەی هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەم سەرکرادانە بکەین. یەک لە نووسەران بە تووڕەییەوە بەرپەرچی ئەو بابەتەی داوەتەوە و پێی وایە دیموکراسیی کۆریای باشوور بەرهەمی داهاتی سەرانە نەبوو بەڵکوو بەرهەمی «ئیرادەی ئەخلاقی»[١٦] بوو. بێگومان ئەمە راستە، بەڵام بە دڵنیاییەوە لە ئۆگاندا و بێلاڕووس و میسریشدا پیاوان و ژنانی بە ئاکار و پێداگرمان هەبوو کە هەوڵەکانیان بۆ چەسپاندنی دیموکراسی چەندین جار شکستی خواردووە. خودی چالاکانی کۆریای باشووریش لە ساڵانی ١٩٦٠، ١٩٧٠ و ١٩٨٠دا تووشی شکست هاتن. بیرمان نەچێ کیم دای جۆنگی سەرۆککۆماری کۆریای باشوور، کە بۆ خۆی لەو ساڵانەدا لە ریزی نارازییاندا بوو، چەندەها ساڵ لە بەندیخانەدا ژیا. چی بوو بە هۆی ئەوەی لە حەفتاکاندا بدۆڕێت بەڵام لە نەوەدەکاندا سەرکەوێت؟ ئایا لە نەوەدەکاندا لەپڕ بوو بە خاوەن «ئیرادەی ئەخلاقی»؟ لی چێن، سەرۆکی سیاسیی بەگوڕی تایوان و سەرنووسەری چینی *ئازاد*، مەبەستی لە دروستکردنی «حیزبی دیموکراتیکی چینی» لە ١٩٦٠دا سەقامگیرکردنی دیموکراسی بوو لە تایواندا. ئەو بە هەمان ئەندازەی چێن شۆی بی یان، پارێزەری مافی مرۆڤ کە لە ساڵی ٢٠٠٠دا وەک سەرۆککۆماری تایوان هەڵبژێردرا، نەترس و بوێر بوو. چما چالاکێکی مافی مرۆڤ شکستی خوارد و ئەویدی سەرکەوت؟

تەنانەت ئەگەر باشترین تێگەیشتنی مێژووییشمان هەبێ ناتوانین ساتەوەختی بەدیموکراسیبوونی وڵاتێک پێشبینی بکەین. ئەم بابەتە بەزۆری پەیوەستە بە تێکەڵکردێکی ئاڵۆزی حەقیقەتە مێژووییە تایبەتییەکانی ئەو وڵاتەوە. بۆچی ئیسپانیا تا پێش ١٩٧٧ نەیتوانی دیموکراسی مسۆگەر بکات؟ چونکوو دیکتاتۆری هەمیشەیی ئەم وڵاتە، واتە ژەنەراڵ فرانکۆ، دوو ساڵ بەرلەم بەرواره مرد. بۆچی هەنگاریا لە ١٩٨٩دا؟ چونکوو لەو ساڵەدا سۆڤییەت وازی لە هەڕەشەکانی هێنا - سۆڤییەت دەیوت ئەگەر بێت و هەنگاریا بەرەو لیبرالیزم بچێت هێرشی نیرامی

دەکاتە سەری. بۆچی هیندستان لە ١٩٤٧دا؟ چونکوو لەو ساڵەدا بریتانیا دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییانەی خۆی لە هیندستاندا پێچایەوە. چەندەها نموونەی دیکەیش... بەڵام پرسیاری سەرنجڕاکێشەرتر ئەوەیە کە هۆکاری بەردەوامبوونی دیموکراسی چییە؟ گەلێ هۆکارمان هەیە دەبنە هۆی گۆڕانی سیستەمە سیاسییەکان، وەک شەڕ و قەیرانی ئابووری و مەرگ. بەڵام کە رژێمێکی دیکتاتۆری دەڕووخێ و جەماوەر هەوڵی رۆنانی دیموکراسی دەدەن، کامە هۆکارە دەبێتە هۆی بەردەوامبوونی ئەو سیستەمە؟ «سەرمایە» باشترین وەڵامی هاوبەشی مێژووییە بۆ ئەم پرسیارە.

بۆچی سەرمایە بە سوودی ئازادییە؟ ئاوڕێک لە نموونە ئەورووپاییەکان بدەنەوە: بە شێوەی سروشتی پرۆسەی گەشەسەندنی ئابووری دوو کاراکتەری لێ دەکەوێتەوە کە لە سەرکەوتنی دیموکراسیی لیبرالیدا دەورێکی ژیانبەخش دەگێڕن. بە ئاستی یەکەم دەرفەتی ئەوە دەڕەخسێنێ کە لایەنە گرنگەکانی کۆمەڵگا ـ لە هەموویان گرنگتر دامەزراوە بازرگانییەکانی کەرتی تایبەت و بە شێوەیەکی گشتیتر، بۆرژوازی ـ ببن بە خاوەن دەسەڵاتێکی سەربەخۆ لە دەوڵەت. بە ئاستی دووەم لە پرۆسەی دیالۆگ و چەقەچەق لەگەڵ ئەم هێزانەدا، ئاستی تالانکاری و سەرەڕۆیی دەوڵەت کەم دەبێتەوە و دەوڵەت هەنگاوێکی زیاتر بەرەو بالادەستیی یاسا و وەڵامدەربوون لە ئاست پێداویستییەکانی کۆمەڵگادا ـ یان لانیکەم پێداویستییەکانی دەستەبژێراندا ـ هەڵدەگرێت. ئەم پرۆسەیە دواجار دەبێتە هۆی لیبرالیزاسیۆن کە زۆربەی کات بە شێوەی نەخوازراویش روو دەدات. مینکسین پی بەم شێوەیە وێنای رێگای تایوان بۆ دیموکراسیی لیبرالی لە هەشتا و نەوەدەکاندا دەکات، کە هاوشێوەی ئەزموونی ئەورووپاییە:

گەشەسەندنی خێرای ئابووری کۆمەڵە دەرئەنجامێکی لێ کەوتەوە کە رژێمی دەسەڵاتدار نەیتوانیبوو پێشبینییان بکات. بووژانەوەی ئابووری کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی پێشکەش بە تایوان کرد کە لە هەموو کۆمەڵگایەکی سەرمایەدارییدا روو لە گەشەدا دەبینرێت: رێژەی خوێنەواری بەرز بوویەوە، پێوەندییە گشتییەکان پەرەی سەند، رێژەی داهاتی سەرانە زیادی کرد و توێژێکی شاریی جیاواز لە دایک بوو کە پێک هاتبوو لە کرێکاران، چینێکی پرۆفیشناڵی مامناوەندی و چینێکی خاوەن کار و پێشە و کاردامەزرێن. سەربەخۆبوونی چینی خاوەن کار و پیشە سیمایەکی بەرجەستەتر و گەشاوەتری پێ دەبەخشی. هەرچەند کۆمپانیاکان بە تەنیا خۆیان بچووک و رێکنەخراو بوون، بەڵام حیزب ـ دەوڵەت نەیدەتوانی بەسەریاندا زاڵ بێت.[١٧]

ئەم چیرۆکە لە زۆربەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا و لە فۆرمگەلی جیاواز و لۆکاڵدا دووپات بۆتەوە. هەروەک ئەورووپا، لیبرالیزمی ئابووری لەوێش بوو بە هۆی لەدایکبوونی چینی بۆرژوا و کۆمەڵگای مەدەنی، ئینجا دوای چەند دەیەیەک بە شێوەی لۆژیکاڵ دیموکراسییەکی لیبرالیی لێ

کەوتەوە. لێرەیش هاوشێوەی ئەورووپا دەسەڵاتدارانی دیکتاتۆر پێیان وا نەبوو دیموکراتیزاسیۆنیان ئەنجام داوە. بەڵام لە کردەوەدا بە پەرەپێدانی گەشەی ئابووری و مۆدێرنیتە، کۆمەڵە هێزێکیان بە کۆمەڵگادا بڵاو کردەوە کە کەس نەیدەتوانی کۆنترۆڵیان بکات. فیلیپ نۆردی مێژوونووس بەم چەشنە لەو پرۆسەیە دەڕوانێت:

دیکتاتۆرەکان وادەزانن خوازیاری گەشەن، بەڵام لە کردەوەدا بەو گەشەپێدانە تووشی هەڵەیەکی کوشندە دەبن. گەشەسەندن دەبێتە هۆی گەورەبوونەوەی چینی خوێندەوار و «ژێرخانێکی پلۆراڵ» دروست دەکات، واتە کۆمەڵگایەکی مەدەنیی تۆڕی[41] کە کۆنترۆڵکردنی لە سەرەوەڕا سەخت و دژوارە... رەنگە لەم قۆناغەدا دەسەڵاتی ئۆتۆریتەخواز زەختی سەر ژیانی کۆمەڵایەتی کەم بکاتەوە. ئەمە بڕیارێکی رووخێنەرە، چونکو ئەو درز و کونانەی پرۆسەی لیبرالیزاسیۆن دروستی کردوون بە نارەزایەتییە کەڵەکەکراوەکان پڕ دەکرێنەوە، دواجار کە نارەزایەتییەکان دەکەونە قۆناغی دەربڕینەوە دەگۆڕدرێن بۆ دژایەتییەکی هەمەلایەنە. [١٨]

نۆرد ئەم بابەتەی لە لێکدانەوەی چۆنیەتیی دیموکراتیزاسیۆنی فەرەنسا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا نووسیوە، بەڵام لە کتێبەکەیدا هەر بەم رێکوپێکییە باردودۆخی رۆژهەڵاتی ئاسیای لە سەدەی بیستەمیشدا شی کردۆتەوە.

## خۆزگەمان بە هەژاران

پارە لە خۆڕا ئازادیی لێ ناکەوێتەوە. ئەو پارەیە ئازادی بەدی دێنێ کە بەرهەمی کار و تێکۆشان بێت. لە نیوسەدەی رابردوودا هەندێ رژێمی وەک شێخنشینەکانی کەنداو، نەیجیریا و ڤێنێزوێلا دەوڵەمەند بوونەتەوە، کەچی هێشتا هەر رژێمگەلێکی دیکتاتۆرن. لە راستیدا سەرمایەی وڵاتانی نەوتی ئاڵوگۆڕی پۆزەتیڤی سیاسیی لێ ناکەوێتەوە، چونکوو لە بنەڕەتدا مۆدێلی گەشەسەندنی ئابوورییان جیاوازە لە مۆدێلی وڵاتانی ئەورووپایی و ئاسیایی. گەشەسەندنی ئابووریی ئەو وڵاتانە لە چوارچێوەی سەرمایەداریدا رووی نەداوە - واتە گۆڕانی میتۆدێک لە وەرزێرییەوە بۆ پیشەسازی و پاشان خزمەتگوزاری لە ئاستی بەرزدا - بە پێچەوانەوە ئەوان ژێرخانە نەوتییەکان و کانزا مەزنەکانیان بە ئاراستەی کڕینی مۆدێرنیتەدا بەکار هێنا - ئەوان مۆدێرنیتەیان بە کڕینی بینا، نەخۆشخانە، خانووی شاهانە، ئۆتۆمبیل و تەلەڤزیۆنی تازە پێناسە کردووە. دانیشتوانی ئەم وڵاتانە لە هەمان دۆخی پێشوویاندا، واتە مرۆڤی رانەهاتوو و ناپسپۆڕ، ماونەتەوە.

---

41. Network civil society

کۆمەڵگاکەیشیان هەمان کۆمەڵگای ساکار و سەرەتاییی پێشووە. لە راستیدا دەوڵەت ناچار بوو زانست و تەنانەت هێزی مرۆییی پسپۆڕ بۆ بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکان، قوتابخانەکان و کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکان لە وڵاتانی بیانییەوە بهێنێ. دەرئەنجام ئەم پرۆسەیە چینێکی مامەڵەچیی لێ کەوتەوە کە لە باتیی ئەوەی سەربەخۆییی خۆی بپارێزێ بەقووڵی وابەستەی دەوڵەت بوون.

خستنەبەردەستی هەندێ ژمارە و رەقەم ئەم خاڵەمان بۆ روون دەکاتەوە. بۆ وێنە سەرەڕای بەرزبوونی رێژەی داهاتی سەرانە لە عەرەبستاندا، رێژەی خوێنەواری لە گەورەساڵاندا تەنیا لە سەدا ٦٢ە و تەنیا لە سەدا ٥٠ی ژنان توانای نووسین و خوێندنەوەیان هەیە. کوێت و قەتەر و ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی تەنیا تۆسقاڵێک لەمە باشترن و رێژەی خوێنەوارییان لە سەدا کەمتر لە ٨٠یە. لە بەرانبەردا رێژەی خوێنەواری لە فیلیپین و تایواندا، کە زۆربەی کرێکارانی ناپسپۆڕی وڵاتانی کەنداو خەڵکی ئەم دوو وڵاتەن، نەوەد و وردەیەکە، کەچی بەمەشەوە هێشتا لە ریزی خوارترین رێژەکانی رۆژهەڵاتی ئاسیادان. ئەگەر حەشیمەتێکی دەرسخوێندوو یان لانیکەم خوێنەوار یەک لە پێداویستییەکانی دەوڵەتی دیموکراتیک و بەشدارییانە بێت، ئەمە هەمان ئەو تاقە فاکتەرەیە کە وڵاتانی تەژی لە نەوتی عەرەبی سەرەڕای بەهرەمەندبوونی چەندەدە ساڵەیان لە سەرمایەی ئەفسانەیی، هێشتا بەدەستیان نەهێناوە.

گونجاوترین شێوازی گەشەسەندنی ئابووری بۆ رۆنانی دیموکراسیی لیبرالی، گەشەسەندنی سەرمایەدارانەیە. مارکس لەو یەکەم کەسانە بوو کە لەم بابەتە گەیشت. مارکس دەیوت سەرمایەداری دەوڵەتی دڵخوازی خۆی واتە دیموکراسیی بۆرژوایی دەخولقێنێ (ئەڵبەت ئەو ئەم دەوڵەتەی قبووڵ نەبوو). مارکس دەیوت سەرمایەداری دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بۆرژوازیی کارداهێن کە خوازراو یا نەخوازراو تەکووزیی کۆنی ئەشرافی دەڕووخێنێ و جۆرە تەکووزییەک رۆدەنێت کە پارێزەری مۆڵکداری، پەیماننامەکان، یاسا و رێساکان و ئازادییەکانیترە. هەرکات بۆرژوازی هەڵگری ئەم تایبەتمەندییە نەبێت ـ وەک ئەڵمانیای سەدەی نۆزدە ـ هیچ ریفۆرمێک لە کۆمەڵگادا ناکرێت. سەیرێکی ئەمریکای لاتین بکەن. لە بەشی زۆری سەدەی بیستەم و لە ئەمریکای لاتیندا گەشەسەندنی کار و پیشە لە رێگای جۆرە سەرمایەدارییەکی دەوڵەتییەوە رووی‌دا. ئولیگارشە خۆماڵییەکان بوون بە هاوپەیمانانی ئارتەش و بەرپرسانی دەوڵەتی و پارێزگارییان لە پیشەسازی و بازرگانیی خۆیان دەکرد، ئەوان پێکهاتەیەکی بیزانسییان بۆ پیتاک و یاسا و رێساکان پێک هێنابوو کە دەبووە هۆی بەردەوامبوونی ژیانی ئاسوودە و سەرخۆشی دەسەڵاتداران. ئاوەها سیستەمێک ناهێڵێ ئابووری گەشەسەندنێکی راستەقینە بڕی و خەسار لە سیاسەتیش دەدات. چینی بەربڵاوتری بازرگانان لاواز کەوتن و ملکەچ و گوێڕایەڵی دەوڵەت مانەوە.

تا ئەم دواییانەش مۆدێلی گەشەسەندنی سیاسیی ئەمریکای لاتین هەمان مۆدێلەکەی ئەڵمانیای سەدەی نۆزدە بوو. شیلی لەخۆڕا نەبۆتە سەرکەوتووترین ئابووری و سەقامگرتووترین وڵاتی ئەم ناوچەیە، بیرمان نەچێ شیلی تاکە وڵات و یەکەم وڵاتێک بوو کە شێلگیرتر لە هەموو وڵاتانیتر خۆی لەم نەریتە دوور خستنەوە و بەرەو بازاڕی ئازاد و بازرگانیی ئازاد هەنگاوی نا.

سامانی سروشتی هەم مودێرنیزاسیۆنی سیاسی وەدرەنگ دەخات و هەم گەشەسەندنی ئابووری. دوو ئابووریزانی زانکۆی هاروارد، جێفری دی ساکس و ئەندرۆ وارنێر، خوێندنەوەیەکیان بۆ نەوەد و حەوت وڵاتی روو لە گەشە لە نێوان دوو دەیەی (١٩٧١ـ١٩٨٩) دا کردووە، بەپێی ئەم توێژینەوەیە پێوەندییەکی قووڵ لە نێوان سامانی سروشتی و شکستی ئابووریدا هەیە. بەگشتی هەرچی وڵاتێک لە رووی سەرچاوەی کانزا و وەرزێڕی و سووتەمەنییەوە دەوڵەمەندتر بووبێ لە رووی ئابوورییەوە درەنگتر و هێواشتر پێش کەوتووە، بۆ وێنە عەرەبستانی سعوودی و نەیجیریا. لە بەرانبەردا ئەو وڵاتانەی هیچ جۆرە سەرچاوەیەکی سروشتییان نەبووە خێراترین پێشکەوتنیان بەخۆوە بینیوە کە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا لە نموونە دیارەکانن. ئەو وڵاتانەی سەرچاوەیەکی کەمیان بووە، وەک وڵاتانی رۆژئاوای ئەورووپا، رێژەی گەشەسەندنیان لە نێوان ئەم دوو جۆرەی سەرەوەدا بووە. چەند نموونەیەکی ئاوارتەی وەک شیلی و مالیزیا و ئەمریکا سەرەڕای ئەوەی خاوەن سەرچاوەی سروشتیی دەوڵەمەندن لە رووی ئابووری و سیاسیشەوە گەشەیان سەندووە. بەڵام بەمەشەوە ئەو یاسا بنەماییە هەر راست و دروستە.[١٩]

چما سەرمایەی خۆڕایی وەها دەورێکی درێو دەگێڕێ؟ چونکوو ئەم جۆرە سامانە ناهێڵێ دامەزراوە سیاسییەکان، یاساکان و سیستەمی ئیداری مۆدێرن ببنەوە. با گریمانەیەکی رەشبینانە بخەینە بەردەست و پێمان وابێت گرنگترین ئامانجی بەرزی هەر دەوڵەتێک بریتییە لە بەرفرەکردنی سەرمایە و دەسەڵاتی خۆی. لە وڵاتێکدا کە سەرچاوەی سروشتیی نییە دەوڵەمەندبوونەوەی دەوڵەت گرێدراوی دەوڵەمەندبوونەوەی کۆمەڵگایە، دەوڵەت پیتاک لەسەر سەرمایەی کۆمەڵگا دادەنێت و داهاتی خۆی دەستەبەر دەکات. بەم پێناسەیە رۆژهەڵاتی ئاسیا گەلێ بەختەوەر بوو، چونکوو زۆر هەژار بوو. حکوومەتی ئەم وڵاتانە بۆ چێکردنی دەوڵەتێکی کارامە دەبا بە جیدی و قووڵی هەڵبسووڕایەن، چونکوو ئەمە تاکە رێگای دەوڵەمەندکردنەوەی کۆمەڵگا و لە ئاکامدا دەوڵەت بوو. ئەو دەوڵەتانەی گەنجینەکەیان لە ژێر خاکدایە بەبێ زەحمەتکێشان دەوڵەمەند دەبنەوە؛ دەتوانین ئەم جۆرە دەوڵەتانە بە دەوڵەتی «خاوەن پاشەکەوت» ناوزەد بکەین. ئەوان بە فرۆشتنی سەرچاوە کانزاییەکان یان نەوت خۆیان دەوڵەمەند دەکەنەوە و بۆ بەرهەمهێنانی سەرمایەی نەتەوەیی مەجبوور نین خۆیان گیرۆدەی تەقالایەکی زۆر دژواری وەک ئافراندنی یاسا و

دامەزراوەکـان بـکەن (وەک نـەیجیریا، ڤێنیـزۆیلا و عەرەبسـتانی سـعوودی). شـاعیرێکی سـەدەی سێزدەی ئاسیای ناوەڕاست بە ناوی یوسف، بە زمانێکی سادە و ساکار ئەم تیۆرییەی لە شیعرێکدا دەربڕیوە:

بۆ پاراستنی وڵات پێویستە سەرباز و ئەسپ و خواردەمەنیی فراوانمان هەبێت.
بۆ پاراستنی ئەو سەربازانە پێویستە پارەی فراوانمان هەبێت.
بۆ بەدەستهێنانی ئەم پارەیە پێویستە خەڵک دەوڵەمەند بن.
بۆ ئەوەی خەڵک دەوڵەمەند ببنەوە پێویستە یاساکانمان دادپەروەرانە بن.
هەرکام لەمانە بەدی نەیەت، چوارەکەی‌تر هیچکامیان بەدی نایەن.
ئەگەر ئەم چواردانەیەش بەدی نەیەن وڵات پارچە پارچە دەبێت.[٢٠]

ئەم تیۆرییە گێڕانەوەیەکی دیکەیشی بـۆ کـراوە کە دەڵێـت هەر دەوڵەتێـک پـارەی بێزەحمەتـی دەست بکەوێ ـ بۆ وێنە وەک وەرگرتنی پیتاکی کەشتیوانی لە کاناڵێکی گرنگدا (وەک میسر) یـان تەنانەت وەرگرتنی یارمەتیی بیانی (وەک زۆربەی وڵاتانی ئافریقایی) ـ لە رووی سیاسییەوە ناتوانێ گەشـە بسـێنێ. پـارەی بێـزەحمەت مانـای ئەوەی دەوڵەت پێویسـتی بە وەرگرتنـی پیتـاک لە هاووڵاتییان نییە. ئەگەر دەوڵەت پیتاک لە خەڵک وەربگرێت پێویسـتە لە بەرانبەردا هەنـدێ پـوەن بـدات، دەسـپێکی ئەم پوەنـانە بـریتییە لە پێشکەشـکردنی خزمەتگـوزاری، وەڵامـدەربوون و بەڕێوەبردنی رێکوپێک، بەڵام دواجار ئازادیی هەڵبژاردنی لێ دەکەوێتەوە. دان و سـتانی دوولایەنەی نێـوان پیتـاک و هەڵبـژاردن هەمـان ئەو هۆکـارەیە لە دونیـای مۆدێرنـدا شـەرعییەت دەبەخشـێتە دەوڵەت. ئەگەر دەوڵەتێک داهـاتی خـۆی لە کۆمەڵگـاوە دابـین نەکـات ئیـدی نـاتوانین پێـی بڵێـین دەوڵەت، بەڵکوو دەربارێک [ی پاشایەتییە] و مامەڵەچییـان و خـاوەن پیشـەوکارەکانی کەسـانێکی دەرباریی رووتن نەک کـارداهێن[٤٢]. بنەمـاڵەی پاشـەیەتیی عەرەبسـتان جـۆرە مـامەڵەیەکی‌تر لەگەڵ هاووڵاتییانیدا دەکـات: «لە رووی ئـابوورییەوە چـاوەڕوانییەکی ئەوتۆمـان لە ئێـوە نییە و لە رووی سیاسیشەوە شتێکی ئەوتۆتان پێ نادەین». ئەمە پـێچەوانەی دروشـمی شۆڕشـی ئـەمریکایە ـ واتە ئەگەر پیتاک نەدەن ناشتوانن هەڵبژێرن.

---

٤٢ . ئەم چەمـکە دەتـوانێ هەنـدێ پرسـمان بـۆ روون بکـاتەوە، تەنـانەت سـەبارەت بە دیموکراسـییە پێشکەوتووەکانیش: تا ئەم دواییانەش لە ولایەتێکی وەک تێگزاسدا پێوەندییەکی نزیک لە نێوان سیاسـەتی دامەزراو لەسەر خزم خزمێنە و نەوتدا دەبینرا.

مەبەســت ئەوە نیــیە کە دەبــێ وڵاتەکــان ئــاواتەخوازی ئەوە بــن کە لە رووی ســەرچاوە سروشــتییەکانەوە هەژاربــن، زۆربەی وڵاتــانی هەژار نە دیموکراســی دەســتەبەر دەکەن نە سەرمایەداری. دامەزراوە سیاسییەکان، سەرکردایەتی و بەخت، هەموویان گرنگن. هەروەک چۆن هەندێ لە منداڵانی دەوڵەمەندان بە مرۆڤی باش دەردەچن هەندێ وڵاتیشمان هەیە کە سەرەڕای دەوڵەمەندبوونیان گەشەسەندن بەخۆوە دەبینن. زۆربەی وڵاتانی ئەوروپایی لە ساتەوەختێکدا تێکەڵ بە پرۆسەی دیموکراتیزاسیۆن بوون کە لە وڵاتانی دیکەی جیهان دەوڵەمەندتر بوون. بەڵام وەک لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان پێ دا ئەوروپا هەڵگری چەندەها خەسڵەتی تایبەت بە خۆی بوو. ململانێ دوور و درێژەکانی نێوان کلێسا و دەوڵەت، کاتۆلیک و پرۆتستان و پادشا و ئەشراف پێکهاتنی دامەزراوە لیبرالییەکان و بەرکورتبوونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی لێ کەوتبۆوە. لە هەندێ وڵاتی دەرەوەی ئەوروپایشدا هاوشێوەی ئەم جۆرە ململانێیانە رووی داوە. بۆ وێنە لە راستیدا رەنگە پلۆراڵبوونی سیاسیی هیندستان کە هەڵگری دەیان جۆر ناوچە و زمان و مەزهەبە، نەتەنیا هەڕەشە نەبێت بەڵکوو بەردەوامبوونی دیموکراسی لەم وڵاتەدا گەرەنتی بکات. دیموکراسیی پۆڵۆنیا لە رێگای کلێسایەکی سەربەخۆ و بەهێزەوە رەگی داکوتاوە. بەگشتی دادپەروەرانەترین ئەنجامگیری ئەوەیە کە هەرچەند هەندێ لە تایبەتمەندییە مێژوویی و دامەزراوەییەکان رۆڵی کاریگەریان هەیە، بەڵام شێوە گەشەسەندنی کاپیتاڵیستی گونجاوترین و کاراترین رێگای هاوبەشە بۆ رووخاندنی تەکووزیی کۆنی فیۆدالی و رۆنانی دەوڵەتێکی لێهاتوو و بچووک.

## لە ستایشی دەوڵەتدا

زۆرجار لایەنگرانی بازاڕی ئازاد بە هەڵە سەرمایەداری وەک دژایەتیکەری دەوڵەت پێناسە دەکەن. ئەم روانگەیە لە کاتی وەرگرتنی پیتاکدا وەک راستییەک دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام کێشەکە زۆر لەمە ئاڵۆزترە. هەرچەند لەسەدەی بیستەمدا لە زۆربەی دەوڵەتەکان هێند بەهێز بوونەوە ئابووریی وڵاتەکەیان خنکاند بەڵام ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی بەربڵاوتری مێژووییەوە لە مەسەلەکە بکۆڵینەوە تێدەگەین تەنیا دەوڵەتێکی رەوا و لێهاتوو دەتوانێ یاسا و رێسای پێویست بۆ سەرکەوتنی سەرمایەداری پێک بهێنێ. بچووکترین رەهەندی بریتییە لەوەی کە ئەگەر دەوڵەتێکمان نەبێ پارێزگاری لە مافی موڵکداری و مافەکانی مرۆڤ، ئازادیی چاپەمەنییەکان و پەیماننامە بازرگانییەکان، یاساکانی دژە تراست و داخوازیی بەکارهێنەران بکات، ئەوسا لە باتیی باڵادەستیی یاسا باڵادەستیی بەهێزان لە کۆمەڵگادا دەچەسپێت. ئەگەر کەسێک دەیەوێ لە دەرئەنجامەکانی نەبوونی دەوڵەت بگات با کورتە ئاورێک لە ئافریقا بداتەوە ـ ئەوێندەر نەبۆتە بەهەشتی بازاڕی ئازاد.

زۆرجار لە وڵاتانی روو لە گەشەدا دەوڵەت ناچار بووە خۆی هەوڵی دامەزرانی سەرمایەداری بدات. ئەم مۆدێلەش هاوشێوەی مۆدێلی ئەوروپاییە؛ دەسپێکی سەرهەڵدانی سەرمایەداریی مۆدێرن بەو شێوەیە بوو کە دەوڵەت زەویوزارە گەورەکانی لە لۆردە فیۆدالەکان سەندەوە و بە ئاراستەی گونجاو لەگەڵ بازاڕدا بەکاری هێنان. ئەم کارە زەمینەدارە گەورەکانی شپرزە کرد، ئەم چینە پاشقەڕۆترین توێژی ناو کۆمەڵگا بوون. ئاکامێکی دیکەی ئەم کارە کە بە هەمان ئەندازەی ئاکامی یەکەم پڕبایەخ بوو، بریتی بوو لەوەی کە میلیۆنەها هێکتار لە ماڵ و موڵکی دامرکاو و بزرکەوتووی ئەو فیۆدالانە، کە زۆر بە کەمیش کەڵکیان لێ وەردەگیرا، لێیان سەنرایەوە و تێکەڵ بە سیستەمی بازاڕ کران. خاوەنە تازەکانیان، کە زۆربەیان هەمان ئەو وەرزێڕانە بوون کە زەوییەکانیان دەکێڵا، گەلێ باشتر لە جاران دەیانهێنانە بەرهەم، چوونکوو ئێستە زیاتر دەستیان دەچووە کار. هەندێ جاریش بە کرێ دەیانسپاردە دەست کەسانێک کە کاری باشتریان تێدا دەکرد، هەندێ جاریش دەیانفرۆشت. بە واتایەکیتر بۆ دەسپێکرانی سەرمایەداری پێویست بوو پرۆسەی مەزنی دابەشکردنەوەی سەرلەنوێی سەرمایە بێتە جێبەجێکردن.

مۆدێرنیزاسیۆنی وەرزێڕی لە ئەوروپادا چەندەها سەدەی خایاند، چاکسازیی زەویوزار لە جیهانی سێهەم و لە نیوسەدەی رابردوودا هەندێ ئاسەواری هاوشێوەی ئەوروپای لێ کەوتۆتەوە. بەم ریفۆرمانە زەویوزارەکان لە چینی فیۆدال سەنرایەوە و بەخشرایە ئەو جووتیارانەی چەندین نەوە بوو کاریان تێدا دەکرد، بیرمان نەچێ لە دونیای تیۆردا مافی موڵکداریی ئەو موڵکانە هی فیۆدالەکان بوو. بەبێ لەبەرچاوگرتنی دادپەروەرانەبوون یان نەبوونی ئەم کارە، لەم پرۆسەیەدا زەویوزارەکان ئازاد و تێکەڵ بە ئابووریی بازاڕ دەکرێن، زۆرجار لە وڵاتانی پێش قۆناغی پیشەسازیدا زەویوزار پڕبایەخترین سەرمایە دەهاتە ئەژمار. چاکسازیی زەویوزار یەک لە هۆکارە سەرەکییەکانی پێشکەوتنی ئابووری بوو لە رۆژهەڵاتی ئاسیادا بەتایبەت لە رۆژهەڵاتی ئاسیادا (بەتایبەت ژاپۆن و تایوان و کۆریای باشوور) هەروەها لە هەندێ وڵاتی ئەمریکای لاتیندا (کە دیارترینیان کاستاریکا و مەکسیک و شیلی بوون).

لە سەردەمی شەڕی ساردا زۆربەی کۆنسێرڤاتیستانی رۆژئاوا دژ بەم ریفۆرمە دەوەستان، چونکوو بەگشتی سیمایەکی مارکسیستیی لەخۆ گرتبوو و زۆربەی لایەنگرانی لە بەرەی چەپدا بوون. بەڵام لە مەیدانی کردەوەدا چاکسازیی زەویوزار سەرمایەداری پەرە پێ دەدات و دواجار بە قازانجی دیموکراسیدا دەشکێتەوە. ئەم ریفۆرمە هەنگاوێکی زۆر گەورەیە لە پرۆسەی گۆڕینی کۆمەڵگادا لە کۆمەڵگایەکی دواکەوتووی لادێییەوە بۆ کۆمەڵگایەکی مۆدێرنی کاپیتالیست و دیموکراتیک. ئەو وڵاتە جیهان سێیەمییانەی نەیانتوانیوە پرۆژەی چاکسازیی زەویوزار بگەیەننە ئەنجام قەت نەیانتوانیوە وەرزێڕی بگۆڕن

بۆ کارێکی پڕسوود، بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بدەینە هەندێ ناوچەی ئەمریکای ناوەڕاست و لاتین، پاکستان، زیمبابوێ و زۆربەی وڵاتانی ئافریقایی. لەم وڵاتانەدا دەستەبژێرانی فیۆدالئاسا دەسەڵاتی خۆیان پاراستووە، هەر بۆیە ڕەوتی بەدواداچوونی دیموکراسی بۆیان بۆتە ئەزموونێکی تاڵ و پڕئازار. تەنانەت لە هیندستاندا زیاترین بشێوی و کاردانەوەی خراپی دیموکراسی لەو دەڤەرانەدا رووی داوە کە ریفۆرمی زەویوزار شکستی خواردووە (ولایەتە باکوورییەکانی ئۆتارپرادێش و بیهار). ئەمریکاییەکان تێگەیشتنێکی پەنامەکییان بۆ پێوەندیی نێوان موڵکداریی تایبەتیی زەویوزار و ئازادی هەیە، ئەمەش وای کردووە دوای شەڕی ناوخۆ دەوڵەت بەپێی یاسای هۆمێستێد[٤٣] زەویوزاری خۆڕایی ببەخشێتە هاووڵاتییان. فێرناندۆ دۆسۆتۆ، ڕۆشنبیرێکی پێرۆیی کە دواتر بوو بە چالاکێکی کۆمەڵایەتی، پێی وایە ئێستاش یەک لە لەمپەرە سەرەکییەکانی بەردەم گەشەسەندنی ئابووریی زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەم (من گەشەسەندنی سیاسیشی پێ زیاد دەکەم) دەگەڕێتەوە بۆ نەبەخشینی مافی تەواوی موڵکداری بە هەژاران.

## شەپۆلی داهاتوو

لەمەودوا لە کام وڵاتانەدا دیموکراسی گەشە دەسێنێ و دەچەسپێ؟ ئێمە ناتوانین پێشبینییەکی تۆکمە و تەواو بۆ ئەوە بکەین کە لەمەولا دیموکراسی لەکوێدا تاقی دەکرێتەوە؛ چونکوو شتێکی ڕێکەوت و کتوپڕە. بەڵام دەتوانین ئەگەرەکان دەستنیشان بکەین و بڵێین ڕەنگە لە فڵان شوێندا دیموکراسی ڕەگ دابکوتێ. مەکسیک گەورەترین وڵاتێکە بەم دواییانە بەرەو دیموکراسی هەنگاوی ناوە و ئاسۆیەکی ڕووناکی لە بەردەمدایە. ئەم ئاسۆ ڕووناکە بەرهەمی بزووتنی گونجاوی ئەو وڵاتەیە کە میکانیزمێکی هاوشێوەی هەمان میکانیزمی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای هەڵبژاردووە (ئەڵبەت خودی مۆدێلی ئاسیاییش جۆرە مۆدێلێکی ئەورووپاییە)، واتە سەرەتا ریفۆرمی ئابووری و پاشان ریفۆرمی سیاسی.

مەکسیک دوای دامەزرانەوەی مۆدێرنی لە ١٩٦٢دا بە شێوەی تاکەحیزبی و لە ژێر کۆنترۆڵی قورسدا بەڕێوە دەبرا. حیزبی دەسەڵاتداری پێ.ئار.ئای[٤٤] هەموو ڕووبەرەکانی دەسەڵاتی پاوان کردبوو بۆ خۆی. سەرەڕای ڕواڵەتی دیاری هەڵبژاردن و پەرلەمان، دیموکراسیی مەکسیک دیموکراسییەکی ناشیرین بوو. بەڵام دوای قەیرانی قەرزداریی سەرەتای هەشتاکان، حیزبی

---

٤٣. Homested Act . دوابەدوای شەڕە ناوخۆییەکانی ئەمریکا (١٨٦٥ـ١٨٦١) یاسایەک پەسند کرا کە دەبا دەوڵەت زەویوزاری پێشکەش بەو هاووڵاتییانە بکردایە کە ناوچەکانی ڕۆژئاوای وڵاتیان بۆ ژیان و وەرزێڕیی خۆیان هەڵدەبژارد. و.ف

44. Institutional Revolution Party (PRI)

دەسەڵاتدار بڕیاری دا هەنگاوێکی گەورە هەڵبگرێت کە بریتی بوو لە ئەنجامدانی ریفۆرمی ئابووری، کردنەوەی دەرگاکان بە رووی ئابووریی جیهانیدا و هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی کۆنترۆڵکردنی ئابووریی ناوخۆیی. وەک هەموو نموونەکانی‌تر بۆ ئەنجامدانی ئەم زنجیرە ریفۆرمە ئابوورییە پێویست بوو ریفۆرم لە دەزگای دادوەری و یاساکانیشدا بکرێت و هەوساری دەسەڵات شل بکرێتەوە. رێکەوتننامەی ئابووریی ئازاد لە ئەمریکای باکووردا[45] گەورەترین پارمەتیدەر بوو، ئەم رێکەوتننامەیە هەنگاونانی مەکسیکی بەرەو دەرەوە و سەرمایەداریی چەسپاند. لە کۆتاییی نەوەکانەوە حیزبی پی.ئار.ئای دەستی‌دایە ریفۆرمی سیاسیش و لە سالّی ٢٠٠١دا سەرۆککۆماری ئەوکاتی مەکسیک، ئێرنێستۆ سەدیۆ، بڕیارێکی زۆر بوێرانە و دووربینانەی وەرگرت و یەکەم هەڵبژاردنی بە راستی ئازادانەی مێژووی مەکسیکی بەڕێوە برد. کاندیدای حیزبی ئۆپۆزیسیۆن هەڵبژاردنەکەی بردەوە و لە دێسامبری هەمان ساڵدا ویسێنتە فاکس وەک سەرۆککۆماری مەکسیک هەڵبژێردرا، ئەو یەکەم کەسێک بوو لە رێگای هەڵبژاردنێکی دیموکراتیکەوە ئەم پۆستەی بەدەست دەهێنا.

مەکسیک رێگایەکی هاوشێوەی رۆژهەڵاتی ئاسیای گرتەبەر و زۆربەی چاپەمەنییەکانی رۆژئاوایش هاوشێوەی رۆژهەڵاتی ئاسیا لەو وڵاتەیان دەڕوانی. سەرەڕای ئەوەی حیزبی پی.ئار.ئای دەستی دابووە لیبرالیزاسیۆنی بەربڵاوی سیستەمی یاسایی و ئابووری، کەچی رۆژنامە و گۆڤارەکانی رۆژئاوا بە دەوڵەتێکی ئۆتۆریتەخواز و توندڕەویان لەقەڵەم دەدا. بەدرێژاییی نەوەدەکان و سەرەڕای بیست ساڵ لیبرالیزاسیۆن، کەچی دیسان مەکسیک بە وڵاتێکی ئۆتۆریتەخواز ناوزەد دەکرا. دیموکراتیزاسیۆنی مەکسیک لە کاتێکدا دەستی پێ کرد کە رێژەی داهاتی سەرانە سنووری ٩٠٠٠ دۆلاری تێپەڕاندبوو، ئەمەش بەتەنیا خۆی نیشاندەری ئەوەیە کە جووڵانەوەی نوێی مەکسیک گەلێ پتەو و بەهێز رێگا دەبڕێت. با هەڵگەڕێینەوە بۆ هەمان پێوەرە سادەکە (داهاتی سەرانە) و ئەو وڵاتانە دەست نیشان بکەین کە رێژەی داهاتی سەرانەیان لە ئاستە بەرزەکانی رووبەری دیموکراتیزاسیۆندایە، واتە ٥٠٠ تا٦٠٠٠ دۆلار لە ساڵدا. ئەگەر ئەو وڵاتانەی وا نزیک بە کۆی داهاتیان لە سەرچاوە سرووشتییەکانەوە دابین دەکەن لەم پێڕستە بسڕینەوە، ئەو وڵاتە گرنگانەی ئەمێننەوە بریتین لە: رۆمانی، بێلاڕووس، بولگاریا، کۆرواسی، مالیزیا، تورکیا، مەراکش (مەغریب)، توونس و ئێران[46]. ئەگەر دیموکراسی لەم وڵاتانەدا تاقی بکرێتەوە رەنگە لەگەڵ تێپەڕینی زەمەندا بگۆڕدرێن بۆ دیموکراسیگەلی رەسەن و لیبرالی.

---

45 . NAETA : رێکەوتننامەی بازرگانیی ئازاد لە نێوان ئەمریکا و کەنادا و مەکسیکدا. و.ف

٤٦ . هەرچەند ئێران وڵاتێکی نەوتییە بەڵام ئەژی بیخەینە نێو ئەم پێرستەوە، چوونکوو هەمیشە خاوەن ئابوورییەکی بەهێز بووە کە وابەستەی سەرچاوە سروشتییەکان نییە. بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئێران بڕوانە بۆ بەشی چوارەم.

ڕۆمانی (٦٨٠٠ دۆلار)، بێلاڕووس (٧٥٥٠ دۆلار)، بولگاریا (٥٥٣٠ دۆلار) و کۆرواسی (٧٧٨٠ دۆلار)، ئەم وڵاتانە ڕێژەی داهاتی سەرانەیان نزیکەی ٦٠٠٠ دۆلارە کە ئەم ڕێژەیە ئەگەری سەقامگیربوونی دیموکراسی لەم وڵاتانەدا گەلێ بەرز دەکاتەوە. هەروەها کە پێشتریش ئاماژەمان پێ دا ڕەنگە ئەم وڵاتانە ئەوروپییانە ئەگەر ڕێژەی داهاتی سەرانەیان لەمەش کەمتر بێت توانای دەربازکردنی ئەو قۆناغەیان هەبێت، چونکوو لە کۆنەوە خاوەن دامەزراوەگەلی سەربەخۆ بوونە. بێلاڕووس نموونەیەکی ئاوارتەیە، چونکوو لە ڕووی ئابوورییەوە بەقووڵی گرێدراوی ڕووسیایە، بەڵام ئەگەر بتوانێ خۆی لە سەرۆککۆماری ئۆتۆریتەخواز و هەڵبژێردراوی، واتە ئەلێکساندێر لووکاشێنکۆ، ڕزگار بکات، ئەوسا ڕەنگە بە خێراییەکی سەرسامکەرەوە پێش بکەوێت.

لە نێو ئەو وڵاتانەدا کە سیستەمی سیاسییان تا ڕادەیەک دیموکراتیک و تا ڕادەیەکیش ئۆتۆریتەخوازە، مالیزیا و تورکیا بە ٨٣٦٠ دۆلار و ٧٠٣٠ دۆلار ڕێژەی داهاتیان لە سەرووی ٦٠٠٠ دۆلارەوەیە، هەر بۆیە ئەگەری سەرکەوتنیان ئەگەرێکی بەهێزە. مالیزیا زیاتر مۆدێلی ئاسیای ڕۆژهەڵاتی گرتۆتەپێش، واتە سەرەتا لیبرالیزاسیۆنی ئابووری و لە هەمان کاتدا داخستنی فەزای سیاسی (بەداخەوە بەرجەستەترین ڕەنگدانەوەی ئەم داخرانە لە بەندکردنی سەرکردەی سیاسی، ئەنوەر ئیبراهیم دا بەتەواوی دەرکەوتووە) پاشان ڕەخساندنی وردەوردەی دیموکراتیزاسیۆنی ڕەسەن. تورکیاش نموونەیەکە بە داهاتوویەکی زۆر ڕوون و لە هەمان کاتدا ئاڵۆزەوە. ئەم وڵاتە دیموکراسییەکی تەواو نییە؛ نیزامییان هەر سێجارونیو سەرۆک دەوڵەتێکی هەڵبژێردراویان ڕووخاندووە (نیوەکەی لە ١٩٩٨دا ڕووی دا، واتە ئەوکاتەی کە نیزامییان گوشاریان خستە سەر دەوڵەتی هەڵبژێردراو کە لەژێر دەسەڵاتی حیزبێکی ئیسلامیدا بوو و ناچاریان کرد واز لە دەسەڵات بهێنێ. چەنگیز کۆندۆر، ڕۆژنامەنووسی تورک، ئەم ڕووداوەی بە «کوودێتای پۆستمۆدێرن» شوبهاندووە). نیزامییەکانی تورکیا خۆیان بە پارێزڤانی تایبەتمەندیی سێکۆلاری دەوڵەت دەزانن و بە یارمەتیی هەندێ لە دادوەرانی هاوبیریان شێلگیرانە بەڕێوەی دەبەن. بەگشتی ئەم دەستەبژێرانە بەڕێوەبەری مۆدێرنیزاسیۆن و سەقامگیرکردن بوون لە کۆمەڵگای تورکیادا، بەڵام ئیدی سەردەمی سوودمەندبوونی دەمارگرژییان بەسەر چووە. هۆکارێکی هاوبەش سەری هەڵداوە کە تورکیا ناچار دەکات ئاڵوگۆڕە لیبرالییەکان جیبەجێ بکات؛ چاوەڕوانی بۆ بوونەئەندام لە یەکێتیی ئەورووپادا سیاسەتمەدارانی تورکیای ناچار کردووە بە بارودۆخی وڵاتەکەیاندا بچنەوە. پەرلەمانی تورکیا لە ئۆکتۆبری (تشرینی یەکەم) ٢٠٠١ بە مەبەستی خۆگونجاندن لەگەڵ ستانداردەکانی یەکێتیی ئەورووپادا سی‌وچوار گەڵاڵەی ریفۆرمی لە یاسای بنچینەییدا پەسندکرد. لەوکاتەوە تورکیا گەلێ ریفۆرمی گەورەگەورەی بەڕێوە بردووە. ئەگەر یەکێتیی ئەورووپا لە گۆشەنیگایەکی دووربینانەی

ستراتیژێک و هەمەلایەنەترەوە لە مەسەلەی تورکیا بکۆڵێتەوە، تێدەگات باشتر وایە هەرچی زووترە ئەو وڵاتە وەک ئەندامی خۆی قبووڵ بکات و چیدی لەمە زیاتر نەیخاتە دواوە، بێگومان ئەم کارە بەرژەوەندیی گەورەی بۆ هەردوولا پێوە دەبێت و بە دونیای دەسەلمێنێ رۆژئاوا ئامادەیە بەگەرمی و باوەشی ئاوەڵاوە پێشوازی لە کۆمەڵگایەکی موسوڵمانی مودێرن و دیموکراتیک بکات[47].

دوو ئەگەری سەرنجڕاکێشی دیکەشمان هەیە کە بریتین لە توونێس (٦٠٩٠ دۆلار) و مەراکێش (مەغریب) (٣٤١٠ دۆلار). توونس حکوومەتێکی دیکتاتۆریی هەیە و مەراکێش حکوومەتێکی پاشایەتی، بەڵام هەردووکیان چەند هەنگاوێکیان بە ئاراستەی کەمکردنەوەی لەمپەرەکاندا، بەتایبەت لە رووی ئابوورییەوە، هەڵگرتووە. سەرۆککۆماری توونێس، زەینەلعابدین بنعەلی، ئێستا لە دووەم دەیەی حکوومەتی خۆیدایە، ئەو زۆر سەختگیرانە وڵات بەڕێوە دەبات و ناهێڵێ فەزای سیاسی بکرێتەوە یان هیچ نەبێ چاکسازی لە یاساکاندا بکرێت. بەڵام لە هەمان کاتدا توونێس پێشکەوتنی ئابووریی بەربڵاو و بەرچاوی بەخۆوە بینیوە. بەپێی هەندێ لێکۆڵینەوە چینی مامناوەندیی توونێس دە قات زیادی کردووە و زیاتر لە نیوەی حەشیمەتی ئەو وڵاتەی گرتۆتەوە. هەرچەند رەوتی پێشکەوتنەکان تا ئێستا هێواش بووە بەڵام لە داهاتوودا ئەم ریفۆرمە ئابوورییانە درێژ دەبێتەوە بۆ رووبەرەکانی دیکەیش و رووبەری یاسا و گەشتوگوزار و زانیاریش دەگرێتەوە. لە مەراکێشدا کە قسەی زۆر دەکرێت و کردەوە کەمترە، دۆخەکە لەمەش خراپترە. شاموحەممەدی شەشەم دەسەڵاتێکی سیاسیی سەدەناوەڕاستیی لە باوکیەوە، حەسەنی دووەم، بە میرات پێ گەیشتووە. ئەم پادشا لاوە لە ئاخافتنە بێشومارەکانیدا داوای ریفۆرمی ئابووری، باڵادەستیی یاسا، مافی یەکسان بۆ ژنان و ئازادیی زیاتر بۆ هەموو هاووڵاتییان دەکات، بەڵام دوای تێپەڕینی سێ ساڵ بەسەر حکوومەتی شاموحەممەددا ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆ رووی نەداوە. بەم حاڵەشەوە هێشتا بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە عەرەبییەکانیتردا مەراکێش و توونێس تا رادەیەک کۆمەڵگایەکی کراوەن. ئەگەر ئەوان لە لیبرالیزەکردنی ئابووری و پاشان سیاسەتی خۆیاندا سەرکەون، بە هەموو دونیای دەسەلمێنن کە هیچ کولتوور و مەزهەب و ناوچەیەکمان نییە بە شێوەی جەوهەری دژ بە دیموکراسی بوەستێت.

---

٤٧ . لە کۆتاییی ٢٠٠٤دا بەرپرسانی یەکێتیی ئەورووپا و تورکیا لەسەر دەسپێکردنی وتووێژی رەسمی بۆ بوونە ئەندامی تورکیا لەم یەکێتییەدا رێکەوتن. هەرچەند ئەم وتووێژانە ناتوانێ ئەندامێتیی تورکیا گەرەنتی بکات و رەنگە تا دەساڵیش بخایەنێت، بەڵام وەک یەکەم هەنگاوی بنەمایی و کرداری دێتە ئەژمار. و.ف

## ئەم ڕەوتە ڕاناگیرێت

گرنگترین ڕووداوی چەند دەیەی داهاتوو لە بواری پێوەندیی نێوان سەرمایەداری و دیموکراسی، لە چیندا دەقەومێت. هەندێجار دیمەنی دەسەڵاتدارانی چین لەسەر میدیاکاندا سیمایەکی تۆقێنەرە، هەندێ لە سیاسەتمەداران و لێکۆڵەران بە دەستەواژەگەلی وەک «جەللادانی پەکین» پێناسەیان دەکەن، ئەڵبەت ئەم دەستەواژانە خاڵی لە حەقیقەت نین؛ ڕووداوەکانی مەیدانی تیان ئان مێن کۆمەڵکوژییەکی وەحشییانە بوون. بەڵام بۆ ئەوەی ڕێکوپێکتر لە دەستەبژێرانی دەسەڵاتداری چین بگەین باشتر وایە وەک کۆمەڵە سەرکردەیەکی نیگەرانی حیزبی کۆمۆنیست وێنایان بکەین، ئەو سەرکردانەی دەیانەوێ پرۆسەی ریفۆرم لە پڕجەشیمەترین وڵاتی جیهاندا بەڕێوە بەرن و لە هەمان کاتدا توند بە دەسەڵاتەوە نووساون و ئاگایان لە دەوروبەری خۆیانە. ئەگەر هەموو شتەکان بە باشی بەڕێوە بچن وەک دامەزرێنەرانی گەورە هێزێکی پیشەسازیی جیهان ڕێزیان لێ دەگرێت، بەڵام ئەگەر ئەزموونەکەیان شکست بخوات یان دەمرن یان دوور دەخرێنەوە بۆ مەغوولستانی بیانی.

«ئەم ئەزموونە» مانای تێکۆشانی سەرکردەکانی چینە بۆ مۆدێرنیزاسیۆنی وڵات لە ڕێگای کردنەوەی دەرگاکانی ئابووری و لە هەمان کاتدا کۆنترۆڵکردنی ئاڵوگۆڕە سیاسییەکان. بە ئاسانی دەتوانین ئەم سەرکردانە لە کاریکاتۆرێکدا وێنا بکەین کە هەوڵ دەدەن سەرمایەداری موتوربە بکەن بە دەوڵەتێکی فاشیستییەوە. ئەوان چاک دەزانن سەقامگیرکردنی سەرمایەداری تەنیا بە گۆڕانکاریی ئابوورییەوە ناوەستێ و گەلێ گۆڕانی دیکەیشی پێویستە، هەر بۆیە زەمینەی ریفۆرمیزاسیۆنی بەربڵاوی ئیداری و یاساییشیان خولقاندووە. لە ڕاستیدا خستنەبەرباسی باشترین ڕێگای لیبرالیزەکردنی سیستەم تا ڕادەیەک باسوخواسێکی ئازادە و هەستیارییەکی ئەوتۆ ناوروژێنێ. حکوومەتی چین تەنانەت لە هەندێ لە گوندەکانیشدا هەڵبژاردنی ئازادانەی بەڕێوە بردووە و مۆڵەتی داوە بە خاوەن کار و پیشەکان و بازرگانان ببنە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست. بەڵام هێشتا دامودەزگای سیاسی بە توندی کۆنترۆڵ دەکرێت و هەموو ناڕازییان بە سەختی سەرکوت دەکرێن. دەسەڵاتدارانی چین لەسەر ئەو باوەڕەن کە دیموکراتیزاسیۆنی پێشوەخت لە وڵاتێکی بەربڵاوی وەکوو چیندا کە گیرۆدەی هەژاری و ڕەنگاوڕەنگییە، دەبێتە هۆی بشێوی و شپرزەیی. ئەڵبەت هەندێ بیانوو و هۆکاری خۆخوازانەتریشیان هەیە: حیزبی کۆمۆنیست پاوانی ڕەهای دەسەڵات لە دەست دەدات.

ریفۆرمیزاسیۆنی ئابووریی چین ئاکامی سەرسووڕهێنەری بەدواوە بووە. لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠ تا ٢٠٠٠دا ڕێژەی مامناوەندیی داهاتی هەر تاکێکی چینی لە ١٣٩٤ دۆلارەوە بەرز بۆتەوە بۆ ٣٩٧٦

دۆلار، واتە نزیکەی سێ قات زیادی کردووە. نزیکەی ١٧٠ میلیۆن کەس هێڵی هەژارییان[٤٨] دەرباز کردووە. هەناردنی کەلوپەل لە پارێزگا کەنارییەکانەوە تەقیوەتەوە؛ لە ١٩٨١دا ڕێژەی هەناردن لە «شێنژێن»ەوە[٤٩] هەڤدە میلیۆن دۆلار بوو، دە ساڵ دواتر گەیشتە ٥/٩ میلیارد دۆلار و ئێستاکە زیاتر لە ٣٠ میلیارد دۆلاری گرتۆتەوە. لەم ناوچانەدا ڕێژەی سەرمایەگوزاریی بیانی بێئەندازە زیادی کردووە. گۆڕانکارییەکانیتر گەلێ هێواشتر روویان داوە. تا ئێستایش نزیکەی نیوەی بەرهەمە پیشەسازییەکان لە دەستی کۆمپانیا و کارگە گەورە دەوڵەتییەکاندایە، ئەڵبەت ئەم ڕێژەیە بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەی ساڵی ١٩٨٠دا ـ لە سەدا ٨٠ ـ ڕێژەیەکی کەمترە و بە خێرایی خەریکە کەمتریش دەبێتەوە. خێرایی ریفۆرمی زەویوزار بە شێوەیەکی بەرچاو دابەزیوە، بەڵام ئەگەر ئەم رەوتە هەر بەم شێوەیە درێژە پەیدا بکات بێگومان لە بیست ساڵی داهاتوودا چین دەبێتە وڵاتێکی دەوڵەمەند و خاوەن ئابووریی بازاڕی ئازاد و تێکەڵ بە ئابووریی جیهانی دەبێت. ئەگەر ئاوەها گۆڕانکارییەک لە چیندا بقەومێت دەبێتە مایەی سەرسووڕمان. ئەگەر چین بیهەوێ ڕێکەوتننامەی لەگەڵ ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانیدا جێبەجێ بکات، پێویستە لە رووبەرە بەربڵاوەکانی ئابووریی ناوخۆدا رەچاوی شەفافییەت، وەڵامدەربوون و دیسیپلینی بازاڕ بکات. رەنگە بوونە ئەندامی چین لە ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانیدا گۆڕانکارییەکی هێواش بەڵام هەژێنەر بێت.

هەندێ کەسی دیکەیش هەرچەند گۆڕانکارییەکانی چین بە گۆڕانێکی گەورە لەقەڵەم دەدەن بەڵام پێیان وایە ئەزموونی چین نیشاندەری ئەوەیە کە لیبرالیزاسیۆنی ئابووری گۆڕانکاریی سیاسیی لێ ناکەوێتەوە. ئەوان دەڵێن بەهەرحاڵ هێشتا دەسەڵات لە دەستی کۆمۆنیستەکاندایە. بەڵام چین تا ئێستایش وڵاتێکی جیهان سێیەمی و هەژارە و بۆرژوازییەکی تا رادەیەک بچووکی هەیە. هەروەها هێشتا بە شێوەیەکی نادیموکراتیکی رەها بەڕێوە ئەبرێت، هەر بۆیە ئەو گۆڕانکارییە بەربڵاوە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی تا ئێستا بە کردەوە روویان داوە زۆر ئاسان دائەپۆشرێن و لە چاو ون ئەبن. لە یەکەم دەیەی چاکسازیی ئابووریدا ـ لە نزیکەی ١٩٧٩وە تا ١٩٨٩ـ نارەزایەتییە سیاسییەکان زۆر خێرا پەرەیان سەند. بزاڤی «دیواری دیموکراسی» کە لە پەکینەوە سەریهەڵدابوو بیست شاری دیکەی گرتەوە و لە تەشق و لووتکەی خۆیدا زیاتر لە چل گۆڤاری جودابیری لێ کەوتەوە. تەنانەت لە نۆڤامبری ١٩٨٧ و لە دووتوێی راپۆرتە بەناوبانگەکەیدا بۆ کۆنگرەی سێزدەی حیزبی کۆمۆنیستی چین، ژائۆ جیانگی سەرۆکی حیزبی کۆمۆنیست رایگەیاند کە سەرەکیترین ئەرکی سەرشانی کۆنگرە بریتییە لە قووڵکردنەوە و خێراکردنەوەی ریفۆرمە سیاسی و

---

48. Poverty line

٤٩ . شارێکە لە باشووری رۆژهەڵاتی چین لە پارێزگای «کوانگ دانگ»دا. و.ف

ئابوورییەکان، جیانگ دەیویست بەم کارە شەرعییەت بە نارەزایەتیی سیاسی بدات. ئەو رایگەیاند کە ئامانجی حیزب «گۆڕینی چینە بۆ وڵاتێکی سۆسیالیستیی دەوڵەمەند، بەهێز، دیموکراتیک، پێشکەوتوو لە رووی کولتوورییەوە و، مودێرن». جیانگ دەیوت رەنگە تاقمە جیاوازەکانی خەڵک خولیا و روانگەی جیاوازیان هەبێت، هەر بۆیە پێویستە دەرفەت و میکانیزمی پێویستیان بۆ ئاڵوگۆڕی بیروڕا لە بەردەستدا بێت.

لە کۆتاییی هەشتاکانەوە نارەزایەتییە سیاسی و ئابوورییەکان بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر پەرەیان سەند. بەڕێوەبردنی هەڵە و گەندەڵی [پێکڕا] بوون بە هۆی لە کۆنترۆڵدەرچوونی سیستەمی ئابووری و لە ١٩٨٨دا رێژەی ئاوسان لە هەشتەوە بەرز بوویەوە بۆ هەژدە لە سەد. حکوومەت کەوتە بەر رەخنەی توند و بەبڵاوی سیاسییەوە، بە شێوەیەک کە تەنانەت وردە بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا تایبەتییەکانیش پاڵپشتییان لە نارازییان دەکرد. رێورەسمی کۆچی دواییی سەرۆکی پراتیکیی بزووتنەوەی نارازییان لە ئاوریلی ١٩٨٩دا ـ واتە سەرۆکی حیزبی لیبرال، هوو یا ئۆوینگ ـ بوو بە دەسپێکی زنجیرەیەک رێپێوان و مانگرتن. ئەم چالاکییانە دوو مانگی خایاند بەڵام لە نێو بڵێسەی ئاگردا سەرکوتیان کرد؛ ئارتەشی چین نارازییانی لە مەیدانی «تیان ئان مێن»دا بە دەبابە و گوللە و گازی فرمێسکرێژ تەفروتوونا کرد. دەلاقە بچووکە سیاسییەکان کە بە خەبات و تێکۆشانی هوو و ژائۆ کرابوونەوە داخران و ژائۆ سەرۆکایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی لێ سەنرایەوە.

دوای ماوەیەکی کورت ریفۆرمە ئابوورییەکان بەردەوام کرایەوە. لە ١٩٩٠ و ١٩٩١دا لە شانگهای و شێن ژێن بازاڕی بورس[50] کرایەوە. لە ژێر گوشاری بازاڕە نێونەتەوەییەکاندا نرخی گۆڕینەوەی دراو بە شێوەیەکی هەستیار دیاری دەکرا. ئاسانکاری لە یاساکانی سەرمایەگوزاریی بیانیدا کرا و شەپۆلێکی نوێی سەرمایەی بیانی رەوانەی چین کرا. لە ١٩٩٢دا گەورە سەرۆکی چین «دەنگ شیائۆپینگ» سەردانی ناوچە کاردامەزێنە کەنارییەکانی گوانگژۆ و شانگهای کرد و دانی بە دروستبوونی سیاسەتی بازاڕی ئازادی ئەو ناوچانەدا نا، لەو رێکەوتە بەدواوە ئاستی دژایەتیکردن لەگەڵ ریفۆرمە ئابوورییەکاندا کەم بۆتەوە. چین درێژەی بە سیاسەتی کەمکردنەوەی رۆڵی دەوڵەت لە ئابووریدا و تێکەڵبوون بە بازاڕە جیهانییەکان داوە و یاسا و رێساکانی قبووڵ کردوون. هەرچەند دەوڵەت بە ئاشکرا ستایشی چینی نوێی خاوەن کاروپیشە دەکات و دەرگای دۆستایەتییان بۆ ئاوەڵا دەکات، بەڵام لە بەستێنی سیاسیدا ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆ رووی نەداوە. ئەم وڵاتە کۆمەڵە کۆنڤانسیۆنێکی نێونەتەوەییی لە بواری مافە کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری، مەدەنی و سیاسییەکاندا ئیمزا کردووە. هەرچەند ئەم جۆرە بەڵگانە بەڵێنێکی رووتی سەر کاغەزن، بەڵام

50. Bourse

وەک چۆن قبوولکردنی دواکۆنڤانسیۆنی هێلسینکی لە لایەن سۆڤییەتەوە هەندێ زەخت و گوشاری خستە سەر ئەم وڵاتە، بێگومان ئەم بەڵگەنامانەش کۆمەڵێ سنوور و کۆتوبەند بۆ هەڵسوکەوتی حکوومەتی چین دیاری دەکەن.

هەرچەند بە رواڵەت نارەزایەتییە سیاسییەکان لەم ساڵانەی دواییدا کوژێنراونەتەوە، بەڵام زۆرێ لە توێژەران لەسەر ئەو باوەڕەن کە نارەزایەتییەکان لە فۆرمگەلێکی نوێ و لە چوارچێوەی رەخنە یاسایی و ئیدارییەکاندا بەرانبەر بە دەسەڵاتدارانی چین، ئاراستە دەکرێن. لێرەش وەک رۆژهەڵاتی ئاسیا ئارەزووی گەورەی دەسەڵات بۆ مۆدێرنیزاسیۆنی ئابووری گەلێ ئاسەواری سیاسیی نەخوازراوی لێ کەوتۆتەوە. بۆ وێنە چین لە پێناو بەڕێوەبردنی رێکەوتننامەکانی لەگەڵ رێکخراوی بازرگانیی جیهاندا ریفۆرمێکی بەربڵاوی لە یاساکانی خۆیدا کردووە و مافە ئابووری و مەدەنییەکانی بە شێوەیەکی پتەوتر دارشتۆتەوە. لە ئاکامدا رێژەی تۆمارکردنی داوانامە و سکاڵانامە یاساییەکان تەقینەوەیەکی گەورەی بەخۆوە بینیوە، بەشێک لەو داوانامە و سکاڵایانە دژ بە رێکخراوە دەوڵەتییەکان بەرز کراونەتەوە. هەژماری ئەو داوانامانەی کە هاووڵاتییانی چین دژ بە دەوڵەت پێشکەشیان دەکەن و تیایاندا سەردەکەون، رێژەیەکی بێوێنەی تێپەڕاندووە (٩٠٥٥٧ دانەی ساڵی ١٩٩٧ لە بەرانبەر هیچ دانەی ساڵی ١٩٨٤دا). ویلیام ئالفۆرد، توێژەری ماف و یاسا چینییەکان لە زانکۆی هارڤارد، کە زۆرجار بەرانبەر ریفۆرمی سیاسی لە چیندا بەدگومانە، بەم شێوەیە لە پێشهاتە نەخوازراوەکانی ریفۆرمی یاسایی دەدوێت:

حکوومەت لە رێگای یاساکانیەوە جۆرە ئەدەبیاتێکی یاسایی و ئەخلاقی و سیاسیی خولقاندووە تاکوو ئەوانەی خوازیاری رەخنەگرتن لە دەسەڵاتن لەم رێگایەوە دڵەخورپەکانیان رابگەیەنن، هاوکات تریبوونێکی بێوێنەیشی پێ بەخشیون کە دەتوانن لەو تریبوونەوە بیروبۆچوونەکانیان ئاراستەی هەموو لایەک بکەن. حکوومەت دەیویست بە شێوەی ئامێری و بە درۆ خۆی بە یاسامەند لەقەڵەم بدات و بە رواڵەت یاسا زاڵ بکات، بەڵام نەخوازراو کەرەستەیەکی کاریگەری پێشکەش بە نەیارانی کرد تاکوو لە رێگایەوە هەوڵی بەدیهێنانی ئامانجە زۆر جیاوازەکانیان بدەن.

چالاکڤانی نارازی و بەئەزموونی چینی، شۆ وێنلی، ئەم لێکدانەوەیە بە دروست دەزانێ و دەڵێت پێویستە لەمەولا بزووتنەوەی نارازییانی چین «بە شێوەی ئاشکرا و لە چوارچێوەی یاسای بنچینەیی چیندا خەبات بکات».

هەرکات باسی نارەزایەتی و جودابیری لە چیندا کرا رەنگە زۆر ئاسان بگەینە ئەو قەناعەتە کە دیموکراسیی زیاتر مانای ئازادیی زیاتر، بەڵام لە کورتخایەندا پێچەوانەی ئەم بۆچوونە دروستە. لە زۆربەی بابەتە گرنگەکاندا دەوڵەتی چین لە میللەتی چین لیبرالترە. کاتێک لە مارسی ٢٠٠١دا چین

فرۆکەیەکی سیخوڕیی ئەمریکای ناچار کرد لە خاکی ئەو وڵاتەدا بنیشێتەوە، ئـەمریکاییەکان گەلێ بەو هەموو سەختگیری و کەللەڕەقییەی چین لە وتووێژە دووقۆڵییەکاندا قەڵس بوون. کەچی بەو ئاستەی دەرفەتی [ڕاپرسی و] نرخاندن هەبوو خەڵکی چین پێیان وابوو دەوڵەت لە بەرانبەر ئەمریکاییەکاندا نەرمییەکی زۆری نواندووە. لە چەندەها بابەتی جۆراوجۆردا، لە تەکووزی و یاساوە بگرە تا ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ تایوان و ژاپۆن و ئـەمریکادا، حکوومەتی چین کەمتر لە خەڵکی چین پۆپۆلیست، ناسیۆنالیست، شەڕانگیز و دەمارگرژە.

ئەڵبەت لە چیندا نرخاندنی ڕای گشتی کارێکی سەختە، دواجار مەجبوورین تەنیا پشت بەو نیشانە و زانیارییە کەمانە ببەستین کە لە بەردەستدان. بۆ وێنە: ئەو ڕاپرسییە بەرکورتانەی بە مۆلەتی دەوڵەت ئەنجام دەدرێن، تەقینەوەی ڕای گشتی لە چاتڕوومەکانی ئینتەرنێتدا، یان ڕاپۆرتە بەپێزەکانی ڕۆژنامە بیانییەکان. بیروبۆچوونی ڕای گشتی لە هەرهەموو ئەم سەرچاوانەدا ئاراستەیەکی هاوبەشیان پێکاوە و بێگومان ئەم تێڕوانینە هاوبەشە نیشاندەری هەندێ ڕاستییە. ڕەنگە چین ئاراستەی مۆدێلێکی مێژوویی گرتبێتە بەر. ئەڵمانیا، نەمسا، هەنگاریا و هەموو ئەو وڵاتانەی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا ڕێگای مۆدێرنیزاسیۆنیان گرتە بەر، بە هەمان شێوەی ئێستای چین لە نێوان حکوومەتەکان و بزاڤگەلێکی بێشوماردا قەتیس مابوون. حکوومەتەکان زۆر بەدوای لیبرالیزاسیۆنەوە نەبوون و لەولاوەش ئەو هەموو بزاڤە بەهێزانە، توندڕەو، فاشیست، کۆمۆنیست و لە یەک وشەدا نالیبرالی بوون. بەم پێیە حکوومەتی ئێستای چین نابێ جودابیری سەرکوت بکات یان لە خێرایی ریفۆرمە سیاسییەکان کەم بکاتەوە، بە پێچەوانەوە سەرکردایەتیی چین تەنیا لە ڕێگای ریفۆرمی یاسایی، کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە دەتوانێ بارودۆخی شێواو و بێسەقامی ناوخۆی وڵات کۆنترۆڵ و میکانیزمێکی بۆ دیاری بکات. بەڵام باشتر وایە پرۆسەی لیبرالیزاسیۆن وردەوردە و وشیارانە بەڕێوە بچێت.

دەستەبژێرانی حیزبی کۆمۆنیستی چین وەک هەموو دەسەڵاتدارێکی پاوانخوازی پێش خۆیان کە هەوڵی مۆدێرنیزاسیۆنی داوە، وادەزانن لە دروستکردنی ئەم هاوسەنگییەدا ـ واتە تێکەڵکردنی لیبرالیزاسیۆنی ئابووری و کۆنترۆڵکردنی سیاسی ـ سەرکەوتن بەدەست دەهێنن. ئەوان لی کوانیوو، سەرۆک وەزیرانی پێشووی سەنگاپووریان وەک سەرچەشن و مۆدێلی خۆیان هەڵبژاردووە، لی خولیای دەسەڵاتخوازانی هێنایە دی، خولیای مۆدێرنیزەکردنی ئابووری و تەنانەت کۆمەڵگا بەبێ مۆدێرنیزاسیۆنی سیاسەت. هەموو ئەو دەسەڵاتدارە پاوانخوازانەی ڕێگای لیبرالیزاسیۆنیان گرتەبەر، وایاندەزانی دەتوانن وەک لی مۆدێرنیتە سەقامگیر کەن بەڵام دیموکراسی بخەنە دواوە. بەڵام ئەمە کارێکی نامومکینە.

جیا له وڵاته نەوتییەکانی کەنداو، سەنگاپوور تاکە وڵاتێکە ڕێژەی بەرهەمی سەرانەی لە سەرووی ١٠٠٠٠ دۆلارەوەیە و وڵاتێکی دیموکراتیک نییە (بەرهەمی سەرانەی سەنگاپوور ٢٦٥٠٠ دۆلارە). سەنگاپوور «شار- وڵات»ێکی بچووکە و لە ژێر سێبەری چەند دراوسێی گەورەدا دەژی و سەرکردایەتییەکی سیاسیی بێئەندازە زیرەک و لێهاتووی بووە. ئەم وڵاتە نموونەیەکی ئاوارتەیە لە یاسای داهاتی سەرانەدا کە ئاوارتەبوونەکەی زۆریش ناخایەنێ. سەنگاپوور هەر ئێستایش هەندێ لە فاکتەرە بەهێزەکانی لیبرالیزمی یاساخوازی هەیە. ئەم وڵاتە خاوەن ئابوورییەکی ئازادی گەشاوەیە و مافەکانی موڵکداری، [ئازادیی] بیروڕا، گەشتوگوزار و هتد بەتەواوی پارێزراوە. دەرگاکانی بە رووی دونیادا کردۆتەوە (تەنانەت قەدەغەکردنی بێمانای هەندێ لە رۆژنامە بیانییە دیاریکراوەکانیش لەبەر ئامادەبوونی ئینتەرنێتی بێسنوور کەمڕەنگ بۆتەوە). خەڵکی سەنگاپوور خەڵکانێکی خوێندەوار و هەڵگری تایبەتمەندیی جیهانین و لە بارودۆخی ناوچەکانیتری جیهان ئاگادارن. لە راستیدا رێکخراوی جیهانیی ئابووری و رێکخراوە سەربەخۆکانیتر بەردەوام سەنگاپوور بە یەکێک لە ئازادترین وڵاتانی دونیا لە رووی ئابوورییەوە لەقەڵەم دەدەن کە پاکژترین سیستەمی ئیداریی هەیە. بەڵام ئازادیی میدیاکان سنووردارە و نارەزایەتیی سیاسی لەویش سنووردارترە و هەڵبژاردنی ئازادانەیشی تێدا بەڕێوە ناچێ. هەرکەس سەردانی سەنگاپوور بکات تێدەگات ئەم وڵاتە لە گۆڕاندایە. لاوان کەمتر حەز لە سیستەمێکی سیاسیی داخراو دەکەن و بەتەمەنەکانیش دەزانن کە سیستەمی سیاسی ئاوەها نامێنێ و بەرەو کراوەیی دەچێت. ئەگەر جێنشینانی لی لە پازدەساڵی داهاتوودا بەدەستی خۆیان وڵات دیموکراتیزە بکەن، رەنگە لە دەسەڵاتدا بمێننەوە و پێگەی سیاسیی خۆیان بپارێزن، پێچەوانەی ئەمە بجووڵێنەوە لەپڕ بارودۆخەکە دەشێوێ و رەنگە دەسەڵاتیان لەکیس بچێ. بەڵام لە هەرحاڵدا ئەم وڵاتە لە دووتوێی ژیانی یەک نەوە و لە کردەوەدا دەگۆڕدرێ بۆ دیموکراسییەکی لیبرالی.

زۆربەی دەسەڵاتدارانی پاوانخوازی لیبرالی ئەورووپا چارەنووسێکی تاڵ ژیان. یا لەسەرکار لابران یان دوای دۆڕاندنی شەڕێک یان سەرهەڵدانی قەیرانێکی ئابووری لەسێدارەدران - هەندێجاریش تووشی هەردووکیان بوون. زۆرجار شەڕوشۆڕ و قەیرانی ئابووری ئاکامێکی باشی لێ دەکەوتەوە: رزگاربوون لە سیستەمی کۆن. جەنگی یەکەمی جیهانی زۆربەی حکوومەتە پاشایەتییەکانی لە شەرعییەت داماڵی؛ جەنگیدووەمی جیهانی دونیای لە فاشیزم رزگار کرد. ئەم پرۆسەیە لە رۆژهەڵاتی ئاسیادا هێمنانەتر رووی دا و قەیرانە ئابوورییەکان هەمان ئەو ئاکامانەیان لێ کەوتەوە کە لە ئەورووپادا بە شەڕ کەوتبوونەوە. قەیرانی قووڵی ئابووری لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا بە شێوەیەک نیزامییە دەسەڵاتدارەکانی کۆریای باشووری لە خشتە برد چیدی بۆ هەتاهەتایە

نەیانتوانی دەسەڵات بگرنەوە دەست. سۆهارتۆی سەرکۆماری ئەندەنۆسیا و کۆنە دەستەبژێرانی دەسەڵاتداری تایلەند، کاتێک کەوتنە نێو گێژاوی قەیرانی دارایی ١٩٩٨ی ئاسیاوە، بە ئاسانی لەسەر دەسەڵات لابران. ڕەنگە ئەگەر چین تووشی بشێوییەکی گەورەی ئابووری بێت شەرعییەتی حیزبی کۆمۆنیست بکەوێتە ژێر پرسیارەوە. چارەنووسی دەسەڵاتداری پاوانخواز کە ڕێگای مۆدێرنیزاسیۆن دەگرێتەبەر هاوشێوەی چارەنووسی مووسایە؛ دەتوانێ وڵاتەکەی بەرەو پێشەوە بەرێت، بەڵام ناتوانێ بۆ خۆی بیگەیەنێتە سەرزەمینی مەوعوود.

کۆمۆنیستەکانی چین دەبێ سەرلەنوێ مارکسەکەی خۆیان بخوێننەوە. کارل مارکس دەیزانی هەر وڵاتێک مۆدێرنیزاسیۆنی ئابووری بکات باوەش بۆ سەرمایەداری دەکاتەوە و بۆرژوازییەک دەئافرێنێ، دامودەزگای سیاسیش بە جۆرێک خۆی دەگۆڕێ کە نیشاندەری ئەم گۆڕانە بێت. بە دەربڕینی مارکسیستی، گۆڕانکاری لە «ژێرخان»دا هەمیشە «سەرخان» دووچاری گۆڕان دەکات. بە بێ لەبەرچاوگرتنی مەبەست و ئامانجی دەسەڵاتدارانی چین، ئەم وڵاتە چۆتە نێو ڕێگایەکەوە یان دیموکراسیی لێ دەکەوێتەوە یان ئاژاوە و بشێوی. هەڵبژاردنی هەرکام لەم دوو دەرئەنجامە لەدەستی دەوڵەتی چیندایە. ئایا دەوڵەتی چین وەک دەسەڵاتدارانی پاوانخوازی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا حەقیقەتە تازەکان قبووڵ دەکات و دەهێڵێ لیبرالیزاسیۆنی ئابووری لیبرالیزاسیۆنی سیاسیی بەدوادا بێت؟ یا تا دوادڵۆپ شەڕ دەکات و کۆی دەسەڵات بۆ خۆی دەپارێزێ؟ درۆمان نەکردووە ئەگەر بڵێین داهاتووی ئاشتی و ئازادی لە ئاسیادا ـ لە ڕاستیدا لە جیهاندا ـ گرێدراوی ئەم بڕیارەیە.

# بەشی سێیەم

## دیموکراسیی نالیبرالی

ئەگەر تاکە دیمەنێک هێمای دوایین مەرگی کۆمۆنیزم بێت، ئەو دیمەنەی بووریس یێلتسینە کە لەسەر دەبابەیەک وەستاوە. نۆزدەی ئووتی (ئاب) ١٩٩١ بوو، سەرلەبەیانیی ئەو رۆژە تاقمێ لە ئەندامانی کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت باری نائاساییان راگەیاندبوو. کۆمیتەی خۆدامەزرێنەری باری نائاسایی، میخاییل گورباچۆفی سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستیان لە ماڵەکەی خۆیدا بەند کردبوو و ئارتەشیان بۆ گەڕاندنەوەی هێمنایەتی رەوانەی شەقامەکان کردبوو و راگرتنی ریفۆرمە لیبرالییەکانی گورباچۆفیان راگەیاندبوو. رەنگە کاربەدەستە کۆمۆنیستەکان توانیبایان جارێکی دیکە رژێمی دیکتاتۆری بەسەر سۆڤییەتدا بسەپێنن، بەڵام یێلتسین کە تازەبەتازە و بە پاڵپشتییەکی مەزن وەک سەرۆککۆماری رووسیا هەڵبژێردرابوو، لەگەڵیان بەشەڕ هات. ئەو کوودێتاکەی شەرمەزار کرد و داوای لە گەلی رووسیا کرد بەرخۆدان بکەن، هەروەها داوای لە ئارتەش کرد گوێڕایەڵی کوودێتاچییان نەبێ. یێلتسین بەم کارەی نیشانی دا مرۆڤێکی زۆر بوێر و نەترسە و بەهرە و توانایەکی جەوهەریی بۆ سیاسەتکردن هەیە، ئەو بە پێ خۆی گەیاندە ئەو سەربازانەی گەمارۆی پەرلەمانی مەرمەڕینی رووسیایان دابوو ـ «کۆشکی سپی»ی رووسەکان ـ لە دەبابەیەکەوە سەرکەوت و تەوقەی لەگەڵ کارگێڕانی حەپەساوی دەبابەکەدا کرد و، کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیی گرێ دا. درێژەی [ئەم چیرۆکە] لە مانای راستەقینەی وشەکەدا، مێژوو بوو.

ئەمە ساتەوەختێکی گەورەی رووسیا بوو. بەڵام بەمەشەوە و سەرەڕای ئەوەی رووسیا لە تەشقی سەرکەوتنی دیموکراتیکدا بوو، مرۆڤ دەیتوانی پێشبینیی تراژێدیایەکی دیموکراتیکی بۆ بکات. لە راستیدا یێلتسین لەسەر ئەو دەبابەیە تەنیا چەند فەرمانێکی خوێندەوە، ئەمە هەمان فەرمانە یەکلایەنییەکانی سەرۆککۆمار بوون کە بوونە بەرجەستەترین تایبەتمەندیی حکوومەتی هەشت ساڵەی یێلتسین. لە ئووتی (ئاب) ١٩٩١دا (هەروەها بۆ جارێکیتر لە ١٩٩٣دا کە پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە و یاسایەکی بنچینەییی تازەی راگەیاند) یێلتسین هەوڵی دەدا لە بەرانبەر تاقمێک

کۆمۆنیستی شەڕانگێزدا پارێزگاری لە دیموکراسیی ساوا و لاوازی رووسیا بکات. بەڵام بەڕێوەبردنی حکوومەت لە رێگای فەرمان دەرکردنەوە بوو بە میتۆدێکی باو و ئاسایی. یێلتسین هەرکات بەرەورووی کێشەیەک دەبوویەوە، نە هەوڵی کۆکردنەوەی لایەنگرانی و خستنە بەردەستی رێگەچارەیەکی سیاسیی دەدا و نە ئامادە بوو (لەگەڵ لایەنی بەرانبەر) رێکەوتن بکات. بە پێچەوانەوە، هەمووکات دەستووری سەرۆککۆمار تاقە رێگاچارە بوو، ئەو دەستوورانەی کە هەندێجار یاساییبوونیان گومانی لەسەر بوو. ئەو دەسەڵات و خۆشەویستیی خۆی بە ئاراستەی پێشێلکردنی مامەڵە ئاساییەکانی دونیای سیاسەتدا دەخستە گەڕ. ئەگەر بەرپرسانی خۆماڵی لەگەڵی بەشەڕ هاتبان کۆی دامودەزگای دەوڵەتی خۆماڵیی ناوچەکەی هەڵدەوەشاندەوە، ئەگەر پارێزگاران دژی وەستابان لەسەرکاری لادەبردن. جارێک دادگای یاسای بنچینەییی رووسیا یەک لە دەستوورەکانی ئەوی بە ناڕەوا لەقەڵەم دا، یێلتسین حوکمی دادگاکەی قبووڵ نەکرد و مووچەی مانگانەی سەرۆکی دادگای بڕی و ناچاری کرد نائومێدانە دەست لە کار بکێشێتەوە. یێلتسین جیا لە نووسینگەکەی خۆی هیچ دامەزراوەیەکی دیکەی رووسیای قبووڵ نەبوو. ئەو بەردەوام بەدوای لاوازخستنی پەرلەمان و دادگاکانەوە بوو. ئاگری شەڕێکی وەحشییانەی لە چیچاندا هەڵگیرساند و گوێی بە هیچکام لە پرۆسە باوەکانی راوێژکاری نەدا، چ بگا بەوەی [ڕەچاوی سیاسەتی] کۆنترۆڵ و هاوسەنگی [بکات]. یێلتسین لە دوامانگەکانی سەرۆککۆماریدا دەستی دایە کارێک کە ریچارد پایپسی مێژوونووس (کە پشتیوانییەکی بێوێنەی لە یێلتسین کردبوو) ناوی «کوودێتا»ی لەسەر دانا: ئەو شەش مانگ پێش هەڵبژاردنەکانی سەرۆککۆماری دەستی لە کار کێشایەوە و ڤلادیمیر پووتینی سەرۆک وەزیرانی وەک کەفیلی سەرکۆماری دیاری کرد. بەم شێوەیە هەڵبژاردنی داهاتووی سەرۆککۆماری بوو بە شتێکی فۆرمالیتە، چونکو لە باتیی ململانێیەکی راستەقینە، دەسەڵات چەسپێنرا. پووتین وەک سەرۆککۆماری وڵات و بە ئۆتۆریتە و شکۆی سەرۆک دەوڵەتێکەوە، لە بەرانبەر تاقمێک سیخوڕ و بەکرێگیراودا بەشداریی لە هەڵبژاردندا کرد (ئەم سەرۆک دەوڵەتە سەرۆکایەتیی شەڕێکیشی دەکرد).

دوای کۆتاییهاتنی حکوومەتەکەی، لە رووسیا و زۆربەی جیهاندا، یێلتسین بە کەسایەتییەک دەزانرا کە سەردەمی بەسەر چووە. ئەم مرۆڤە شەڕانی و پەککەوتە و نەخۆش و هەمیشە مەستە، وەک فوسیلێکی سیاسیی لێ هاتبوو. بەڵام رەنگە لە راستیدا یێلتسین پێشەنگی داهاتوو بووبێ، ئاڵاهەڵگری جۆرە سەرکردایەتییەکی سیاسی کە رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر تەشەنە دەسێنێ: سەرۆکی ئۆتۆریتەخوازی جەماوەری. لە رووخانی کۆمۆنیزم بەملاوە هەندێ لە وڵاتانی جیهان کەوتوونەتە ژێر

دەسەڵاتی حکوومەتگەلێکی هاشێوەی حکوومەتی رووسیاوە، ئەمانە تێکەڵکردێکن لە هەڵبژاردن و ئۆتۆریتەخوازی، بە زمانێکیتر ئەمانە دیموکراسیی نالیبرالین.

## گەڕانەوەی رووسیا

رووسیا و چین گرنگترین وڵاتانی جیهانن کە دیموکراسیی لیبرالی نین. هەوڵەکانی ئەو دوو وڵاتە لە پێناو دۆزینەوەی سیستەمی سیاسی و ئابووریی گونجاو لەگەڵ خۆیاندا، گرنگایەتییەکی گەورەی جیهانیی هەیە. ئەگەر هەردووکیان دیموکراسیی لیبرالیی رۆژئاوا قبووڵ بکەن هەموو زلهێزانی جیهان دەبنە خاوەن سیستەمی بەسەقام، سیستەمێک کە بە میتۆدی رەزامەندیی گشتی و باڵادەستیی یاسا دەجووڵێتەوە. ئەمە بە واتای ئاشتیی هەمیشەیی و نەمانی رکابەرییە نێونەتەوەییەکان نییە، بەڵام رەنگە بە واتای دونیایەکی جیاواز و هێمنتر بێت. بەڵام ئەم دوو وڵاتە ئەمێستا میتۆدی جیاواز لە یەکتر دەژین. چین بەرەو ریفۆرمی ئابووری و هەروەها بە شێوەیەکی زۆر هێواش بەرەو ریفۆرمی رەهەندەکانیتری سیستەمی یاسایی و ئیداریی خۆی هەنگاوی ناوە، بەڵام هەوڵەکانی بۆ سەقامگیرکردنی دیموکراسی گەلێ بچووک و لاوازە. بە پێچەوانەوە، رووسیا سەرەتا و بە خێرایی بەرەو ریفۆرمی سیاسی هەنگاوی نا، تەنانەت لە سەردەمی گورباچۆفیشدا زیاتر ئەولەوییەت بە گلاسێنۆست (کرانەوەی سیاسی) درابوو تاکوو پرۆستێرویکا (چاکسازیی ئابووری). دوای رووخانی کۆمۆنیزم رووسیا زۆر خێرا بەرەو هەڵبژاردنی ئازاد و دادپەروەرانە هەنگاوی هەڵگرت، بەو هیوایەی هەڵبژاردن دیموکراسیی لیبرالیی رۆژئاواییی لێ بکەوێتەوە. هەروەها قۆناغێکی کورت لە سەرەتای نەوەدەکاندا گەلێ ریفۆرمی ئابوورییان دەست پێ کرد، بەو هیوایەی سەرمایەداریی رۆژئاوایی بەدی بهێنن، بەڵام زۆربەی ئەم هەوڵانە هیچ ئاکامێکیان بەدواوە نەبوو. بە زمانێکی زۆر سادە، چین بەر لە ریفۆرمی سیاسی سەرقاڵی ریفۆرمی ئابوورییە بەڵام رووسیا پێچەوانەی ئەم رێگایەی هەڵبژارد.

لەوڕۆدا رووسیا لە چین ئازادترە. رووسیا زیاتر لە چین مافە تاکییەکان و ئازادیی چاپەمەنییەکان دەپارێزێ و تەنانەت لە تیۆریدا ئابوورییەکی کراوەتری بۆ رەقابەت و سەرمایەگوزاریی بیانی هەیە. چین هێشتا وڵاتێکی داخراوە کە لە لایەن حیزبی کۆمۆنیستەوە بەڕێوە دەچێت، بەڵام بەردەوام لە چەندین بوارەوە - زیاتر لە بواری ئابووری و یاساییەوە - سەرقاڵی لیبرالیزاسیۆنە. دواجار کام یەک لەم دوو رێگایە رێگایەکی گونجاوترە بۆ بەدەستهێنانی دیموکراسیی لیبرالی؟ ئەگەر گەشەسەندنی ئابووری و چینی مامناوەندی دوو فاکتەری سەرەکی بن بۆ بەدیهێنانی دیموکراسییەکی درێژەدار، بێگومان چین رێگایەکی دروستی هەڵبژاردووە. لە ٢٥ ساڵی رابردوودا ئابووریی ئەم وڵاتە بە شێوەیەکی بەرچاو گەشەی سەندووە. بە پێچەوانەوە دوای

١٩٩١ ڕێژەی سەراپای بەرهەمی نەتەوییی ڕووسیا[٥١] لە سەدا نزیکەی ٤٠ دابەزیوە و تەنیا لەم چەند ساڵەی دواییدا هەوڵی قەرەبووکردنەوەی دراوە کە ئەویش زیاتر هەڵدەگەڕێتەوە بۆ بەرزبوونەوەی نرخی نەوت. ئەگەر چین درێژە بەم ڕێگایەی ئێستا و گەشەسەندنی ئابووری بدات، ئەگەر باڵادەستیی یاسا زیاتر پەرە پێ بدات، ئەگەر بۆرژوازییەک ڕۆ بنێت و ئینجا سیاسەتی خۆی لیبرالیزە بکات ـ هەرچەند ئەم ئەگەرانە ئەگەری زۆر گەورەگەورەن ـ ئەوسا لە گۆڕانکارییەکی مەزندا دەبێتە خاوەن دیموکراسییەکی ڕەسەن.

ئەگەر ڕووسیا لەم ڕێگا سەرەولێژەیدا بەرەو ئۆتۆریتەخوازیی هەڵبژێردراو بڕوات ـ کە ئەمەش ئەگەرێکی گەورەیە ـ واتە ئۆتۆریتەخوازییەک کە تیایدا ئازادییەکان ئەوەندەی بە قسە دەپارێزرێن بە کردەوە پێشێل دەکرێن و گەندەڵی لایەنێکی پەیوەست و دانەبڕاوە لە سیستەمی سیاسی و ئابووری، ئەوسا دەتوانێ درێژە بە ژیانی تەواو دیموکراتیک بەڵام نالیبرالیی خۆی بدات. ڕەنگە دواجار ڕووسیا سیمای ئەو جۆرە ڕژێمانە بگرێت کە لە شەست و حەفتاکاندا ئەمریکای لاتینیان گرتبووە ژێر دەسەلاتی خۆیان، واتە ڕژێمێکی سەرمایەداریئاسا کە یەکگرتنێکی هەمیشەیی دەستەبژێرانی دەسەلاتداری پێکەوە گرێ داوە. لە ئەمریکای لاتیندا کۆمپانیا گەورەکان و ئارتەش یەکیان گرتبوو: لە ڕووسیادا ئۆلیگارشەکان و دەستەبژێرانی کۆمۆنیستیی پێشوو یەکیان گرتووە. وادیارە زۆربەی کۆمارەکانی [وڵاتانی] سۆڤییەتی پێشوو ـ ئاسیای ناوەڕاست، بێلاڕووس و ئۆکراین ـ گیرۆدەی ئەم جۆرە ڕژێمەن. لەم بوارەدا سێ وڵاتەکەی کەناری باڵتیک نموونەگەلێکی ئاوارتەی سەرنجڕاکێشەرن.

ڕووسیا، بە زانابوون یان لە ڕووی نەزانینەوە، دوو وانەی گرنگ و کاریگەری ناو ئەزموونی مێژوییی دیموکراتیزاسیۆنی لە بەرچاو نەگرتووە: جەختکردن لەسەر گەشەسەندنی ڕەسەنی ئابووری و ڕۆنانی دامەزراوەگەلی کارامەی سیاسی. مۆسکۆ نەیتوانیوە هیچ کامیان بەدی بێنێ.

کێشەی سەرەکیی ڕووسیا ئەوە نییە کە وڵاتێکی هەژارە کە هەوڵی مۆدێرنیزاسیۆن دەدات، بەڵکوو ئەوەیە کە وڵاتێکی دەوڵەمەندە کە هەوڵی مۆدێرنیزاسیۆن دەدات. لە سەردەمی سۆڤییەتی پێشوودا منداڵە قوتابییەکانیان بەوە ڕادەهێنا کە لە دەوڵەمەندترین وڵاتی جیهاندا دەژین. ئەم پڕوپاگەندە کۆمۆنیستییە ڕاست بوو. ئەگەر سەرچاوە سروشتییەکان ڕێبەی پێوانەی سامانی نەتەوەیی بووبێ، ڕەنگە ڕووسیا پلەی یەکەمی دونیای بەدەست بهێنایە. ڕووسیا خاوەن سەرچاوەی مەزنی نەوت، گاز، ئەڵماس، نیکێل و سەرچاوە کانزاییەکانیترە. ڕەنگە ئەم سەرچاوانە تەمەنی

---

51. Gross national product

سۆڤییەتی کۆمۆنیستیان یەک نەوە زیاتر کردبێ، بەڵام لە هەمان کاتدا کاریگەرییان لەسەر دروستبوونی دەوڵەتێکی هەڵشکاویش[٥٢] هەبوو.

دەوڵەتی مەملەکەتی خەونەکانی کۆمۆنیزم، پێویستی بە داهاتی پیتاکی نەبوو، چونکوو خاوەن سەرجەم ئابووریی وڵات بوو. بەشێکی گەورەی (کارگە و کۆمپانیا) بەرهەمهێنەرەکان لە حەفتاکانەوە بێبایەخ کەوتبوون. لە راستیدا کەرەستە خاوەکان لە کەرەستە بەرهەمهاتووەکان بەبایەختر بوون. دەوڵەتی سۆڤییەت بۆ دابینکردنی بوودجەی خۆی، بە رادەیەکی زۆر، یەکسەر پشتی بە داهاتی سەرچاوە سروشتییەکان بەستبوو. بەم شێوەیە رژێمی سۆڤییەت، پێچەوانەی رژێمە دیکتاتۆرییەکانی کۆریای باشوور و تایوان، قەت نەکەوتە دوای رۆنانی یاسا و سیاسەتگەلێکی تایبەت بۆ ئاسانکردنەوە و پەرەپێدانی گەشەسەندنی ئابووری. ئەو حکوومەتە دەوڵەمەندانەی کە شەرعییەتێکی کەمیان هەیە، زۆرجار هەندێ پوەن و مافی تایبەتی پێشکەش بە هاووڵاتییانیان دەکەن و ئەمە وەک بەرتیلێک بە کار دێنن بەڵکوو بەر بە هەرچەشنە یاخیبوونێک بگرن (وەک عەرەبستانی سعوودی). بەڵام سۆڤییەت بە ترساندن و تۆقاندنی هاووڵاتییان ئەم کارەی دەکرد. مۆسکۆ نەیدەویست سەروەت و سامانی خۆی بە هاووڵاتییانی ببەخشێ، چونکوو ئامانجی زۆر بەرزتر و پیرۆزتری بۆ ئەو سەروەتە دارشتبوو، ئامانجی وەک پاراستنی سیستەمی زەبەلاحی بەرگریکردن و راگرتنی نوێنەرە جیهان سێیەمییەکانی. دوای رووخانی کۆمۆنیزمی سۆڤییەت جێنشینانی گورباچۆف بوون بە میراتگری دەوڵەتێک کە دەرەقەتی تۆقاندنی خەڵک دەهات، بەڵام لە ئاست بەرێوەبردنی ئابوورییەکی مۆدێرندا زۆر دەسکورت و لاواز بوو.

بەداخەوە یێلتسین لەمپەرەکانی بەردەم گەشەسەندنی سیاسیی بەرفراوانتر کردەوە. لایەنگرانی یێلتسین بۆ پاساودانەوەی هەڵسوکەوتی ئۆتۆریتەخوازانەی ئەو دەڵێن سەرۆککۆمار بە شێوەیەکی شێلگیرانە و سەرسەختانە دژ بە هێزە دژەدیموکراسییەکان خەباتی دەکرد، ئەمە قسەیەکی دروستە، بەڵام دامەزرێنەرێکی سیاسی پێویستە هەنگاوە رووخێنەرەکانی بە کۆمەڵە هەنگاوێکی ئاواکارانەی گەورەتر درێژە پێ بدات. جەواهێر لەعل نەهرۆ سێزدە ساڵ لە تەمەنی لە پێناو خەباتکردن لە دژی داگیرکاریی بریتانیا لە بەندیخانەدا بوو، بەڵام کاتێ کە بوو بە سەرۆک وەزیرانی هیندستانی سەربەخۆ ساڵانێکی زۆر زیاتری بۆ پاراستنی دامەزراوە بریتانییەکان تەرخان کرد. نێلسۆن ماندێلا بریاری بەرخۆدانی توندرەوانە و توندوتیژی دژ بە ئاپارتاید راگەیاند، بەڵام دوای بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات و لە پێناو ئاواکردنی ئافریقای باشووری چەندرەگەزیدا داوای یارمەتیی لە سپیپێستان کرد.

---

52. Bankrupt state

بەڵام پێچەوانەی نەهرۆ و ماندێلا، یێلتسین هەنگاوێکی ئەوتۆی بە ئاراستەی رۆنانی دامەزاروە سیاسییەکان لە رووسیادا هەڵنەگرت. لە راستیدا یێلتسین زۆر چالاکانە نزیک بە هەموو ناوەندە دەسەڵاتە رکابەرەکانی لاواز خست، ناوەندی وەک پەرلەمان، دادگاکان و پارێزگارە خۆماڵییەکان. یاسای بنچینەیی ساڵی ١٩٩٣ کە دیاریی کرد بە رووسیا، خەسارێکی گەورە بوو، ئەم یاسایە بوو بە بەرهەمهێنەری پەرلەمانێکی لاواز، دامودەزگایەکی دادوەریی ناسەربەخۆ و سەرۆککۆمارێکی کۆنتررۆڵنەکراو. رەنگە لە هەمووی ناخۆشتر ئەوە بێت کە حیزبێکی سیاسیی دانەمەزراند. ئەو دەیتوانی بەم کارە زۆر ساکارە هەموو ریفۆرمخوازانی رووسیا کۆ بکاتەوە و یەکیان بخات. ئەم کارە زیاتر لە هەر کارێکیتر دەیتوانی ببێتە گەرەنتییەک بۆ رۆچوونی دیموکراسی بە کۆمەڵگای رووسیادا و دواجار هاتنە بەرهەمی دیموکراسییەکی رەسەن لەم وڵاتەدا، بەڵام ئەم کارەی ئەنجام نەدا. رەنگە ئەم خاڵە بە کارێکی بچووک بزانین، بەڵام حیزب میکانیزمێکە کە خەڵکی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان لە رێگایەوە بەها ئەخلاقی و سیاسییەکانیان رادەگەیەنن، پەسندی دەکەن و دەیچەسپێنن. سەردەمانێک کلینتۆن راسیتێر، مێژوونووسی دیموکراسیی ئەمریکا، دەیوت: «ئەمریکا بە بێ دیموکراسی، دیموکراسی بە بێ سیاسەت و سیاسەت بە بێ حیزب، بێمانایە». ئەمە بۆ هەموو شوێنێک دەشێت. ئەگەر حیزبی سیاسی نەبێت سیاسەت دەبێتە یارییەکی رووت بۆ [یاریکردنی] تاکەکان، گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان و پیاوانی بەهێز و بەدەسەڵات. ئەمە پێناسەیەکی گونجاوە بۆ دیموکراسیی ئەمڕۆی رووسیا.

گرنگترین میراتی یێلتسین چاکسازییە لیبرالییەکانی نەبوو بەڵکوو [ئافراندنی] سەرۆککۆمارییەکی بەهێز بوو کە پووتین بەهێزتریشی کردەوە. پووتین لە هەمان یەکەم ساڵی سەرۆککۆماریدا پاشماوەی دەوڵەتی رووسیای لاواز و بێکاریگەر خست. سەرەکیترین ئامانجی ئەو [بێکاریگەرخستنی] پارێزگارانی خۆماڵی بوو، پووتین سەرەتا حەوت «سەرووپارێزگار»ی بۆ چاودێریکردنی ٨٩ ناوچەکەی رووسیا دیاری کرد و بەم کارە و لە کردەوەدا دەسەڵاتی لە پارێزگارانی خۆماڵی سەندەوە، دواجار لە ئەنجومەنی سێناش دەری کردن[٥٣]. نوێنەرانی دیاریکراوی کرێملین جێگای ئەوانیان گرتەوە. هەروەها لەمەوبەدوا ئەگەر سەرۆککۆمار پێیوابوایە پارێزگارێک یاسای پێشێل کردووە دەیتوانی لایبات. هەروەها رەزامەندیی ئەنجومەنی دۆمای بۆ پەسندکردنی

---

٥٣ . لە دوایین نموونەی ئەم جۆرە کارانەدا و دوابەدوای رووداوی بەدیلگرتنی سێپتامبری (ئەیلول) ٢٠٠٤ لە قوتابخانەیەکدا لە بۆسلان، پووتین لە ژێر ناوی شەڕی دژەتیرۆردا دەستی دایە زنجیرەیەک ریفۆرمی سیاسی کە بە پێی یەک لەم ریفۆرمانە دیاریکردنی پارێزگاران لە رێگای هەڵبژاردنەوە هەڵوەشێنرایەوە و ئیتر سەرۆککۆمار بۆخۆی راستەوخۆ پارێزگارانی دیاری دەکرد.

یاسایەک بە مەبەستی کەمکردنەوەی بەشی پارێزگاکان لە داهاتی پیتاکی وەرگرت. ئامانجێکی دیکەی پووتین ترساندن و تۆقاندنی میدیاکان و ئۆلیگارشە بەدناوەکانی رووسیا بوو کە بۆ ئەم مەبەستە لە هێرشی کتوپڕی پۆلیس، دەستگیرکردن و زیندانیکردن کەڵکی وەردەگرت. ستراتیژی تۆقاندن گەلێ کاریگەر بوو، ئێستە بە دەگمەن رووبەڕێک بۆ ئازادیی چاپەمەنییەکان ماوەتەوە. لە ئاوریلی (نیسان) ساڵی ٢٠٠١دا کۆنسێرسیۆمێکی هاوپەیمانی کرێملین کۆنترۆڵی کەناڵی تەلەڤزیۆنیی NTVی گرتە دەست و زۆربەی فەرمانبەرە بەرزەکانی ئەم کەناڵەی دەرکرد، ئەمە دواهەمین کەناڵی سەرانسەری و سەربەخۆی رووسیا بوو. هەندێ لە هەواڵنێرانی ئەم کەناڵە بۆ ناڕەزایی دەربڕین دەستیان لە کار کێشایەوە و پەنایان بردە بەر کەناڵێکیتر کە ڤلادیمیر گوسینێسکی، دامەزرێنەری NTV، خاوەنی بوو، بەڵام کاربەدەستانی پیتاکی زۆر خێرا هێرشیان کردە سەر سەرۆکی ئەم کەناڵە تازەیەش. بە ناو هێشتا چاپەمەنییەکان سەربەخۆن، بەڵام بە هەموو شێوەیەک ملکەچ و گوێڕایەڵی دەوڵەتن.[١]

پووتین هەموو ئەم کارانەی لەسەر داخوازیی دەنگدەران ئەنجام داوە. لە راپرسییەکی «سندووقی رای گشتی» لە ساڵی ٢٠٠٠دا لە سەدا ٥٧ی خەڵکی رووسیا بەرنامەکانی پووتینیان بۆ سانسۆڕی چاپەمەنییەکان پێ باش بوو. تەنانەت بە رێژەیەکی بەرزتر پشتیوانییان لە سەرکوتکردنی ئۆلیگارشەکان کردبوو، زۆربەی ئەم ئۆلیگارشانە گومانیان لەسەرە، ئەوان سەروەت و سامانی خۆیان بە شێوازێکی گومانلێکراو کۆ کردۆتەوەوە و بە شێوازێکی گومانلێکراوتر دەیپارێزن. زۆربەی پارێزگارانی ناوچەیی کۆمەڵە دەرەبەگێکی خۆماڵی و تینووی گەندەڵی بەولاوە هیچیتر نین. بەڵام کاتێ پووتین پۆلیسی نهێنی بەر دەداتە گیانی بازرگانان و سیاسەتمەدارانی نابەدڵی خۆی، تاقە بەرهەمی ئەم کارەی لاوازخستنی باڵادەستیی یاسایە. جارێکیان ئولیگارشێکی بچووک (کە تا رادەیەک ناوبانگێکی باشی هەیە) لە مۆسکۆ پێی وتم «ئێمە هەموومان، هەریەکەو بە جۆرێک لە جۆرەکان، یاسامان پێشێل کردووە. لە رووسیا کەس ناتوانێ بە بێ پێشێلکردنی یاسا بازرگانی بکات. پووتین ئەم مەسەلەیە دەزانێت، هەر بۆیە ئەگەر بڵێین ئەو تەنیا بەڕێوەبەری یاسایە قسەیەکی قۆڕمان کردووە. پووتین بۆ ئامانجە سیاسییەکانی خۆی بە شێوەی گوڵبژێر یاساکان بەکار دەهێنێ». بەکارهێنانی یاسا وەک چەکێکی سیاسی، ئایدیای یەکسانبوون لە بەرانبەر یاسادا لەخشتە دەبات.

ئاسەوارە درێژخایەنەکانی ئەم هەوڵانەی پووتین بۆ سڕینەوەی وردەوردەی نەیاران، لە هەموو شتێ گرنگترە. پلورالیزم لەسەر بنەمای بەربەرەکانێی ناوەندەکانی دەسەڵات دامەزراوە. ڤلادیمیر ریزخۆف، یەک لە دەگمەن نوێنەرانی لیبرالی پەرلەمانی رووسیا، بە ئاشکرا رووسیا و رابردووی

ئەورووپای پێکەوە بەراورد کردووە: «ئەو لۆرد و بارۆنانەی لە هەمبەر دەسەڵاتی پاشایەتیدا دەوەستان، بۆ خۆیان پیاوچاک و بەشەرەف نەبوون، بەڵام دەسەڵاتی پاشایەتییان هەوسار کرد. کێشەی ئێستای رووسیا ئەوەیە کە ئەگەر پووتین سەرکەوێت ئەوا تەنانەت تاقەیەک کەسیش نامێنێتەوە کرێملین کۆنترۆڵ بکات. ئەگەر بکەوینە ئاوەها دۆخێکەوە باشترین کار ئەوەیە دیسان پەنا بۆ تێزارێکی باش بەرین».[٢] پووتین تێزارێکی باشە. ئەو دەیەوێ رووسیایەکی مۆدێرن ئاوا بکات. ئەو پێی وایە بۆ لیبرالیزەکردنی ئابووریی رووسیا پێویستە تەکووزی و دەوڵەتێکی لێهاتووی هەبێ. رەنگە تەنانەت پێی وابێ دواجار رووسیا دەتوانێ سیستەمی سیاسیی خۆی دیموکراتیزە بکاتەوە. ئەگەر پووتین سەرکەوتن بەدەست بهێنێ ئەتوانێ رووسیا بکاتە وڵاتێکی پیشەسازیی ئاسایی کە هەڵگری هەندێ تایبەتمەندیی لیبرالییە، ئەمە هەمان ئەو کارەیە شیاوی تێزارێکی باشە. ریزخۆف دەڵێت: «بارودۆخی رووسیای سەرەتای نەوەدەکان لە پۆڵەندای دوای کۆمۆنیزم دەچوو، ئێستا لە شیلیی سەردەمی پینۆشە دەچێت». بێگومان دەکرێ مۆدێلی پینۆشە دووپات بێتەوە؛ ئەو دواجار وڵاتەکەیی بەرەو دیموکراسیی لیبرالی برد.

بێگومان بەڵگاندنێکی سەیرە ئەگەر بۆ پەسندکردنی رەوتی دیموکراتیکی رووسیا بڵێین ئەم رەوتە سەرۆکێکی هەڵبژاردووە کە بە سەرکوتکردنی نەیاران، خنکاندنی میدیاکان، قەدەغەکردنی حیزبە سیاسییەکان و پاشان لیبرالیزەکردنی ئیجباریی ئابووری، دواجار دیموکراسییەکی راستەقینە پێشکەش [بە رووسیا] دەکات. بەپێی ئەم تێزە دیموکراسیی نالیبرالی شتێکی باشە، چونکوو بە رێکەوت بۆتە هۆی هاتنەسەرکاری ئۆتۆریتەخوازێکی لیبرال کە رەنگە دواجار وڵاتەکەی بەرەو دیموکراسیی لیبرالیی رەسەن ببات. ئەمە بەڵگاندنێکە بۆ پشتیوانیکردن لە ئۆتۆریتەخوازانی لیبرال نەک پشتیوانیکردن لە دیموکراسی. ئەڵبەت هەمیشە ئەو ئەگەرەش لە ئارادایە کە رەنگە پووتین یا زیاتر لە خۆیشی یەک لە میراتگرانی، ببێتە تێزارێکی خراپ و دەسەڵاتی مەزنی خۆی بە ئاراستەی ئامانجگەلێکی کەمتر چاک و بەشەرەفانەدا بەکار بهێنێ. ئاوەها شتێک لە رابردوودا قەوماوە.

## رێگای هەڵە

رێگای رووسیا بەرەو دیموکراسی رێگایەکی ناسراوە. لەم بیست ساڵەی رابردوودا و پێچەوانەی نموونەکانی رۆژئاوا و ئاسیای رۆژهەڵات، کۆمەڵە رژێمێکی دیکتاتۆر لە ئافریقا و هەندێ ناوچەی ئاسیا و ئەمریکای لاتیندا، کە مێژوویەکی بچووکی لیبرالیزمی یاساخواز یان سەرمایەداری ژیابوون، هەوڵی رۆنانی دیموکراسییان دا، بەڵام بەرهەمێکی دڵخۆشکەری لێ نەکەوتەوە. بەپێی تۆێژینەوەکانی ساڵی ١٩٩٣ی لێری دایامۆند کە توێژەرێکی بەرجەستەی بواری دیموکراتیزاسیۆنە لە

زانکۆی ستانفۆرد، هەرچەند لە نیوەگۆی رۆژئاوای زەویدا جیا لە کووبا لە هەموو وڵاتەکانیتردا هەڵبژاردن بەڕێوە دەچێ، بەڵام لە وڵات لە کۆی ٢٢ وڵاتی سەرەکیی ئەمریکای لاتین «مافەکانی مرۆڤ بە ئاستێک پێشێل دەکرێت کە پێچەوانەی پەتەوکردنەوەی دیموکراسی (ی لیبرالی)یە». لەوکاتە بەدواوە، جیا لە چەند نموونەیەکی ئاوارتەی گرنگی وەک بەرازیل، بارودۆخەکە خراپتریش بووە.

ئاورێک لە ئەزموونی هۆگۆ چاڤێز و ڤێنێزۆیلا بدەنەوە. ئەو لە ١٩٩٢دا کۆلۆنێلی ئارتەش بوو و بە تاوانی بەشداریکردن لە کوودێتایەکی سەرنەکەوتوودا لە ئارتەش دەرکرا و خرایە زیندانەوە. دوای شەش ساڵ بە هەڵگرتنەوەی دروشم و بەرنامەی رادیکاڵ و پۆپۆلیستی بەشداریی لە هەڵبژاردندا کرد و لە سەدا ٥٦ی کۆی دەنگەکانی بەدەست هێنا و وەک سەرۆککۆماری ئەو وڵاتە هەڵبژێردرا. چاڤێز گەڵاڵەی ریفراندۆمێکی خستە بەردەست کە بەپێی ئەو گەڵاڵەیە یاسای بنچینەیی دەگۆڕدرا، دەسەڵات لە پەرلەمان و دەزگای دادوەری دەسنرایەوە و دەسپێردرایە دەست «ئەنجومەنی دامەزرێنەران»[٥٤]. ئەم ریفراندۆمە بە رێژەی لە سەدا ٩٢ پەسند کرا و سێ مانگ دواتر حیزبەکەی چاڤێز لە سەدا ٩٢ی کۆی کورسییەکانی ئەنجومەنی دامەزرێنەرانی گرتە دەست خۆی. بەپێی گەڵاڵەی پێشنیاردراوی یاسای نوێی بنچینەیی، ساڵێک بە سەرۆککۆماری زیاد دەکرا، چاڤێز دەیتوانی جارێکیتر ببێتەوە بە سەرۆککۆمار، یەک لە دوو پەرلەمانەکە هەڵدەوەشێنرایەوە، دەسەڵاتی غەیرەنیزامییان لە کۆنترۆڵکردنی ئارتەشدا کەم دەکرایەوە، دەوڵەت رۆڵێکی گەورەتری لە ئابووریی وڵاتدا دەگرتە ئەستۆ و ئەنجومەنی دامەزرێنەران دەیتوانی دادوەران لەسەرکار لابەرێت. خۆرخە ئۆلاواریا، نوێنەری بەئەزموونی پەرلەمان کە پێشتر لایەنگری چاڤێز بوو، هوشداریی ئەدا: «ئیمە بەرەو کارەسات دەڕۆین. یاسای تازەی بنچینەیی سەد ساڵ بەرەو دوامان ئەگێڕێتەوە و ئارتەش دەکاتە لقی نیزامیی بزووتنەوەی سیاسی».[٣] یاسای نوێی بنچینەیی لە دیسامبری (کانونی یەکەم) ١٩٩٩دا خرایە ریفراندۆمەوە و بە رێژەی لە سەدا ٧١ پەسند کرا. سەرەڕای خراپبوونی باری ئابووری لە ساڵانی یەکەمی دەسەڵاتداریی چاڤێزدا، هیچکات ئاستی پشتیوانیی رای گشتی بۆ سەرۆککۆمار لە سەدا لە ٦٥ کەمتری نەکردووە.

رەوتی رووداوەکان لە سەرەتای ٢٠٠٢وە گۆڕدرا و مرۆڤ وای هەست دەکرد ئیدی سەردەمی خۆشبەختیی چاڤێز هاتۆتە دوایی. ناڕەزایەتیی جەماوەر بەرانبەر حکوومەتی جینایەتکاری چاڤێز و هەروەها ئابوورییەکی داڕووخاو و قەیراناوی، بوونە هۆی کەوتنەوەی زنجیرە رێپێوانێکی بەربڵاو. دەستەبژێرانی ئارتەش و بازرگانان گەڵاڵەی کۆدەتایەکیان داڕشت و لە مارسی ٢٠٠٢دا بۆ دوو رۆژ

---

٥٤ . ئەنجومەنێکە مافی گۆڕینی یاسای بنچینەییی هەیە. و.ف

چاڤێز لەسەر کار لابرا. بەڵام چاڤێز لە ڕێکخستنی «هێـزی خەڵـک»دا گەلـێ لێهـاتووە و لەولاوەش کوودێتا لە جەوهەردا شتێکی نادیموکراتیکە، هەر بۆیە چاڤێز بە ئاسـانی و تەنیـا دوای هەفـتەیەک گەڕایەوە سەر دەسەڵات.

ڤێنێزۆیلا هەڵگری هەمان هۆکاری سەرەکیی پەککەوتنی دیموکراسـییە: سـەرچاوەی بەرفراوانـی سرووشـتی. بـۆ وێـنە سـەرچاوە نەوتییەکـانی ئەو وڵاتە لە دەرەوەی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت بە گەورەترین سەرچاوەکانی جیهان دێنە ئەژمار. ئەمە مانای بەڕێوەبردنی هەڵەی ئابووری، گەنـدەڵیی سیاسی و داڕووخانی دامەزراوەیی. بیست ساڵ لەمەوپێش ئاستی ژیـانی خەڵکـی ڤێنێـزۆیلا یەک لە بەرزترین ئاستەکانی ئەمریکای لاتین بوو بەڵام ئێستە لە سەدا ٨٠ی دانیشتووانی ئەم وڵاتە لە ژێر هێڵی هەژاریدان. [ئەودەم] لە هەنـدێ لایەنەوە زەمینـەی سـەرهەڵدانی شۆڕشـێک لەم وڵاتەدا لەبار بوو، بەڵام تاکە بەرهەم سەرکردەیەکی نوێ بوو، دیکتاتۆرێ کە بانگەشـەی پاراسـتنی وڵاتەکەی لە هەڕەشەی دوژمنان (کە زیـاتر مەبەسـتی وڵاتە یەکگرتووەکـانە) دەکـات. هەر ئەمەشـە وای کـردووە هۆگۆ چاڤێز ستایشی فیدێل کاسترۆ، سەدام حوسێن و تەنانەت شـێتێکی وەک مـوعەممەر قەزافـی بکات. لە هەمووی مەترسیدارتر ئەوەیە کە چاڤێز بۆتە هێمای هیوایەکی مێژوویی ئەمریکای لاتین، ئەو هیوایەی کە دەڵێـت گۆڕانکـاریی بەکەڵـک لە ڕێگـای سیسـتەمێکی سیاسـیی پلـۆراڵەوە نـایەتە بەرهەم - سیسـتەمی پلـۆراڵ ئەو سیسـتەمەیە کە حیـزبە سیاسـییەکان و گـرووپە خـاوەن بەرژەوەندییەکان لە دووتوێی کرداری ماندووکەری ریفـۆرمی وردەوردەدا گەشـە دەکەن - بەڵکـوو لە ڕێگای سـەرهەڵدانی سـەرکردەیەکی تـازەی مەسـیحاییەوە دێتە بەرهەم، ئاوەهـا سـەرۆکێک هەمـوو بەدبەختییەکانی رابردوو بەتەواوی دەسڕێتەوە و لە سەرەتاوە هەموو شتێک ڕێک دەخاتەوە. ئاوەها روانـگەیەک لەم چەنـد سـاڵەی دواییـدا لە نـاوچەی ئانـد پەرەی سـەندووە. ئەگەر گیروگـرفتە ئابوورییەکانی ئەمریکای لاتین بەردەوام بێت، ئەم روانگەیە دەتوانێ لەمەش زیاتر پەرە بسێنێ.

دە ساڵی رابـردووی ئافریقـا زۆر نائومێـدکەر بـوو. لە سـاڵی ١٩٩٠ بەدواوە لە کۆی ٤٨ وڵاتـی خوارووی سەحرای ئافریقا ٤٢ وڵات بە هیوای ئەوەی بەشکوو ئافریقـا سـنوورەکانی دیکتـاتۆرییەتی تالانکەر و گەندەڵیی بێوێنە دەرباز بکات، هەڵبژاردنی چەندحیزبییان بەڕێوە بـردووە. بەم دواییـانە ڕۆژنامەی *نیۆیۆرک تایمز* شەپۆلی هەڵبژاردنەکانی ئافریقا و قۆناغی تێپەڕینی ئەورووپـای ڕۆژهەڵاتـی دوای رووخـانی کۆمـۆنیزمی بە یەکتـر بەراورد کـردووە.[٤] بەڵام ئاوەهـا بەراوردکردنێـک تووشـی هەڵەی گەورەمـان دەکـات. هەرچەنـد لە زۆر لایەنەوە دیموکراسـی بـۆتە هـۆی کـرانەوەی فەزای سیاسیی ئافریقا و ئازادیی پێشکەش بە خەڵـک کـردووە، بەڵام لە هەمـان کاتـدا تـا رادەیەک بـۆتە هـۆی روودانـی کـۆمەڵێ ئـاژاوە و بشـێوی و بێسـەقامی کە لە راسـتیدا ئەم دۆخە گەنـدەڵی و

یاساشکێنیی لە زۆربەی وڵاتەکاندا قووڵتر کردۆتەوە. یەکێک لە وردبینترین چاودێرانی کاروباری ئافریقا، مایکڵ چێگ، شەپۆلی نەوەدەکانی دیموکراتیزاسیۆنی ئافریقای بە وردی تاوتوێ کردووە و بەپێی ئەنجامگیرییەکانی ئەو، «ئافریقا لەڕادەبەدەر جەخت لەسەر هەڵبژاردنی چەندحیزبی دەکات... لە بەرانبەردا باوەڕی بە فاکتەرە سەرەکییەکانی بەڕێوەبردنی لیبرالی نییە».[٥] زۆربەی وڵاتانی ئافریقایی لە رووی ئابووری یان پێکهاتەییەوە گەشەیان نەسەندووە، هەر بۆیە بەدەستهێنانی ئەم فاکتەرانە گەلێ دژوار و سەختە. دوو وڵاتی ئافریقایی ـ ئافریقای باشوور و بوتسوانا ـ کە زیاتر لە هەموو وڵاتانی تر بەرەو دیموکراسیی لیبرالی هەنگاویان ناوە، رێژەی داهاتی سەرانەیان لە رووبەری پێویست بۆ رۆنانی دیموکراسی ـ واتە ٣٠٠٠ تا ٦٠٠٠ دۆلار ـ زیاترە و بێگومان ئەمە لە رووی رێکەوتەوە نەبووە. داهاتی سەرانەی ئافریقای باشوور ٥٨٠٠ دۆلار و بوتسوانا ٦٦٠٠ دۆلارە کە هۆکاری ئەم بەرزبوونە دەستکردە و دەگەڕێتەوە بۆ سامانی [بەرچاوی] سەرچاوە سروشتییەکان. ئەمە بەو واتایە نایەتەوە کە ئافریقا لە سەردەمی دیکتاتۆرییە تاڵانکارەکاندا دۆخێکی باشتر دەژیا، بەڵام بێگومان نیشاندەری ئەوەیە کە ئافریقا خێراتر و زیاتر لەوەی پێویستی بە دیموکراسی بێت پێویستی بە بەڕێوەبردنێکی باش و گونجاوە. چەند نموونەیەکی زۆر سەرکەوتوومان لەبەردەستدایە، وەک مۆزامبیک کە کۆتاییی بە شازدە ساڵ شەڕی ناوخۆیی هێنا و ئێستە بە کردەوە خاوەن دیموکراسی و ئابووریی بازاڕە. بیرمان نەچێ مۆزامبیک لە رێگای یارمەتییە گەورە و بەرچاوەکانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە توانیویەتی دەوڵەتێکی لێهاتوو و کارامە بەدی بێنێ، دووبارەبوونەوەی ئاوەها مۆدێلێک بۆ دانەبەدانەی وڵاتانی ئافریقایی شتێکی دوور و چاوەڕواننەکراوە.

هەڵبژاردنەکانی ئاسیای ناوەڕاست ـ تەنانەت هەڵبژاردنگەلی تا رادەیەک ئازاد وەک هەڵبژاردنی قرقیزستان ـ ئەوەی بەرهەمیان هێناوە بریتییە لە دەوڵەتی بەهێز، پەرلەمان و دەزگای دادوەریی لاواز و ئازادیی مەدەنی و ئابووریی بەرکورت و ناتەواو. هەندێ لەم وڵاتانە هەڵبژاردنیان بەڕێوە نەبردووە؛ لەم وڵاتانەدا ئۆتۆریتەخوازانی جەماوەری دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست. بۆ وێنە سەرۆککۆماری ئازەربایجان، حەیدەر عەلییەف، لە سەردەمی سۆڤیەتدا لە بەرپرسانی ک.گ.ب و ئەندامی کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیست بوو. لە ساڵی ١٩٩٣ و لە رێگای کۆدەتایەکەوە دەسەڵاتی گرتە دەست بەڵام جیدیترین چاودێرانی ناوچەکە لەسەر ئەو باوەڕەن کە تەنانەت ئەگەر هەڵبژاردنێکی ئازاد و دادپەروەرانەیش بەڕێوە بچێت عەلییەف هەر براوەیە.[٦] وادیارە تەنانەت ئەگەر قارەمانەکانیش دەسەڵات بگرنە دەست گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ روو نادات. سەرۆککۆماری گورجستان، ئێدوارد شواردنادزە، کەسایەتییەکی ناسراو و بەڕێزە، شواردنادزە

هەمان وەزیری ریفۆرمخوازی دەرەوەی سەردەمی گوربـاچۆفە کە لە دامرکانـدنەوەی شـەڕی سارددا دەورێکـی بەرچـاوی گێـڕا. کەچـی بەمەشـەوە شـواردنادزە بە قـازانجی خـۆی دەسـکاری لە هەڵبژاردنەکاندا دەکات (هەرچەند لە هەڵبژاردنێکی ئازادیشدا هەر براوەیە). وڵاتـی ژێر دەسـەڵاتی شواردنادزە پڕە لە گەندەڵی و ئازادییە تاکییەکان لەرزۆکن و بە ئاسانی پێشێل دەکرێن.[٥٥]

بێگومان دیموکراسیی نالیبرالی لە نموونەیەکەوە بۆ نموونەیەکیتر جیاوازە، لە هەنـدێ وڵاتـی وەک ئارژانتیندا ئاستی لادانەکە کەمە، لە وڵاتانی وەک قەزاقسـتاندا دۆخێکـی دیکتاتۆرئاسا زاڵە و هەنـدێ وڵاتـی وەک ئـۆکراین و وێنێزۆیلایشـمان هەیە کە ئەکەونە نێـوان ئەم دوو جەمسـەرەوە. لە زۆربەی ئەم وڵاتانەدا بە دەگمەن رێ دەکەوێ هەڵبژاردنەکـان بەقەدەر رۆژئـاوا ئـازاد و پـاکژ بێـت، بەڵام بەمەشـــەوە هەڵبـــژاردن نیشـــاندەری بەشـــداریکردنی گشـــتییە لە سیاســـەتدا و مانـــای پشتیوانیکردنە لەو کەسانەی وا هەڵدەبژێردرێن. جۆری تێکەڵبـوونی دیموکراسـی و ئۆتۆریتەخـوازی بە یەکتر لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازە؛ لە راسـتیدا هەڵبژاردنەکـانی رووسـیا لە هەڵبژاردنـی زۆربەی ئەم وڵاتـانە ئـازادانەتر بەڕێـوە دەچـێ، بەڵام لە هەرهەموویانـدا ئەو فـاکتەرە نەگونجـاوانە دەبینـرێن. تـاکە سـەرچاوەی زانیـاری کە بە شـێوەی جیاجیـا وڵاتـانی دونیـا لە رووی مێـژووی دیموکراتیـک و باڵادەسـتیی یاسـاوە پۆلێنبەنـدی دەکـا، ئەوەمـان پـێ دەڵێـت کە لە بیست ساڵـی رابردوودا هەژماری دیموکراسـییە نالیبرالییەکـان بە شـێوەیەکی روون و ئاشـکرا زیـادی کـردووە. لە ١٩٩٠دا تەنیا لە سەدا ٢٢ی کۆی ئەو وڵاتانەی لەسەر هێڵی دیموکراتیزاسیۆن بوون دەکەوتـنە نێـو ئەم پۆلێنبەندییەوە، ئەم رێژەیە لە ١٩٩٢دا بەرز بوویەوە بۆ لە سەدا ٣٥ و لە ١٩٩٧دا گەیشـتە لە سەدا ٥٠. لەم بەروارە بەدواوە تا رادەیەک دابەزیوە بەڵام هاوکات لەگەڵ نووسینی ئەم کتێـبەدا، لە کـۆی ئەو وڵاتـانەی لە هەمـوو جیهانـدا رێگـای دیموکراتیزاسـیۆنیان گرتـۆتەبەر، نـزیکەی نیوەیـان دیموکراسیی نالیبرالین.

هەندێ کەس ئەم دیاردەیە بە دیاردەیەکی کاتی دەزانن و پێیان وایە ئەمانە کۆمەڵە کێشەیەکن لە هەمان سەرەتاوە داوێنی هەمـوو دیموکراسـییەکی تـازەدامەزراو دەگـرێتەوە. بەوجـۆرەی گۆڤـاری ئێکۆنۆمیسـت نووسـیویەتی لیبرالیزمـی یاسـاخواز «لە سیسـتەمێکی دیموکراتیکـدا ئاسـانتر دێـتە دی». [٧] بەڵام ئایا ئەم روانگە گشتییە روانگەیەکی دروستە؟ ئایا لە هەندێ دەڤەری وەک ئاسیای ناوەڕاست و ئافریقادا هەڵبژاردن دەتوانێ ببێتە هۆی کرانەوەی فەزای سیاسیی وڵاتێـک؟ دوابەدوای

---

٥٥ . لە پـاییزی ٢٠٠٣دا کـوڕەکەی حەیـدەر عەلیـیەف بە هەڵبژاردنێکی گومانـاوی و دەسـکاریکراو بـوو بە جێنشینی باوکی و شواردنادزەیش دوای بردنەوەی هەڵبژاردنەکانی سەرۆککۆماری و لە ژێر زەخت و گوشاری نەیارانیدا بە ناچاری وازی لە دەسەڵات هێنا. و.ف

ئەم قۆناغە ئایا دەتوانێ ریفۆرمی سیاسی، ئابووری و یاسایی بەربلاوتر [بەسەر دەسەڵاتدا] بسەپێنێ؟ ئایا هەڵبژاردن دمامکێک نییە بۆ شاردنەوەی ئۆتۆریتەخوازی و پۆپۆلیزم؟ زۆربەی ئەم قۆناغانە هێشتا تەواو نەبوون، هەر بۆیە زۆر زووە مرۆڤ وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە، بەڵام نیشانەکان دڵخۆشکەر نین. زۆربەی دیموکراسییە نالیبرالییەکان - بۆ وێنە نزیک بە هەموو نموونەکانی ئاسیای ناوەڕاست - زۆر خێرا گۆڕدران بۆ کۆمەڵە دیکتاتۆرییەکی بەردەوام. لەم وڵاتانەدا هەڵبژاردن تەنیا و تەنیا شەرعییەتی بە [دیاردەی] دزینی دەسەڵات بەخشیوە. لە وڵاتانیتردا، وەک زۆرێک لە وڵاتانی ئافریقایی، دیموکراتیزاسیۆنی خێرا بۆتە هۆی لاوازکەوتنی ئۆتۆریتەی دەوڵەت و گەلێ کێشەی جۆراوجۆری ناوچەیی و ئەتنیکیی لە بەردەم دەسەڵاتی ناوەندیدا قوت کردۆتەوە. بەڵام دەستەیەکیتر لەم وڵاتانە، وەک وێنێزۆیلا و پێرۆ، هێشتا [تێکەڵکردی] نەختێک دیموکراسیی ڕەسەن و دونیایەک ڕەوتی نالیبرالییان پاراستووە. دواجار چەند نموونەیەکی وەکوو کۆرواسی و ئۆسلۆواکیشمان هەیە کە ڕژێمێکی دیموکراتیکی نالیبرالی هەوڵی ریفۆرمکردن و بالادەستکردنی یاسا دەدات. لەم دوو نموونەیەدا تایبەتمەندیی دیموکراتیک پاڵنەرێکی گرنگ بوو بۆ چاکسازیکردن؛ چونکو ئەم تایبەتمەندییە کارێکی جێبەجێ کرد کە دیموکراسی باشتر لە هەموو جۆرە دەوڵەتێکیتر ئەنجامی دەدات: خوێڕییەکانی خستە لاوە و هەلومەرجێکی لەباری بۆ گواستنەوەی ئاشتیخوازانەی دەسەڵات لە کۆنەپارێزانەوە بۆ سیستەمێکی نوێ پێک هێنا. بەڵام بیرمان نەچێ هەردوو وڵاتی کۆرواسی و ئۆسلۆواکی دوو وڵاتی ئەوروپایین و ڕێژەی داهاتی سەرانەیان بەرزە: کۆرواسی ٦٦٩٨ دۆلار و ئۆسلۆواکی ٩٦٢٤ دۆلار. بەگشتی لە دەرەوەی ئەورووپادا دیموکراسیی نالیبرالی نەیتوانیوە ببێتە ڕێگایەکی گونجاو و کاریگەر بۆ دەستەبەرکردنی دیموکراسیی لیبرالی.

با ئاوڕێک لە پاکستان بدەینەوە. ڕووداوەکانی ئۆکتۆبری (تشرینی یەکەم) ١٩٩٩ی پاکستان دونیای ڕۆژئاوای سەرسام کرد، ژەنەراڵ پەرویز موشەڕەفی فەرماندەی ئارتەش بە کوودێتایەک دەوڵەتی نەواز شەریفی سەرۆک وەزیرانی هەڵبژێردراوی ڕووخاند. ئەوەی مایەی سەرسووڕمان بوو کوودێتاکە نەبوو، چونکو ئەمە چوارەمین کوودێتایەک بوو لە چەندە دەیەدا لە پاکستان دەقەوما، بەڵکو پێشوازیکردنی گەرمی خەڵک بوو لەو کوودێتایە. زۆربەی پاکستانییەکان خۆشحاڵ بوون بەوەی لە یازدە ساڵ دیموکراسیی ناشیرین ڕزگار بوون. لەو سەردەمەدا نەواز شەریف و بینەزیر بۆتۆی سەرۆک وەزیرانی پێشوو، دەسەڵاتیان کردبووە پردێک بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان. ئەوان هاوڕێیانی سیاسیی خۆیان لە دادگاکاندا دادەمەزراند، دەوڵەتە خۆماڵییەکانیان هەڵئەوەشاندەوە، ئیجازەیان بە بونیادگەرا ئیسلامییەکان دەدا یاسای توندوتیژ

پەسند بکەن و خەزێنەی دەوڵەتیان بە تالان دەبرد. سەردێڕی وتاری ڕۆژنامەیەکی گرنگی پاکستان لە ژانویەی (کانونی یەکەم) ١٩٩٨دا بەم شێوەیە بارودۆخی ئەو وڵاتەی وێنا کردووە: «دیموکراسیی فاشیستی: دەسەڵات بدزە، نەیاران بخنکێنە».[٨] ڕۆژنامەکانی ڕۆژئاوا و بەتایبەت ڕۆژنامە ئەمریکاییەکان هەڵوێستێکی زۆر جیاوازیان وەرگرت، نزیک بە هەرهەموویان بە دروستی کوودێتاکەیان شەرمەزار کرد. لە کێبەرکێکانی هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٠دا جۆرج دەبلیۆ بووش دانی بەوەدا نا کە ناوی سەرۆکی تازەی پاکستانی لە بیر کردووە، بەڵام وتیشی ئەم سەرۆکە تازەیە «لە ناوچەکەدا سەقامگیری پێک دەهێنێ». ڕۆژنامەی *واشینگتۆن پۆست* زۆر خێرا ئەم جۆرە دەربڕینە نائاساییەی جۆرج بووشی سەبارەت بە دیکتاتۆرێک شەرمەزار کرد.

موشەڕەف دوو ساڵ دواتر و دوابەدوای ئەوەی ڕووداوە کاریگەر و گۆڕێنەرەکانی ١١ی سێپتامبر پێگە و جێگەیان بەهێز کردەوە، ڕەوتی ریفۆرمە ڕادیکاڵە سیاسی، کۆمەڵایەتی، فێرکاری و ئابوورییەکانی درێژە پێدا، تەنانەت لایەنگرانیشی چاوەڕێی ئاوەها ریفۆرمێکیان لە موشەڕەف نەدەکرد. لە ناو سیاسەتمەدارانی هەڵبژێردراودا هەژمارێکی زۆر کەمیان پشتیوانییان لەم کارانە دەکرد. لە ڕاستیدا موشەڕەف تەنیا لەبەر ئەوە توانیویەتی سیاسەتەکانی بەڕێوە ببات کە مەجبوور نییە لە هەڵبژاردندا بەشداری بکات و بەرژەوندیی دەوڵەمەندە فیۆدالەکان و میلیشیا ئیسلامگەراکان و دەرەبەگە خۆماڵییەکان لەبەرچاو بگرێت. هیچ گەرەنتییەک نەبوو دیکتاتۆرێک ئەو کارانەی مۆشەرەف ئەنجام بدات، بەڵام لە پاکستاندا هیچ سیاسەتمەدارێکی هەڵبژێردراو نەیتوانیوە وەک موشەڕەف ئاوەها بوێرانە و جیدی و کاریگەرانە وڵات بەڕێوە ببات. ئێستە کە سەرقاڵی نووسینی ئەم دێڕانەم، بە بەراورد لەگەڵ دەسپێکدا ئۆتۆریتەخوازاییەکەی کەمێک زیاتر بۆتەوە و لیبرالبوونەکەی گەلێ کەم بۆتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا و سەرەڕای ئەوەی زۆرێ لە گروپە فیۆدال و مەزهەبییەکانی کۆمەڵگای پاکستان لە هەمبەریدا وەستاون، ئەو هەر سوورە لەسەر مۆدێرنیزاسیۆن و سێکۆلاریزاسیۆنی وڵاتەکەی. چاکسازیی و گۆڕینی ئابووری و سیاسیی پاکستان لە داهاتووی نزیکدا شتێکی مەحاڵ و نامومکینە، بەڵام ـ وەک رووسیا ـ ئەگەر بێت و لیبرالیزاسیۆن و تەنانەت دیموکراسیی ڕەسەن لەم وڵاتەدا بێتە دی، هۆکارەکەی هەڵناگەڕێتەوە بۆ مێژووی دیموکراسیی نالیبرالیی پاکستان، بەڵکوو هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بە ڕێکەوت ئۆتۆریتەخوازێکی لیبرال جڵەوی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست.[٥٦]

---

٥٦ . ساڵی ٢٠٠٨ و داوابەدوای گەڕانەوەی بینەزیر بۆتۆ و نەواز شەریف بۆ پاکستان و زنجیرەیەک ڕووداوی سیاسی و تێرۆریستیی گەورەگەورە، موشەڕەف وازی لە دەسەڵات هێنا و پاکستانی بەجێ هێشت.و.ک

## کێشەکانی دیموکراسی

نیگەرانییەگانی ئێستای ئێمە بەرانبەر بە ئۆتۆریتەخوازانی هەڵبژێردراوی رووسیا، ئاسیای ناوەڕاست و ئەمریکای لاتین، قەت نەدەبوو بە مایەی سەرسووڕمانی لیبرالەکانی سەدەی نۆزدەهەمی وەک جان ستیوارت میل. میل کتێبە کلاسیکەکەی خۆی، *سەبارەت بە ئازادی*، بەو ئاگادارکردنەوەیە دست پێ دەکات کە هەرچی وڵاتەکان دیموکراتیکتر دەبنەوە وردەوردە خەڵک دەگەنە ئەو قەناعەتەی کە «زیاتر لە رادەی پێویست لەسەر بەرکورتکردنەوەی دەسەڵات (دەوڵەت) وەستاون و.. [ئەم جەختکردنە] تەنیا دژکردەوەیەک بووە لە بەرانبەر ئەو دەسەڵاتدارانەدا کە بەرژەندییەکانیان پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی خەڵکە». بەڵام کاتێک خەڵک دەبنە بەرپرسی کاروبار[ی وڵات] ئیدی پێویست بە نیگەرانی و خۆپاراستن نییە. «پێویست نییە لە بەرانبەر ئیرادەی خۆیاندا پارێزگاری لە خەڵک بکەین». دوای ئەوەی ئەلێکساندێر لووکاشێنکۆ لە هەڵبژاردنی ئازادانەی ١٩٩٤دا بە رێژەیەکی بەرز سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بوو بە سەرۆککۆماری بێلاڕووس، سەبارەت بە بەرکورتکردنەوەی دەسەڵاتی پرسیاران لێ کرد، وەڵامەکەی ئەو وەک پشتڕاستکردنەوەیەک بۆ نیگەرانییەکانی میل وابوو: «دیکتاتۆرییەک لە ئارادا نییە، من لە خەڵکم و بۆ خەڵک کار دەکەم».

گەورەترین کێشەی نێوان لیبرالیزمی یاساخواز و دیموکراسی، ئۆتۆریتەی دەوڵەتە. لیبرالیزمی یاساخواز لەسەر بەرکورتکردنەوەی دەسەڵات دەوەستێ و، بە پێچەوانە، دیموکراسی لە کەڵەکەبوون و بەکارهێنانی دەسەڵات رادەمێنێ. هەر بۆیە زۆربەی لیبرالەکانی سەدەی هەژدە و نۆزدە لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە دیموکراسی هێزێکە دەتوانێ زەبر لە ئازادییەکان بکات. دەوڵەتی دیموکراتیک وادەزانێ خاوەن خودموختاری (واتە دەسەڵات)ی رەهایە و دەتوانێ دەسەڵات سانترالیزە بکات، ئەم کەڵەکەکردنەی دەسەڵات بە زۆری لە رێگاگەلی سەرڕوویاساییەوە بەڕێوە دەچێ و ئاکامی تاڵ و دڵتەزێنی لێ دەکەوێتەوە. دواجار بەرهەمی ئەم رەوتە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ دیکتاتۆریدا نییە، تەنیا رەوایی و شەرعییەتی لە دیکتاتۆری زیاترە.

لەم دە ساڵەی رابردوودا ئەو دەوڵەتە هەڵبژێردراوانەی خۆیان بە نوێنەر و هێمای خەڵک دەزانن، بەردەوام دەستیان بەسەر دەسەڵات و مافی گروپەکانی دیکەی ناو کۆمەڵگادا گرتووە، ئەم دەستبەسەراگرتنە هەم ئاسۆییە (لە ئاست لقەکانیتری دەوڵەتی نەتەوەییدا) و هەم ئەستوونییە (لە ئاست بەرپرسانی ناوچەیی و خۆماڵی و هەروەها کۆمپانیا تایبەتییەکان و گروپە

نادەوڵەتییەکانی‌تری وەک چاپەمەنییەکاندا). پووتین و لووکاشێنکۆ و چاویز تەنیا چەند نموونەیەکی ئەم جۆرە دەسەڵاتدارانەن. تەنانەت ریفۆرمخوازێکی رەسەنی وەک سەرۆککۆماری پێشووی ئارژانتین ـ کارلۆس مێنیم ـ لە هەشت ساڵ دەسەڵاتداریدا نزیکەی ٣٠٠ دەستووری سەرکۆماریی دەرکرد کە نزیکەی سێ قاتی کۆی ئەو دەستوورانەیە هەموو سەرۆککۆمارانی پێشووی ئارژانتین لە ١٨٥٣ بەدواوە دەریان کردووە. لە ١٩٩٦دا عەسکەر ئاقایەفی سەرۆککۆماری قەرقیزستان کە لە سەدا ٦٠ی کۆی دەنگەکانی بەدەست هێنابوو، گەڵاڵەی پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆی خستە ریفراندۆمەوە کە زۆر بە ئاسانی پەسند کرا. بەم پێیە دەسەڵاتی دیاریکردنی هەموو بەرپرسانی باڵای وڵات جگە لە سەرۆک وەزیرانی پێ دراوە، هەرچەند ئەگەر پەرلەمان سێ جار کاندیدای سەرکۆمار بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆک وەزیران رەت بکاتەوە، ئەوا ئاقایەف دەتوانێ پەرلەمان هەڵبوەشێنێتەوە.[٥٧]

دەستبەسەراگرتنی ئاسۆیی زیاتر ئەکەوێتە بەرچاو بەڵام دەستبەسەراگرتنی ئەستوونی زیاتر باوە. لە سی ساڵی رابردوودا دەوڵەتە هەڵبژێردراوەکانی هیندستان و پاکستان بەردەوام پەرلەمانە ئەیالەتییەکانیان لە خۆڕا و بەبێ هۆ هەڵوەشاندۆتەوە و ناوچەکانیان خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی دەوڵەتی ناوەندییەوە. دەوڵەتی هەڵبژێردراوی کۆماری ئافریقای ناوەندی کارێکی لەم چەشنە بەڵام کەمتر گرنگی ئەنجام دا و سیستەمی زانکۆی ئەو وڵاتەی لە سەربەخۆیی دێرینی خۆی داماڵی و کردی بە بەشێک لە دامودەزگای دەوڵەتی ناوەندی. لە پێرووە تا ئۆکراین و فیلیپین، دەسەڵاتداران بۆ ترساندن و تۆقاندنی یەک لە لەمپەرە زۆر گەورەکانی بەردەم دەسەڵاتی دەوڵەت، واتە هەواڵنێران، بە شێوەیەکی بەربڵاو و سیستماتیک لە هێزەکانی ئاسایش کەڵک وەردەگرن. لە ئەمریکای لاتیندا تەنانەت بە رواڵەت دیموکراتێکی ریفۆرمخوازی وەک ئالبێرتۆ تۆلیدۆی سەرۆککۆماری پێرۆ، هەمیشە دەسەڵاتی خۆی بە ئاراستەی تۆقاندنی نەیارانی سیاسیدا بەکارهێناوە.

پاوانکردنی دەسەڵات بەتایبەت لە ئەمریکای لاتین و وڵاتانی سەر بە سۆڤییەتی پێشوودا دیاردەیەکی باوە، رەنگە هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سیستەمی حکوومەتیی زۆربەیان سیستەمی سەرۆککۆمارییە. ئەم رژێمانە جۆرە سەرۆکێک بەرهەم دێنن کە پێی وایە لە لایەن

---

٥٧ . لە خاکەلێوەی ١٣٨٤ی هەتاوی [٢٠٠٥] و دوابەدوای بەرێوەچوونی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان کە دەستکاری و ساختەکاریی زۆر گەورەی تێدا کرابوو، زنجیرە نارەزایتیەکی بەربڵاو هەموو قەرقیزستانی گرتەوە و عەسکەر ئاقایەف بە ناچاری وڵاتی بەجێ هێشت و دواجار دەستلەکارکێشانەوەی خۆی راگەیاند. و.ف

خەڵکەوە قسە دەکات، تەنانەت ئەگەر زۆرینەیەکی رێژەیی دەنگەکانیشی بە دەست هێنابێ [هەر خۆی بە وتەبێژی خەڵک دەزانێ]. جۆوان لینز، بیرمەندی زانستە سیاسییەکان، لەم بارەیەوە سەرنجمان بۆ لای سالڤادۆر ئالێندە رادەکێشێ کە لە ١٩٧٠دا تەنیا لە سەددا ٣٦ی دەنگەکانی بە دەست هێنا و بەم رێژە کەمەوە بوو بە سەرۆککۆماری شیلی. لە ئاوەها دۆخێک و لە سیستەمی پەرلەمانیدا سەرۆک وەزیران ناچارە بە دروستکردنی دەوڵەتێکی هاوبەش دەسەڵات دابەش بکات، بەڵام لە سیستەمی سەرۆکایەتیدا سەرۆککۆمار لە باتیی ئەندامانی باڵای حیزبەکان هاورێ نزیکەکانی خۆی لە کابینەدا دادەنێت و بەم شێوەیە کەمترین لەمپەری ناوخۆیی لە هەمبەر دەسەڵاتیدا دەمنێتەوە. هەرکاتیش هەڵوێستی ئەو لەگەڵ هەڵوێستی پەرلەمان و تەنانەت دادگاکاندا تەبا نەیەتەوە، خۆی لە بازنەی ماندووکەر و ناخۆشی دیالۆگ و چەقەچەقی سیاسی و هاوپەیمانیکردن دەدزێتەوە و «پەنا دەباتەوە بۆ گەل». توێژەران و لێکۆڵەران لەسەر چاکتربوونی سیستەمی سەرکۆماری لە سیستەمی پەرلەمانی کۆک نین، ئەڵبەت لە هەردوو جۆردا ئەگەر ناوندە پێشکەوتووەکانیتری دەسەڵات نەبن ـ ناوەندی وەک پەرلەمان، دادگاکان، حیزبە سیاسییەکان، دەوڵەتە خۆماڵییەکان، زانکۆکان و میدیای سەربەخۆی هەواڵنێری ـ ئەگەری پاوانکردن و دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات هەیە. لە راستیدا زۆربەی وڵاتانی ئەمریکای لاتین هەردوو سیستەمی سەرکۆماری و پەرلەمانتارییان تێکەڵ بە یەکتر کردووە و ئاوێتەیەکی لەرزۆکی سەرۆکی پۆپۆلیست و سیستەمی چەندحیزبییان بەرهەم هێناوە.

دەوڵەتانی پاوانخواز ناتوانن وڵاتێکی بەدیسیپلین و سەقامگرتوو دروست بکەن. دەوڵەتی بەهێز جیاوازە لە دەوڵەتی لێهاتوو و کارامە؛ لە راستیدا دەشێت ئەم دووانە پێکەوە ناتەبا بن. ئافریقا تەژییە لە دەوڵەتانی تینووی دەسەڵات و ناکارامە، [لە بەرانبەردا] دەوڵەتی ئەمریکا دەسەڵاتێکی بەرکورتی هەیە و لەهەمانکاتدا زۆر لێهاتوو و کارامەیە. فامکردنی هەڵەی ئەم دوو چەمکە بۆتە هۆی ئەوەی زۆرێک لە دەوڵەتان و توێژەرانی رۆژئاوایی، لە پێکهێنانی دەوڵەتی بەهێز و چەقبەستوو لە جیهانی سێهەمدا پشتیوانی بکەن. سەرۆکی ئەم وڵاتانە دەڵێن بۆ شکستدانی فیۆدالیزم، هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانێتییە تونددوتۆڵەکان، زاڵبوون بەسەر گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان و نەزمبەخشین بە کۆمەڵگای شپرزەی خۆیان، پێویستە ئۆتۆریتە و دەسەڵاتیان هەبێت. ئەم بابەتە تا رادەیەک راستە بەڵام نەیتوانیوە دەوڵەتی رەوا لە دەوڵەتی تەواو دەسەڵاتخواز جیا بکاتەوە. دەوڵەتێ کە خاوەن دەسەڵاتێکی بەرکورتە و بەم پێیەش شەرعییەتی هەیە، زۆرجار تەنانەت ئەگەر بە هێواشیش بووە دەتوانێت بە رێگای پێکهێنانی هاوپەیمانیدا تەکووزی سەقامگیر بکات و سیاسەتە قورسەکان جێبەجێ بکات. گرنگترین تاقیکاری بۆ

شەرعییەتی هەر دەوڵەتێک بریتییە لە کۆکردنەوەی پیتاک، چونکو راپەڕاندنی ئەم کارە پێویستی بە هێزێکی گەورەی پولیس نییە، بەڵکو پێویستە خەڵک بە شێوەی دڵخواز و خۆکرد ملکەچی یاسا بن. هیچ دەوڵەتێک پۆلیسێکی هێند مەزن و بەهێزی نییە لە رێگایەوە بە زۆر پیتاک لە خەڵک وەربگرێت. تا ئێستایش رێژەی کۆکردنەوەی پیتاک لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا زۆر کەمە، ئەمەش لەبەر ئەوەی دەوڵەت و سیاسەتی ئەم وڵاتانە، ناشەرعین.

ئاوڕدانەوەیەکی دووبارە لە دۆخی رووسیا گەلێ سوودمەندە. لە ساتەوەختی رووخانی سۆڤییەتەوە ئاکادیمسیەن و رۆژنامەنووسانی رۆژئاوا هەمیشە لە لاوازبوونی دەوڵەتی رووسیا زۆر ترساون. بنەمای لێکدانەوەی ئەوان دەگەڕایەوە بۆ ئەگەری بێتوانابوونی دەوڵەتی رووسیا لە کۆکردنەوەی پیتاکدا، ئەمە پێوەرێکی گومانلێکراوە، چونکو دەوڵەتی رووسیا قەت پێشتر ئەم کارەی نەکردبوو، کەوابوو دوای رووخانی سۆڤییەت کارێکی نوێی دەست پێ کردبوو. لە راستیدا دوای رووخانی سۆڤییەتیش دەوڵەتی رووسیا هێشتا دەوڵەتێکی بەهێز بوو، بەڵام دەوڵەتێکی گەندەڵ بوو کە زۆرجار بە دەوڵەتێکی ناشەرعییان لەقەڵەم دەدا. دوای تێپەڕینی چەندین ساڵ بەسەر سەقامگرتن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵە ریفۆرمێکی گرنگ (لە سەردەمی پووتیندا) ئێستاکە رێژەی کۆکردنەوەی پیتاکی ئەم دەوڵەتە نزیک بە رێژەی زۆربەی وڵاتانی ئەورووپاییە. ئەڵبەت دڵەڕاوکێ و نیگەرانیی سەرەتاییی ئاکادیمسیەنەکان کاریگەریی کرداری و راستەقینەی لەسەر سیاسەتەکانی دەوڵەت بەجێهێشت. سیاسەتمەدارانی رۆژئاوا دەستووره جۆراوجۆرەکان و دەسەڵاتخوازییە بەردەوامەکانی یێلتسینیان بە تەواوی قبووڵ کردبوو و ئەگەر بیگوتبا دەوڵەتی ناوەندی گەمارۆ دراوە و پێویستی بە یارمەتییە، بێچەندوچوون باوەڕیان پێ دەکرد.

هەروەک چۆن تەنیا سیاسەتمەدارێک دەرەقەتی ئاوەها کارێک دێت، پووتین ئەم باسوخواسە ئاکادیمیکەی بڕییەوە. لە هەمان مانگە سەرەتاییەکانی سەرکۆماریدا، سەرلەنوێ دەسەڵاتی کرێملینی بووژاندەوە و لە هەمبەر هەموو دەسەڵاتە رکەبەرەکانیدا چەسپاندی و بەمەش سەلماندی کە دامەزراوە دێرینەکانی سۆڤییەت هێشتا زیندوون. هەرکات نەیتوانیایە کارەکانی لە رێگە رەسمییەکانەوە جێبەجێ بکات لە هێزی «قانیعکردن»ی خۆی کەڵکی وەردەگرت. هەر پەرلەمانتار یان دادوەرێک کرێملینی قبووڵ نەبێ مووچە و ئیمتیازەکانی دەبڕدرێت (پەرلەمانی رووسیا ناتوانێ لەسەر مووچەی پەرلەمانتارانی خۆیشی بڕیار بدات چ بگا بە بوودجە دەوڵەتییەکانیتر). هەر ئەمەش وای کرد سێنای رووسیا یاسایەک پەسند بکات کە لە دونیای سیاسەتدا باو نەبووە؛ سێنا دەنگی دا بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵات و بچووککردنەوەی خۆی. سەبارەت بە پیتاکیش دەبێ بڵێین کە لە ساڵی ۲۰۰۰دا دەوڵەت سەداسەدی پیتاکی بەراوردکراوی کۆ کردەوە. کێشەی رووسیا

نەخۆشبوونی دەوڵەت نەبوو بەڵکوو نەخۆشبوونی یێلتسین بوو. ئێستە کە سەرۆککۆمارێکی تەندروست هاتۆتە سەرکار، دەوڵەتی گەورە دیسان گەڕاوەتەوە. رەنگە ئەمە رووداوێکی دڵتەزێن بێت، چونکو لاوازکردنی دەوڵەتی ناوەندی بۆ هەرەدەوڵەتی سۆڤییەت ریفۆرمێکی پێویست و ژیانبەخش بوو.

دەسەڵاتی چەقبەستووی کۆنترۆڵنەکراو دوژمنی مێژوویی دیموکراسیی لیبراڵییە. لە سەدەی نۆزدەدا بەشداریکردنی سیاسی لە ئەوروپادا پەرەی سەند. لە وڵاتانی وەک بریتانیا و سویددا کە دامەزراوە سەدەناوەڕاستییەکانی وەک ئەنجوومەنەکانی یاسادانان، دەوڵەتە خۆماڵییەکان و شۆرا خۆماڵییەکان هێشتا بەهێز بوون، بەشداریکردنی سیاسی وردەوردە و هێواشهێواش تێکەڵ [بە پرۆسەی سیاسی] دەبوو. لەلایەکیترەوە هەندێ وڵاتی وەک فەرەنسا و پرۆس کە دامودەزگای پاشایەتی بە کردەوە خاوەن دەسەڵاتێکی چەقبەستوو (هەم ئاسۆیی و هەم ئەستوونی) بوو، دواجار گۆڕدران بۆ وڵاتی نالیبرالی و نادیموکراتیک. لە خۆڕا نییە لە سپانیای سەدەی بیستەمدا کاتالۆنیا[٥٨] دەبێتە ئاخێزگە و سەنگەری سەرەکیی لیبرالیزم، ئەم ناوچەیە بەدرێژاییی چەندین سەدە و زۆر شێلگیرانە سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمیی خۆی پاراستووە. لە ئەمریکادا ئامادەبوونی دامەزراوە جۆراوجۆرە دەوڵەتی، خۆماڵی و تایبەتەکان بوو بە هۆی کەمتربوونەوەی لەمپەرەکانی بەردەم پەرەسەندنی خێرای مافی دەنگدان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا. مێژوونووسی ناسراوی هارڤارد، ئارتۆر شلەزینگێر، لە ١٩٢٢دا بە خستنە بەردەستی بەڵگە و دۆکیۆمێنتی جۆراوجۆر سەلماندی کە لە پەنجا ساڵی یەکەمی دامەزرانی ئەمریکادا نزیک بە هەموو ویلایەتەکان و گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان و تاقمەکان هەوڵی لاوازکردن یان تەنانەت رووخاندنی دەوڵەتی فیدراڵیان دەدا.[٩] دیموکراسیی نیوەلیبراڵیی هێندستان نموونەیەکی تازەترە، ئەم دیموکراسییە نەک سەرەڕا بەڵکوو لەبەر ویلایەت و ناوچە بەهێزەکان و زمانەکان و کولتوورەکان و تەنانەت چینە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکانی درێژەی بە ژیانی خۆی داوە. ئەمە بابەتێکی لۆژیکاڵ و تەنانەت ئاشکرایە: دەوڵەتی چەقنەبەستوو رێخۆشکەرە بۆ پێکهاتنی دەوڵەتی بەرکورت.

## دیکتاتۆرییەتی زۆرینە

ئەگەر لە سیستەمێکی دیموکراتیکدا یەکەم سەرچاوەی بەکارهێنانی خراپی دەسەڵات ئۆتۆریتەخوازەهەڵبژێردراوەکان بن، بێگومان دووەم هۆکار و سەرچاوە خودی خەڵکن. لەم بارەیەوە

٥٨ . ناوچەیەکی باکووری رۆژهەڵاتی سپانیا کە بارسێلۆنا گرنگترین شاریەتی. و.ف

جەیمز مەدیسۆن[٥٩]، لە *فێدراڵیست پەیپێرزدا*، پێی وابوو سەرچاوەی «مەترسیی ستەم» لە سیستەمێکی دیموکراسیدا دەگەڕێتەوە بۆ «زۆرینەی کۆمەڵگا». تۆکڤیل مەترسییەکانی «دیکتاتۆرییەتی زۆرینە»ی بیر خستینەوە و دەڵێ: «بنەمای دەوڵەتی دیموکراتیک دەسەڵاتداریی رەهای زۆرینەیە». هەرچەند ئەم کێشەیە لە تێڕوانینی مەدیسۆن و تۆکڤیلدا مەترسییەکی جیدی بوو بەڵام رەنگە لە ئێستای رۆژئاوادا هێند گرنگ نەکەوێتە بەرچاو، چونکو کۆمەڵە میکانیزمێکی ورد و کاریگەر بۆ پاراستنی مافی تاکی و مافی کەمینەکان لەبەردەستدایە. بەڵام لە چەند دەیەی رابردوو و لە وڵاتانی روو لە گەشەدا، ئەزموونی دیموکراسی تەنیاوتەنیا ئەزموونێک بووە کە زۆرینە - زۆرجار بەبێ هیچ جۆرە کێشە و هەرایەک و هەندێ جاریش لەگەڵ هەراوزەنادا - جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی سڕیوەتەوە، مافی مرۆڤی لاواز خستووە و نەریتە دێرینەکانی ئاسانگیری و یەکسانیی لە ناو بردووە.

بۆ روونکردنەوەی ئەم بابەتە با ئاوڕێ لە هیندستان بدەینەوە، ئەو وڵاتەی لێی گەورە بووم. هێندستان لە باسوخواسی دیموکراسیدا پێگەیەکی سست و لاوازی هەیە. ئەم وڵاتە سەرەڕای دەستەویەخەبوون لەگەڵ هەژاریی قورسدا لە ١٩٧٤ەوە بە کردەوە خاوەن دیموکراسی بووە. هەرکەسێک دەیەوێ بیسەلمێنێ دیموکراتیزاسیۆن پێویستی بە گەشەسەندنی ئابووری نییە یەکسەر ئاماژە بە تاکە نموونەی بەردەست، واتە هیندستان، دەکات. زۆرێک لەم ستایش و پیاهەڵدانانە دروستە، لە راستیدا هیندستان کۆمەڵگایەکی ئازاد و بێسنوورە. بەڵام ئەگەر پەردە لەسەر دیموکراسیی هێند هەڵماڵین کۆمەڵێ حەقیقەتی ئاڵۆزتر و دڵتەزێنتر دەکەونە روو. لەم ساڵانەی دواییدا هیندستان بۆتە شتێکی تەواو جیاواز لەوەی وا ستایشکەرانی بیری لێ دەکەنەوە. مەبەست ئەوە نییە لە دیموکراتیکبوونی کەم بۆتەوە، بە پێچەوانەوە لە هەندێ لایەنی گرنگەوە دیموکراتیکتریش بۆتەوە. بەڵام زیاتر لە جاران لە ئاسانگیری، سێکۆلاریزم و باڵادەستیی یاسا دوور کەوتۆتەوە و بۆتە وڵاتێکی نالیبرالتر. ئەم دوو رەوتە - واتە دیموکراتیزاسیۆن و نالیبرالبوونەوە - راستەوخۆ گرێدراوی یەکترن.

هێندستان لە بریتانیا و حیزبی کۆنگرەوە فێری دیموکراسی بوو. زۆربەی دامەزراوە بنەماییەکانی دیموکراسیی لیبرالیی هێندستان لە لایەن بریتانییەکانەوە دامەزران: دادگاکان، ئەنجومەنەکانی یاسادانان، دابونەریتی ئیداری و چاپەمەنیی (تارادەیەک) ئازاد. تەنیا کێشەکە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە ئیجازەیان بە هێندییەکان نەدەدا بە شێوەیەکی ئەوتۆ لەم دامەزراوانەدا دەور بگێڕن. دوابەدوای وەرگرتنی سەربەخۆیی لە ١٩٤٧دا، هێندییەکان بوونە میراتگری ئەم

---

٥٩ . لە داڕێژەرانی یاسای بنچینەیی ئەمریکا و چوارەمین سەرۆککۆماری ئەو وڵاتە. و.ف

دامەزراو و نەریتانە و سەرۆکایەتیی کۆنگرەی نەتەوەییی هێندستان - کە لە خەباتی سەربەخۆییخوازانەی ئەو وڵاتەدا دەوری سەرەکیی گێڕابوو - لەسەر ئەو بنەمایانە دیموکراسیی خۆیان ڕۆ نا. تەنانەت خودی حیزبی کۆنگرەیش بە میتۆدی حیزبە بریتانییەکان هاتە دروستکردن، لە ئایدیۆلۆژیا ناسیۆنالیستییە لیبرالییەکەیەوە بگرە بۆ پێکهاتەی کۆمیتەکانی [لە حیزبەکانی بریتانیا دەچوو]. دادگاکانی هێندستان شێواز و میتۆدی دادوەریی بریتانیایان بەکار دەهێنا و زۆرجار لە ڕەوتی دادوەری و چۆنێتیی موحاکەمەکردندا بە یاساکانی بریتانیا کاریان دەکرد. پەرلەمانی دێهلیی نوێ یاسا و دابونەریتی پەرلەمانی بریتانیای بەڕێوە دەبرد، تەنانەت بۆ «ساتەوەختی پرسیارکردن» لە سەرۆک وەزیران [بە پێی میتۆدی بریتانیا دەچووڵایەوە]. ئەگەر بریتانیا و حیزبی کۆنگرە لەبەرچاو نەگرین سەختە بتوانین بیر لە دیموکراسیی هێندستان، بەو شێوەی ئەمڕۆ دەیبینین، بکەینەوە.

یەکەم سەرۆک وەزیری ئەم وڵاتە، نەهرۆ، جارێکیان خۆی بەم شێوەیە پێناسە کرد: «دوا بریتانییەک کە بەسەر هێندستاندا حکوومەت دەکات». ئەم دەربڕینە ڕاست بوو. نەهرۆ کوڕی پارێزەرێک بوو کە هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکی تەواو بریتانی دەژیا و لایەنگری بریتانییەکان بوو، هەروەها مامۆستایەکی تایبەت مێژوو و ئەدەبیاتی بریتانیای فێر دەکرد. لە ساڵانی دارشتنی کەسایەتیدا وەک جێنتێلمەنێکی بریتانی پەروەردە کرا. لە یەکێک لە بەناوبانگترین قوتابخانە شەو و ڕۆژانە نادەوڵەتییەکانی بریتانیادا - قوتابخانەی هارۆ - خرایە بەر خوێندنەوە و لە زانکۆی کەمبریجدا خوێندنی باڵای درێژەپێدا. پاشان لە لەندەندا چەند ساڵێکیتر بۆ پارێزەری پەروەردە کرا. نەهرۆ تەنانەت دوای هەڵگرتنی بیری ناسیۆنالیستیی هێندی، هێشتا هەر هەڵگری هەمان دونیابینیی ڕۆشنبیرانی بەرەی چەپی بریتانیا لە ساڵانی ١٩٤٠دا بوو.

باشترین وێناکردن بۆ هێندستانی سەردەمی سەرۆکایەتیی نەهرۆ لە نێوان ساڵانی ١٩٤٧ تا ١٩٦٢، ناوزەدکردنیەتی بە دیموکراسیی تاکحیزبی. هەڵبژاردنەکان ئازاد و دادپەروەرانە بەڕێوە دەچوون بەڵام حیزبی کۆنگرە - واتە ئەو حیزبەی هێندستانی ڕزگار کردبوو و تاکەحیزبی بەراستی نەتەوەیی بوو - بەسەر هەموو رووبەرەکاندا زاڵ بوو و زۆرجار زۆرینەی دوو لە سێی پەرلەمان و ئەنجومەنە ئەیالەتییەکانی بەدەستەوە بوو. ئاوەها پێگەیەکی ئێرەییئامێز هەموو تایبەتمەندییە ڕەسمی و نارەسمییەکانی بۆ دەقۆستەوە و وای کردبوو لە زۆر لایەنەوە کەس نەتوانێ ململانێیەکی جیدیی لەگەڵدا بکات. وەک ئەوسای حیزبی دیموکرات لە باشووری ئەمریکادا، حیزبی کۆنگرەیش هەموو رووبەرەکانی پرۆسەی سیاسیی قۆرخی خۆی کردبوو. هێندستان دیموکراسی بوو بەڵام لەم دیموکراسییەدا حیزبێکی سیاسیمان هەبوو لەوانی دیکە یەکسانتر بوو. بە هەموو ئەمانەشەوە

هێندستان وڵاتێکی تەواو لیبرال بوو. حیزبی کۆنگرە نەریتە رەسەنەکانی حکوومەتی یاساخوازی دەپاراست، بەتایبەت خودی نەهرۆ بە قووڵی باوەڕی بە دامەزراوە و نەریتە لیبرالییەکانی وەک یاسا و دەسەڵاتی پەرلەمان و چاپەمەنییەکان بوو و رێزی لێ دەگرتن. نەهرۆ پشتگیریی لە دەزگای سەربەخۆی دادوەری دەکرد، تەنانەت ئەگەر ئەم پاڵپشتییە بە مانای قبووڵکردنی شکستی سیاسی لە دادگادا بوایە. ئەو کەڵکەڵەی سێکۆلاریزم و ئاسانگیریی مەزهەبیی هەبوو و سەرەڕای ئەوەی زۆر خۆشەویست بوو تەگەرەی نەدەخستە بەردەم بیروبۆچوونی جیاواز و زۆرجار بیرە جیاوازەکان هەم لە حیزبەکەی و هەم لە دەوڵەتدا سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا.

سەردەمی شەست و حەفتاکان کە لەم وڵاتەدا گەورە دەبووم، ئەم نەریتە هێشتا زیندوو بوو بەڵام بەرەو نەمان دەچوو. حیزبی کۆنگرە لە رێکخراوێکی زیندوو و بەبنەماوە گۆڕدرا بۆ دەربارێکی ماستاوچی و شاهانە کە ستایشی سەرۆکە جەماوەرییەکەی خۆی، واتە ئیندیرا گاندی، دەکرد و هەر ئەم سەرۆکە بوو مانیفێست و چارەنووسی حیزبەکەی دیاری دەکرد. خاتوو گاندی کۆمەڵە سیاسەتێکی پۆپۆلیستیی بەڕێوە دەبرد کە زۆربەیان یاسانەخواز و بێگومان نالیبرالی بوون، بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بدەینە بەنەتەوەییکردنی بانکەکان و هەڵوەشاندنەوەی مافەکانی شازادە هێندییەکان. بەڵام بەمەشەوە هێشتا دادگاکان بە زۆری سەربەخۆ بوون، چاپەمەنییەکان ئازاد بوون و ئاسانگیریی (لێبوردەیی) مەزهەبی پیرۆز و بەڕێز بوو. بەڵام حیزبی کۆنگرە وردە وردە لەم دامەزراو و بەهایانە زیاتر و زیاتر دوور دەکەوتەوە. لەمەش گرنگتر ئەوە بوو کە حیزبی کۆنگرە ئەو پێگە باڵا و بەرزە نەتەوەییەی پێشووی لە دەست دا و کۆمەڵە هێزێکی تازە بە مەبەستی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە هاتنە مەیدان کە گرنگترینیان حیزبی بونیادگەرای هێندوو، واتە حیزبی بەهاراتیا جاناتا (بی.جی.پی) بوو. ئەڵبەت بی.جی.پی تەنیا یەکێکە لەو هەموو حیزبە پڕهەراوزەنا تازانەی کە جیاوازییە ناوچەیی و مەزهەبی و چینایەتییەکان بە ئاراستەی راکێشانی سەرنجی خەڵکدا بەکار دەهێنن. هەر بۆیە دەنگدەری نوێ هاتوونەتە نێو سیستەمی سیاسییەوە کە زۆربەی هەرەزۆریان لە توێژی هەژار و لادێیی و چینە خوارەکانی کۆمەڵگان. لە پەنجاکاندا نزیکەی لە سەدا ٤٥ی جەماوەر دەنگیان دەدا و ئەم رێژەیە ئێستە سنووری ٦٠ی تێپەڕاندووە. بیرمەندێکی زانستە سیاسییەکانی هێندستان بە ناوی یووجێندرا یاداف، خوێندنەوەیەکی بۆ ئەم بابەتە کردووە و پێی وایە «گۆڕانکارییەکی بنەمایی بەڵام لەسەرخۆ» هێندستانی گرتۆتەوە، واتە کردنەوەی دەرگاکانی سیاسەت بە رووی ئەو تاقم و گرووپە زۆر بەربڵاوانەی دیکەدا کە پێشتر کەوتبوونە پەراوێزەوە. ئەم حیزبانە هێندستانیان دیموکراتیکتر کردۆتەوە بەڵام هاوکات نالیبرالیتریشیان کردۆتەوە.

بی.جی.پـی لە ڕێگـای شـەرمەزارکردنی سـێکۆلاریزمی نەهـرۆ و پشـتیوانیکردنی جـۆرە ناسـیۆنالیزمێکی میلیشـیاییی هێنـدوویی و هەڵگـرتن و پەرەپێـدانی دروشـم و هێرشـی دژ بە موسوڵمانان و مەسیحییانەوە دەسەڵاتی گرتە دەست. ئەم حیزبە هەوڵێکی نەتەوەییی بە ئاراستەی ڕووخانـدنی مزگەوتێکـدا لە بـاکووری هێندسـتان (لە شـاری ئایۆدێهیـا) خسـتە گەڕ، چونکـوو دەستەیەک لە هێندووەکان پێیان وابوو ئەم مزگەوتە لە شـوێنی لەدایکبـوونی «رامـا»[٦٠]دا دروست کراوە. بی.جی.پـی گـوێی نەدەدا بەوەی کە راما سـیمایەکی ئەفسـانەییە و مەزهەبـی هێنـدوو دژی توندوتیژی و لایەنگری ئاسانگیرییە، تەنانەت بۆی گرنگ نەبوو کە هێندستان مێژوویەکی تـۆقێنەری توندوتیژیی مەزهەبی ژیاوە (کە بۆ جارێکیتر لە ڕووداوی ئایۆدێهیـادا دووپـات بـوویەوە). دروشـمە پڕ لە قینەکانی بی.جی.پی سەرنجی دەنگدەرانی ڕەسەنی ئەو حیزبەی بۆ لای خۆی رادەکێشا. بەم دواییـانە بی.جی.پـی دەوڵەتێکـی هاوپەیمـانیی پێـک هێنـاوە و بە ناچـار و لەبەر ئەنـدامە هاوپەیمانەکـانی، دروشـمی دژی موسـوڵمانان، مەسـیحییان و چینـە خوارووەکـانی کۆمەڵگـای کەم کردۆتەوە. بەڵام هێشـتا سیاسـەتی سـەرەکیی ئەم حیـزبە «بەهێنـدوویی‌کردنی هێندسـتان»ە، واتە سەرلەنوێ نووسینەوەی کتێبی مێژووی قوتابخانەکان بە مەبەستی کەمکردنەوەی ڕۆڵی موسوڵمانان و کەمایەتییەکـانی‌تر، کـردنەوەی کـۆلیژی بەختناسـی[٦١] لە زانکـۆ گەورەکانـدا و پەرەپێـدانی کەڵکوەرگرتن لە هێما مەزهەبییەکانی ئایینی هێندوو لە شـوێنە گشـتییەکاندا. ئەم حیـزبە هەرکـات کەوتبێـتە تەنگـاوێکی سیاسـییەوە هەوڵـی هەڵگیرسـاندنی شـەڕی مەزهەبیـی داوە کە بـۆ نمـوونە دەتوانین ئاماژە بە ڕووداوەکانی ساڵی ٢٠٠٢ی گوجەرات بکەین[٦٢].

دەوڵەتی خۆمـاڵیی بی.جی.پـی لە گوجەراتـدا بە شـێوەیەکی بێـوێنە لە بەرانـبەر کۆمەڵکـوژیی هەزاران پیاو و ژن و منداڵی بێتاوانی موسوڵماندا بێدەنگ بوو و تەنانەت بگـرە یـارمەتیی بکەرانـی ئەم جینایەتەیشـی دەدا. لەم پاکسـازییە ئێتنیکیـیەدا بە هەزاران کەس لە مـاڵ و شـاری خۆیـان ئاوارە و دەربەدەر کران. لە هەندێ لایەنەوە ئەمە یەکەم کۆمەڵکوژییەک بـوو لە هێندسـتاندا کە بە یارمەتیی دەوڵەت ئەنجام دراوە. لە هەمووی دڵتەزێنتر ئەو حەقیقەتەیە کە بەپێی هەموو بەڵگەکان ئەم ڕووداوە بوو بە هۆی پتەوبـوونەوەی حیزبـی بی.جی.پـی و پـێگەی هێنـدوویی ئەم حیـزبە. لە

---

٦٠ . خودای ئەفسانەییی هێندووەکان. و.ک

٦١ . Astrology : خوێندنەوەی چارەنووس بە پێی ئەستێرەکان. و.ک

٦٢ . لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٤دا حیزبی کۆنگرە توانیی زۆرینەی ڕێژەیی دەنگەکان بەدەست بهێنێ و بوو بە بەرپرسی دروستکردنی دەوڵەتی هاوپەیمانی. حیزبی کۆمۆنیستی هێندستانیش یەکێکە لە گرنگتـرین لایەنەکانی ئەم هاوپەیمانییە کە دواجار دەوڵەتێکی چەپگەرای لێ کەوتۆتەوە. و.ف

راستیدا سەرۆکی گوجەراتی بی.جی.پی دەیویست ئەم توندوتیژییانە بکاتە بیانوویەک بۆ ئەوەی چەند مانگ دواتر هەڵبژاردن بەڕێوە بچێت، بەڵام کۆمیسیۆنی ناحیزبیی هەڵبژاردنەکان زۆر بوێرانە ئیجازەی بەم کارە نەدا و رایگەیاند کە ئەم بارودۆخە بۆ بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن ناشێت.

دەمارگرژیی مەزهەبی تەنیا لایەنێکی سیمای تازەی دیموکراسیی هێندستانە. گەندەڵیی بەربڵاو و گوێنەدان بە باڵادەستیی یاسا سیاسەتی ئەم وڵاتەی بەتەواوی گۆڕیوە. با ئاوڕێک لە ئۆتارپرادێش بدەینەوە کە گەورەترین ویلایەتی هێندستان و پێگەی سیاسیی نەهرۆ و گەورە کاربەدەستانی دیکەی حیزبی کۆنگرە بوو. ئێستاکە بی.جی.پی و دوو حیزبی چینی خوارەوە بەسەر ئەم ئەیالەتەدا زاڵ بوون. تاقە ناوێک دەتوانین بیبڕین بە باڵای سیستەمی سیاسیی ئەم ئەیالەتەدا یەک ناوە: «دیموکراسیی چەتەیی». لەم ئەیالەتەدا هەموو ساڵێ هەڵبژاردن بەڕێوە دەچێ و سندووقەکانی دەنگدان لەسەر یەک کەڵەکە دەکرێن. حیزبی سەرکەوتوو دامودەزگای ئیداری و تەنانەت هەندێجار دادگاکان پڕ دەکات لە ئەندامانی خۆی و بەرتیل بە نوێنەرانی حیزبی دژبەری دەدات بەڵکوو بیانکاتە ئەندامی خۆی. تراژیدیای میلیۆنان دەنگدەری چینە خوارەکان ئالێرەدا دەقەومێ، ئەم جەماوەرە لێقەوماوە بە سۆزی بەڵێنداری و بەرپرسایەتی نوێنەرەکانیان هەڵدەبژێرن، بەڵام ئەم نوێنەرانە بە تاڵانکردنی سامان و سەروەتی میللەت گەلێ بەدەسەڵات و دەوڵەمەند دەبنەوە، کەچی هاوکات کۆمەڵێ دروشمی رووت و بێناوەڕۆک لەسەر بارودۆخی دژوار و سەختی خەڵک بەرز دەکەنەوە.

خراپترین دۆخی ئەم پرۆسەیە لە نوڤامبری (تشرینی دووەم) ١٩٩٧دا رووی دا؛ سەرۆک وەزیرانی ئۆتارپرادێش بە مەبەستی پاراستنی زۆرینە لە پەرلەماندا، ٩٣ وەزیری بۆ کابینەکەی دەسنیشان کرد تاکوو هەموو ئەو نوێنەرانەی حیزبەکەیان دەگۆڕن و پشتیوانی لەو دەکەن، پۆستێکی دەوڵەتییان بەربکەوێت. وەزیرە تازەکان رابردوویەکی پڕهەورازونشێویان هەبوو؛ نۆزدەیان پێشینەی تاوانکاری و مەحکوومبوونیان هەبوو (دیارە مەبەستم غەرامەی لێخوڕینی ئۆتۆمبیل نییە). بۆ وێنە وەزیری زانست و تەکنۆلۆژیا، هەری شنکار تیواری، لە ئیدارەی پۆلیسدا دۆسیەیەکی بۆ کرابوویەوە کە بەپێی ئەو دۆسیەیە تاوانبار بوو بە ئەنجامدانی ٩ قەتڵ (کوشتن)، دە جار هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی قەتڵ، سێ جار دزی و سێ جار مرۆڤڕفاندن. وەزیری بەڕێوەبردنی گەڵاڵەکان (با واز لە واتاکەی بهێنین)، راگوراج پراتاپ سینچ، بە تۆمەتی سێ قەتڵ، سێ جار هەوڵدان بۆ قەتڵ و چەندجاریش مرۆڤڕفاندن لە ژێر لێپرسینەوەدا بوو (بەگشتی ٢٥ تاوان). وەزیرێکیتر بە ناوی پراتاپ سنچ دەسەڵاتی تازە دۆزراوەکەی کردبووە پردێک بۆ ئەوەی خۆی

بکاتە بارۆنێکی فیۆدال. گۆڤاری هەواڵنێریی *ئاوت لووک* کە یەکێکە لە بەپێزترین گۆڤارەکانی هێندستان، بەم شێوەیە هەوارگەکەیمان بۆ وێنا دەکات:

لە حەوشەی ماڵەکەیدا خوانێکی گشتی دەکاتەوە و عەداڵەتی خێرا بەڕێوە دەبات ـ «رەعیەتە خەتاکارەکان» غەرامە دەکات یاکوو دەستووری فەلاقەکردنی توندیان دەدات. رەعیەتەکانی ـ پیاوان و ژنان و منداڵانی هەژار ـ تەوێڵ بە پێیدا دەساون و داوای لێبوردنی لێ دەکەن. هەموو بەیانییەک جەماوەر لە دەرەوەی ماڵ و موڵکە قورس و قایمەکانیدا کۆ دەبنەوە و بە کڕنووشبردن رێزی لێ دەگرن... ئەم (سالارە) ٢٨ ساڵە سواری ئەسپی شاهانە دەبێت، چەندەها فیلی هەیە و بە خێرایییەکی زۆرەوە بە ئۆتۆمبیل تەراتێن دەکات و لایەنگرە چەکدارەکانیشی بەدوای ئۆتۆمبیلەکەیدا بەڕێوەن. بەپێی دۆسییەکانی پۆلیس نەیارانی خۆی دەکوژێت و چەتەگەری دەکات، بەڵام هیچکام لەم شتانە نەبوتە لەمپەر لە بەردەم پێشکەوتنەکانیدا. ئەوکاتەی بۆ یەکەم جار هەڵبژاردنی ١٩٩٣ی بردەوە هێشتا ٢٤ ساڵیشی نەبوو. سێ ساڵ پاش ئەو بەڕوارە بۆ جارێکیتر لە ململانێکان [ی هەڵبژاردندا] بەشداریی کرد بەڵام جیا لە بی.جی.پی کەسیتر نەیدەوێرا دژایەتیی لەگەڵدا بکات.[١٠]

ئەمە سیمای راستەقینەی دیموکراسیی هێندستانە. کەچی بەم حاڵەشەوە لە رۆژئاوادا کەس نایەوێ بە شێوەیەکی جیدی لێی بکۆڵێتەوە. ئێمە پێمان خۆشە بە خەونی جوانی دەنگدانی هێندییەکان و چێژەکانی گەورەترین دیموکراسیی جیهانەوە بژین. بەڵام بیرمەندانی هێندی لێکدانەوەیەکی جیاوازیان بۆ ئەم دیموکراسییە هەیە. کۆڵدیپ نایار، کۆنە رۆژنامەنووسی هێندستان، رووداوەکانی ئۆتارپرادێش بە «کوشتنی دیموکراسی لە رۆژی نیوەڕۆدا» پێناسە دەکات. نووسەرێکی بەناوبانگی دیکە، پرم شنگرجا، پێی وایە لە ئۆتارپرادێش دیموکراسی «دووسەد ساڵ» گەڕاوەتە دواوە. بەڵام ئۆتارپرادێش تاقە نموونە نییە. گەندەڵیی سیاسی لە ئەیالەتە دراوسێکانی ئۆتارپرادێش، بیهار و هاریانا، گەلێ بەرفراوانتر و قووڵترە. رەوتی گەندەڵی تەنانەت پەرلەمان و دەوڵەتی دێهلیشی گرتۆتەوە، ئەڵبەت بە رێژەیەکی کەمتر.

دەزگای دادوەری کە سەردەمانێک سەرگوڵی دیموکراسیی هێندی بوو، ئێستا بوتە کەنیزێکی گەندەڵی دەسەڵاتی سیاسی. لە ١٩٧٥دا دادوەرێکی خۆماڵی ئیندیرا گاندیی سەرۆک وەزیرانی لەسەر کار لابرد، چونکو پێی وابوو یاسایەکی بچووکی هەڵبژاردنی پێشێل کردووە. لە ١٩٨١دا دادوەرێکی خۆماڵیی دیکە بڕیارێکی دژی بەهێزترین سیاسەتمەداری ئەیالەتیی هێندستان واتە سەرۆوەزیری ئەیالەتی ماهاراشیترا راگەیاند (ئەم ئەیالەتە دەوڵەمەندترین ئەیالەتی هێندستانە کە پایتەختی ئابووریی ئەو وڵاتە، واتە بەمبەیی، کەوتۆتە ئەو ئەیالەتەوە). بەڵام ئێستا هەر کە

حیزبێک لە ناوچەیەکدا دەسەڵات دەگرێتە دەست یەکسەر بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕێ بۆ ئەوەی دادگا خۆماڵییەکان پڕ بکا لە هاوڕێ و ئەندامانی خۆی. ئێستە دادوەران بوونەتە ئالاهەڵگری ئەم پرۆسەیە و بوونەتە خزمەتکاری سەرکردە سیاسییەکان بەشکوو پێگەی کارییان توندوتۆڵ بکەنەوە و دوای خانەنشینی خەڵات بکرێن. لەوڕۆدا جگە لە دیوانی باڵای دیهلیی نوێ، هیچ دادگایەکیتر خاوەن ئەو سەربەخۆییە نییە کە زۆربەی هەرەزۆری دادگاکان سەدەیەک لەمەوپێش بوویان.

هێندستان هەمیشە گەندەڵیی تێدا بووە، بەڵام تا پێش حەفتاکان وردەگەندەڵییەکی کەمبایەخ دەبینرا کە ئەویش لەبەر یاسای ئابووریی گەمژانەی وڵات بوو. باوترین جۆری گەندەڵی لە شەستەکاندا بریتی بوو لە بەرتیلوەرگرتنی کاربەدەستێکی دەوڵەتی لە [چالاکانی] کەرتی تایبەت. ئەمە زەبری لە گەشەسەندنی ئابووری دەدا بەڵام کۆی پرۆسەی سیاسیی پەک نەدەخست. گەندەڵیی سیاسیش دەبینرا بەڵام کەم و بەرکورت بوو. هیچکات تاوانی گەندەڵی نەخرایە پاڵ نەهرۆ یان سەرۆک وەزیرانی دوای ئەو واتە لەعل بەهادۆر شەستری، یاکوو ئەندامێکی باڵای دەوڵەت لە پەنجا و شەستەکاندا. ڕەنگە لە هەموو شت گرنگتر ئەوە بێت کە دەزگای دادوەری دەزگایەکی پاکژ و خاوەن پێوەری بەرز و باڵا بوو. نەهرۆ لە ١٩٥٨دا یەک لە بەرجەستەترین دادوەرانی هێندستانی بە ناوی ئێم سی چاگلا وەک باڵیۆزی ئەو وڵاتە لە ئەمریکادا دیاری کرد. ئەنجومەنی پارێزەرانی بەمبەیی زۆر خێرا بە ڕاگەیاندننامەیەکی ڕەسمی ئەم کارەی شەرمەزار کرد و نیگەرانیی خۆی دەربڕی. بە باوەڕی ئەوان دانانی دادوەرێک لە پۆستێکی بەرزدا سیمای سەربەخۆی دەزگای دادوەری دەخاتە بەر مەترسییەوە. کەچی ئێستا پێشکەشکردنی پۆستە دەوڵەتییەکان بە دادوەرانی گوێڕایەڵ هێند ئاسایی بۆتەوە کەس تووشی سەرسووڕمان ناکات. لە ئاکامدا هەرچەند گەندەڵی و بەکارهێنانی خراپی دەسەڵات لە هێندستاندا گەشتۆتە ئەوپەڕی خۆی، بەڵام هیچ دادوەرێک لە هیچ شوێنێکی ئەم وڵاتەدا دۆسیەیەک بۆ سیاسەتمەدارێکی بەهێز ناکاتەوە و مەحکوومی ناکات. تەنیا سەرۆکی کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن بوو کە هەوڵی پاککردنەوەی پرۆسەی هەڵبژاردنی لە گەندەڵی دەدا کە هەراوزەنایەکی گەورەی لێ کەوتەوە.

ئێستە کە ئاوڕێک لە ڕابردوو ئەدەینەوە بە باشی تێدەگەین کە لە پەنجا و شەستەکاندا حیزبی کۆنگرەی نەهرۆ تەکووزییەکی لیبرالئاسای بەسەر هێندستانا داسەپاند، بەڵام ململانێکانی ئەو حیزبە تازە هەڵتۆقیوانەی لە پێناو کۆکردنەوەی دەنگی جەماوەردا بە ئاشکرا سیاسەتی وورووژاندنی هەستی زمانی و مەزهەبییان بەکار دەهێنا، بوو بە هۆی لەخشتەچوونی ئەم تەکووزییە. گەورەترین ڕەنگدانەوەی ئەم دیاردەیە زیاتر لە هەموو شوێن لە بارودۆخ و گۆڕانکارییەکانی زادگەکەی مندا دەرکەوتووە. بەمبەیی شارێکە کۆمەڵگای کەمایەتییە گرنگەکانی بەردی بناغەیان داناوە:

پیشەکارانی پارسی[٦٣]، بازرگانانی گوجەراتی، ڕێستۆراندارە موسوڵمانەکان و هەروەها بریتانییەکان.
بە پێچەوانەی کەلکەتە و دێهلی، ئەم شارە قەت نەبوو بە پایتەختی بریتانییەکان. دەتوانین ئەم شارە بشوبهێنین بە تێکەڵکردێکی نیۆیۆرک و لۆس ئانجلێس، واتە شارێکی تازە هەڵتۆقیو و پارەپەرست، بەڵام لە هەمان کاتدا زیندوو و شیاوسالار و ئاسانگیر. وەک زۆربەی شارە بەندەرییە گەورەکان ئەم شارەش هەمان کەشوهەوای ورووژێنەری جیهانیی بەسەردا زاڵ بوو.

تاقە شتێک لە بەمبەیی ئەو سەردەمە ماوەتەوە تەنیاوتەنیا یادەوەرییەکی رووتە و هیچیتر. لە بیست ساڵی رابردوودا سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی هیندوو و مۆدێلە خۆماڵییەکەی، واتە نیشتمانپەرستیی توندڕەوانەی ماراتا، سیمای پێشووی ئەم شارەی تێک داوە، ئەو حیزبە ئەیالەتییەی ئالاهەڵگری ئەم بزاڤەیە، حیزبی شیوسنا، ناوی خۆی لە سەرکردەیەکی سەدەی حەڤدە بە ناوی شیواجی وەرگرتووە، ئەو کابرایە دژی ئیمپراتۆرە مەغۆلەکانی (موسوڵمان) دێهلی بوو. ئەو حیزبە سوورە لەسەر سڕینەوەی ئاسەوارەکانی «بێگانە» لە پارێزگای ماهاراشیترا کە بەمبەیی دەبێتە پایتەختی (لە سەدەی دوازدەهەمەوە وردەوردە موسوڵمانان تێکەڵ بە هیندستان بوون بەڵام وا دیارە ٨٠٠ ساڵ ناتوانێ ببێتە پێوەری هیندیبوونی ئەوان). گەورەترین دەرکەوتەی ئەم سیاسەتە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ بەرنامەی گۆڕینی ناوی هەموو ئەو شار و شارۆچکە و جادە و بینایانەی ناوێکی رەسەنی هیندوویان نییە. لووتکەی ئەم بەرنامەیە ئەوکاتە بوو کە لە ١٩٩٦دا گۆڕینی ناوی بەمبەیی بۆ مۆمبای کەوتە رۆژەڤەوە، بێگومان ئەم بابەتە مانای دەستکردبوونی زۆربەی هەرەزۆری ناوەرۆکی ناسیۆنالیزمی هیندوو. بە پێچەوانەی بیجینگ (شارێکی کۆن کە رۆژئاواییەکان لە زمانی ئینگلیزیدا ناوی «پیکەن»یان بۆ دانا)، لە راستیدا بەرلەوەی پورتەگاڵییەکان و بریتانییەکان ئەم ناوەی لەسەر دانێن قەت شارێکمان بە ناوی مۆمبای نەبووە. بەمبەیی وەکوو سەنگاپوور و هۆنگکۆنگ گوندێکی بچووکی ماسیگری بوو، کۆلۆنیالیستەکان کردیانە شار. «مومبای» گەڕانەوە نییە بۆ رابردوو، بەڵکوو شەرعییەتبەخشینە بە ئەفسانەیەک.

رەنگە ناوی تازەی شارەکان وەک کردەیەکی هێمایین لێک بدرێتەوە، بەڵام نیشاندەری ئەوەیە کە «روانگە» تووشی ئاڵوگۆڕێکی گەورە بووە. ئەم ئاڵوگۆڕە لە کاتی قەیراندا دەتوانێ بەرهەمهێنەری کارەساتی خوێناوی بێت. لە دە ساڵی رابردوودا گەورەترین کەمایەتیی بەمبەیی، واتە موسوڵمانان، بوون بە قوربانیی کۆمەڵە ئاژاوەیەکی خوێناوی کە خراپترین ئاژاوەی دوای پارچەپارچەبوونی خوێناویی هیندستان لە ١٩٤٧دا بووە. بە دەیان هەزار کەس کوژراون و سەدان هەزار کەس لە ترسدا بەمبەییان بەجێهێشتووە و روویان کردۆتە گوندەکان. ئەمە دەقاودەق

---

٦٣ . مەبەست ئەو زەردەشتییانەیە کە بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئێران. و.ف

پێچەوانەی ڕەوتی باو و ئاساییە کە کەمایەتییەکان بە مەبەستی بەهرەمەندبوون لە یەکسانی و بەدەستهێنانی پێگەیەکی باشتر بە کۆمەڵ ڕوو لە شارەکان دەکەن. کۆمیسیۆنێکی سەربەخۆ پۆلیس و دەوڵەتی بەوە تاوانبار کرد کە هیچ پارێزگارییەک لە قوربانییانی ئەم ئاژاوەیە ناکەن و تەنانەت جارناجارێ یارمەتیی یاخیبووانیش دەدەن. ئەمەش بوو بە مایەی تۆڵەسەندنەوەی موسوڵمانان کە دوژمنایەتیی مەزهەبیی لەم ئەیالەتەدا هێندەی تر قووڵ کردەوە، بە شێوەیەک کە زۆربەی چاودێران بە درێژاییی تەمەنیان قەت ئاوەها دۆخێکیان نەدیبوو. ئەم ڕەوتە هەموو هێندستانی گرتۆتەوە و تەنیا لە بەرانبەر موسوڵمانانیشدا بەڕێوە ناچێ، دوا نموونەی ئەم ڕووداوانە لە گوجەراتدا قەوما. هەژماری ئەو مەسیحییانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٩٨ و ١٩٩٩دا بوون بە قوربانیی توندوتیژییە مەزهەبییەکانی هێندستان، چوارقاتی سیوپێنج ساڵی ڕابردوو بوو. لە ١٩٩٩ بەدواوە بەڵگە و ئامارەکان ناتەواو و کەموکورتن، بەڵام هێشتا ڕێژەی قوربانییان هێند زۆرە مرۆڤ سەرسام دەکات. جیا لەم کوشتوبڕانە هەندێ تێگیرانی دیکەیش قەوماوە، وەک سوتاندنی ئینجیل، تاڵانکردنی کلێساکان و دەستدرێژیکردنە سەر ڕاهیبەکان. دیسان دەوڵەت یان ئیجازەی لێکۆڵینەوەی لەسەر زۆربەی ئەم تاوانکارییانە نەداوە یاکوو خستوویەتە دواوە.

شەڕی ڕەگەزی هاوتەمەنی مێژووە و ڕژێمە دیکتاتۆرییەکان لە پەرەپێدانی ئەم شەڕانەدا دەستیان هەبووە. بەڵام لە هەموو ئەو وڵاتانەدا کە تازە بە تازە و ئاراستەی دیموکراتیزاسیۆنیان گرتۆتە پێش، نیشانەکانی ئاوەها دیاردەیەک دەبینرێت و مرۆڤ گەلێ نیگەران دەکات. هۆکارەکەی گەلێ ساکارە: هەرچی کۆمەڵگا زیاتر بکرێتەوە سیاسەتمەداران زیاتر هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات دەدەن و بۆ کۆکردنەوەی دەنگەکان پەنا دەبەنە بەر ڕێگایەک کە دواجار ڕاستەوخۆترین و کاریگەرترین ڕێگایە؛ واتە کەڵکوەرگرتن لە یەکێتی و یەکخستنی گرووپێک لەسەر بنەمای دژایەتیکردنی گرووپەکانیتر. زۆرجار ئەم سیاسەتە دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی تێگیرانی ئێتنیکی و مەزهەبی. هەندێ جاریش ئەم پێکدادان و تێگیرانانە دەگۆڕدرێن بۆ شەڕێکی هەمەلایەنە و ڕاستەقینە.

## شەڕ

ڕۆژی ٨ی دێسامبری (کانونی یەکەم) ١٩٩٦ ژاک لانگ بە پەلە چوو بۆ بێلگراد. سیاسەتمەدارای بەناوبانگی فەرەنسا و وەزیری پێشووی ڕۆشنبیری، کەوتبووە ژێر کاریگەریی ڕێپێوانەکانی دەیان هەزار

خوێندکاری یۆگۆسلاڤیاوە کە بۆ ناڕەزایی دەربڕین بەرانبەر سەرۆککۆماری ئەو وڵاتە، سلۆبۆدان میلۆسـویچ، کـۆ بووبـوونەوە، لانـگ و زۆربەی رۆشـنبیرانی رۆژئـاوا میلۆسـویچیان بە بەرپرسـیاری شـەڕی باڵکـان دەزانـی. لانـگ دەیویسـت پشـتیوانیی مەعـنەوی لە نارازییـانی یۆگۆسـلاڤیا بکـات. سـەرکردایەتیی بـزووتنەوەکە لە نووسـینگەکانیان لە کـۆلێژی فەلسـەفەی یەک لە زانکۆکانـدا پێشوازییان لێکرد، بەڵام تەنیا بۆ ئەوەی بە نووکەشەق بیکەنە دەرەوە و بە «دوژمنـی سـێرب»ی نـاوزەد بـکەن و فـەرمانی پـێ بـدەن وڵاتەکەیـان بە جـێ بهێڵـێ. دەرکەوت کە خوێنـدکاران لەبەر دەسـپێکردنی شـەڕ دژایەتیـی میلوسـویچ نـاکەن، بەڵـکوو لەوە نـاڕازین کە نەیتوانیـوە لە شـەڕدا سەربکەوێت.

ئەم رووداوە، کە بوو بە مایەی تەریقبـوونەوە و پەسـتبوونی لانـگ، بۆچـوونێکی بـاو و زۆرجـار هەڵەی خسـتە روو: هێـزە دیموکراسـیخوازەکان لایەنگـری پێکەوەژیـانی ئەتنیکـی و ئاشـتین. بەڵام مەرج نییـە ئەم بۆچـوونە هەمیشـە راست بێت. دیموکراسـییە لیبـرالییە پێشـکەوتووەکان، زۆربەی کات، دەتوانن بەبێ توندوتیژی و تیرۆر و تۆقاندن جیاوازییە رەگەزییەکان قبووڵ بـکەن و ژیـانێکی ئاشتییانە لەگەڵ دیموکراسییە لیبرالییەکانیتردا بژین. بەڵام لە راسـتیدا ئەگەر دیموکراسـی تـێکەڵ بە کۆمەڵگایەکی ناتەبا و رەنگاوڕەنگ بێت کە هیچ جۆرە مێژوویەکی لیبرالیزمی یاساخواز نەژیاوە، دەبێتە هـۆی سـەرهەڵدانی ناسـۆنالیزم، ململانێـی ئەتنیکـی و تەنـانەت شەڕوشـۆڕ. لەو هەڵبـژاردنە یەکلەدوای‌یەکـانەدا کە یەکسـەر دوای رووخـانی کۆمـۆنیزم لە سـۆڤییەت و یۆگۆسـلاڤیادا بەڕێوەچـوون، جوداییخـوازە ناسیۆنالیسـتەکان سـەرکەوتن و دواجـار ئەم وڵاتـانە لێـک تـرازان و هەڵوەشـانەوە. ئەم دیـاردەیە لە جەوهەردا شـتێکی خـراپ نەبـوو، چوونکـوو ئەم وڵاتـانە بە زۆر پێکەوە لکێنرابوون. بەڵام چونکوو هیچ جۆرە گەرەنتـی و دامەزراوە و دەسـەڵاتێکی سیاسـی نەبـوو پشتیوانی لەو هەموو کەمایەتییانە بکات کە لەم وڵاتە تـازەهەڵتۆقیوانەدا دەژیـان، ئەو جیـابوونەوە خێرا و کتـوپڕانە بـوون بە مـایەی کەوتـنەوەی زنجیـرەیەک شـۆڕش و ئـاژاوە و سـەرکوتکردن و لە هەندێ وڵاتی وەک بۆسنی و ئازەربایجان و گورجستاندا شەڕیان لێ کەوتەوە.

پێویستە سیاسەتمەداران بۆ بەدەسـتهێنانی دەنگـی خەڵـک هەڵبژاردنەکـان بـکەن بە مەیـدانی رکابـەری و ململانـێ. لە هەر کۆمەڵگایەکـدا نەریتـی تونـدوتۆڵ بـۆ [بەڕێـوەبردنی] گـرووپە فرەنەتەوەییەکـان یـان تواندنەوەی کەمایەتییەکـان لە نـاو کۆمەڵگـادا لە بەردەسـتدا نەبێـت، بـۆ بەدەسـتهێنانی پشـتیوانیی خەڵـک سـادەترین کـار ئەوەیە کە پەنـا ببەیـتە بەر پرسـە رەگەزی، ئەتنیکی و مەزهەبییەکان. هەر گرووپێکی ئەتنیکی دەسەڵات بگرێتە دەست گرووپە ئەتنیکییەکـانیتر دەنێتە لاوە. وا دیارە رێکەوتـن و پێکەوەژیـان نـاموومکینە؛ ئیمکـانی دیـالۆگ و دەمەتەقـێ لەسـەر

خانووبەرە، نەخۆشخانە و [کۆکردنەوەی] خێرو خێرات هەیە، بەڵام ئایا ئیمکانی ڕێکەوتن لەسەر مەزهەبی نەتەوەییش هەیە؟ ئەگەر رکابەریی سیاسی بەرهەمهێنەری دووبەرەکی بێت ئەگەری ئەوە دەچێت زۆر خێرا بگۆڕدرێ بۆ شەڕانگێزی و توندوتیژی. ئافریقا گەلێ بزاڤ و شەڕی چەکداری و کوودێتای بەخۆوە دیوە کە زۆربەیان دژ بە حکوومەتگەلی ئەتنیکی هەڵگیرساون، زۆربەی ئەم حکوومەتانەش لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە هاتبوونە سەرکار. ئەو دوو توێژەرەی وا لە هۆکارەکانی رووخانی دیموکراسییە ئاسیایی و ئافریقاییەکان لە دەیەی ١٩٦٠دا کۆڵاونەتەوە، دەرئەنجام پێیان وایە دیموکراسی «بە هیچ شێوەیەک لە شوێنێکی تەژی لە هەلاواردنی قووڵی ئەتنیکیدا سەقامگیر ناکرێت». [١١] توێژینەوەکانی ئەم دواییانە، بەتایبەت لە ئافریقا و ئاسیای ناوەڕاستدا، ئەو بۆچوونە رەشبینانەیان پشتڕاست کردۆتەوە. پسپۆڕێکی گەورەی بواری ململانێ ئەتنیکییەکان بە ناوی دۆناڵد هۆرۆویتز ئاوەها ئەنجامگیرییەک ئەدا بەدەستەوە: «مرۆڤ کە لەم چیرۆکە دڵتەزێنە ورد دەبێتەوە... چیرۆکی داڕووخانی ئاشکرای دیموکراسی لە کۆمەڵگا فرەچەشنییەکاندا... حەز دەکات دەستەکانی بە نیشانەی تەسلیمبوون بەرز بکاتەوە. هەڵبژاردن سوودی چییە ئەگەر دواجار لە زامبیادا حکوومەتی بەمبا جێگای حکوومەتی نیانجا[٦٤] بگرێتەوە کە هەردووکیان وەک یەک و بەقەد یەک دەمارگرژ و گەمژەن، یان لە بەنیندا هەڵبژاردن دەسەڵات لە باکوور بسێنێتەوە و بیسپێرێتە دەست باشوور کە هیچکامیان هیچ حسێبێک بۆ نیوەی دیکەی وڵات ناکات؟». [١٢]

لە دە ساڵی رابردوودا پرسی «ئاشتیی دیموکراتیک» ـ واتە ئەو بانگەشەیە کە هیچکات دوو دیموکراسیی مۆدێرن نەکەوتوونەتە شەڕی یەکترەوە - یەک لە گەرمترین دیالۆگەکانی نێوان تۆێژەرانی پێوەندییە نێونەتەوەییەکان بووە. ئەم بابەتە گەلێ پرسیاری بنەمایی و سەرنجڕاکێشەری وروژاندووە (چ پاساوێکمان بۆ شەڕی ناوخۆیی ئەمریکا پێیە؟ ئایا چەکی ئەتۆمی باشتر ئاشتیمان بۆ شێ دەکاتەوە؟)، هەروەها تەنانەت زانیارییە ئامارییەکان بوونەتە مایەی بۆچوونی جیاوازی سەیروسەمەر (یەک لە توێژەران بە ناوی دەیڤید ئەسپیرۆ دەڵێت بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە دووسەد ساڵی رابردوودا هەم هەژماری دیموکراسییەکان و هەم شەڕەکان کەم بووە، رەنگە هۆکاری پێکەوە شەڕنەکردنی دیموکراسییەکان تەنیا و تەنیا «رێکەوت»ی رووت بێت و هیچیتر؛ رێکەوتی رووت، هەروەک چۆن هیچکام لە ئەندامانی بنەماڵەی دیڤید قەت لە کێبەرکێی لاتاریدا سەرنەکەوتوون. ئەڵبەت کەمتر تیۆرێکمان هەیە لە پێوەندیی نێوان ئەم یەککگرتنە دوولایەنییە ئامارییە سەیرە رامابێت). بەڵام ئەگەر تەنانەت ئەم ئامارەش دروست بێت ئاخۆ هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چ شتێک؟

---

٦٤ . دوو زمانی باو لە زامبیادا. و.ف

ئیمانوێل کانت ـ یەکەم داڕێژەری ئایدیای ئاشتیی دیموکراتیک ـ پێی وا بوو لە سیستەمی دیموکراسیدا بڕیار لە دەستی ئەوانەدایە کە خەرجی شەڕەکان دەدەن، واتە خەڵک، هەر بۆیە بە شێوەیەکی سروشتی پارێزگارن. بە رواڵەت ئەم دەربڕینە مانای ئەوەی دیموکراسییەکان لە رژێمەکانیتر ئاشتیخوازترن، کەچی بە کردەوە ئەوان شەڕخوازترن و بە بەراورد لەگەڵ زۆربەی رژێمەکانیتردا بە جۆش و خرۆشێکی زیارترەوە روو لە مەیدانی شەڕ دەکەن. تاقە رێگای بەردەوامبوونی ئاشتی ئامادەبوونی دیموکراسییەکانیترە. ئەگەر لە هۆکارەکانی ئەم پێوەندییە دوولایەنییە بکۆڵینەوە پەی بە شتێک دەبەین: لە راستیدا ئاشتیی دیموکراتیک ئاشتیی لیبرالییە. کانت کە لە سەدەی هەژدەدا ئەم بابەتانەی دەخستە بەردەست لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دیموکراسییەکان رژێمگەلێکی دیکتاتۆرین و بەتایبەت ئامادە نەبوو بیانخاتە ناو تیۆریی رژێمگەلی «کۆماری»یەوە کە [بەڕای ئەو] لە ئاشتیدا دەژیان. بە رای کانت کۆماریخوازی مانای جیاکردنەوەی دەزگاکانی حکوومەت، کۆنترۆڵ و هاوسەنگی، باڵادەستیی یاسا، پاراستنی مافە تاکییەکان و تا رادەیەک کەڵکوەرگرتن لە نوێنەرایەتی و هەڵبژاردن لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا (کە بە هیچ شێوەیەک واتای مافی دەنگدانی گشتی ناگرێتەوە). هەموو تایبەتمەندییەکانی دیکەی کانت سەبارەت بە «ئاشتیی هەمیشەیی» پێوەندییەکی نزیکیان هەیە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی باڵادەستیی یاسا و لیبرالیزم لە سیستەمی کۆماریدا: رێزگرتنی دوولایەنەی هاووڵاتییان لە مافەکانی یەکتر، سیستەمێکی کۆنترۆڵکردن و هاوسەنگی بۆ گەرەنتیکردنی ئەوەی کە هیچ سەرکردەیەک ناتوانێ وڵات لە شەڕەوە بگلێنێ، هەروەها سیاسەتە کلاسیکەکانی ئابووریی لیبرالی کە گرنگترینیان بازرگانیی ئازادە کە بە دروستکردنی وابەستەیی و گرێدراوییەکی دوولایەنە شەڕ دەکاتە شتێکی پڕ خەرج و خەسار و هاوکاری دەبێتە شتێکی پڕسوود. توێژەری بەرجەستەی ئەم بوارە، مایکڵ دۆیل، لە کتێبی *رێگاکانی شەڕ و ئاشتی*دا (١٩٩٧) جەختی لەسەر ئەو بابەتە کردووە کە ئەگەر لیبرالیزمی یاساخواز نەبێت، دیموکراسی لە جەوهەری خۆیدا هەڵگری هیچ جۆرە خەسڵەتێکی ئاشتیخوازانە نییە:

کانت بەدگومان بوو بە زۆرینەخوازیی دیموکراتیک و بێمەرج و بەڵگاندنەکانی قەت بەو واتایە نایەتەوە کە هەرهەموو رژێمگەلی سیاسیی بەشدارییانە، دیموکراسییەکان ـ چ بە گشتی و چ لەگەڵ دیموکراسییەکانیتردا ـ ئاشتیخوازن. بەشێکی زۆر لە رژێمگەلی بەشدارییانە رژێمگەلی نالیبرالی بوونە. بە درێژایی دووهەزار ساڵ بەر لە سەردەمی مۆدێرن، دەسەڵاتداریی خەڵک بەزۆری یان ئاوێتە بووە لەگەڵ توندوتیژی و دەستدرێژیدا (بەو شێوەی توسیدید[٦٥] ئاماژەی پێ کردووە) یان

---

٦٥ . مێژونووسی یۆنانیی سەدەی پێنجەمی پێش زایین. و.ف

بارگاوی بووە بە داگیرکاری و پەرەپێدانی ئیمپریالیستییەوە (بەو شێوەی ماکیاڤێلی ئاماژەی پێ کردووە)... دەنگدەری ئاسایی کە خاوەن بڕیارێکی چارەنووسسازە، بە شێوەی سرووشتی خوازیاری «سڕینەوەی ئەتنیکی»ی سیستەمە دیموکراتیکەکانی دیکەیە.

جیاوازیی نێوان دیموکراسیی لیبرالی و نالیبرالی یەکگرتوویەکی دوولایەنەی ئاماریی سەیری دیکەشمان بۆ روون دەکاتەوە. دوو بیرمەندی زانستی سیاسی، جەک سنایدێر و ئێدوارد مەنسفیلد، بە کەڵکوەرگرتن لە کۆمەڵە زانیارییەکی سەرسامکەر، ئەنجامگیرییەکی وەهایان خستۆتە بەردەست کە لە بیست ساڵی رابردوودا ئەو وڵاتانەی دەستیان داوەتە دیموکراتیزاسیۆن زۆر زیاتر لە رژێمە ئۆتۆریتەخوازە سەقامگرتووەکان یان دیموکراسییە لیبرالییەکان لە شەڕەوە گلاون.[١٣] زۆربەی کات هەرهەڵدانی دیموکراسی لە وڵاتێکدا کە لەسەر بنەمای لیبرالیزمی یاساخواز دانەمەزراوە، ناسیۆنالیزمی رادیکاڵ و شەڕانگێزیی لێ دەکەوێتەوە. هاوکات لەگەڵ کرانەوەی سیستەمی سیاسیدا دەسەڵات دەکەوێتە دەست کۆمەڵە گروپێکی لێکنەچوو و خاوەن بەرژەوەندیی جیاواز کە هەرکامەو بەدوای داخوازی و بەرنامەکانی خۆیدا دەچێت. سەرکردە سیاسییەکان و نیزامییە شەڕخوازەکان کە زۆربەیان پاشماوەی سیستەمی ئۆتۆریتەخوازی پێشوون، تێدەگەن کە تاکەڕێگای سەرکەوتن کۆکردنەوەی جەماوەری خەڵکە لە دەوری ئایدیایەکی نەتەوەیی. هەمیشەیش تەنیا شتێک دێتە بەرهەم کۆمەڵێ دروشم و سیاسەتی دوژمنکارانەیە کە وڵاتەکان راپێچی ململانێ و شەڕ دەکات. هەندێ لە دیارترین نموونەکان بریتین لە فەرەنسای سەردەمی ناپلیۆنی سێیەم، ئەڵمانیای سەردەمی ویلهێلم[٦٦]، ژاپۆنی سەردەمی تایشۆ[٦٧] و لە نموونە تازەکانیش دەتوانین ئاماژە بدەینە ئەرمەنستان، ئازەربایجان و یۆگۆسلاڤیای پێشوو. ئاشتیی دیموکراتیک بابەتێکی راستەقینەیە، بەڵام وا دیارە پێوەندییەکی ئەوتۆی لەگەڵ دیموکراسیدا نییە.

## دەبێ چی بکەین؟

رەنگە پێمان وا بێت کێشەکانی بەردەم دیموکراسییە تازەکان بابەتێکی رووتی تیۆریکن و تەنیا شیاوی باسوخواسی زانکۆکان و ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەن. بەڵام زۆرجار تیۆرییەکان لەپڕ دەبنە واقیع. زۆرکات وڵاتان سەرقاڵی دۆزینەوەی باشترین رێگای دەستەبەرکردنی دیموکراسین و ئەمریکا هەمیشە سەرقاڵی دارشتنی سیاسەتەکانیەتی بۆ دیاریکردنی چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو

٦٦ . قەیسەری ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٨٨ەوە تا کۆتاییی جەنگی یەکەمی جیهانی. و.ف

٦٧ . ئیمپراتۆری ژاپۆن لە نێوان ساڵانی ١٩١٢ تا ١٩٢٦دا. و. ف

وڵاتانەدا کە بەرەو دیموکراسی هەنگاویان هاوێشتووە یاکوو نەخوازراو بەرەو ئەو ڕێگایە کشاون. ئەگەر بە هەڵە لە تیۆری بگەین لە کردەوەیشدا تووشی هەڵە دەبین. ئاوڕێک لە ئەندەنۆسیای ١٩٩٨ بدەنەوە؛ ئەوکاتەی وا ئەمریکا و سندووقی نێونەتەوەیی دراو یارمەتییان بە ڕووخانی کۆنە دیکتاتۆری ئەو وڵاتە واتە سۆهارتۆ ەدا بەڵکوو دیموکراسییەکی نوێ بێتە دامەزران یان لانیکەم ئاوەها هیوایەکیان هەبوو، دەبا ڕەوتی دیموکراتیزاسیۆنی ئەم وڵاتە گەلێ هێمنانەتر بوایە.

ئەندەنۆسیای ١٩٩٨ نموونەیەکی ئایدیال نەبوو بۆ [تاقیکردنەوەی] دیموکراسی. بە ئاستی یەکەم لە نێو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا لە هەمووی زیاتر وابەستەی سەرچاوە سروشتییەکانە. بە ئاستی دووەم خاوەن دامەزراوە سیاسییە شەرعییەکان نەبوو، چونکوو سۆهارتۆ ئەم وڵاتەی بە کۆمەڵێکی کەمهەژماری نزیکان و دەربارییان بەڕێوە دەبرد و پێکهێنانی سازە و دامەزراوەی هیچ لا گرنگ نەبوو. دواجار و بە ئاستی سێیەم ئەندەنۆسیا ئەوکاتەی دەستی دایە دیموکراتیزاسیۆن ڕێژەی داهاتی سەرانەی کەم بوو، نزیک بە ٢٦٥٠ دۆلار لە ١٩٩٨دا. ئەم کارە ئاکامی زۆر دڵتەزێنی بەدواوە بوو. لە دوای دیموکراتیزاسیۆنەوە ڕێژەی بەرهەمی سەراپای ناوخۆیی ئەم وڵاتە نزیکەی لە سەدا ٥٠ دابەزیوە، بەرهەمی بیست ساڵ پێشکەوتنی ئابووری بە فیڕۆ چووە و بیست میلیۆن کەس لە هاووڵاتییان چوونەتە ژێر هێڵی هەژارییەوە. لەم وڵاتەدا کە بەم دواییانە کرانەوەی بەخۆوە دیوە بونیادگەرایانی ئیسلامی سەریان هەڵداوە و لە وڵاتێکدا کە زمانی سیاسی بزر و نامۆیە بە زمانێکی زۆر ئاشنا و ناسراو بۆ هەموان دەئاخفن: زمانی ئایین. هەر ئێستا لە سەدا ٢٠ی کۆی پەرلەمانتارانی ئەم وڵاتە خۆیان بە سیاسەتمەداری ئیسلامگەرا ناوزەد دەکەن. ئەگەر ئیسلامی سیاسی سەرکەوێت ئەوا هەڕەشەیەکە بەسەر خەسڵەتی سێکۆلاری ئەم وڵاتەوە و دەبێتە هۆی پەروەردەکردنی کۆمەڵە بزاڤێکی جوداییخواز کە یەکپارچەیی ئەندەنۆسیا دەخەنە بەر مەترسییەوە. لەم کەشە ئانارشیکەدا گەندەڵی و ڕەفیقبازیی سیاسیش زیاتر لە جاران پەرەی سەندووە و ریفۆرمە ئابوورییەکان پەکیان کەوتووە و ڕاگیراون.

هەرچەند کۆی خەتاکانی ١٩٩٨ی ئەندەنۆسیا ناکەوێتە ئەستۆی ئەمریکا و سندووقی نێونەتەوەیی دراوەوە، بەڵام داواکاریی ئەوان بۆ ریفۆرمی خێرا و ڕادیکاڵ، لە داماڵینی شەرعییەت و ڕووخانی دەوڵەتدا کاریگەر بوو. ئەگەر ئەوان بیانزانیایە ئەم ریفۆرمانە چ بشێوییەکی سیاسیی گەورەی لێ دەکەوێتەوە ڕەنگە داواکارییەکانیان کەم کردایەتەوە و میتۆدێکی وردەوردە و هێمنانەتریان بگرتایەتە بەر. حکوومەتی سۆهارتۆ تەژی بوو لە کەموکوڕی، بەڵام هەر ئەم حکوومەتە توانیبووی تەکووزی، سێکۆلاریزم و لیبرالیزاسیۆنی ئابووری دەستەبەر بکات کە لە جیهانی سێیەمدا تێکەڵکردێکی گرنگ و پڕبایەخە. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە هیچ

ئەڵتەرناتیڤێکی باشتر لە بەردەستدا نەبوو تاکوو جێی ئەو دەوڵەتە بگرێتەوە. باشتر وابوو لە باتیی شۆڕشی بەربڵاو و یەکجارەکی ریفۆرمێکی سیاسیی هێمنانە و وردەوردە بەڕێوە ببرایە، بەتایبەت بۆ خەڵکی ئاساییی ئەم وڵاتە کە بڕیار بوو سیاسەتەکانی رۆژئاوا قازانجیان پێ بگەیەنێ.

لەورۆدا رۆژهەڵاتی ناوین زیاتر لە هەموو شوێنێکی دونیا پێویستی بەوەیە دەست بداتە هەڵبژاردنێک لە نێوان تەکووزی و بێسەقامی، لیبرالیزم و دیموکراسی و، سێکۆلاریزم و رادیکاڵیزمی مەزهەبیدا. ئەمریکایش زیاتر لە هەموو شوێنێک لە رۆژهەڵاتی ناویندا پێویستی بەوەیە تێگەیشتنێکی دروستی تیۆری و کرداریی لە مەسەلەکە هەبێت.

# بەشی چوارەم

## ئیسلام وەک نموونەیەکی ئاوارتە

هەمیشە هەمان دیمەنی رازاوە و هەمیشە هەمان چیرۆکی دڵتەزێن. دیپلۆماتێکی پایەبەرزی ئەمریکایی دەچێتە ناو یەکێک لە کۆشکە رازاوەکانی سەرکۆمارییەوە لە نزیک قاهیرە، حوسنی موبارەک لێرەوە میسر بەڕێوە دەبات. هۆڵە مەرمەڕینەکان و ژوورە پڕ لە مۆبیلیاتە زێڕینەکان تێدەپەڕێنێ، کە سەرلەبەری لاساییکردنەوەیەکی نەزانکارانەیە لە شێوازی ئیمپراتۆریای فەرەنسا و بە گاڵتەوە ناویان ناوە «لۆیی فاررووق» (بە پێی ناوی دواپاشای میسر). دوای تێپەڕاندنی چەندین دەستە لە هێزەکانی ئاسایش دەچێتە ناو هۆڵی میوانداریکردنی رەسمییەوە و سەرۆککۆماری میسر بەگەرمی پێشوازیی لێ دەکات. دیالۆگێکی گەرم لەسەر پێوەندییەکانی ئەمریکا و میسر، گۆڕانکارییەکانی ناوچە و پرۆسەی ئاشتیی نێوان ئیسرایل و فەلەستینییەکان دەست پێ دەکات. پاشان لایەنی ئەمریکایی زۆر هێمنانە پرسی مافی مرۆڤ دەکاتەوە و پێشنیاری پێ دەکات دەوڵەتی میسر زەخت و گوشاری سەر ناڕازییانی سیاسی کەم بکاتەوە، ئازادیی چاپەمەنییەکان پەرە پێبدات و رۆشنبیران توندی بەندیخانە نەکات. موبارەک هەڵدەشاخێتەوە و بە توورەییەوە دەڵێت: «ئەگەر داواکارییەکانتان جێبەجێ بکەم بونیادگەرا[68] ئیسلامییەکان میسر داگیر دەکەن، ئایا ئێوە ئاوەها شتێکتان دەوێ؟» دیسانەوە وتووێژەکان دەچێتەوە سەر دواگۆڕانکارییەکانی پرۆسەی ئاشتی.

ساڵەهای ساڵە وتووێژی نێوان ئەمریکا و عەرەبەکان لێوانلێوە لەم جۆرە قسانە. کاتێ کلینتۆن داوای لە یاسر عەرەفاتی سەرۆکی فەلەستین کرد گەڵاڵەی ئاشتیی کەمپ دەیڤید کە لە ژوویەی (تەمووز) ٢٠٠١دا کەوتبووە بەر وتووێژەوە، قبووڵ بکات، عەرەفات ئاوەها وەڵامێکی پێ دایەوە: «ئەگەر داواکارییەکەتان جێبەجێ بکەم هەر سبەینێ دەسەڵات دەکەوێتە دەست

68. Fundamentalism

حەماس». ڕەوانبێژترین وتەبێژی دەسەڵاتی پاشایەتیی عەرەبستان، شازادە بەندەر بن سوڵتان، زۆرجار ئەو بابەتە دەخاتەوە بیر ئەمریکاییەکان کە ئەگەر گوشارەکانی سەر حکوومەتی ئالی سعوود لەڕادەبەدەر بێت، قەت دیموکراسییەکی جێفێرسۆنی[٦٩] جێی ئەم حکوومەتە ناگرێتەوە، بەڵکوو تیۆکراسییەکی تاڵەبانی دێتە سەر کار.

ناخۆشترین بەشی ئەم چیرۆکە ئەوەیە کە ڕەنگە حەق بەوان بێت. دەسەڵاتدارانی عەرەبی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئۆتۆریتەخواز و گەندەڵ و سەرکوتکەرن، بەڵام بەمەشەوە هێشتا لیبراڵتر، ئاسانگیرتر (لێبوردەتر) و پلۆراڵیستترن لەوانەی ڕەنگە جێیان بگرنەوە. لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبیدا ئەگەر بێت و هەڵبژاردن بکرێت [بێگومان] ئەو سیاسەتمەدارانە دەیبەنەوە کە زیاتر لە ڕوانگەکانی بنلادەنەوە نزیکن تا شازادە عەبدوڵڵای پادشای لیبراڵی ئەردەن. ساڵی ڕابردوو و بە هاندانی ئەمریکاییەکان ئەمیری کوێت پێشنیاری دا مافی دەنگدان بۆ ژنان پەسند بکرێت، بەڵام پەرلەمانی کوێت کە لە ڕێگای هەڵبژاردنێکی دیموکراتیکەوە هاتۆتە چێبوون و لێوانلێوە لە بونیادگەرایانی ئیسلامی، گەڵاڵەکەی بەتەواوی ڕەت کردەوە. عەبدوڵڵا شازادەی عەرەبستان، پێشنیارێکی زۆر سادەتری خستە بەردەست و داوای کرد ژنان مافی لێخوڕینی ئۆتۆمبیلیان پێ بدرێت (ژنان تا ئێستایش ئەم مافەیان نییە، هەر بۆیە عەرەبستان بەناچاری نیو میلیۆن شۆفیری لە هیندستان و فیلیپینەوە بانگهێشتی عەرەبستان کردووە) بەڵام کۆنەپارێزانی مەزهەبی ناڕەزایەتییەکی گشتییان وروژاند و شازادەیان مەجبوور بە پاشەکشە کرد.

هاوشێوەی ئەم هەڵچوون و داچوونانە لە وڵاتە عەرەبییەکانیتریشدا دەبینرێت. لە عەممان، قەتەر، بەحرەین، ئەردەن و مەراکش و لە زۆربەی هەرەزۆری بابەتە سیاسییەکاندا، پادشاکان لە کۆمەڵگاکەیان لیبراڵترن. تەنانەت لە فەلەستینیدا کە بۆ ماوەیەکی دووردرێژ ناسیونالیستانی سێکۆلاری وەک یاسر عەرەفات و کۆمەڵەی ڕزگاریخوازی فەلەستین خۆشەویستترین هێزی سیاسی بوون، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تاقمە مەزهەبییەکان و میلیشیاکانی وەک حەماس و جیهادی ئیسلامی، بەتایبەت لە ناو لاواندا، بەهێزتر دەبنەوە. هەرچەند حیزبە ئیسلامییەکان بانگەشەی هەڵبژاردن دەکەن بەڵام هێشتاکوو بە تووڕەییەوە لە دیموکراسی دەڕوانن و بە شتێکی سووک و بێبایەخی لەقەڵەم دەدەن و پێیان وایە دیموکراسی مۆدێلی ڕۆژئاوایی حکوومەتە. ئەوان حەز دەکەن لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە دەسەڵات بگرنە دەست، بەڵام دوابەدوای کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات یەکسەر تیۆکراسیی تایبەت بە خۆیان دادەمەزرێنن. وەک دەڵێن، یەک کەس، یەک دەنگ، یەک جار.

---

٦٩ . تۆماس جێفێرسۆن، لە دامەزرێنەرانی ئەمریکا و سێیەم سەرۆککۆماری ئەو وڵاتە. و.ف

بۆ وێنە بەراوردێک بکەن لە نێوان دژکردەوەی زۆر جیاواز و دژبەیەکی کۆمەڵگا و دەوڵەتان[ی عەرەبیدا] لە ئاست کاسێتە ڤیدیۆییەکەی بنلادەنی سەرخۆش لە سەرکەوتن کە هێزەکانی ئەمریکا نۆڤامبری (تشرینی دووەم) ٢٠٠١ لە حەشارگەیەکی ئەلقاعیدە لە کابۆل دۆزییانەوە. لەم کاسێتەدا بن لادەن ئاشکرای کردووە کە زانیاریی ورد و تەواوی لە رووداوەکانی ١١ی سێپتامبر (ئەیلول) هەیە و خۆشحاڵیی خۆی بەرانبەر بە هەژماری کوژراوەکان دەربڕیوە. زۆربەی دەوڵەتانی ناوچەکە زۆر خێرا رایانگەیاند وادیارە کاسێتەکە واقیعییە و نیشاندەر و سەلمێنەری تاوانکاربوونی بنلادەنە، شازادە بەندەر راگەیاندننامەیەکی ئاوەهای بڵاو کردەوە: «ئەم کاسێتە سیمای بێڕەحم و دڵڕەقی جینایەتکارێکی وەحشیمان نیشان دەدات کە هیچ بایەخێک بە پیرۆزبوونی ژیانی مرۆڤ یان [تەنانەت] بنەماکانی ئایینەکەی خۆی نادات». لە بەرانبەردا زانای ئایینی و نارازیی بەناوبانگی سعوودی، شێخ موحەممەد ساڵح رایگەیاند؛ «وادەزانم ئەم کاسێتە دروستکراو بێت». عەبدوللەتیف عەرەبییات، سەرۆکی بەرەی چالاکیی ئیسلامی کە حیزبێکی ئیسلامگەرای ئەردەنییە، ئەم پرسیارەی خستە ئاراوە: «ئایا بە راست ئەمریکاییەکان پێیان وایە دونیا هێند گەمژەیە ئەم کاسێتە وەک بەڵگەیەک قبووڵ دەکات؟».

لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا نارازییان گوشار دەخەنە سەر وڵاتەکەیان بۆ ئەوەی شکست و دۆڕانەکانی خۆی جیدیتر وەربگرێت. [کەچی] لە رۆژهەڵاتی ناویندا ئەوانەی خوازیاری دیموکراسین زیاتر لە هەمووان پەنا دەبەنە بەر وەهم و حاشاکردن و خۆفریودان. ئەم ناوچەیە تەژییە لە تیۆریی پیلان، وەک ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت دەزگای سیخوریی ئیسرایل (مووساد) هێرشەکانی ١١ی سێپتامبری (ئەیلول) دارشتبوو. CNN لە فووریەی (شوبات) ٢٠٠٢دا راپرسییەکی لە ٩ وڵاتی عەرەبیدا بەڕێوە برد کە بەپێی ئەو راپرسییە لە سەدا ٦١ی بەشداربووان دەیانوت عەرەبەکان بەرپرسیاری هێرشەکانی ١١ی سێپتامبر (ئەیلول) نین. کەناڵی تێلەڤیزیۆنیی ئەلجەزیرە کە یەکەم کەناڵی تێلەڤیزیۆنیی سەربەخۆی ئاسمانییە لە ناوچەکەدا و لە نێو ناسیۆنالیستانی عەرەبدا بینەری زۆری هەیە، کەناڵێکی پۆپۆلیست و مۆدێرنە و زۆربەی پێشکەشکارانی بەرنامەکانی ژنن. زۆربەی ئەو هەواڵانەی میدیا رەسمییەکان سانسۆڕیان دەکەن لە لایەن ئەلجەزیرەوە بڵاو دەکرێتەوە، کەچی بەمەشەوە بە ئاشکرا پەنا دەباتە بەر ناسیۆنالیزمی عەرەبی، دژایەتیی ئەمریکا، دژایەتیی جوولەکە[٧٠] و بونیادگەراییی ئیسلامی[٧١].

---

70. Anti – semitism
71. Islamic Fundamentalism

دونیای عەرەب لە نێوان دوو جەمسەردا قەتیس ماوە کە هیچکامیـان بەدیهێنـەری دیموکراسـیی لیبرالی نین؛ لە جەمسەرێکەوە دەوڵەتانی ئۆتۆریتەخواز و لەولاشەوە کۆمەڵگای نالیبرالی. ململانێی مەترسیداری نێوان ئەم دوو هێزە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی ئەتمۆسـفێرێکی سیاسـی کە بارگـاوییە بە رادیکاڵیزم و توندوتیژیی مەزهەبی. هەرچی دەوڵەت زیاتر دەکەوێتە سەرکوتکردن نارەزایەتییەکـانی نـاو کۆمەڵگـایش خەسـارئامێزتر دەبـنەوە، دواجـار ئەمەش دیسـان دەبێـتەوە بە بیـانوویەک بـۆ گەورەتربوونەوەی سەرکوتکاریی دەوڵەت. ئەمە پێچەوانەی پرۆسە مێـژووییەکەی دونیـای رۆژئـاوایە کە لیبرالیزم دیموکراسیی پێـک هێنـا و دیموکراسـی لیبرالیزمـی بەهێـز کـردەوە. بەپـێچەوانەوە ئەو رێچکەیەی وڵاتانی عەرەب گرتوویانەتە بەر دیکتاتۆریی لێ کەوتۆتەوە و دیکتاتۆریش تیرۆریزمی بەرهەم هێناوە. ئەڵبەت تیرۆریزم تاقە بەرهەمی ئەم پێوەندییە شێواوەی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا نییە بەڵکوو ئاشکراترین و دیارترین بەرهەمیەتی، چەنـدەها کێشـەی دیکەشـمان هەیە: پەککەوتنـی ئابووری، راوەستانی کۆمەڵایەتی و هەڵشکانی رۆشنبیران.

هەنووکە رۆژهەڵاتی ناوین بەقووڵی پێچەوانەی دونیا رێگـا دەبـڕێ، ئەو دونیـایەی کە لە بیست ساڵی رابردوویدا پێشکەوتنی ئازادی و دیموکراسیی بەخـۆوە دیـوە. بەپێـی راپـۆرتی سـاڵی ٢٠٠٢ی «یـانەی ئـازادی» لە سـەدا ٧٥ی وڵاتـانی جیهـان «ئـازاد» یـان «تـا رادەیەک ئـازادن»ن. ئەم پێناسەیە تەنیا لە سەدا ٢٨ی وڵاتانی رۆژهەڵاتـی نـاوین دەگرێتەوە کە لە بیست سـاڵی رابـردوودا کەمتریش بۆتەوە. بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی ئافریقادا لە سـەدا زیـاتر لە ٦٠ی ئەم وڵاتـانە دەکەونە ریزی وڵاتانی ئازاد یان تا رادەیەک ئازادەوە.

دوای هێرشەکانی یازدەی سێپتامبر(ئەیلول) بشێوە سیاسییەکانی دونیای عەرەب لەپـڕ داوێنـی رۆژئاوایشی گرتەوە. ئەو پرسیارە لای زۆرکەس ورووژاوە کە بۆچی؟ بـۆچی ئەم دەڤەرە لە دونیـای سیاسەتدا ئاوا ئیفلیجە؟ بۆچی تووشی وەستان هاتووە و نەیتوانیـوە خـۆی لەگەڵ پێشـکەوتنەکانی کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا یەک بخات؟

## دونیای بەربڵاوی ئیسلام

بێرنلادەن وەڵامێکی پێیە. بەڕای ئەو، کێشـەی دەوڵەتـانی عەرەب ئەوەیە کە بەڕادەی پێویست ئیسلامی نین. بێرنلادەن لایەنگەرانی ئاگادار دەکـاتەوە کە تاقەڕێگـای دەسـتەبەرکردنی دادپەروەری گەڕانەوەی موسـوڵمانانە بـۆ لای ئیسـلام. بە رای ئەو دیموکراسـی دروسـتکراوی رۆژئـاوایە کە بە جەختکـردن لەسـەر ئـازادی و ئاسـانگیری، گەنـدەڵی و بەرەڵڵاییـی کـۆمەڵایەتی بەرهەم دێنـێ. بـێرنلادەن و کەسـانی وەک ئەو دەیـانەوێ حکـوومەتە عەرەبییەکـان و رەنـگە سـەرتابەری دونیـای

ئیسلام ئاوەژوو بکەنەوە و کۆمەڵگایەکی تازە لەسەر بنەمای دەستووره ڕەهاکانی ئیسلام ئاوا بکەن. ئەم کۆمەڵگایە بەپێی یاسا ئیسلامییەکان (شەریعەت) دەجوڵێتەوە و لەسەر مۆدێلی حکوومەتی خەلیفەکانی سەرەتای ئیسلام (ئیمپراتۆریای ئیسلامیی عەرەبستان لە سەدەی حەوتی زایینیدا) بینا دەکرێت. حکوومەتی تاڵەبانی ئەفغانستان مۆدێلی تازەتریانە.

لە ڕۆژئاوایشدا کەسانێک هەن کە هاوشێوەی بێنلادەن بیر دەکەنەوە و پێیان وایە هۆکاری بشێوییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین ئیسلامە. هەندێ کەشیشی وەک پێت ڕۆبێرتسۆن و جێری فالوێل و نووسەرانی وەک پۆڵ جانسۆن و ویلیام لیند ئیسلام بە ئایینی سەرکوتکردن و دواکەوتوویی لەقەڵەم دەدەن. بیرمەندانی جیدیتر بە تێڕوانینێکی زۆر قووڵترەوە دەڵێن کێشەکە زۆر لەمە ئاڵۆزترە: بونیادگەرایان پێیان وایە ئیسلام سەرچەشنێکە بۆ هەموو ڕەهەندەکانی ژیان، تەنانەت بۆ سیاسەت. بەڵام ئیسلامی کلاسیک کە تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوت و هەشت زۆر کەم بارگاوی کراوە بەو ئەندێشانەوە کە پێوەندییان بە دیموکراسیی ئەمڕۆوە هەیە. یەک لە توێژەرانی بەرجەستەی سیاسەتی عەرەبی، ئێلی کێدووری، ئاوەها دەنووسێت: «ئەندێشەی نوێنەرایەتی، هەڵبژاردن، مافی دەنگدانی گشتی، ئەو ئەندێشەیە کە دامەزراوە سیاسییەکان بە یاسای پەسندکراوی ئەنجومەنە پەرلەمانییەکان ساز بدرێن، یان ئەوەی کە دەزگایەکی سەربەخۆی دادوەری پارێزگاری لەو یاسایانە بکات، ئەندێشەی سێکۆلاربوونی دەوڵەت و... هەرهەموو ئەم ئەندێشانە بەتەواوی نامۆ و بێگانەن بە نەریتی سیاسیی موسوڵمانان».[١]

بێگومان مۆدێلی قورئان بۆ سەرکردایەتی مۆدێلێکی ئۆتۆریتەخوازانەیە. کتێبی پیرۆزی موسوڵمانان تەژییە لە چیرۆکی پاشایانی دادپەروەر، حاکمانی دروستکار و دادوەرانی ژیر و ئاقڵ. بەڵام کتێبی پیرۆزیش ڕوانگەی ئۆتۆریتەخوازانەی تایبەت بە خۆیی هەیە. پادشاکانی پەیمانی کۆنیش (تەورات) دیموکرات نین. بیرمان نەچێ سلێمان ی ناو کتێبی پیرۆزیش کە بە ژیرترین مرۆڤ لەقەڵەم دراوە پاشایەکی دیکتاتۆر بوو. هەروەها لە هەندێ پاژی کتێبی پیرۆزدا مرۆڤ وا هەست دەکات کۆیلەداری و بندەستخستنی ژنان ئازاد کراوە. لە ڕاستیدا لێکۆڵینەوەی قورئان شتێکی ئەوتۆی بۆ ناسینی ناوەرۆکی ڕاستەقینەی ئیسلام پێوە نییە. قورئان کتێبێکی زۆر بەربڵاوە و پڕە لە بابەتی جۆراجۆر، ئینجیل و تەوراتیش زۆر لە قورئان دەچن. هەر سێ کتێبەکە، هاوشێوەی دەقە ئایینییەکانیتر، ستایشی پادشاکان دەکەن. سەبارەت بە تێکەڵکردنی ئۆتۆریتەی ئاسمانی و دونیاییش دەبێ بڵێین هیچکات هیچ دەسەڵاتدارێکی موسوڵمان نەیتوانیوە وەک پاپا کاتۆلیکەکان ئۆتۆریتەی ئایینی و دەسەڵاتی سیاسی تێکەڵ بە یەکتر بکات. ئایینی جوولەکە زۆر کەمتر لە دەسەڵاتی سیاسییەوە گلاوە، چونکو لە دونیای مۆدێرندا تا پێش دامەزرانی ئیسرائیل

جوولەکە لە هەموو شوێنێکدا کەمایەتی بوون. بەڵام وشـەی «تیۆکراسـی» بـۆ یەکەمجـار لە لایەن مێژوونووسـێکی جـوولەکەوە بە نـاوی یووسـێفووس و بەمەبەسـتی ڕاڤەکردنـی ڕوانـگەی سیاسـیی جوولەکەکانی سەردەمی کەونارا بەکارهێنرا.[٢] دەقە مەزهەبییـە سـەرەکییەکانی هەمـوو ئایینەکـان لە سەردەمێکی جیاوازدا نووسراون، سەردەمێک کە پڕ بوو لە پادشایان، فیۆدالیزم، شەڕ و بشێوە. ئەم دەقانە هەڵگری تایبەتمەندییەکانی ئەو سەردەمانەن.

کەچی لە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا زۆرجـار بیرمەنـدانی ڕۆژئـاوایی ئیسـلامیان بە پەرەپێدانی ئۆتۆریتەخوازی تاوانبار دەکرد. وادیارە ئیمپراتۆریای عوسمانی ئاوەها بۆچوونێکی لا گەڵاڵە کـردوون، (بە تێگەییشـتنی ئەوان) کۆمەڵگـای عوسـمانی لە سـەدان میلیـۆن موسـوڵمانی بێدەنگ پێک هاتبوو کە بەبێ هیچ جۆرە نارەزایەتییەک لەژێر دەسەڵاتی سوڵتانەکانی عوسمانی کە لە قوستەنتەنییەی دوورەپەرێز و تەریککەوتوودا جێگیربوون، سەرقاڵی کار و ژیانی خۆیان بـوون و ڕۆژانی هەینـی بەرلە نـوێژی جومعـە دوعـای خێریـان بـۆ حکـوومەت دەکـرد. بەڵام لەو سـەردەمەدا زۆربەی ناوچەکـانیتری جیهـانیش هەر ئاوەهـا دۆخێـک دەژیـان و ملـکەچ و گـوێڕایەڵی ئۆتـۆریتەی سیاسی بوون. تێزاری ڕووسیا وەک خودایەک چاوی لێ دەکرا. ئیمپراتۆری ژاپۆن خودی خودا بوو. بەگشتی ئیمپراتۆریاکانی ڕۆژهەڵات لە ئیمپراتۆریاکانی ڕۆژئاوا دیکتـاتۆرتر بـوون، بەڵام حکـوومەتی ئیسلامی لە حکوومەتی چینی و ژاپۆنی و ڕووسی ئۆتۆریتەخوازتر نەبوو.

لە ڕاستیدا ئەگەر یەک لە خەسڵەتە جەوهەرییەکانی ئیسلام شایانی سەرنجدان و لێوردبـوونەوە بێـت، نەک خەسـڵەتی ملکەچبـوون بە دەسـەڵات بەڵـکوو پێچەوانەکەیەتـی: ئیسـلام هەڵـگری تایبەتمەندییەکی دژە ئۆتۆریتەخوازانەیە کە هەنـووکە لە هەرهەمـوو وڵاتـانی ئیسـلامیدا دەبینرێـت. ڕەنگە ئەم تایبەتمەندییە لەو حەدیسانەوە سەرچاوەی گرتبێ کە دەڵێن پێڕەویکردن لە حاکم تەنیا تا ئەوکاتە شیاو و واجبە کە دەستوورەکانی حـاکم لەگەڵ یاسـاکانی خوداوەنـددا بگونجێـت. ئەگەر حاکمێـک داوای وازهێنـان لە ئایینتـان لـێ بکـات هەرهەمـوو بەڵـێن و پەیمانەکـان هەڵدەوەشـێتەوە («ئەگەر دەستووری ئەنجامـدانی کـارێکی حەرام بە موسـوڵمانێک بـدرێت، پێویسـتە نە گـوێ [بـۆ قسەکانی سەرکردە] شل بکات و نە بەرێوەی ببات»).[٣] ئەڵبەت ئایینەکـان لێڵوپێـڵ و نـاڕوونن. ئەمە مانای ئەوەیە پێڕەویکردن لە ئایین ئاسانە ـ تۆ دەتوانی چۆنت پـێ خۆشـە ئـاوا بەرنامەکـانی دین تەفسیر بکەیت. بەڵام لە هەمانکاتدا بەو مانایەش دێتەوە کە ڕەنگە زۆر ئاسـان تووشـی هەڵە بیت ـ هەمیشە شتێکی قەدەغەکراو هەیە کە پێشـێلی دەکەیـت. بەڵام ئیسـلام خـاوەن ڕێکخسـتنی مەزهەبـی نییـە ـ نە پاپـا و نە کەشـیش ـ تـاکوو ئەو ڕێکخسـتنە شـەرعیبوونی یەکێـک لەو هەمـوو تەفسـیر و خوێنـدنەوە جۆراوجـۆرانە ڕابگەیەنێـت. بەم پێـیە هەرکەس بـۆی هەیە دەوڵەتێـک بە

نائیسلامی لەقەڵەم بدات و لەگەڵی بەشەڕ بێت. ئەمە خەسڵەتێکی هاوبەشە لە نێوان ئیسلام و پرۆتستانیزمدا. هەر وەک چۆن هەر پرۆتستانێکی وەک فال وێڵ و پێت رۆبێرتسۆن دەتوانێ خۆی وەک پێشەوایەکی دینی لەقەڵەم بدا، هەر موسوڵمانێکیش دەتوانێ خۆی لە دین هەڵقورتێنێ و قسەی تێدا بکات. لە ئایینێکدا کە سەرچاوەی مەزهەبیی رەسمیمان نییە بن‌لادەن و شۆفیرێکی تاکسیی خەڵکی پاکستان لە نیۆیۆرک بەقەد یەکتر مافی دەرکردنی فتوایان هەیە. بە واتایەکی‌تر کێشەی ئیسلام، نەبوونی سەرچاوەی ئایینییە نەک زاڵبوونی سەرچاوەی ئایینی.

ئاورێک لە سەرچاوەی ئانارشی و بشێوەی ناو کۆمەڵگا عەرەبییەکان بدەنەوە. تاقمە ئیسلامگەراکان[72] لە میسر، عەرەبستانی سعوودی، ئەلجەزایر و شوێنەکانی‌تر دەستیان داوەتە خەباتێکی خوێناوی لە دژی دەوڵەتەکان، ئەو دەوڵەتانەی تاوانبارن بەوەی کە خیانەتیان بە ئیسلام کردووە. بن‌لادەن و جێگرە میسرییەکەی، ئەیمەن ئەلزەواهیری ـ کە هیچکامیان مامۆستای ئایینی نین ـ دەسپێکی خەباتیان دژ بە دەوڵەتەکانی خۆیان بوو، چونکو سیاسەتەکانیان بە نائیسلامی دەزانی (لای زەواهیری پەیماننامەی ئاشتیی ئەنوەر سادات لەگەڵ ئیسرائیل لە ١٩٧٨دا و لای بن‌لادەن ئیجازەدانی شافەهەد بە جێگیربوونی هێزەکانی ئەمریکا لە عەرەبستان لە ١٩٩١دا). بن‌لادەن ساڵی ١٩٩٦ راگەیاندننامەی جیهادی دەرکرد و تیایدا رایگەیاند کە دەوڵەتی سعوودی وازی لە ئوممەتی ئیسلامی هێناوە، هەر بۆیە شەڕی چەکداری دژ بەو دەوڵەتە ئازادە: «رژێم خیانەتی بە ئوممەتی ئیسلام کردووە و تێکەڵ بە بەرەی کوفر بووە و لە شەڕی دژ بە موسوڵماناندا یارمەتییان دەدات». بن‌لادەن داوای لە خەڵک کرد دژ بە دەسەڵاتداران سەرهەڵدان بکەن و هەژمارێکی بەرچاویش داواکارییەکەیان قبووڵ کرد. رەنگە دەسەڵاتدارانی رۆژهەڵاتی ناوین ئاواتەخوازی ئەوە بن کە بریا موسوڵمانان زیاتر ملکەچی دەسەڵات دەبوون.

یەکێکی‌تر لە بابەتەکان مەسەلەی زەمەنە: ئەگەر کێشەکە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام ئەی بۆچی ئەم دژایەتییە لەم ساتەوەختەدا تەقیوەتەوە؟ بۆچی بونیادگەراییی ئیسلامی تازە دوای شۆڕشی ١٩٧٩ی ئێران بووژایەوە؟ ئیسلام و رۆژئاوا بە درێژاییی چواردە سەدە پێکەوە ژیاون. چەند خولێکی شەڕ و پێکدادان لە نێوانیاندا رووی داوە، بەڵام گەلێ قۆناغی زۆر زیاتر لە ئاشتیدا ژیاون. گەلێ توێژەر دانیان بەوەدا داناوە کە تا دەیەی ١٩٤٠ بە بەراورد لەگەڵ حکوومەتی

٧٢ . مەبەست لە ئیسلامگەرا کەسانێکی وەک بن‌لادەنە کە دەیانەوێ ئیسلام وەک ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی و بە ئاراستەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامیدا بە کار بهێنن کە دەقاودەق بە پێی یاساکانی ئیسلام بجووڵێتەوە. من هەندێجار ئەم دەستەواژەیەم لە باتیی دەستەواژەی «بونیادگەرایانی ئیسلامی» کە دەستەواژەیەکی باوترە، بەکارهێناوە. ئەڵبەت زۆرێک لە توێژەران دەستەواژەی یەکەم بە گونجاوتر دەزانن.

ئایینەکانی‌تردا، حکوومەتە ئیسلامییەکان زۆر کەمتر ئازاری کەمایەتییەکان و بەتایبەت جوولەکەکانیان داوە. ئەمەش وای کردبوو بەدرێژاییی چەندین سەدە رۆژهەلاتی ناوین ببێتە نیشتمانی زۆربەی کەمایەتییەکان. زۆرجار دەیگێڕنەوە کە دوای دامەزرانی ئیسرایل لە ١٩٤٨دا یەک ملیۆن جوولەکە ولاتانی ئیسلامییان بەجێهێشت یاکوو دەریان کردن، بەلام کەس ناپرسێ ئەرێ باشە ئەم هەموو جوولەکەیە بۆچی لە ولاتانی عەرەبیدا دەژیان؟

گرفتی بەیاننامە پەراوێزەناکان سەبارەت بە «ناوەڕۆکی ئیسلام» لەوەدایە کە نازانن ئیسلامیش وەک هەموو ئایینەکانی‌تر ئەو شتە نییە کە کتێبەکان دەیلێن، بەلکوو ئەو شتەیە کە خەلک دەیلێن. و ڕاوەی بونیادگەراکان لە بیر بەرنەوە، ئەوان کەمایەتییەکی بچووکن. ژیانی رۆژانەی زۆربەی موسولمانان پێچەوانەی ئەو بۆچوونەیە کە دەلێت ئیسلام لە جەوهەردا ئایینێکی دژەرۆژئاوا یان دژەمۆدێرنە. پڕ حەشیمەتترین ولاتی ئیسلامی، واتە ئەندەنوسیا، دوای وەرگرتنی سەربەخۆیی لە ١٩٤٩دا دەولەتێکی سێکولاری دامەزراند و حیزبی ئۆپۆزیسیۆنی دەولەت کە پارتێکی ئایینییە، حیزبێکی بچووکە (ئەلبەت ئێستا لە گەشەسەندندایە). بۆ پرسی پێکەوەگونجانی ئیسلام و سەرمایەداریش دیسان دەتوانین ئاماژە بە [ئەزموونی] ئەندەنوسیا بکەین، ئەم ولاتە تا ئەم دواییانەش لە ڕوانگەی بانکی جیهانیدا وەک سەرچەشنی جیهانی سێیەم لەقەلەم دەدرا. ئەندەنوسیا لە سی سالدا ئابووریی خۆی لیبرالیزە کردەوە و ڕێژەی گەشەسەندنی گەیشتە لە سەدا ٧، ئێستایش باوەشی بۆ دیموکراسی ئاوەلا کردووە (ئەلبەت هێشتا ئەزموونێکی لەرزۆکە) و هاوولاتییانی ئەندەنوسیا ژنێکیان وەک سەرۆککۆماری خۆیان هەلبژاردووە. دوای ئەم ولاتە پڕحەشیمەتترین ولاتانی موسولمانی جیهان بریتین لە پاکستان، بەنگلادێش و هێندستان (هەژماری موسولمانانی هێندستان زیاتر لە ١٢٠ ملیۆن کەسە). ئەم سێ ولاتە نەتەنیا ئەزموونی بەرچاوی دیموکراسییان هەیە بەلکوو لە هەر سێ ولاتەکەدا ژنان وەک سەرۆک وەزیران هەلبژێردراون کە لە زۆربەی ولاتانی رۆژئاواییش زیاتر بووە. کە وابوو هەرچەند هەندێ ڕەهەندی ئیسلام لەگەل مافەکانی ژناندا تەبا نایەتەوە بەلام هەندێ جار واقیعی بەردەست زۆر جیاوازترە. لە ئاست مەسەلەی ژنانی موسولماندا باشووری ئاسیا نموونەیەکی تاقانە و نائاسایی نییە. بەرلەوەی ئەفغانستان دوچاری داڕووخانێکی بیست سالەی تەژی لە ئانارشیزم و دیکتاتۆری بێت، لە سەدا ٤٠ی پزیشکانی ئەو ولاتە ژن بوون و لە هەرهەموو ئاسیادا کابۆل یەک لە ئازادترین شارەکان بوو بۆ ژنان. هەرچەند ڕەنگە بێنلادەن ئیسلامی تالەبانیی قبوول کردبێ بەلام زۆربەی ئەفغانییەکان ئەم شتەیان قبوول نەکردووە. بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بابەتە با سەیرێکی ئەو هەموو پیاوانە

بکەیـن کە دوای رووخانیتالّیبـانلە کـابۆل و مەزارشـەریف لە نـۆبەتی سـینەما، مۆسـیقا، سـەما و هەڵپەڕکێ و هەڵفڕین بە کایتدا دەوەستان.

یان ئاوڕێک لە تورکیا، واتە پێنجەم وڵاتی پڕحەشیمەتی موسوڵمانان بدەنەوە؛ دیموکراسییەکی لیبرالیی کەموکورت و نـاتەواو بەڵام کـرداری و پراکتیزەکـراو، ئەنـدامی پەیمـانی نـاتۆ و رەنـگە لە داهاتوویشـدا ئەنـدامی یەکێتیـی ئەورووپـا. ئەگەر دیموکراسـییە تـازە سـەرهەڵداوەکانی نەیجیریـا و مالیش بەم پێڕستە زیاد بکەن ئەوسا دیمەنێکی تۆکمەتر لە دونیای ئیسلام دەبینن. [ئەڵـبەت] ئەم دیـمەنە جـوانترین دیـمەن نیـیە. زۆربەی وڵاتـانی ئیسـلامی کەوتـوونەتە نێـو جیهـانی سـێیەمەوە و گیرۆدەی کێشە باوەکانی ئەم جیهـانەن: هەژاری، گەنـدەڵی و بەڕێـوەبردنی خـراپ. بەڵام لە نێـوان ئیسـلام و سـەرکوتکاریدا هـیچ جـۆرە پێوەنـدییەکی روون و ئاشـکرا نیـیە. هەروەهـا کە «یـانەی ئـازادی» جەختـی لەسـەر کـردووە: «لەوڕۆدا زۆربەی موسـوڵمانانی جیهـان لە چوارچێـوەی حکوومەتگەلی دیموکراسیی هەڵبژاردنیدا[73] دەژین». ئەگەر ناتەباییەکانی بنەمایی لە نێوان ئیسـلام و دیموکراسیدا هەبێت وا دیارە ٨٠٠ میلیۆن موسوڵمان ئاگایان لەم بابەتە نییە.

کێشەی راستەقینە ناگەڕێتەوە بۆ ئیسلام بەڵکوو دەگەڕێتەوە بـۆ رۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت. ئەگەر سەردانێکی ئەم دەڤەرە بکەن ئەو شپرزی و بشێوییە دزێو و ناحەزانە دەبینن کە لای خەڵکانی ئەمـڕۆ پەیوەسـت کـراون بە ئیسـلامەوە. لە میسـر، سـووریا، ئێـراق، لێـواری رۆژئـاوا، هێڵـی غەزە و وڵاتـانی کەنداودا دەوڵەتانی دیکتاتۆر بە چەندەها سیمای جۆراوجـۆرەوە دەبینـین، بە شـێوەیەک کە مـرۆڤ وا هەست دەکات دیموکراسیی لیبرالی شتێکی دوور و چاوەڕواننەکراوە. سیحری بونیـادگەراییی ئیسـلامی گەلێ بەهێز خۆ دەنوێنێ، چ ئەوکاتەی وا لە پشت دەرگا داخراوەکانەوە شێلگیرانە دەکەوێتە بەر باس و چ ئەو کاتانەی بە ئاشکرا لە ناو خوتبە و وتاری مزگەوتەکانـدا سـتایش دەکرێـت. ئێـرە مەملەکەتـی ئـاڵا سـووتاندن و مەلایـانی ئـاگرین و خۆتەقانـدنەوەیە. ئـەمریکا لە ئەفغانسـتاندا شـەڕی کـرد بەڵام تەنانەت تاقەیەک ئەفغانیش دەستی لە هێرشە تیرۆریستییەکانی دژ بە ئـەمریکادا نەبـوو. ئەفغانسـتان بووبوو بە مۆڵگەی هێزێکی چەکداری عەرەب بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئەمریکادا.

دونیای عەرەب بەشـێکی گرنگـی جیهـانی ئیسـلام و لە راسـتیدا سـەرەکیترین بەشـیەتی. بەڵام تەنیا بەشێکە لەم دونیایە و لە رووی حەشیمەتیشەوە بەشێکی بچووکە لە ١/٢ میلیارد موسوڵمانی جیهان ـ تەنیا ٢٦٠ میلیۆن کەس لە دونیای عەرەبدا دەژین. زۆرجار رۆژئاواییەکان دەسـتەواژەکانی «ئیسـلامی»، «رۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت» و «عەرەب» لە بـاتیی یەکتـر بەکـار دێـنن، بەڵام ئەمـانە هاوواتا نین.

---

73. Elective democracy

## هزری عەرەبان

ئایا تەنیا بارەکەم لە کۆڵ خۆم کردۆتەوە؟ ئایا بە دەرخستنی ئەوەی کە لە کردەوەدا ئیسلام گەلێ کەمتر لەوەی وا زۆرکەس دەیڵێن، لەگەڵ دیموکراسی و لیبرالیزمدا ناکۆک و ناتەبایە، تەنیا پەنام بردۆتە بەر تیۆرییەکی کولتووری و ئەم جارە لە ئاست عەرەباندا؟ ئەم تیۆرییەش شتێکی تازە نییە و رۆژئاواییەکان لە کۆنەوە بەکاریان هێناوە کە بۆ یەکەم جار لە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست و لە لایەن ئەفسەرانی بریتانییەوە خرایە بەردەست، ئەم فەرماندانە حاکمی کۆلۆنییەکانی بریتانیا لە دونیای عەرەبدا بوون. یەک لەو داوەرییە باوانە داوەرییەکەی جان باگووت گلابە کە لە ١٩٣٩ تا ١٩٥٦ فەرماندەی «لۆژیۆنی عەرەبەکان» بوو لە ئەردەندا:

ئێمە ئۆتۆنۆمیمان پێ بەخشیون کە بە هیچ شێوەیەک شایانی نین. ئەوان بەشێوەی سروشتی بەرەو دیکتاتۆری دەڕۆن. دامەزراوە دیموکراتیکەکان زۆر خێرا دەگۆڕدرێن بۆ کەرەستەی پیلانگێڕی، هەر بۆیە دوای هەر کوودێتایەک هەمان ئەو تاقمە لە بەرگێکی تازەدا سەر هەڵدەدەنەوە، مەگەر ئەوەی بکوژرێن و لە کۆڵ بکرێنەوە.[٤]

تەنانەت تی.ئی.لارێنس، فەرماندە و گەرۆکی بریتانی کە دۆستی عەرەبان بوو و بە دروستکردنی فیلمی «لارێنسی عەرەبستان» لە لایەن دەیڤید لینەوە ناوبانگێکی گەورە و هەرمێنی بەدەست هێنا، سیمای رەگەزێکی خەونپەرستمان بۆ وێنا دەکات کە زۆر ئاسان دەکەوێتە ژێر کاریگەریی هەمەجۆرە دیماگۆژیستییەکەوە:

دەکرا عەرەبان بە ئەندێشەیەکدا هەڵواسی و بیانجووڵێنی، دەقاودەق وەک گوریسێک؛ چونکو ملکەچبوونی فیکریی رەها و بێمەرجیان دەیانکاتە خزمەتکارانێکی بەکەڵک و لێهاتوو... هزرێکی نامۆ و تاریکیان هەبوو، تەژی لە بەرزی و نزمی، بێ هیچ رێسا و چوارچێوەیەک، بەڵام لە هەموو کەسێکی ناو ئەم جیهانە زیاتر خولیا و بەهرەی ئیماندارییان هەبوو.[٥]

ئۆلین بارینگ کە دواتر بە لۆرد کرامێر ناوبانگی دەرکرد و لە نێوان ساڵانی ١٨٨٣ تا ١٩٠٧دا بە تاقی تەنیا میسری بۆ بریتانیا بەڕێوە برد، شرۆڤەیەکی خستۆتە بەردەست کە هەرچەند کەمتر سۆزەکییە بەڵام بە هەمان رادە بێتوانایی عەرەبان لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیاندا دەخاتە بەر رەخنەی توندوتیژەوە. ئەو لە بەرهەمە مەزن و بەنرخەکەیدا دەربارەی مێژووی هاوچەرخی میسر، هزری «رۆژهەڵاتی» و «رۆژئاوایی» لە هەمبەر یەکدیدا دادەنێت:

لە راستیدا قووڵنەبوونەوە (وردنەبوونەوە) کە زۆر ئاسان دەگۆڕدرێ بۆ درۆ و فێڵ و تەڵەکە، سەرەکیترین تایبەتمەندیی مێشکی رۆژهەڵاتییە... مێشکی مرۆڤی رۆژهەڵاتی... وەکوو شەقامە لار

و ناڕێکەکانی (ڕۆژهەڵات) هەڵگری هیچ جۆرە هاوڕێژەییەک نییە و بیرکردنەوە و بەڵگاندنەکانی لەوپەڕی کاڵفامی و هەڵپژاویدایە.[٦]

لەمڕۆدا ئاوەها پۆلێنبەندییەک بۆ تایبەتمەندیی «ڕۆژهەڵاتییەکان» بە هیچ شێوەیەک قبووڵ ناکرێت. ئەم جۆرە بۆچوونانە مرۆڤ دەخاتەوە بیری ئەو سەردەمانەی کە هەندێ ئەندێشەی وەک «کەللەسەر خوێندنەوە»[٧٤] بە زانست لەقەڵەم دەدرا (جا ئەگەر چینییەکان و هێندییەکانیش بکەونە نێو ریزی «ڕۆژهەڵاتییەکان»ەوە ـ کە ئەوکات ئاوەها بوو ـ ئەی باشە چ وەڵامێکمان هەیە بۆ پێشکەوتنی سەرسامکەری ئەوان لە ڕووبەری زانست و ماتماتیک و هێما ئەقڵانییە هاوشێوەکانی دیکەدا؟). بەڵام کێشەکان لە زێدەڕۆییەوە بەرەو کۆتاهی و خەساری گەڕاونەتەوە. نەوەیەکی نوێ لە بیرمەندانی سیاسیی پاکژ جێگەی ئەو «ڕۆژهەڵاتناس[٧٥]»انەیان گرتۆتەوە کە پەنایان دەبردە بەر ئەو جۆرە کڵێشە کولتوورییانە، ئەم نەوە تازەیە ناوێرێ لەو پرسیارە بکۆڵێتەوە کە چما مرۆڤ وا هەست دەکا وڵاتانی عەرەب لە فەزایەکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی زۆر جیاواز لە شوێنەکانیتری جیهاندا قەتیس ماون؟ لە دونیای عەرەبیشدا کەس نادۆزیتەوە ڕەخنە لە خۆی بگرێت. زۆربەی نووسەرانی عەرەب زیاتر لەوەی هەوڵی ڕاڤەکردنی بێشێوییەکانی دونیای عەرەب بدەن سەرقاڵی بەرگریکردنن لە غووروری نەتەوەییان لە بەرانبەر بۆچوونی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەدا کە ئێستا هیچیان زیندوو نین.

حەقیقەت ناشاردرێتەوە؛ لە کۆی ٢٢ وڵاتی ئەندامی یەکێتیی عەرەب تەنانەت یەک وڵاتیان دیموکراسیی هەڵبژاردنی نییە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە لە سەدا ٦٣ی وڵاتانی جیهان ئاوەها سیستەمێکیان هەیە. ئەڵبەت هەندێ وڵاتی وەک ئەردەن و مەراکش حکوومەتگەلێکی ئۆتۆریتەخوازیان هەیە کە لە هەندێ لایەنەوە لیبرالین، بەڵام زۆربەیان ئاوا نین. مێژووی هاوچەرخیئەم دەڤەرە گەلێ دڵتەزێنە. لەم پەنجا ساڵەی دواییدا چەندەها دیکتاتۆر دەستیان بەسەر ئەم ناوچەیەدا گرتووە، کەچی جەماوەری عەرەب ئەوانیان وەک ڕزگارکەر و نەجاتدەری خۆیان لەقەڵەم دەدا و بە گوڕوتین و چەپڵەلێدان بە گەرمی پێشوازییان لێ دەکردن. جەمال عەبدولناسری میسر، موعەممەر قەزافیی لیبی و سەدام حسوسێنی ئێراق، هەموویان لە لایەن جەماوەری عەرەبەوە بە قووڵی ستایش کراون و پێیاندا هەڵگوتراوە.

ئەو دەگمەن بیرمەندە عەرەبانەی مەترسیی ئاوڕدانەوە لە بەستێنی کولتووریان قبووڵ کردووە، دانیان بەوەدا ناوە کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی عەرەب بە قووڵی ئۆتۆریتەخوازانەیە. بەهەجەت

---

٧٤ . ناسینی کەسایەتیی مرۆڤ بە پێی کاسەی سەر کە ئێستا ڕەت کراوەتەوە. و.ف

75. Orientalist

قورانی، بیرمەنـدی بەڕەگەز میسـری، دەڵێـت: «گوتـاری سیاسـیی عەرەب تەژیـیە لە وێنـاکردنی دیکتاتۆری رۆشنگەر، سەرکردەی قارەمان، پێشـەوای پـایەبەرز و سـەرۆکی بەڕێـزی بنەمـاڵە».[٧]

حەلیم بەرەکات، بیرمەندی لوبنانی، دەڵێت وا دیارە ئەو پێوەندی و بەهـا پیاوسـالارانەی وا لە نـاو بنەمـاڵەی عەرەبانـدا بـاون، هەمـان ئەوانە لە شـوێنی کـارکردن و قوتابخانەکـان و لە ڕێکخـراوە مەزهەبی و سیاسـی و کۆمەڵایەتییەکانیشـدا بـاون. لە هەمـوو ئەم شـوێنانەدا باوکسـالارێک بەسـەر ئەوانیتردا زاڵە، دەسەڵاتی پاوانی خۆی کردووە، چاوەڕێی ملکەچبوونی بێئەملاولایە و لە بەرانـبەر جیابیراندا قاییـل بە هـیچ جـۆرە ئاسـانگیرییەک نیـیە. ئەوانەی بەرپرسـایەتییەکیان بەدەسـتە (لە پۆسـتی حـاکم، سـەرۆک، مامۆسـتا، خاوەنکـار و سەرپەرشـتیاردا) سـیمایەکی باوکـانە بـۆ خۆیـان دروست دەکەن و بەم شێوەیە پـێگەی خۆیـان لە سـەری سـەرەوەدا دەچەسـپێنن. هەرکـات ئاوەهـا کەسایەتییەکی باوکسالار ببێتە خاوەن ئاوەها پێگەوجـێگەیەک، کەس توانـای لابردنـی نیـیە مەگەر کەسایەتییەکی باوکسالاری دیکە بە هەمان هێز و دەسەڵاتەوە.[٨]

دەتوانین نموونەی پیاوسالاریی عەرەبی لە چیرۆکەکانی نەجیب مەحفووز، نووسـەری میسـری و خاوەن خەڵاتی نۆبێلدا بەدی بکەین. ئەو لە کتێبە سـێ بەرگیـیە (تریلـۆژی) بەناوبانگەکەیـدا، *بـین القسـرین، قسرالشـوق و سـیکریە*، چیرۆکـی بازرگـانێکی میسـری بە نـاوی «السـید احمـد الجـواد» دەگێڕێتەوە. «سل سید» ـ ئەو نازناوەی ژنەکەی بۆی داناوە ـ سەرۆکی ڕەهای ماڵە. بنەمـاڵەکەی ناوێرن لەلای ئەودا هیچ کارێک ئەنجام بدەن، کاتێ کە بە تەنیا نان دەخوات ئەوان قـنج و قیـت بە پێوە لە بەردەمیدا دەوەستن؛ هاوسەر و منـداڵەکانی تەنیـا دوای دەسـگرتنەوەی لە خـواردن بۆیـان هەیە نان بخۆن. ئەوکاتەی ژنەکەی دان بە جەرگی خۆیدا دەنێ و بەبێ ئیزنی ئەو لە مـاڵ دەچێـتە دەرێ، دەینێرێتەوە بۆ ماڵە باوکی. ئێستە نازناوی «سل سید» لای میسرییەکان بۆتە هێمایەک بۆ ئاماژەدان بە هەموو شتێک؛ لە مێردە ملهوڕەکانەوە بگرە تا دەگاتە سەرکردەکان.

سـێیەری «سـل سـید» بەسـەر زۆربەی سـەرکردە عەرەبەکانـدا زاڵە: ناسـر، سـەرکردەیەکی کاریزماتیـک بەڵام دیکتـاتۆر کە لای نەتەوەکەی هەم ئەوینـی ئافرانـدبوو و هەم نەفـرەت؛ سـاداتی جێنشینی ناسر، نەتەوەکەی ناو نـابوو «منـداڵەکانی مـن»، بەڵام دڵرەقییەکـی بێـوێنەی دەنوانـد. «سـل سـید» لە پاشـایانی کەنـداو و لە «ڕێوڕەسـم»ی مانگانەیانـدا دەبینـین، لەو کۆبـوونەوانەدا ئیجازە بە «هاووڵاتی ـ پاڕانەوەچی»یەکان دەدرێت گلەوگازندە (لە پێشەوە تاوتوێکراوەکان)یان لە بەردەم شێخدا بگێڕنەوە. یەکێک کچەکەی نەخۆشە و ئەویدی لەگەڵ دراوسێکەیدا لەسـەر زەویوزار بەشەڕ هاتووە. شێخ یەکێکیان دەنێرێ بۆ وەزارەتی تەندروستی و ئەویتریان بۆ وەزارەتی نـاوخۆ. خاوەن گلەییەکان دەستەکانی شێخ ماچ دەکەن و سوپاسی خودا دەکەن بۆ ئەو حاکمە میهرەبان و

دڵڕەحمەی پێشکەشی کردوون. شێخ دەستیان بۆ دەجووڵێنێ، وەک ئەوەی بڵێت تەنیا ئەرکەکانم جێبەجێ کردووە. دەڵێن شاعەبدولعەزیزی کوڕی سعوود، دامەزرێنەری عەرەبستانی سعوودی، ئەم قسانەی کردووە: «پێمخۆشە هەمیشە پێوەندییەکی نزیکم لەگەڵ خەڵکەکەمدا هەبێ، چونکو بەم شێوەیە ئاواتەکانی ئەوان دێتە دی. هەر بۆیە هەرکەس پێی خۆش بێ دەتوانێ لە کۆبوونەوەکانمدا بەشداری بکات».

هەرچەند رۆژئاوای مودێرن هەموو ئەم شتانەی پێ سەیر و نائاساییە، بەڵام هیچکامیان تایبەت بە عەرەب نییە، نە پیاوسالاری و نە پیاوانی بەدەسەڵات و نە خولیا و وەهم. رەخنە پڕ لە سووکایەتییەکانی نیزامییانی بریتانیا (دەربارەی عەرەب) کە ئاماژەمان پێکردن، هاوشێوەی هەمان ئەو بابەتانەیە کە سەبارەت بە چینییەکان و ژاپۆنییەکان و هێندییەکان و لە راستیدا هەرهەموو «رۆژهەڵاتییەکان» و «ئاسیاییەکان» نووسیویانە. زۆربەی وڵاتانی ئاسیایی و ئافریقایی تا ئەم دواییانەش لە ژێر رکێفی کۆمەڵە پیاوانێکی بەدەسەڵاتدا بوون کە خەڵک بە ترس و حەزەرەوە باسیان دەکردن. ئاورێک بدەنەوە لە سوکارنۆی ئەندەنوسیا، جۆلیۆس نایرێرەی تانزانیا، خوان پرۆنی ئارژانتین و تیتۆی یۆگۆسلاڤیا. تەنانەت لە مێژووی هاوچەرخی رۆژئاوایشدا چەند نموونەیەک لەم دیکتاتۆرە بەدەسەڵاتانە دەبینین کە زۆرجار جەماوەر پێیدا هەڵدەگوتن. فرانسیسکۆ فرانکۆ، ئانتۆنیۆ سالازار، بێنیتۆ مووسولینی و ئادۆڵف هیتلەر سەردەمانێک زۆربەی خەڵکانی وڵاتەکانیان شەیدای خۆیان کردبوو. هەرچەند رۆژئاوا بە سەدان ساڵ پێشکەوتووتر و لیبرالتر بووە، بەڵام بەگشتی مێژوویەکی چەندهەزارساڵەی پێکهاتەی پتەوی پیاوسالارانەیش ژیاوە. بیرمان نەچێ تا چەند سەدە لەمەوپێش هێشتا ژنان وەک بەشێک لە سامانی پیاوان لەقەڵەم دەدران. بەڵام هەرچەند رۆژئاوا پێشکەوتنێکی گەورە ژیاوە و بەشێک لە دونیای دەرەوەی رۆژئاوایش مۆدێرنیزاسیۆنیان بەتایبەت لەم پەنجا ساڵەی رابردوودا دەست پێ کردووە، کەچی دونیای عەرەب لە هەمان دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسیی سەرەتایی و دواکەوتووی پێشوودا ماوەتەوە. عەرەب خاوەن سیاسەتێکی کولتووریی تاقانە نییە، بەڵکوو تەنیا لە رابردوودا قەتیس ماوە.

هەرکەس لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا ئاورێ لە وڵاتانی عەرەب کە تازەبەتازە لە دەست کۆلۆنیالیزمی ئیمپراتۆریاکانی ئەورووپا رزگار بووبوون، بدایەتەوە، قەت باوەڕی نەدەکرد رۆژێک لە رۆژان ببن بە زەلکاو. وڵاتە ئاسیاییەکانیتری وەک کۆریای باشوور و مالێزی کە ئەوکات دۆخێکی زۆر خراپتر دەژیان، گەلێ باشتر و ژیرانەتر جووڵانەوە. لە ١٩٤٥دا هیچ کەسێک نەبوو پێشبینیی ئەو دەرئەنجامانەی داهاتوو بکات. لە راستیدا زۆرێک لە چاودێرانی ئەو سەردەمە پێیان وا بوو بە بەراورد لەگەڵ ئەو وڵاتانەیتردا کە بەم دواییانە لە کۆلۆنیالیزم رزگاریان بووبوو، وڵاتانی عەرەب

گەلێ باشتر جووڵاونەتەوە. بەیرووت، دیمەشق، قاهیرە و بەغداد لە زۆربەی پایتەختە ئاسیایی و ئافریقاییەکانی‌تر خاوەن کولتوورتر، بازرگانیتر و پێشکەوتووتر بوون. بیرمان نەچێ عەرەب خاوەن مەدەنییەتێکی گەورەیە کە مێژوویەکی دوورودرێژی زانست، فەلسەفە و سەرکەوتنی نیزامی ژیاوە. ئەوان زانستی جەبریان[٧٦] داهێنا، ئەوکاتەی ئەرەستۆ لە رۆژئاوادا بیرکرابوو ئەوان زیندوویان راگرت و شەڕی گەورەترین دەسەڵاتەکانی ئەو سەردەمەیان کرد و تێیدا سەرکەوتن. لە «سەردەمی تاریکی»ی ئەوروپادا هونەر و کولتووری ئیسلامی گەلێ پێشکەوتوو بوون.

دونیای عەرەب لە چل و پەنجاکاندا زۆر هیوادار بوو بەوەی شکۆ و شانازاییەکانی رابردووی زیندوو بکاتەوە. وەک هەموو ئەو وڵاتانەی کە لە کۆلۆنیالیزم رزگاریان بووە، دونیای عەرەبیش بەرانبەر رۆژئاوا بەدگومان بوو، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان زۆر لا بەرز و بەڕێز بوو. موحەممەد هەیکەل، بەناوبانگترین رۆژنامەنووسی میسری، بەم چەشنە لەم بابەتە دەکۆڵێتەوە: «دیمەنی گشتیی وڵاتە یەکگرتووەکان... دیمەنێکی سیحرئامێز بوو. بریتانیا و فەرەنسا دوو ئیمپراتۆریای روو لە رووخان و نەفرەتلێکراو بوون. سۆڤییەت کەوتبووە پێنج هەزار مایل ئەولاترەوە و موسوڵمانان رەقیان بوو لە ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم. بەڵام ئەمریکا لەدوای جەنگیدووەمی جیهانییەوە بە سیمایەکی دەوڵەمەندتر، بەهێزتر و سەرنجڕاکێشەرتر لە هەمیشە سەری هەڵدابوو»[٩] تێڕوانینی ئەم دەستەبژێرە نوێیانە بۆ ئایین تێڕوانینێکی مۆدێرن و سێکۆلار بوو. ئیسحاق حوسێن، رۆشنبیری عەرەب، لە ١٩٥٦ و لە دووتوێی راپۆرتە لێکۆڵینەوەیەکدا لە گۆڤاری *ئاتلانتیک مانتلی*، ئاوەهای نووسیوە: «ئێستە ئیسلام بەرەو جۆرە هەڵوێستێکی هاوشێوەی ئایینی رۆژئاوایی، واتە جیاکردنەوەی کلێسا و دەوڵەت لە یەکتر، هەنگاوی ناوە». هەرچەند رەنگە ئەمڕۆ ئەم دەربڕینەمان زۆر لا سەیر بێت بەڵام وێناکردنێکی رێک و یەکلانگیرە لەگەڵ مەعریفەی باوی ئەو سەردەمەدا.

شتێک لە نێوان ئەوکات و ئێستەدا هاتە قەومان. بۆ تێگەییشتن لە قەیرانی سەردەمی هاوچەرخی دونیای عەرەب پێویستە لەم رێگا سەرەولێژە بگەین. پێویستە بە تێڕوانینێکی رەخنەگرانە مێژووی ئەم ناوچەیە لەم چل ساڵەی رابردوودا، نەک لە چوارسەد ساڵی رابردوودا، شی بکەینەوە.

---

٧٦. ئەڵبەت زانستی جەبر (Gabria) بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشانی چەند هزرڤانێکی ئێرانیی وەک خاڕەزمی و غیاسەدین جەمشیدی کاشانی بوو. و.ف

## پەککەوتنی سیاسەت

مرۆڤ بە سەختی دەتوانێت بیر لە گوڕ و تینی دونیای عەرەب لە دواساڵەکانی ١٩٥٠دا، واتە ئەوکاتەی وا جەمال عەبدولناسر سەرقاڵی پتەوکردنەوەی دەسەڵاتی خۆی بوو لە میسردا، بکاتەوە. بە درێژایی چەندده ساڵ دونیای عەرەب کەوتبووە ژێر رکێفی هێزە کۆلۆنیالیستەکان و دواتریش پادشا گەندەڵەکانەوە. ئێستا خولیای سەربەخۆیی دونیای عەرەب هاتبووە دی و ناسر رزگارکەری تازەیان بوو، پیاوێکی مۆدێرن بۆ سەردەمی دوای شەڕ. ناسر لە سەردەمی دەسەڵاتداریی بریتانییەکان لە ئێسکەندەرییەدا هاتبووە دونیاوە، ئەم شارە شارێکی نێونەتەوەیی بوو و زیاتر لەوەی عەرەب بێت مەدیترانەیی بوو. قۆناغی لاویی ناسر لە نێو ئارتەشدا تەواو بوو، ئەوکات ئارتەش رۆژئاواییترین لایەنی کۆمەڵگای میسر بوو. جەمال عەبدولناسر بە جلوبەرگە شیک و رازاوەکانی و چاویلکە رەشەکەیەوە ـ کە دوامۆدی رۆژ بوو ـ لە گۆڕەپانی جیهانیدا گەشایەوە. «شێری میسر» هێمای روانگەکانی دونیای عەرەب بوو.

بە باوەڕی ناسر دەبا سیاسەتی عەرەبی بە هەندێ ئەندێشەی وەک ئۆتۆنۆمی، سۆسیالیزم و یەکگرتنی عەرەب بورووژێنرێت. ئەمانە کۆمەڵە چەمکێکی مۆدێرن و لە هەمان کاتدا رۆژئاوایی بوون. ئەویش وەک زۆربەی سەرکردەکانی ئەودەمی جیهانی سێیەم یەکێک بوو لە خوێنەرە هەمیشەییەکانی گۆڤاری ئینگلیزیی *نیۆستاتێسمەن*[٧٧]. لە ١٩٦٢دا «مانیفێستی نەتەوەیی» بە جۆرێک دارشتبوو مرۆڤ وایدەزانی رۆشنبیرێکی چەپگەرای پاریس یان لەندەن نووسیویەتی. تەنانەت بەبرشتترین ئایدیا و ئامانجەکەیشی، واتە پان عەرەبیزم، لە ژێر کاریگەریی ئەورووپادا بوو. ئەم ئەندێشەیە نوسخەیەک بوو لە هەمان ئەو ناسیۆنالیزمەی وا لە دەیەی ١٨٧٠دا سەرەتا ئیتالیا و پاشان ئەڵمانیای یەکپارچە کرد، بەپێی ئەم ئەندێشەیە ئەوانەی بە یەک زمان دەئاخفن پێویستە ببن بە نەتەوەیەکی یەکگرتوو.

بەرلەوەی وڵاتانی کەنداو بە پارەی نەوت بتەقێنەوە، میسر سەرۆکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو. هەر بۆیە روانگەکانی ناسر روانگەی هەرهەموو ناوچەکە بوو. هەرهەموو حکوومەتەکان، لە بەعسییەکان و ژەنەراڵەکانی سووریا و ئێراقەوە بگرە تا دەگاتە پادشا کۆنەپارێزەکانی کەنداو، بە یەک جۆر زمان و دەربڕین و دەستەواژە دەئاخفان. ئەوان لاساییکەرەوەی رووتی ناسر نەبوون، دونیای عەرەب تینووی مۆدێرنیزاسیۆن بوو و مۆدێرنیتەیش لای ئەوان مانای قبووڵکردنی ئەندێشەکانی رۆژئاوا، ئەڵبەت هاوکات بەرنگاری دەسەڵاتی رۆژئاوایش دەبوونەوە.

---

77 . New statesman: گۆڤاری چەپگەرای بریتانیایی. و.ف

لەم بارەیەوە وڵاتـانی عەرەب وەک زۆرێـک لە وڵاتە ناڕۆژئاواییەکـانیتر وا بـوون. ئەو ژیـارانەی سەرهەڵدانی رۆژئاوایان دیتبوو و دەیانزانی لێی دواکەوتوون ـ وەک چین، هێندستان و ئیمپراتۆریای عوسمانی ـ دەیانویست رێگایەک بۆ گرتنەوەی رۆژئاوا بدۆزنەوە. وادیارە لە زۆربەی ساڵانی مێژووی هاوچەرخدا دەستەبژێرانی ئیسلامی زیـاتر لە هەمـوان بە ئـارەزووی ئەم شـتەوە بـوون. عەرەبەکـان دوابەدوای ئەوەی لە ١٦٨٣ و لە نزیکیی ڤیەنادا شەڕی ئیمپراتۆریای عوسمانییان دۆڕاند، هەستیان کـرد پێویسـتە لە رۆژئـاواوە فێـری زۆر شـت بـن. دوای ئەوەی نـاپلیۆن بە داگیرکردنـی میسـر لە ١٧٩٨دا رۆژئــاوای بــردە نێــو مەملەکەتــی عەرەبیــیەوە، عەرەبە خۆماڵییەکــانی شــەیدای ئەم مەدەنییەتە دەوڵەمەند و بەهێزە بوون. وەک چۆن ئالبێرت هورانی ـ ی مێژوونـووس بە پشتبەسـتن بە بەڵـگە مێژووییەکـان وتـوویەتی، لە سـەدەی حەڤـدە و هەژدەدا بیـری سیاسـی و کـۆمەڵایەتیی لیبراڵیی وەرگیراو لە ئەورووپا، لە رۆژهەڵاتی ناویندا پەرەی سەند.

هیـواداریی دونیـای عەرەب بە دۆسـتایەتیکردنی بریتانییەکـان، لە سـەردەمی کۆلۆنیالیسـتیی دواساڵەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا گەلێ گەشابوویەوە، هەرچەنـد ئەم هیـوایە زۆر زوو رەوییەوە و گۆڕدرا بۆ نائومیدی، بەڵام دەستەبژێرانی عەرەب هێشـتا هەر شـەیدای رۆژئـاوا بـوون. پادشـا و ژەنەراڵەکـانی داهـاتووی عەرەب بە مەبەسـتی فێربـوونی شـێوازی ئاخـافتن و هەڵسـوکەوتی جێنتـێلمەنە بریتانییەکـان خۆیـان لە زانکـۆی ڤیکتۆریـای ئێسـکەندەرییەدا نـاونووس دەکرد. دواتر زۆرێکیان لە کەمبریج، ئۆکسفۆرد یان سەندهۆرسـت ـ دا[78] درێژەیـان بە خوێنـدن دا. بنەماڵەی پاشایەتیی ئەردەن تا ئێستایش ئەم نەریتەیان پاراستووە، ئەڵبەت ئێستا روویان کردۆتە زانکۆکـانی ئـەمریکا. دوای جـەنگی یەکـەمی جیهـانی و پەرەسـەندنی کـۆمەڵە هزروئەندێشـەیەک دەربارەی کردنەوەی سیاسەت و کۆمەڵگا لە هەندێ وڵاتی وەک میسر، لوبنان، ئێـراق و سـووریادا، قۆناغێکی کورتخایەنی لیبراڵی دونیای عەرەبـی گـرتەوە. بەڵام دوای رووخـانی حکـوومەتە کۆنەکـان رەخنەگرانی لیبراڵی پادشایان و ئەشرافیش بزر بوون. ئایدیۆلۆژیایەکی مۆدێرنتر و ناتەواوتر پەرەی سـەند کە تێکەڵکردێـک بـوو لە کۆمـاریخوازیی نیزامـی، سۆسـیالیزمی دەوڵەتـی و ناسـیۆنالیزمی عەرەبی. بەڵام ئەم ئەندێشانەش لە بنەڕەتـدا هەر رۆژئـاوایی بـوون؛ هەمـوو بەعسـی و ناسرییەکان قاتیان لەبەر دەکرد و دەیانویست وڵاتەکەیـان مـۆدێرن بـکەنەوە. بیروبۆچـوون و رێچکە سیاسـییە تازەکانی دونیای عەرەب هیچیان پـێ نەکـرا. حکـوومەتە عەرەبەکـان هەرچەنـد بەتوانـا بـوون بەڵام کۆمەڵە ئەندێشەیەکی خراپیان هەڵبژارد و بە میتۆدگەلێکی خراپتریش بەکاریان هێنان. سۆسیالیزم بـوو بە بەرهەمهێـنەری مەنـدی و داوەسـتان و بۆرۆکراسـی. سیسـتەمی ئابووریـیـان ریفـۆرمی لە

---

78. sandhurst : شارێکی نزیک لەندەن کە زانکۆی پاشایەتیی نیزامیی بریتانیا لەو شارەدایە.و.ف

کێشـەکانی گەڵاڵەدارشـتنی ناوەندیدا نەکـرد و قەت ئەکتیـڤ نەبـوویەوە. کۆمـارە عەرەبییەکـان لە باتیی دیموکراسی، بەرەو دیکتاتۆری هەنگاویـان هەڵگـرت. «بێبەڵێنـی»[79] جیهـان سـێیەم بـوو بە داموودەزگای پڕوپاگەنـدەی سـەر بە سـۆڤییەت. ناسـینەوەی دەرفەت و بەرژەوەنـدییە [تـایبەتییە] نەتەوەییەکان دەبوو بە هۆی دوورکەوتنەوەی وڵاتـانی عەرەب لە یەکتـر و رووخـانی هاوپەیمـانێتیی نێوانیان. «شەڕێکی سارد»ی عەرەبی لە نێوان عەرەباندا هـاتە قەومـان، لە لایەکەوە وڵاتـانی ژێـر دەسەڵاتی پاشایانی سەر بە رۆژئاوا (وڵاتانی کەنداو و ئەردەن) لەولاشەوە وڵاتـانی ژێـر دەسـەڵاتی ژەنەراڵە شۆڕشـگێڕەکان (سـووریا و ئێـراق). لە هەمووشـی ناخۆشـتر، ئیسـراییل چەنـد جـار لە گۆڕەپـانی شـەڕدا دونیـای عەرەبـی تـرۆ کـرد و بە قورسـی شکسـتی دان. دۆڕانـدنی خێـرا و سەرسامکەری شەڕی ١٩٦٧ لە هەندێ لایەنەوە خاڵێکی وەرچەرخان و نیشاندەری ئەو راستییە بوو کە لە پشـت دروشـم و ئیـدیعا گەورەکـانی دونیـای عەرەبەوە کۆمەڵگـایەکی روو لە رووخـان دەژی. سەدامیش بە داگیرکردنی کوێت لە ١٩٩٠دا پاشماوەکانی پانعەرەبیزمی تەفروتوونا کرد.

لەوکـاتە بەدواوە بەردەوام هەمـوو شـتێک خراپتـر و خراپتـر بـووە. ئاوڕێـک لە ئێسـتای میسـر بدەنەوە. بەڵێنەکەی ناسر گۆڕدراوە بۆ دێوەزمەیەکی بێـدەنگ و هەرا. دەوڵەت تەنیـا لە تـاقەیەک بەسـتێندا لێهـاتوو و ئەکتـیڤە: لەخشـتەبردنی جـودابیری و خنکانـدنی کۆمەڵگـای مەدەنـی. فـواد ئەجمـی، تـوێژەری ئـەمریکاییی بەڕەگەز لوبنـانی، گەلـێ پەشـێو و دڵگـرانە بە دۆخـی رۆشـنبیریی میسر، ئەم وڵاتە سەردەمانێک دڵی ژیانی رۆشنبیریی عەرەب بـوو بەڵام ئێسـتە سـاڵانە تەنیـا ٣٧٥ کتێبی تێدا دەنووسرێت. ئەگەر بەراوردی بکەین بە ئیسـراییل کە رێـژەی حەشـیمەتی یەک بە دەی میسرە بەڵام ساڵانە ٤٠٠٠ کتێب بەرهەم دێنێ [ئەوسا لەم داخ و کەسەرەی ئەجمی دەگەیـن]. فـواد ئەجمی لە زمان توێژەرێکەوە بە ناوی کەریم ئەلـڕاوی دەگێـڕێتەوە کە هۆشـداریی داوە «ئـارەزووی قـووڵ و فراوانـی مۆدێرنبـوونەوە کە لە سـاڵە سـەرەتاییەکانی ١٨٠٠ و دوابەدوای پێوەنـدیکردن بە ئەورووپاییەکانەوە بەسەر میسردا زاڵ بووە و ئەو وڵاتەی بزواندووە، خەریکە ئاوەژوو دەبێـتەوە و بە باری پێچەوانەدا وەردەسوورێ».[١٠]

مرۆڤ ئەوکاتە دەهەژێـت کە تێـدەگا میسـر باشـتر لە وڵاتە عەرەبە دراوسـێکانی هەڵسـووڕاوە. سووریا بۆتە یەکێک لە سەرکوتکارترین وڵاتـانی پۆلیسـیی هەرهەمـوو جیهـان، سـووریا ئەو وڵاتەیە سیهەزار مرۆڤی کۆکردەوە و بە کۆمەڵ کوشتنی ـ رووداوی شاری حەمما لە ساڵی ١٩٨٢ دا ـ هیچ شتێکیش ئێخەی نەگرت (بیرمان نەچێ دیمەشقی پیتەختـی ئەم وڵاتە کـۆنترین شـاری دونیـایە کە هیچکات چۆڵ نەکراوە). یان ئێراق کە یەکێک بوو لە مـودێرنترین و سـێکۆلارترین وڵاتـانی عەرەب ـ

---

79) مەبەست رێکخراوی وڵاتانی بێلایەنە. non – aligned countries. و.ک.)

لەم وڵاتەدا ژنان مافی کارکردنیان هەبوو، هونەرمەندان دەرفەتی پێشکەوتن و بووژانەوە و ڕۆژنامەنووسان دەرفەتی نووسینیان هەبوو ـ لە ٣٠ ساڵدا گۆڕدرا و بوو بە گاڵتەجاڕی دەستی شێتێکی خۆبەزلزان. لە نێو دیکتاتۆرە مۆدێرنەکاندا سەدام تاقە کەسێک بوو کە چەکی کیمایی دژ بە هاووڵاتییانی خۆی بەکار هێنا (لە ئاست کورداندا). لوبنان کە کۆمەڵگایەکی پلۆراڵ و ڕەنگاوڕەنگ و نێونەتەوەیی بوو و بەیرووتی پایتەختی سەردەمانێک بە «پاریسی ڕۆژهەڵات» ناوزەد کرابوو، لە نێو شەڕ و تیرۆری رووخێنەردا چەقیوە و تازە بە تازە خەریکە ڕزگاری دەبێت.

هەموو ئەم وڵاتانە پێشتر ئۆتۆریتەخواز بوون، بەڵام لە چەند دەیەی رابردوودا دیکتاتۆرە سوننەتییەکان بە مەبەستی ئەوەی دەوڵەت توانای کۆنترۆڵکردنی هەموو ڕەهەندەکانی کۆمەڵگا پەیدا بکات، بە شێوەیەکی قووڵ ڕوویان کردۆتە تەکنۆلۆژیا و میتۆدە نوێیەکانی کۆنترۆڵ. هەروەها کە مێژوونووسی ئیسلام، بێرنارد لوییس، ئاماژەی پێداوە، دیکتاتۆرە بچووکەکانی ئێستا زۆر لە ئیمپراتۆرە ئەفسانەییەکانی ئەوسا بەهێزترن ـ ئەوان بەهێزترن لە ئیمپراتۆرە ناودارەکانی وەک سلێمانی مەزن، پاشای عوسمانی لە سەدەی شازدەمدا، یان خەلیفە هاروون ئەلرەشید لە سەدەی هەشتەمدا (کە بە چیرۆکەکانی *هەزار و یەک شەو* ناوبانگێکی هەرمێنی پەیدا کرد). بۆ وێنە شێخنشینەکانی کەنداو کە پاشاکانیان سەردەمانێک حکوومەتگەلێکی بەرەڵڵا و سەرەتاییان هەبوو و نەیاندەتوانی بە باشی عەشیرەتە گەڕۆک و دەشتەکییەکانیان کۆنترۆڵ بکەن، ئێستا بوونەتە کۆمەڵە دەوڵەتێکی دەوڵەمەند و سەروەت و سامانی خۆیان بە ئاراستەی دروستکردنی هێزی پۆلیس، ئارتەش و دامودەزگای هەواڵگریدا بەکار دەهێنن و ئەمانەیان کردۆتە هۆکاری کۆنترۆڵکردنی توندوتۆڵی هاووڵاتییان. تەنانەت لە وڵاتانی دەوڵەمەندی کەنداویشدا ئەم جۆرە خەڵکە داماو و لێقەوماوانە دەبینین کە کەمەکێک سەروەت و سامانیان پێ دراوە بەڵام مافی رادەربڕینیان لێ زەوت کراوە. ئەوان لە قەفەزێکی زێڕیندا دیل و یەخسیرن. زۆربەی ئەمریکاییەکان پێیان وایە عەرەبان دەبێ سوپاسگوزاری ئەمریکا بن کە کوێت و عەرەبستانی لە شەڕی کەنداودا ڕزگار کرد، بەڵام زۆربەی عەرەبەکان پێیان وایە ئەمریکا لە ڕاستیدا تەنیا بنەماڵەی پاشایەتیی کوێت و عەرەبستانی ڕزگار کرد و ئەم دوو شتە زۆر لێکدی جیاوازن.

لە کۆتاییی هەشتاکانەوە هەرهەموو دەوڵەتانی کۆن و سواو لە مۆسکۆوە تا پراگ و سیۆل و ژۆهانسبۆرگ بەرەو رووخان دەچوون، بەڵام دونیای عەرەب هێشتا گیرۆدەی دیکتاتۆرانی گەندەڵ و پادشایانی پیر و پەککەوتە بوون. لە شەستەکاندا مرۆڤ وایدەزانی ئەم حکوومەتانە داهاتوویەکی روون و چارەنووسێکی گەشاوەیان دەبێت، بەڵام ئێستا جۆرە چەتەسالارییەکیان بەسەردا زاڵ بووە و بە هیچ شێوەیەک جەماوەری نین و بەتەواوی شەرعییەتیان لێ داماڵراوە. نزیک بە هەموو

وڵاتانی عەرەب بە بەراورد لەگەڵ چل ساڵ لەمەوپێشدا کەمتر ئازادن، واتە لەوپەڕی سەرسووڕماندا ڕەوتێکیان گرتۆتە پێش بە تەواوی پێچەوانەی مۆدێلی جیهانییە. لە جیهاندا کەمتر وڵاتێکمان هەیە بتوانین بەم ڕستە و دەربڕینانە وێنای بکەین.

## یەککەوتنی ئابووری

لە زۆبەی هەرەزۆری ئەو مێزگرد و کۆنفرانسانەدا کە دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتامبر(ئەیلول) و لە زانکۆکان و ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەدا دەربارەی تیرۆریزم بەڕێوە دەچن، ئەگەر کەسێک بیەوێ وەک مرۆڤێکی بیرمەند و جیدی خۆی بناسێنێ، بە دەربڕینێکی ورد دەڵێت: «پێویستە نەتەنیا لەگەڵ تیرۆریزم بەڵکوو لەگەڵ بنەماکانی تیرۆریزمیشدا بەشەڕ بێین». درێژەی ئەم دەربڕینە بێگومان خستنە بەردەستی پرۆژەیەکی هاوشێوەی پرۆژەکەی مارشاڵە[٨٠] بۆ سڕینەوەی هەژاری لە وڵاتانی ئیسلامیدا. کێیە لەگەڵ سڕینەوەی هەژاریدا نەبێت؟ بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئەم پرۆژەیە حەقیقەتێکی تاڵی بیرکردووە: تۆڕی تیرۆریستیی ئەلقاعیدە لە هەژاران و بێبەشان پێک نەهاتووە.

ئەم مەسەلەیە لە ئاستی سەرۆکی ئەم تۆڕە تیرۆریستییەدا زۆر ڕاستە؛ بن‌لادەن لە بنەماڵەیەکدا لە دایک بوو کە زیاتر لە ٥ ملیارد دۆلار سەرمایەیان هەبوو. زۆربەی هاوڕێ سەرەکییەکانیشی هەر لە ئاوەها دۆخێکدا ژیاون. بۆ وێنە ئەیمەن ئەلزەواهێری، جێگری بن‌لادەن، پێشتر لە قاهیرەدا پزیشکی نەشتەرگەر بوو و لە نێو بەرزترین چینەکانی کۆمەڵگەوە تەڤلی ئەلقاعیدە بوو. باوکی لە مامۆستا ناسراوەکانی زانکۆی قاهیرە بوو، باپیری یەکێک بوو لە ئیمامەکانی ئەلئەزهەر (واتە گرنگترین ناوەندی ئیسلامیی دونیای عەرەب) هەروەها مامیشی یەکەم سکرتێری یەکێتیی عەرەب بوو. یان کەسانی پلەخوارتری وەک موحەممەد عەتا، فرۆکەوانی یەکەم فرۆکەیەک خۆی بە سەنتەری بازرگانیی جیهانیدا تەقاندەوە، ئەو لە بنەماڵەیەکی مۆدێڕن و میانەڕەوی میسریدا هاتۆتە دونیاوە، باوکی پارێزەر بوو و خوشکەکانیشی یەکیان مامۆستای زانکۆ و ئەوی‌تریان پزیشک بوو. خۆیشی وەک چەند تیرۆریستەکەی‌تر لە هامبۆرگ خوێندبووی. وا دیارە تەنانەت توێژە خوارووەکانی ئەلقاعیدەیش خوێندەوارن و لە چینی مامناوەندین. لە ڕووی خوێندەوارییەوە جان واکێر لیند، لاوێکی کالیفۆرنیایی کە وازی لە ژیانی ئەمریکایی هێنا و تەڤلی تاڵیبان بوو، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ هاوکارە بونیادگەراکانیدا نەبوو. لە ڕاستیدا دەتوانین

٨٠. وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دوای جەنگیدووهەمی جیهانی کە پرۆژەی یارمەتییە داراییەکانی ئەمریکا بۆ ئەورووپا بەناوی ئەوەوە ناو نراوە. و.ف

بڵێین ئەو بە دیپلۆمی دواناوەندییەوە لە بەرانبەر بەڵگەنامەی ئەندازیاریی ئەواندا وەک کەسێکی نەخوێندەوار دەهاتە ئەژمار.

لە راستیدا تیرۆریزم لەو شوێنانەوە سەری هەڵداوە کە لە سی ساڵی رابردوودا زیاترین رێژەی سەرمایە و دەوڵەمەندییان بە خۆوە دیوە. ١٥ کەس لەو ١٩ تیرۆریستەی لە ١١ی سێپتامبردا چوار فڕۆکەکەیان رفاند خەڵکی گەورەترین فرۆشیاری نەوت لە هەرهەموو جیهاندا واتە عەرەبستان بوون. ئەستەمە هۆکاری سەرەکیی تووڕەبوونیان هەژاری بووبێت. تەنانەت میسر کە یەکێکی ترە لە سەرەکیترین دابینکەرانی هێزەکانی ئەلقاعیدە، بەپێی پێوەرە جیهانییەکان وڵاتێکی هەژار نییە. رێژەی داهاتی سەرانەی میسر ٣٦٩٠ دۆلارە کە [لە پۆلێنبەندییەکاندا] وەک وڵاتێکی مامناوەندی لەقەڵەم دەدرێت و لە دەیەی رابردوودا بە رێژەی گونجاوی لە سەدا ٥ لە رووی ئابوورییەوە گەشەی سەندووە. رەنگە بە بەراورد لەگەڵ پەرەسەندنی لە سەدا ٣ی حەشیمەتیدا ئەم رێژەیە نەتوانێ چارەسەر بێت بەڵام زۆرێک لە وڵاتانیتر دۆخێکی زۆر خراپتر دەژین، بەڵام کۆمەڵ کۆمەڵ لەو پیاوانەیان پەروەردە نەکردووە کە ئامادەن بە فڕۆکە خۆیان بە ئاسماندرە (باڵەخانە) زەبەلاحەکانی مەنهەتەندا بدەن. ئەگەر سەرچاوەی تیرۆر هەژاری بوایە دەبا ئەندامانی ئەلقاعیدە خەڵکی وڵاتانی ئافریقای باشووری بیابان یان باشووری ئاسیا بوایەن نەک رۆژهەڵاتی ناوین.

نایەکسانیش ناتوانێ تاقە هۆکاری تیرۆریزم بێت. پێوەری نرخاندنی داهاتی نایەکسانی وڵاتێک «ئیندێکسی جینی[81]»ی پێ دەڵێن. هەرچی ئەم پێوەرە لە خوارترەوە بێت دۆخەکە باشترە. ئیندێکسی جینی لە بڕێزیلدا ٦٠، بەلجیک ٢٥ و لە میسردا ٢٨/٩یە کە لە هەرهەموو وڵاتانی ئەمریکای لاتین و زۆربەی هەرەزۆری وڵاتانی روو لە گەشە کەمترە. لە راستیدا دابەشکردنی داهات لە میسردا کەمێک لە فەرەنسایش باشترە کە رێژەی ٣٢/٧ نیشان ئەدات. لە سەدا ٦٤ی سەراپای بەرهەمی ناوخۆیی میسر لە دەست لە سەدا ٣٠ی توێژی سەرەوەی میسرییەکاندایە بەڵام لە فەرەنسادا لە سەدا ٦٥ی سەراپای بەرهەمی ناوخۆیی لە دەست لە سەددا ٣٠ی توێژی سەرەوەی فەرەنسییەکاندایە. لەولاوەش لە سەدا ١٤/٢ی سەراپای بەرهەمی ناوخۆیی میسر لە دەست لە سەدا ٣٠ی توێژی خوارەوەی میسرییەکاندایە و لە فەرەنسادا لە سەدا ١٠ی ئەم بەرهەمە لە دەست لە سەدا ٣٠ی توێژی خوارەوەی فەرەنسییەکاندایە.[١١] رەنگە وڵاتانی کەنداو کە ئەم ئامارانە بڵاو ناکەنەوە دۆخێکی نایەکسانتر بژین، ئەڵبەت رەنگە بەقەدەر وڵاتانێکی وەک برازیل و کۆلۆمبیا و نەیجیریا نایەکسان نەبن.

---

81. Gini Index

لە راستیدا رەهەندێکی بەهێزی ئابووری لە قەیرانی وڵاتانی عەرەبدا دەور دەگێڕێ؛ کێشەکە دەوڵەمەندییە نەک هەژاری. لە بەشی دووەمی کتێبەکەدا لەو بابەتە ورد بووینەوە کە چۆناوچۆن ئەو رژێمانەی لە رێگای سەرچاوە سروشتییەکانەوە دەوڵەمەند دەبنەوە قەت گەشە ناسێنن یان شەرعییەت وەرناگرن. دونیای عەرەب نموونەی دیار و بەرچاوی تیۆریی داهاتی ئاسانی هەندێ لە دەوڵەتانە، ئەم بابەتە تەنیا تایبەت بە وڵاتانی گەورەی بەرهەمهێنەری نەوت نییە. بۆ نموونە میسر فرۆشیارێکی بچووک بەڵام گرنگی نەوت و گازە، هەروەها داهاتی میسر لە وەرگرتنی پیتاک لەو کەشتییانەی بە کەناڵی سوێزدا دەپەڕنەوە دوو ملیارد دۆلارە و ئەمریکایشساڵانە ٢/٢ ملیارد دۆلاری‌تر یارمەتیی پێشکەش دەکات. هەروەها پارەیەکی بەرچاو لە رێگای ئەو میسرییانەوە کە لە وڵاتە عەرەبییەکانی کەنداودا کار دەکەن، تێکەڵ بە ئابووریی میسر دەبێت. بەگشتی دەتوانین بڵێین بەشێکی زۆری سەرمایەی بەرهەمی ناخۆیی میسر لە رێگای داهاتی خۆڕایی و باهاوردەوە دەستەبەر دەکرێت. یان با ئاوڕێک لە ئەردەن بدەینەوە کە وڵاتێکی پێشکەوتووە و خەریکی لیبرالیزاسیۆنە. یارمەتیی ساڵانەی ئەمریکا بۆ ئەم وڵاتە یەک ملیارد دۆلارە. رەنگە وا بزانن ئەمە پارەیەکی کەمە، بەڵام بیرتان نەچێ سەرمایەی بەرهەمی ناوخۆیی ئەم وڵاتە تەنیا ١٧ ملیارد دۆلارە، بەم پێیە نزیکەی لە سەدا ٦ی کۆی داهاتی ساڵانەی ئەردەن لە رێگای یارمەتییەکانی تاکە یەک وڵاتی بیانییەوە دەستەبەر دەکرێت.

داهاتی بێزەحمەت مانای کەمبوونی مۆدێرنیزاسیۆنی ئابووری یان سیاسی. ئەگەر دەوڵەت داهاتی باهاوردەی هەبێ پێویستی بە وەرگرتنی پیتاک لە هاووڵاتییان نامێنێ، دیارە هەر دەوڵەتێک پیتاک وەربگرێت پێویستە لە بەرانبەردا هەندێ شتی وەک وەڵامدانەوە، شەفافییەت و تەنانەت [مافی] نوێنەرایەتی بۆ خەڵک دابین بکات.[١٢] مێژوو سەلماندوویەتی دەوڵەتێک کە پێویستی بە وەرگرتنی پیتاکە ناچارە وەڵامدەرتر بێت و نوێنەرایەتیی خەڵک بە ئاستێکی زیاتر قبووڵ بکات. داواکاریی رژێمەکانی رۆژهەڵاتی ناوین لە هاووڵاتییان کەمە و لە بەرانبەردا شتی کەمیشیان پێ دەدەن. یەکێکی‌تر لە ئاسەوارە خراپەکانی داهاتی سەرچاوە سرووشتییەکان بۆ دەوڵەت ئەوەیە کە هێند دەوڵەمەندی دەکاتەوە کە دەیگۆڕێت بۆ دەوڵەتێکی سەرکوتکار، [چونکوو] دەوڵەت هەمیشە پارەی پێویستی بۆ دابینکردنی پۆلیس و ئارتەش هەیە. بۆ وێنە عەرەبستانی سعوودی و عەممان لە سەدا ١٣ی سەرمایەی بەرهەمی ناوخۆییان بۆ کاروباری نیزامی تەرخان کردووە. کوێت لە سەدا ٨ی بۆ ئەم کارە تەرخان کردووە. هەروەها بەپێی نرخاندنە جۆراوجۆرەکان بەر لە شەڕی کەنداو لە نێوان لە سەدا ٢٥ تا ٤٠ی سەرمایەی بەرهەمی ناوخۆیی ئێراق بۆ کاروباری نیزامی تەرخان کرابوو، تەنانەت بە لەبەرچاوگرتنی شەڕی ئێران و ئێراقیش ئەم

ڕیـژەیە هێشـتا هەر زۆرە، ئەڵـبەت هۆکـارێکی دیکەیشـی دەگەڕێـتەوە بـۆ ئەو تـۆڕە هەواڵگـرییە زەبەلاحەی سەدام حسێن و حیزبی بەعس کە بۆ [کۆنترۆڵکردنی] ناوخۆی وڵاتیان دامەزراندبوو.

زۆرێـک لە عەرەبـان بە درێژاییـی چەنـدەها سـاڵ دەیـانوت سـامانی فراوانمـان دەبێـتە هـۆی مۆدێرنبوونەوەمـان. [بـۆ سـەلماندنی ئەمەش] ئاماژەیـان دەدایە حەزی قـووڵی سـعوودییەکان و کوێتییەکـان بـۆ شـتومەکی ڕۆژئـاوایی، لە هەمبێرگێرەکـانی مەکدۆناڵـدەوە بگـرە تـا دەگـاتە کاتژمێرەکـانی ڕۆلـێکس و لیمۆزینەکـانی کـادیلاک[٨٢]. کڕینـی شـتومەکی ڕۆژئـاوایی ئاسـانە بەڵام وەرگرتنی ناوەڕۆکی ناوەکیی کۆمەڵگای مۆدێرن ـ واتە بازاڕی ئازاد، حیزبی سیاسی، وەڵامدانەوە و باڵادەستیی یاسا ـ گەلێ ئەستەم و تەنانەت بـۆ دەسـتەبژێرانی دەسـەڵاتدار مەترسـیدارە. بـۆ وێـنە وڵاتانی کەنداو کە شتومەک و تەنانەت کرێکارەکانیان لە وڵاتانی بیانی وەردەگرن، تەنیا مـۆدێلێکی تەقلیدی و ساختەی مۆدێرنیزاسیۆنیان بەدەست هێناوە. ئەم مۆدێرنیتەیە هیچی هـی خۆیـان نییە؛ ئەگەر بێت و سبەینێ نەوت تەواو بێـت لە بەرانـبەر چەنـد دە سـاڵ بەهرەمەنـدبوون لە سـەرمایە و سامانی گەورەدا شتێکی ئەوتۆیان بۆ پێشکەشکردن پێ نابێت، ئەڵبەت ڕەنگە بەهرەیەکی فراوانیان بۆ حەسانەوە و ئیسراحەتکردن هەبێت.

## فۆبیای بەڕۆژئاواییبوون

نزیکەی دە ساڵ لەمەوپێش بە ڕێکەوت لەگەڵ ڕۆشنبیرێکی بەساڵاچووی عەرەبدا قسەم دەکـرد و بە نـاڕەحەتییەوە باسـم لەوە کـرد کە دەوڵەتـانی ڕۆژهەڵاتـی نـاوین نەیـانتوانیوە وەک وڵاتـانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ئابووری و کۆمەڵگاکەیان لیبرالیزە بـکەنەوە، هەروەهـا ئامـاژەم دایە پێشـکەوتنە ئابوورییە زۆر گەورەکانی ئەو وڵاتـانە و پـێم وت: «ئاوڕێـک لە هۆنگکۆنـگ و سـەنگاپوور و سـیۆل بدەرەوە». ئەو پیاوە کە ڕۆژنامەوانێکی ناسراو و زانا و بەڕێز و ڕۆژئاواگەرا بوو هەستایە سەرپێ و بە گـرژی و تـووڕەییەوە وتـی: «سـەیری ئەوان بـکە، ئەوان تەنیـا لاسـاییی ڕۆژئـاوا دەکەنەوە. شارەکانیان لاساییکردنەوەیەکی ناشیرینی هۆستۆن و دالاسە. ڕەنـگە بـۆ گونـدێکی ماسـیگیری ئەم کارە عەیب نەبێت، بەڵام ئێمە میراتگری یەک لە شارستانییەتە گەورەکانی دونیاین. ئـێمە نـاتوانین ببینە کەلاوە کۆنەی ڕۆژئاوا».

کێشەی سـەرەکیی دونیـای عەرەب هەر ئەم هەسـتی خـۆبەزلزانین و داڕووخـانەیە. ئەم هەسـتە بەر بە بـووژانەوەی ئـابووری دەگرێـت و پێشـکەوتنی سیاسـی گەلـێ سـەخت و دژوار دەکـاتەوە. ئـەمریکا مـۆدێرنیتە بە شـتێکی تەواو بـاش دەزانێـت و تـا ڕادەیەکـی زۆریـش هەر وا بـووە. بەڵام

---

٨٢ . چەند کۆمپانیایەکی ناسراو و گەورەی ڕۆژئاوا. و.ک

مۆدێرنیتە بۆ دونیای عەرەب زنجیرە دۆڕانێکی بەردەوام و یەک لەدوای یەک بووە. هەرهەموو ڕێگاکان ـ سۆسیالیزم، سێکۆلاریزم و ناسیۆنالیزم ـ داخراون و گەشتوونەتە بونبەست. زۆرجار خەڵک ئەپرسن بۆچی وڵاتانی عەرەب سێکۆلاریزم تاقی ناکەنەوە. بەڵام لە ڕاستیدا زۆربەی ئەو وڵاتانە لە زۆرێک لە ساڵانی سەدەی ڕابردوودا دەستیان دایە ئەم کارە. بەڵام سەرنەکەوتن و پەککەوتنی دەوڵەتەکان وای لە خەڵک کردووە ئەم دۆڕانە بە دۆڕانی سێکۆلاریزم و ڕێبازی ڕۆژئاوا لێک بدەنەوە. دونیای عەرەب لە ڕۆژئاوا نائومێد بووە، بەڵام پێویستە لە سەرکردەکانی خۆی نائومێد بێت.

ڕەوتی نوێ و خێرای بەجیهانیبوون[83] کە لە نەوەدەکاندا گەشایەوە، زەبرێکی سەیری لە دونیای عەرەب داوە. کۆمەڵگا عەرەبییەکان تەنیا ئەوەندە کراوەن کە مۆدێرنیتە دەبێتە هۆی لێکترازانیان، بەڵام هێند کراوە نین بتوانن شەپۆلی بەجیهانیبوون بە قازانجی خۆیان بقۆزنەوە. ئەوان سەیری کلیپە تێلەڤیزیۆنییەکان دەکەن، خواردنی حازری دەخۆن و لیمۆناد دەخۆنەوە، بەڵام نەیانتوانیوە لیبرالیزاسیۆنی ڕاستەقینە کە دەبێتە هۆی ڕەخساندنی دەرفەتەکان و کرانەوەی هەرچی زیاتر، لە کۆمەڵگاکەی خۆیاندا بەدی بێنن و ببیننەوە. ئەوان دەرفەت و بزووتنی ئابوورییان نەدیوە، تەنیا شتێک بینیویانە هەمان ئەو دەستەبژێرانە بووە کە هەمیشە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵن. بەجیهانیبوون لە دونیای عەرەبدا هاوشێوەی ئەو کاریکاتێرەیە کە ڕەخنەگران کێشاویانەتەوە ـ تەنیا دونیایەک بەرهەم و کەلوپەلی ڕۆژئاوایی و تابلۆکانی پڕوپاگەندە و، هیچیتر. لای دەستەبژێرانی دونیای عەرەب بەجیهانیبوون مانای شتی زیاتر بۆ کڕین، بەڵام لای هەندێکیتریان دیاردەیەکی مەترسیدارە کە هەڕەشە لە بنەما حەساوەکانی دەسەڵاتیان دەکات.

تێکەڵکردی شەیدابوون و ڕق بەرانبەر بە ڕۆژئاوا ـ بەرانبەر بە مۆدێرنیتە ـ بەتەواوی سەری لە دونیای عەرەب شێواندووە. لاوان کە زۆربەیان لە دایک و باوکیان خوێندەوارترن گوندە سوننەتییەکانیان بە جێ دێڵن و بۆ دۆزینەوەی کار ڕوو لە شارە قەرەباڵغ و پڕحەشیمەتەکانی قاهیرە و دیمەشق و بەیرووت ئەکەن یان بەرەو وڵاتانی خاوەن نەوت کۆچ دەکەن. (سەردەمانێک نزیکەی لە سەدا ١٠ی کۆی حەشیمەتی کارکەری میسر لە وڵاتە عەرەبییەکانی کەنداوا کاریان دەکرد). لەم جیهانە نوێیەدا بە چاوی خۆیان نایەکسانییە قووڵەکانی سەرمایە و ئاسەوارە گومڕاکەرەکانی مۆدێرنیتە دەبینن. ئەوەی زیاتر لە هەموو شتێک دەیانئاڵۆزێنێ دیمەنی ئەو ژنە سەرڕووت و دانەپۆشراوانەیە کە بە شوێنە گشتییەکاندا دەگەڕێن، سواری پاس دەبن، لە ڕیستۆرانەکاندا نان دەخۆن و لە تەنیشت خۆیانەوە کار دەکەن. ئەم لاوانە کە خوازیاری سەروەت و

83. Globalization

سەرمایەی دونیای نوێ و نەریت و رەهاگەری و دڵنیاییی دونیای کۆنن، بەرەورووی پارادۆکسەکانی ژیانی مۆدێرن دەبنەوە.

لە رووی پێکهاتەی حەشیمەتەوە دونیای عەرەب لە سەردەمێکی خراپ و نەگونجاودا گیرۆدەی بەجیهانیبوون بووە. رێژەی حەشیمەتی لاو لە کۆمەڵگا عەرەبەکاندا بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە؛ زیاتر لە نیوەی دانیشتووانی ئەم وڵاتانە تەمەنیان لە ٢٥ساڵ کەمترە. تەمەنی ٧٥ لە سەدی حەشیمەتی عەرەبستان لە ژێر ٣٠ ساڵدایە. بەرزبوونەوەی رێژەی لاوانی بێئۆقرە بۆ هەموو وڵاتێک هەواڵێکی ناخۆشە. نزیک بە هەموو جینایەتەکانی (تاوانەکانی) ناو هەر کۆمەڵگایەک لە لایەن پیاوانی پازدە تا بیستوپێنج ساڵەوە ئەنجام دەدرێت. یەک لە بیرمەندانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان وتوویەتی ئەگەر هەموو لاوان بخەینە بەندیخانەوە رێژەی تاوانە توندوتیژەکان لە سەدا زیاد لە ٩٥ دادەبەزێت. (هەر بۆیە شێوازی هەڵسوکەوتی لاوان لە قوتابخانەکان، زانکۆکان و گەشت و گەڕانەکاندا یەکێکە لە سەرەکیترین کێشە و بابەتەکانی هەموو کۆمەڵگایەکی شارستانی). ئەگەر بەرزبوونەوەی رێژەی حەشیمەتی لاو یەکانگیر بێت لەگەڵ گۆڕانکارییەکی زۆر بچووکی ئابووری و سیاسیدا، دەبێتە هۆی دروستبوونی سیاسەتێکی نارەزایەتییانەی تازە. لە رابردوودا هەر کۆمەڵگایەک هەڵگری ئەم تایبەتمەندییانە بوایە دەبوو بە قوربانیی رێگەچارە و گەلاڵەی شۆڕشگێڕانە. دەقاودەق پێش روودانی شۆڕشی ١٧٨٩ی فەرەنسا، رێژەی حەشیمەتی لاوی ئەم وڵاتە زیادی کردبوو، ئێرانیش پێش شۆڕشی ١٩٧٩ تووشی ئەم کێشەیە ببووبوو. کێشەی بەرزبوونەوەی حەشیمەتی لاو تەنانەت وڵاتە یەکگرتووەکانیشی گرتبۆوە کە لە ١٩٦٨دا گەشتە ئەوپەڕی خۆی، لەم ساڵەدا ئەمریکا گەورەترین نارەزایەتیی کۆمەڵایەتیی لەدوای قەیرانی گەورەوە (١٩٢٩ـ١٩٣٩) بەخۆوە بینی. ئەم کێشەیە لە دونیای عەرەبدا لە دیاردەی ژیانەوەی ئایینیدا رەنگی داوەتەوە.

### بەهێزبوونەوەی ئایین

جەمال عەبدولناسر تا رادەیەک موسوڵمانێکی دەمارگرژ بوو بەڵام باوەڕی بە تێکەڵکردنی ئایین و سیاسەت نەبوو و بە دیاردەیەکی کۆنەپەرستانەی لەقەڵەم دەدا. ئەو حیزبە بچووکە ئیسلامییانەی پشتیوانییان لە ناسرەوە کردبوو کاتێ بەم بابەتەیان زانی گەلێ پەشێو و نارەحەت بوون. گرنگترینیان واتە ئیخوانولموسلیمین، لە سەرەتای پەنجاکانەوە وردە وردە بوو بە نەیارێکی جیدی و کەللەڕەقی ناسر و زۆرجاریش وەک دوژمن لێی دەردەکەوتن. ئەویش لەوپەڕی دڵڕەقیدا کەوتە سەرکوتکردنیان، زیاتر لە هەزار کەس لە ئەندامانی سەرکردایەتیی ئەم حیزبەی دەستگیر

کرد و له ١٩٥٤دا شەشیانی لە سێدارە دا. یەک لەم زیندانییانە پیاوێکی لاواز و خاوەن قەڵەمێکی بەبڕشت بوو بە ناوی سەید قوتب. ئەم پیاوە لە بەندیخانەدا کتێبێکی لە ژێر ناوی *نیشانەکانی ڕێگا*دا نووسی کە لە هەندێ لایەنەوە دەبێ وەک خاڵی دەسپێکی ئیسلامی سیاسیی مۆدێرن، یان ئەوەی زۆرجار بە بونیادگەراییی ئیسلامی ناوی دەبەن، لەقەڵەمی بدەین[٨٤].

لەم کتێبەدا سەید قوتب وێڕای پرۆتێستۆکردنیان، ناسری بە موسوڵمانێکی ناپاک و حکوومەتەکەیی بە حکوومەتێکی نائیسلامی لەقەڵەم دا. لە ڕاستیدا ئەو نزیک بە هەرهەموو ڕژێمە مودێڕنەکانی دونیای عەرەبی بە ڕژێمگەلێکی سەقەت و ناتەواو دەزانی. قوتب داوای کۆمەڵگایەکی باشتر و پاکژتری دەکرد کە لەسەر بنەما ڕەها و بێچەندوچوونەکانی ئیسلام ڕۆ نرابێت کە سەرەکیترین ئامانجی موسوڵمانانی فاناتیک بوو لە ساڵانی ١٨٨٠ بەملاوە.[١٣] ڕژێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەدوای ناسر هەرچی کەمتەرخەمتر و سەرکوتکارتر و بێناوەرۆکتر دەبوونەوە، بونیادگەراکان زیاتر گەشەیان دەسەند و دەکەوتنە بەر سەرنجەوە. بونیادگەرایی بووژایەوە، چونکوو لەم جیهانە شڵەژاو و بگۆڕەدا ئیخوانولموسلیمین و حیزبە هاوشێوەکانی هەوڵیان دەدا لانیکەم واتایەک و ئامانجێک بۆ [ژیانی] خەڵک بدۆزنەوە، بەڵام هیچ سەرکردەیەکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدوای ئەم شتەوە نەبوو. فواد ئەجمی لە گرنگترین کتێبەکەیدا بە ناوی *گێچەڵی عەرەبان*، بە باشترین شێوە لێکترازانی کولتووری سیاسیی عەرەبی شی کردۆتەوە، ئەجمی لەو کتێبەدا دەڵێت: «بانگەشەی بونیادگەرایان دەنگ دەداتەوە، چونکو جەماوەر بانگهێشتی بەشداریکردن دەکەن... ڕێک لە بەرانبەردا کولتوورێکی سیاسی [ی دیکەمان] هەیە کە هاووڵاتییان دادەبەزێنێ بۆ کۆمەڵە بینەرێکی رووت و داوایان لێ دەکات هەموو شتێک بخەنە ژێر رکێفی حاکمانەوە. لە سەردەمێکدا کە داهاتوو لێڵ و نادیارە، بونیادگەرایی خەڵکی گرێدراوی نەزیتێک کردووە کە سەرلێشێواوییان کەم دەکاتەوە...». بونیادگەرایی ئامێرێکی بەهێزی ناڕەزایەتیی پێشکەش بە هەموو ئەو عەرەبانە کردووە کە لە چارەنووسی خۆیان ڕازی نەبوون.

لەم بوارەدا ئیسلام ڕکەبەرێکی ئەوتۆی نەبوو. دونیای عەرەب بیابانێکی وشکەهەڵاتووی سیاسییە، مەملەکەتێکە حیزبی سیاسیی ڕاستەقینەی تێدا نییە، چاپەمەنیی ئازادی نییە و دەرفەتی بیری جیاواز گەلێ بەرکورت و سنووردارە. هەر بۆیە مزگەوت بوو بە شوێنی باسوخواسی

---

٨٤ . لە زۆر لایەنەوە یەکەم بونیادگەرا بیرمەندێکی پاکستانی بوو بە ناوی ئەبووعەلا مەودوودی کە لە هەمان سەردەمی سەید قوتبدا دەژیا. قوتب یەکێک بوو لە موریدان و ستایشکەرانی مەودوودی و کتێبەکانی وەردەگێڕایە سەر زمانی عەرەبی. بەڵام ئێستا لە دونیای ئیسلامدا بەرهەمەکانی سەید قوتب خوێنەری زیاتریان هەیە.

سیاسی. له کۆمەڵگای ئیسلامیدا مزگەوت تەنیا شوێنێکە بەری پێ ناگیرێ، لەم شوێنەدا هەرهەموو رق و دژایەتییەکانی دژ بە حکوومەت لەسەریەک کەڵەکە بوون و پەرەیان سەند. لەم مەملەکەتەدا زمانی ئایین بوو بە زمانی دژایەتیکردنی سیاسی. لە مەیدانی کردەوەدا ئەم جۆرە ئاوێتەکردنەی ئایین و سیاسەت زۆر خێرا کڵپە دەسێنێ. ئایین یان لانیکەم ئایینە ئیبراهیمییەکان (جوولەکە، مەسیحییەت و ئیسلام) جەخت لەسەر بنەما ئەخلاقییە رەهاکان دەکەن. بەڵام سیاسەت مانای رێکەوتن و ئاسانگیری. ئەم تێکەڵکردنە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی روانگەیەکی دڵڕەقانە و تۆتالیتاریانە لە ئاست ژیانی سیاسیدا.

رێکخراوە بونیادگەراکان تەنیا بە قسەکردنەوە نەوەستاون. لە ئیخوانولموسلیمینەوە بگرە تا دەگاتە حەماس و حیزبوڵڵا، هەرهەموویان بە شێوەیەکی ئەکتیڤ و چالاک دەستیان داوەتە بەڕێوەبردنی گەلاڵەی خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی، دەوا و دەرمان، راوێژکاری و نیشتەجێکردنی کاتی. ستایشکەرانی کۆمەڵگای مەدەنی گەلێ پەشێو و دڵگرانن بەوەی کە کۆمەڵگای مەدەنیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئا لەم گروپە نالیبرالانە پێک هاتووە. توێژەرێک بە ناوی شێری بێرمەن، کە لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی فاشیزم لە ئەورووپادا دەکۆڵێتەوە، بەراوردکارییەکی سەرنجڕاکێشی ئەنجام داوە. ئەو دەڵێت:

فاشیستەکان زۆربەی کات لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکاندا زۆر لێهاتوو و سەرکەوتوو بوون. ئەگەر دەوڵەت یان حیزبە سیاسییەکان دابڕووخێن، واتە ئەگەر نەتوانن هەستی شەعییەت یان ئامانج یان خزمەتگوزارییە بنەماییەکان لای خەڵک بوروژێنن، رێکخراوەکانیتر ئەم بۆشاییە پڕ دەکەنەوە. لە وڵاتانی ئیسلامیدا ئایین وەک سەرچاوەیەکی بەردەست و ئامادەی شەرعییەت وایە. هەر بۆیە نابێ سەرمان سووڕ بمێنێ لەوەی کە ئەم تاقمانە لەسەر ئەم بنەمایە پەرەیان سەندووە و بووژاونەتەوە. ئەم فۆرمە تایبەتییە، واتە بونیادگەرایی ئیسلامی، تایبەتە بەم ناوچەیە، بەڵام هۆکارە بنەماییەکەی هاوشێوەی هەمان [هۆکاری] سەرهەڵدانی فاشیزم و نازیسم و تەنانەت پۆپۆلیزمی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە.

ئەگەر سەرهەڵدانی بونیادگەرا ئیسلامییەکان تاقەیەک هۆکاری هەبێت، بێگومان ئەو هۆکارە بریتییە لە شکستی رەها و تەواوی دامەزراوە سیاسییەکانی دونیای عەرەب.

بونیادگەرایی ئیسلامی لە ١٩٧٩دا بووژانەوەیەکی گەورەی بەخۆوە بینی، لەم ساڵەدا شای ئێران کە لایەنگری قورس و قایمی ئەمریکا بوو بە دەستی ئایەتوڵڵا خومەینی رووخێنرا. شۆڕشی ئێران ئەوەی سەلماند کە گروپەکانی نێو کۆمەڵگا دەتوانن تەنانەت لەگەڵ دەسەڵاتدارێکی بەهێزیشدا بەشەڕ بێن. هەروەها ئەوەیشی بۆ روون کردینەوە کە چۆناوچۆن لە وڵاتێکی روو لە

گەشەدا تەنانەت هێزە بەروالەت بێمەترسییەکانی پێشکەوتنیش، وەک فێرکاری و خوێندنی بالا، دەتوانن ببن بە هۆکاری بێشوە و ئانارشی. تاکوو حەفتاکان زۆربەی موسوڵمانانی ڕۆژهەڵاتی ناوین نەخوێنەوار بوون و لە گوندەکان و شارۆچکە بچووکەکاندا دەژیان. ئەوان جۆرە ئیسلامێکی گوندییان بەکار دەهێنا کە لەگەڵ کولتووره لۆکاڵەکان و داواکارییە ئاساییەکانی مرۆڤدا تەبا دەهاتەوە. زۆربەی ئەم گوندییە پلۆرال و ئاسانگیرانە شەخس و ئیمامزادەکانیان دەپەرستی، سەردانی زیارەتگەکانیان دەکرد، سرووده مەزهەبییەکانیان دەوتەوە و ڕێزیان لە هونەر دەگرت، هیچکام لەم شتانە لە یاسای ئیسلامیدا حەڵاڵ نەبوو. بەڵام لە حەفتاکانەوە ئەم کۆمەڵگایانە بوونە کۆمەڵگای شاری و خەڵک بە مەبەستی دۆزینەوەی کار وردەوردە روویان لە شارەکان کرد. ئیدی ئەزموونە دینییەکانیان تەنیا لە شوێنێکی دیاریکراو و کۆمەڵە دابونەریت و ڕێسایەکی لۆکاڵ و خۆماڵییەوە سەرچاوەی نەدەگرت. لە هەمان کاتدا خوێندەواری پەرەی سەند و ئەم خەڵکانە بە نەوەیەکی نوێی نووسەر و وتاربێژ و مامۆستا ئاشنابوون کە ئیسلامێکی تازەیان دەخستە بەردەست. ئەم جۆرە ئیسلامە ئایینێکی فانتازی و دابڕاو بوو کە لە ئەزموونی مێژووییەوە سەرچاوەی نەدەگرت، بەڵکوو ئایینێکی وشک و پاکژخوازانە بوو - واتە ئیسلامی ئایینی لە بەرانبەر ئیسلامی نەریتیدا.

لە ئێراندا ئایەتوڵڵا خومەینی تەکنۆلۆژیایەکی بەهێزی بەکار هێنا: شریتی کاسێت. تەنانەت ئەوکاتەش کە دوور خرابوویەوە بۆ پاریس و لە مەنفادا دەژیا، وتارەکانی لە هەرهەموو ئێراندا بڵاو دەکرایەوە کە تیایدا دژایەتیی لەگەڵ حکوومەتی سەرکوتکاری پاشایەتیدا دەکرد. بەڵام هاوکات خەڵکی فێری جۆرە ئیسلامێک دەکرد کە ڕۆژئاوای بە شەیتان و ئەمریکای بە «شەیتانی گەورە» ناوزەد دەکرد. خومەینی تاقەکەسێک نەبوو کە زمانی ئیسلامی وەک ئامێرێکی سیاسی بەکار دەهێنا. ئەو ڕۆشنبیرانەش کە لە مۆدێرنیزاسیۆنی ناتەواو یان بەپەلە نائومێد بووبوون، دژی «بەڕۆژئاواییبوون» کتێبیان دەنووسی و مرۆڤی مۆدێرنی ئێرانییان - کە کەرتێکی ڕۆژئاوایی بوو و کەرتێکی ڕۆژهەڵاتی - بە مرۆڤی «بێبنەما» لەقەڵەم دەدا. ڕۆشنبیرانی مۆدی ڕۆژیش کە زۆربەیان لە پاریس و لەندەنی هێمن و ئاسوودەدا کتێبیان دەنووسی، سێکۆلاریزم و بەکارهێنانی[85] ئەمریکاییان دەخستە بەر ڕەخنەوە و داکۆکییان لەسەر ئەڵتەرناتیڤێکی ئیسلامی دەکرد. کاتێک ئەم جۆرە تیۆرییانە بە دونیای عەرەبدا بڵاو دەبوونەوە، ئەمە هەژاران و بێبەشان نەبوون کە پێشوازییان لێ دەکرد، لە ڕاستیدا لای ئەوان بەڕۆژئاواییبوون مانای شتێکی سیحری، مانای خواردن و دا و دەرمان. بە پێچەوانەوە ئەم جۆرە تیۆرییانە لە لایەن ئەو خوێندەوارانەوە

---

85. Consumption

پێشوازییان لێ دەکرا کە پـۆل پـۆل نیشـتەجێی شـارەکانی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت دەبـوون یـان لە سەودای دۆزینەوەی کار و [درێژەدانی] خوێندندا ڕێگای ڕۆژئاوایان دەگرتە بەر. ئەمانە سەریان لـێ شێوابوو و حەزیان دەکرد بەو بیرەیان را بهێنن کە تاقە چارەی ئەم سەرلێشـێواوییە پەنـابردنە بـۆ جۆرە ئیسلامێکی نوێ و راستەقینە.

لە دونیای سوننەدا بونیـادگەرایی ئیسـلامی لە دووتـۆیی ئەو واقیـعەدا لە دایـک بـوو و پەرەی سەند کە دەیوت ئایینی ئیسلام بە قووڵی یەکسانخوازە. بە درێژایی مێژوو ئەم بابەتە بۆتە هاندەر و پاڵپێوەنەری ئەو خەڵکانەی هەسـتیان بە لاوازی و کەمهێـزی دەکـرد. بەڵام لە هەمـان کاتـدا بەو واتایەش دێتەوە کە هیچ موسوڵمانێک بـۆی نییە گومـان لە «شایسـتە بـوون»ی موسـوڵمانێکیتر بکات. لە سەدەکانی ناوەڕاست و بەپێی ڕێکەوتنێکی ناڕەسمی مافی داوەریکردن و بڕیاردان لەسـەر ئەم جۆرە بابەتـانە درابـوو بە تـاقمە مەلایەکـی چاکەکـار کە بە «زانایـان» ناسـرابوون.[١٤] بەڵام بیرمەندانی بونیادگەرا، لە مەولانا مەوددودیی پاکستانی و سەید قوتبەوە تا دەگاتە پێڕەوەکانیـان، خـۆ لەم بـابەتە هەڵـدەقورتێنن و بە شـێوەیەکی شـێلگیرانە و بەردەوام لەسـەر ئەوەی کە ئایـا تاکەکان «موسوڵمانانێکی باش»ن یان نە، بڕیار [و فتـوا] دەردەکەن. ئەوان بە کـردەوە تەکفیـری هەر کەسێک دەکەن کە ئیسلامەکەی لە ئیسلامی خۆیان جیاواز بێت. ئەم پرۆسـەیە موسـوڵمانانی تۆقاندووە. سەرکردەکان ناوێرن خۆ لە قەرەی ڕەوتی ڕوولەگەشەی ئیسلامگەرایی بدەن. هەڕەشە و گوشار دەخرێتە سەر ڕۆشنبیران و دەستەبژێرانی کـۆمەڵایەتیش تـاکوو دژ بە مامۆسـتا ئـازادیخوازە راسـتەقینەکان بوەسـتن (ئەمە لە حاڵێکـدایە کە بەگشـتی ئەم ڕۆشـنبیر و دەسـتەبژێرانە لەبەر پاڵپشتیکردنی کوێرانە و ڕەهایان لە ڕێبازی ڕەسمیی دەوڵەت لە کۆمەڵگادا بێبایەخ کەوتوون). هەر بـۆیە موسـوڵمانانی میـانەڕەو نایـانەوێ ڕەخـنە لە رادیکـاڵیزمی بونیادگەراکـان بگـرن یـان پەردەی لەسەر هەڵماڵن. هەندێکیان لەوە دەترسن ئەگەر بێت و بۆچوونی راستەقینەی خۆیان ئاشکرا بکەن گیانیـان بکەوێـتە بەر مەترسـییەوە، هاوشـێوەی ئـاوا دۆخێـک لە ئیرلەنـدای بـاکوور و لە ئاسـت میانەڕەوەکانـدا دەبینـرا. تەنـانەت کەسـایەتییەکی بەڕێـزی وەک نەجیـب مەحفـووزی میسـری کە ڕەخنەیەکی هێمنانەی ئاراستەی ئیسلامگەراکان کردبوو کەوتە بەر هەڕەشـە و لێـدانی فیـزیکییەوە. زۆربەی میانەڕەوەکان بە هەڕەشە بێدەنگ دەکرێن. بۆ خـۆم ئەم گۆڕانکـارییەم لە هێندسـتان، واتە ئەو وڵاتەی تێیدا گەورە بووم، بینیوە. ئیسـلامی دەوڵەمەنـد، ڕەنگاوڕەنـگ، پلـۆراڵی و ئاسـانگیری سـەردەمی لاوێتیـی مـن خەریـکە دەگۆڕدرێـت بـۆ ئـایینێکی وشـک و سـەختگیر و دەمـارگرژ، سەرکردایەتیی ئەم ئایینە کەوتۆتە ژێردەست تیۆکراتە سووک و ترۆکان و دەستووردەرانی چاکەوە.

ئەم بابەتە زیاتر لە هەموو شوێنێک لە وڵاتە پاشایەتییە میانەڕەوەکانی کەنداو و بەتایبەت لە عەرەبستانی سعوودیدا ڕەنگی داوەتەوە. ڕژێمی سعوودی یارییەکی مەترسیداری دەست پێ کردووە: ئەم ڕژێمە ئیجازەی بە توندڕەوترین مەلایانی خۆی داوە بە کەیفی خۆیان تەڕاتێن بکەن، بەڵکوو لە ڕێگای ئەم پێوەندییەوە شەرعییەت وەربگرێت و ڕای گشتی لە باکگراوندی شپرز و شێواوی ئابووری و سیاسیی خۆی دوور بخاتەوە. کۆمەڵە کاربەدەستێکی مەزهەبی بە بیری سەدە ناوەڕاستییەوە، بوونەتە بەرپرسی سیستەمی فێرکاریی عەرەبستان. سعوودییەکان لەم سی ساڵەی ڕابردوو و بە زۆری لە ڕێگای تراستە تایبەتییەکانەوە، لە سەرانسەری جیهاندا قوتابخانە و ناوەندە ئایینییەکانی خۆیان کردۆتەوە، ئەم قوتابخانانە بیری وەهابیگەری بڵاو دەکەنەوە (کە شێوازێکی وشک و تەریککەوتووی ئیسلامە و بۆتە مۆدێل و ڕێڕەوی زۆربەی هەرەزۆری بونیادگەرایانی ئیسلامی). لە سی ساڵی ڕابردوودا بە دەیان هەزار موسوڵمانی نیوەخوێنەوار و دەمارگرژ لەم ناوەندانەدا خوێندوویانە کە بە ڕوانگەیەکی پڕ لە گومان و دوودڵییەوە بیر لە دونیای مۆدێرن دەکەنەوە. لەم دونیابینییەدا ئەمریکا هەمیشە شەیتانێکی تاقانەی تایبەتییە.

پەتای ئەم بونیادگەراییە هەناردەیە[86] تەنیا بە دونیای عەرەبەوە نەوەستاوە و وڵاتانی دیکەیشی داگرتووە. ئەم بونیادگەراییە زۆرجار جۆرە گەلاڵەیەکی سیاسیی دیاریکراوی گەمژانە و کاڵفامانەی عەرەبی پێشکەش [بە وڵاتانیتر] دەکات. بەم شێوەیە موسوڵمانانی ئەندەنۆسیا کە بیست ساڵ لەمەوپێش تەنانەت نەیاندەزانی فەلەستین لەکوێیە، ئێستە بوونەتە لایەنگری توندوتیژی ئامانجەکانی فەلەستین. دونیای عەرەب تەنانەت کاریگەریی لەسەر بەستێنی بیناسازیش داناوە. هەمیشە لە بیناکانی دونیای ئیسلامدا شێوازە عەرەبییەکان تێکەڵ بە شێوازە خۆماڵییەکانی وەک هێندی، ئەندەنۆسیایی و ڕووسی دەکرا، بەڵام لەوڕۆدا لە هەندێ وڵاتی وەک ئەندەنۆسیا و مالیزیادا کولتووره خۆماڵییەکان پشتگوێ دەخرێن، چونکو بە ڕادەی پێویست ئیسلامی (واتە عەرەبی) نین.

بەتایبەت پاکستان ئەزموونێکی تاڵ و ناخۆشی بونیادگەرایی هەناردە ژیاوە. ژەنەراڵ زیائەلحەقی دیکتاتۆری پاکستان، کە لە هەشتاکاندا یازدە ساڵ دەسەڵاتداری ئەم وڵاتە بوو، هەستی دەکرد پێویستە هاوپەیمانێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە، چونکو جیابیرانی سیاسی و حیزبە ئۆپۆزیسیۆنەکانی سەرکوت کردبوو. زیائەلحەق بونیادگەرا خۆماڵییەکانی هەڵبژارد و لە ڕێگای یارمەتیی ماڵی و سەرپەرشتیاریی سعوودییەکانەوە هەژمارێکی زۆر فێرگە و قوتابخانەی ئیسلامیی لە پاکستاندا کردەوە. شەڕی ئەفغانستان بوو بە هۆی ئەوەی دەمارگرژانی مەزهەبی بەرەو ئەم

---

86. Exportation Fundamentalism

فێرگـانە بکشـێن، ئەم کەسـانە دەیانویسـت دژ بە کۆمـۆنیزمی کـافر خەبـات بـکەن. زۆربەی ئەم «جەهـادی»یـانە خەڵکـی عەرەبسـتان بـوون. ئەگەر پـارە و تـاکی سـعوودی نەبـایەن ئێسـتە نە تاڵیبانمان دەدیت و نە پاکسـتان بەم شـێوەیە دەبـوو بە مەڵبەنـدی بونیـادگەرایی. خۆبەسـتنەوەی زیائەلحەق بە ئیسلامەوە جۆرە شەرعییەتێکی پێ بەخشی، بەڵام بوو بە هۆی داڕووخانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی پاکستان. ئەم وڵاتە ئێستە لێوانلێوە لەو توندڕەوە چەکدارانەی سـەرەتا پشـتیوانییان لەتاڵیبـان دەکـرد، پاشـان تەقلـی شـەڕی کەشـمیر بـوون و ئەمێسـتا هەوڵـی لاوازکردنـی ڕژێمـی سـێکۆلاری پەرویـز موشـەڕەف دەدەن[٨٧]. ئەوان سیسـتەمی یاسـایی و سیاسـیی پاکسـتانیان بە ئەندێشـــە سەدەناوەڕاســتییەکانی خۆیــان گیــرۆدە و گــلاو کــردووە، ئەندێشـــەگەلێکی وەک سووکایەتیکردن بە شتە پیرۆزەکان، بندەستبوونی ژنان و حەرامبوونی بانکداریی مۆدێرن.

پاکسـتان نمـوونەیەکی تاقـانە نیـیە. چەنـدەها وڵاتـی جۆراوجـۆر، لە یەمەنەوە تـا دەگـاتە ئەندەنۆسیا و فیلیپین، کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئاوەها پرۆسـەیەکەوە. لە هەشتا و نەوەدەکانـدا عەرەبستان و ئێـران کە مەزهەبیتـرین دەوڵەتەکـانی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتن، لەسـەر ئەوەی کامیـان گەورەترین دەسەڵاتی مەزهەبیی دونیـای ئیسـلام بێـت کەوتـنە نێـو جـۆرە ڕکابەرییـەکەوە. دواجـار ئەوەی سەردەمانێک کۆمەڵە توخمێکی بچووکی ئیسـلامی توندڕەو بـوو و تەنیـا چەنـد نـاوچەیەکی کورتی ڕۆژهەڵاتی ناوینی گرتبۆوە، ئێستا و لە دووتوێی بەجیهانیبوونەوەی ئیسـلامی ڕادیکاڵـدا، ڕۆ چووە بە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا.

## ئیسلام و «ریفۆرمی ئایینی»

تەنانەت ئەگەر کێشەکە لە ڕاستیدا هەڵگەڕێتەوە بـۆ دونیـای عەرەب نەک بـۆ ئیسـلام، دیسـان هەنـدێکەس هەر پێیـان وایە ڕێگاچـارەی ئەم کێشـەیە لای ئیسـلامە. زۆرێـک لە ڕۆژئاواییەکـان و هەندێ لە موسوڵمانان دەڵێن ئەوەی ئیسلام پێویستیەتی جیاکردنەوەی تەواوی دەوڵەت و کلێسایە [ئایین] لە یەکتر، واتە نوسخەیەکی ئیسلامی بـۆ «ریفـۆرمی ئـایینی» تـاکوو چـی لە ڕۆژئـاوا کـرد ئاوەهاش لە موسوڵمانان بکات. ئەو کارە سـیحراوییەی ئەم پرۆسـە مەزنـانە لە دونیـای مەسـیحیدا بەئەنجامیـان گەیانـد، هاوواتـای هەمـان ئەو شـتەیە کە هەنـدێ کەس ناویـان نـاوە «وازهێنـان لە دڵنیایی». ئیدی پۆلێ کەشیش نەیاندەتوانی کۆ ببـنەوە و کـارە شـیاو و نەشـیاوەکان بـۆ خەڵکـی

---

٨٧ . ئەم کتێبە پێش دەست لە کارکێشانەوەی موشەڕەف نووسراوە. و.ک

ئاسایی دیاری بکەن. «ریفۆرمی ئایینی» مانای داڕووخانی سەلاحییەت و دەسەلاتی کەشیشەکان، بەتایبەت پاوانی دەسەلاتی مەسیحییەتی لە پاپا سەندەوە.

بەڵام قەت ئیسلام خاوەن وەها سیستەمێکی هیرارشیکی کەشیشی نەبووە کە هەموان ملکەچی بن و بۆ رزگارکردنی جەماوەر لەدەستی ناچار بە خەباتکردن بین. ئیسلام نە سیستەمی زانایانی ئایینی بووە و نەش هیراشییەتێکی ئایینی، مەزهەبی کاتۆلیک و هەندێ لە تاقمە پرۆتستانەکان ئەم خەسڵەتانەیان هەیە. لە ئیسلامدا مزگەوت تەنیا شوێنێکە بۆ بەندایەتیکردن و وەک کلێسا دامەزراوەیەکی تیۆلۆژیک نییە. زۆرجار تاکە خاڵی جیاوازیی پێشنوێژی زۆربەی نوێژەکانی جەماعەت کە لە تەنیشت نوێژکەرانیترەوە دەوەستێ، ئەوەیە کە باشتر لەوان شارەزای نوێژە. قەت لە ئیسلامدا سەرچاوەیەکی سەرەکیی ئایینیمان نەبووە، هەر بۆیە لە ولاتانی ئیسلامیدا هەمیشە دەوڵەت بەسەر کلێسادا زاڵ بووە، لە ئەورووپادا ئەم دیاردەیە دوای زنجیرە شەڕە مەزهەبییەکان هاتەدی. خەلیفەی موسوڵمانان پێش هەر شتێکیتر پادشا بوو؛ ئەو پاپا نەبوو و مەجبووریش نەبوو ململانێی پاپایەک بکات. ئەو دەیتوانی مزگەوت بکاتەوە و یارمەتیی بیرمەندانی ئایینی بدات، بەڵام سەرچاوەیەکی ئایینی نەبوو. هەر بۆیە زۆر بێمانایە ئەگەر چاوەڕوان بین موسوڵمانان بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەک کە هەرگیزاوهەرگیز لە ئارادا نەبووە پرۆسەیەکی مێژوویی دەرباز بکەن.

لە راستیدا هۆکار و سەرچاوەی سەرەکیی شپرزەیی و سەرلێشێواویی موسوڵمانان دەگەرێتەوە بۆ ئەو حەقیقەتەی کە ئەوان هەرگیز پاپایەکیان نەبووە لە دژی خەبات بکەن. لە دونیای ئیسلامدا (دوای پێغەمبەر) هەمیشە دەسەلاتی زەمینی بەسەر دەسەلاتی ئاسمانیدا زاڵ بووە، هەر بۆیە پرسی جیاکردنەوەی ئەم دووانە لە یەکتر هەرگیز نەکەوتۆتە رۆژەڤەوە. ئەمەش مانای ئەوەی کە هەم دەسەلاتداران و هەم دژبەرانیان دەیانتوانی ئایین بە قازانجی خۆیان بقۆزنەوە. دەسەلاتداران هەمیشە دەیانتوانی کۆمەڵە مەلایەک بۆ پەسندکردنی رەوایی و شەرعییەتی خۆیان بدۆزنەوە و نەیارانیش پێداویستییەکانی خۆیان لای کۆمەڵە مەلایەکیتر دەدۆزییەوە. پاشای سعوودی مەلای تایبەت بە خۆی هەیە و بنلادەنیش مەلای تایبەت بەخۆی.

تاقەیەک نموونەی ئاوارتەمان هەیە کە ئێرانە. لە نەریتی مەزهەبی شیعەدا کە بەسەر ئێراندا زاڵە، زانایانی ئایینی رێکخستنی تایبەت بە خۆیان هەیە. ئەم رێکخستنە دوای شۆڕشەکەی خومەینی پەرەی سەند و ئێستاکە خاوەن هیرارشییەتێکی ئاڵۆزە و سیمایەکی هاوتای پاپای بەسەردا زاڵە. بێرنارد لوییس سەبارەت بەوەی ئەم بابەتە چۆناچۆن دەتوانێت ببێتە هۆی ریفۆرمێکی ئایینی لە ئێراندا، دەڵێت:

وا دیاره خومەینی لە سەردەمی دەسەڵاتداریی خۆیدا دامەزراوە ئیسلامییەکانی ئێرانی بەرەو جۆرە «بەمەسیحیبوون»ێک بردووە، واتە خۆی بۆتە پاپایەکی پاکژ و بێگوناه و زنجیرە پلەیەکیشی پێک هێناوە کە هەڵگری کۆمەڵە فانکشێنێکە هاوتای ئۆسقۆفی مەزن، ئۆسقۆف و کەشیش (لە مەسیحییەتدا) دەکەونەوە. هەموو ئەم شتانە بە نەریتی ئیسلامی نامۆ بوون، هەر بۆیە (دەتوانین بڵێین) «شۆڕشی ئیسلامی» لەسەر واتایەک ڕۆنراوە کە بەتەواوی جیاوازە لەو شتەی کە بە شێوەی ئاسایی وەک میراتی خومەینی ناوزەد دەکرێت... ڕەنگە موسوڵمانان کە گیرۆدەی نەخۆشینێکی مەسیحین، دواجار ڕێگاچارەیەکی مەسیحیش بگرنەبەر، واتە جیاکردنەوەی ئایین و دەوڵەت لە یەکتر.[١٥]

پارادۆکسەکە لەوەدایە کە ڕەنگە تێوکراسیی ئێران [بە ڕاستی] دەرگایەک بەڕووی ڕیفۆرمی زیاتردا بکاتەوە. نامومکین نییە هەمان ئەو وڵاتەی کە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ڕاپێچی بونیادگەراییی ئیسلامی کرد دواجار هەر خۆیشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕزگار بکات. بەڵام ئەمە دیموکراسی نییە کە ئەگەری هەنگاونانی ئێران بەرەو مۆدێرنیتە دەئافرێنێ، دەسەڵات ئاوەها ئیدیعایەک دەکات بەڵام دیموکراسیی ئێران بێئەندازە بەرکورت و داخراوە. کاندیداتۆرەکان پێش هەڵبژاردن لە لایەن تاقمێ لە مەلایانەوە تاوتوێ دەکرێن، چاپەمەنییە ئازادەکان داخراوە و ناڕەزایەتییە خوێندکارییەکان سەرکوت کراوە و بەری پێ گیراوە. هەموو دەسەڵات لەژێر ڕکێفی مەلاکاندایە، لەهەمانکاتدا سەرۆککۆماری هەڵبژێردراو، موحەممەدی خاتەمی، کە فەیلەسوف - مەلایەکی زانا و بلیمەتە، ئاخافتن و بەیاننامەی پڕناوەڕۆک بەڵام بێسوود و بەکەڵکنەهاتوو پێشکەش دەکات. ئەڵبەت دروشمی ڕیفۆرمخوازانە و هەڵبژاردنی خاتەمی لە لایەن زۆرینەیەکی بەرچاوی جەماوەرەوە گرنگ و پڕبایەخە. ئێران لە دووتوێی پرۆسەیەکدا کە ڕیفۆرم و شۆڕش تێکەڵ بە یەکتر دەکات وردە وردە دەگۆڕدرێت بۆ دیموکراسییەکی سێکۆلار. هۆکارەکانی ئەم ئاڵوگۆڕە دیار و ڕوونە: حکوومەت نەیتوانیوە ئابووری بەباشی بەڕێوە ببات، لە ڕووی سیاسییەوە سەختگیرە و بەرەوڕووی [کێشەی] میلیۆنان لاوی بەخۆنامۆ بۆتەوە، لە هەمووی گرنگتر، لە ئێراندا تیۆکراسی فەشەلی هێناوە و ئیسلامگەراکان کارتی براوەیان پێ نەماوە. لە هەموو ناوچەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوین و باکووری ئافریقادا ئیسلامگەرایی ئەڵتەرناتیڤێکی خلەتێنەر و ئەفسانەییە بۆ ئەو واقیعە پڕخەسار و

دڵتەزێنەی خەڵکی تێدا دەژی، لە ئێراندا ئەم واقیعە خودی بونیادگەراییی ئیسلامییە. ئەگەر بێت و مەلاکان جارێکی دیکە روو لە خەڵکی ئێران بکەن، خەڵک وەریاننا‌گرن و پشتیان لێ دەکەن[٨٨].

ئەزموونی ئێران زۆر کەسی والێکردووە بڵێن بۆ لەبایەخکەوتنی ئیسلامگەرایی و لاچوونی پەردەکان، باشتر وایە لە وڵاتانیتری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا ئیسلامگەراکان دەسەڵات بگرنە دەست. بەپێی ئەم بەڵگاندنە پێویستە مەلاکان دەسەڵات بگرنە دەست، چونکو دەبن بە هۆکاری رووداني نارەزایەتی و یاخیبوون، رەنگە ئەم کارە تەنانەت ببێتە هۆی «ریفۆرمی ئایینی»ی ئیسلامی و دواجار دیموکراسییەکی راستەقینە بەرهەم بهێنێ. بەڵام ئەم بەڵگاندنە هەڵەیەکی تێدایە؛ ئەزموونی تایبەتیی ئێرانی شیعە گشتێنراوە بەسەر کۆی دونیای ئیسلامی سوننەدا. جیا لەمە لە بیستوپێج ساڵی رابردوودا ئێران دۆخێکی گەلێ دژوار ژیاوە، کولتووری ئێرانی کە سەردەمانێک کولتوورێکی گەشاوە و زیندوو بوو دامرکاوەتەوە و ئابووریی ئەو وڵاتە پێبەپێی ستانداردی ژیان دابەزیوە. ئەمە رێگەچارەیەکی راستەقینە نییە کە بڵێین با وڵاتانیتر لە کارەساتەوە بگلێن بەشکوو ئەگەر هات و خۆشبەخت بوون دواجار نەجاتیان بێت.

لە راستیدا بونیادگەرا ئیسلامییەکان لە هەرکوێدا تێکەڵ بە سیاسەتی رۆژانە بووبێتن - بەنگلادێش، پاکستان، تورکیا و ئێران - شکۆ و دەسەڵاتیان رووی لە کزی داوە. ئەوان هەمیشە کەمتر لە حیزبە سیاسییە سوننەتییەکان دەنگیان پێ دەدرێت. خەڵک گەشتوونەتە ئەو قەناعەتەی کە لەهەرحاڵدا پێویستە شەقامەکان پاک بکرێنەوە، سەرپەرشتیی کاروباری دارایی دەوڵەت بکرێت و سیستەمی فێرکاری بەهەند وەربگیرێ. مەلاکان دەتوانن وتار بخوێننەوە و ئامۆژگاریی خەڵک بکەن بەڵام ناتوانن حکوومەت بەڕێوە بەرن. بەڵام ئەمە بەڵگەیەک نییە بۆ ئەوەی مەترسیی گۆڕینی حکوومەت لە میسر و عەرەبستاندا قبووڵ بکەین، ئاوەها گۆڕانکارییەک ئەو وڵاتانە تووشی ئاژاوەیەکی بیست ساڵە دەکات. ئەگەر ئەم حکوومەتانە تەنیا تۆسقاڵێک فەزای سیاسیی بکەنەوە

---

٨٨ . دوای چوار ساڵ سەرۆکایەتیی سەرۆککۆمارێکی پۆپۆلیست (مەحموود ئەحمەدینژاد) و پاشەکشەی بەرچاوی ئابووری و سیاسیی کۆمەڵگای ئێرانی، هەڵبژاردنەکانی خولی دەیەمی سەرۆککۆماری (بەهاری ٢٠٠٩) بوو بە مایەی سەرهەڵدانی زنجیرە رێپێوانێکی گەورە بۆ نارەزایی دەربڕین بەرانبەر بە ساختەکاریی مەزنی دەوڵەت لە هەڵبژاردندا. ئەم نارەزایەتییانە کە تاران و هەرهەموو ئێرانی گرتەوە بە «بزاڤی سەوز» ناوبانگی دەرکردووە و بە دەیان کوژراوی پێشکەش کردووە و تا ئێستایش هەر بەردەوامە. وەک چۆن فەرید زەکەریا پێشبینیی کردبوو داخوازیی سەرەکیی نارازییان دامەزراندنی حکوومەتێکی سێکۆلار و غەیرە دینییە کە لە دروشمەکاندا بە ئاشکرا رەنگی داوەتەوە. ئێستا ئەگەری سێکۆلاریزاسیۆنی ئێران گەلێ زیاترە لە سەردەمی نووسینی ئەم کتێبە. و.ک

و دژبەرە بونیادگەراکانیـان مەجبـوور بـکەن لەبـاتیی خەون و خەیـاڵی رووت تـێکەڵ بە واقیعـی پراتیکی بن، ئەوسا سیحری ئەم توندڕەوانە زۆر خێرا پـووچەڵ دەبێـتەوە. ئەڵـبەت قەت ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە دیموکراسـی بە شـەوێک دەسـتەبەر دەکرێت. بەڵام بۆ وێنە میسـر دەرفەتـی ریفـۆرمی سیاسـیی گەورە و بەرچـاوی هەیە. داهـاتی سـەرانەی سـاڵانەی ئەم وڵاتە ٤٠٠٠ دۆلارە کە دەکەوێـتە نێـو رووبەری دەسـتەبەرکردنی دیموکراسـییەوە. میسـر خـاوەن چینـی مامناوەنـدی و کۆمەڵگای مەدەنیی پێشکەوتووە. بەڵام سەرەڕای ئەوەی پەرلەمانی ئەو وڵاتە هـیچ دەسەڵاتێکیشـی نییە، دەوڵەت ئیجازە بە ئیسلامگەراکان نادات لە پرۆسەی هەڵبژاردنی پەرلەماندا بەشـداری بـکەن. بەرنگـاربوونەوەی نەیـارە سیاسـییەکانی حکـوومەت، چ لیبـرال و چ ئیسـلامی، بە قـازانجی تونـدڕەوەکان شـکاوەتەوە. ئەو حکـوومەتە دەگـمەنە عەرەبییـانەی وەک ئەردەن و مەراکـێش کە رێگـایەکی دیکەیـان تـاقی کـردۆتەوە ـ واتە رێـگەدان بە کەمەکێـک بیـری جیـاواز لە نێـو خـودی سیسـتەمدا ـ گەلـێ باشـتر هەڵسـووڕاون. ئەگەر وڵاتـان[ی نـاوچە] هەوڵـی بەشـداریکردنی هەرچـی زیاتری بونیادگەراکان لە حکوومەتدا بدەن، ئیدی خەڵک وەک قارەمانانی ئەفسانەییان وێنا ناکەن و دەگۆڕدرێن بۆ سیاسەتمەدارانی خۆماڵی.

کەوابوو ریفـۆرمی ئـایینی رێگاچـارە نییە، بەڵـکوو کێشـەکان بە ریفـۆرمی سیاسـی و ئـابووری چارەسەر دەکرێن. لەخۆڕا ئەو هەمووە جەخت لەسەر گۆڕینی ئیسلام دەکرێت. هۆکـاری سـەرەکیی خۆگونجانـدنی مەسـیحییەت لەگەڵ مـۆدێرنیتەدا قبـووڵکردنی کتـوپڕی راڤەکـارییە لیبرالییەکـان بـۆ تیۆلۆژی لە لایەن کلێساوە نەبوو، بەڵـکوو مۆدێرنیزاسـیۆنی کۆمەڵـگا بـوو، بەشـێوەیەک کە کلێسـا ناچار بوو خۆی لەگەڵ دونیای دەورووبەریدا بگونجێنێ. بیرمان نەچـێ زۆرێـک لە دەمـارگرژییە دژە مۆدێرنەکانی ئیسلام لە مەسیحییەتیشدا هەیە. شەرمەزارکردنی ریبا و قومار، حەڵاڵ و حەرامبـوونی خواردەمەنییەکـان و واجببـوونی رۆژوو، هاوشـێوەی دەسـتوورەکانی کتێبـی پیـرۆزە. بەڵام کۆمەڵگاکانی مەسـیحییان لە رووی سیاسـی و ئـابووری و کـۆمەڵایەتییەوە مـۆدێرنیزە کـراون و لەم پرۆسـەیەدا ئەوان ئایینەکەیشـیان لەگەڵ مـۆدێرنیتەدا گونجانـدووە. لەمـڕۆی رۆژئـاوادا ئـایین سەرچاوەیەکە بۆ ورووژاندنی رۆحی نەک مۆدێلێک بۆ ژیانی رۆژانە. کتێبی پیرۆز هێشتا دەسپەڕ و ریبا و لەبەرکردنی جلوبەرگی دووراو بە نـاڕەوا دەزانێـت، بەڵام کۆمەڵـگای مەسـیحی ئیـدی کتێبـی پیرۆز لەم پرسانەدا بە سەرچاوە و بەرپرسیار نازانێت.

لە وەڵامی ئەوانەدا کە دەڵێن ئیسلام جیاوازە تەنیا دەڵێم راستە. بەڵام ئایا ئەوەنـدە جیـاوازە کە ئەگەر بکەوێـتە نـاو کۆمەڵـگایەکی پێشـکەوتووی کاپیتاڵیسـت و دیمـوکراتیکەوە دیسـان هەر گـۆڕانی بەسـەردا نـایەت؟ دیسـان ئەگەر واز لە تیـۆری بهێنـین و سـەیری واقیـع بکەیـن هەنـدێ

بەڵگەمان دەست دەکەوێت. لە تورکیا، بۆسنی، مالیزی و بە رادەیەکی کەمتر لە باشووری ئاسیا، کۆمەڵگا ئیسلامییەکان کەم تا زۆر مۆدێرنن. رەنگە لەمەش گرنگتر ئەو راستییە بێت کە لە وڵاتە یەکگرتووەکان و کەنەدا و ئەورووپادا کۆمەڵگای گەورەی موسوڵمان دەژین. لە هەموو ئەم شوێنانەدا بەبێ ئەوەی «ریفۆرمێکی ئایینی»ی گەورە رووی دابێت ئیسلام خۆی لەگەڵ ژیانی مۆدێرندا گونجاندووە. لە هەموو ئەم وڵاتانەدا زۆربەی ئیمانداران - ئەڵبەت نەک هەموویان - هەندێ رێگایان دۆزیوەتەوە بۆ ئیمانداربوون بەبێ بیرتەسکی و، چاکەکاری بەبێ توورەیی و شەڕانگێزی. ئەو کۆمەڵە باسوخواسەی لە بەشەکانی پێشوودا سەبارەت بە رێگا جۆراوجۆرەکانی دەستەبەرکردنی مۆدێرنیتە پێشکەش کرا - پرۆتستان، کاتۆلیک، ئۆرتۆدۆکس، کۆنفۆسیۆسی، لاتین - هەڵگری وانەیەکە: بەرێوەبردنی باش و گونجاوی سیاسەت و ئابووری، کولتووریش دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە و کولتووریش هەمان هێڵ دەگرێتەبەر.

## رێگای دیموکراسی

پێویستە زیاترین رێژەی ئەرکی ریفۆرم لە رۆژهەڵاتی ناویندا بخرێتە ئەستۆی خودی نەتەوەکانی ئەم ناوچەیەوە. کەس ناتوانێ بەبێ گەڕان و تێکۆشان و سەرکەوتنی گەلانی ناوچەکە دیموکراسی، لیبرالیزم یان سێکۆلاریزم لەم کۆمەڵگایانەدا سەقامگیر بکات. ئەڵبەت رۆژئاوا و بەتایبەت ئەمریکا دەتوانن یارمەتیدەرێکی گەورە بن. وڵاتە یەکگرتووەکان دەسەڵاتی زاڵی رۆژهەڵاتی ناوینە؛ هەموو وڵاتانی ناوچەکە پێوەندییەکانی نێوان خۆیان و واشینگتۆن بە ژیانبەخشترین پێوەندییان لەقەڵەم دەدەن. [کۆمەڵە هۆکارێکی وەک] نەوت، پێوەندییە ستراتیژیکەکان و پێوەندیی تاقانە و تایبەتیی نێوان ئەمریکا و ئیسراییل وایان کردووە دەستێوەردانی ئەمریکا مسۆگەر و حاشاهەڵنەگر بێت. واشینگتۆن یارمەتییەکانی خۆی بۆ حکوومەتی میسر، پارێزگاریکردن لە رژێمی پاشایەتیی عەرەبستان و سەرپەرشتیکردنی وتووێژەکانی نێوان ئیسراییل و فەلەستینییەکان درێژە پێ دەدات. لە راستیدا ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ کە ئایا نابێ لە باتیی ئەم خزمەتگوزارییانە داوای شتێکیان لێ بکات؟[89] گوشار نەخستنە سەر ئەم رژێمانە مانای ئەوەی کە ئەمریکا بە زانابوون بڕیاری داوە هەموو شتێک وەک خۆی بمێنێتەوە - واتە سەقامگیری لە هەموو شتێک گرنگترە. ئەمە ئامانجێکی پڕبایەخە، بیرمان نەچێ دۆخی هەنووکەی رۆژهەڵاتی ناوین گەلێ شێواو و بێسەقامە. تەنانەت لە روانگەی ستراتیژیکیشەوە

---

٨٩ . ئەڵبەت ئەمریکا شتی فراوانی بەدەست هێناوە کە گرنگترینیان زاڵبوونە بەسەر سەرچاوەی وزەی جیهاندا. و.ف

بەرژەوەنـدیی خێـرای ئاسایشـی ئـەمریکا دەخوازێـت ئەو وڵاتە جۆرێـک بجـووڵێتەوە رژێمەکـانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەمتر بەرهەمهێنەری بزاڤە رادیکاڵ و تیرۆریستییەکان بن.

پێویستە ڕۆژئـاوا پـێش هەمووشـتێک بەو قەنـاعەتە بگـات کە لانـیکەم ئێسـتا نەکەوێتە دوای سـەقامگیرکردنی دیموکراسـی لە ڕۆژهەڵاتـی ناوینـدا. ئـێمە خوازیـاری سـەقامگیرکردنی لیبرالیزمـی یاسـاخوازین کە شـتێکی تەواو جیـاوازە. لە راسـتیدا ئەگەر ئامـانجە خێراکانمـان روون بکەیـنەوە بێگومان ئاسانتر دەتوانین دەستەبەریان بکەین. رژێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین گەلـێ خۆشـحاڵ دەبـن ئەگەر بزانن مەجبووریان ناکەین هەر سبەینێ هەڵبژاردن بەڕێوە بەرن. ئەوان کەمتر خۆشحاڵ دەبن ئەگەر بـزانن بەردەوام بـۆ بـابەتە جۆراوجۆرەکـانیتر گوشـاریان دەخەیـنە سـەر. پێویسـتە رژێمـی سعوودی بۆ کوتاییهێنان بە پشـتیوانییە دەوڵەتـی و نادەوڵەتییەکـانی خـۆی لە ئیسـلامی تونـدڕەو هەوڵێکی زیاتر بخاتەگەڕ، ئەم دیاردەیە ئێسـتە دووەم هەنـاردەی گەورەی ئەو وڵاتەیە بـۆ جیهـان. ئەگەر بێت و داکۆکیکەرانی [تیۆریی] ئازادیی رەهای رادەربڕین بەم کـارە قەڵـس بـن، نـابێ لامـان گرنگ بێت. پێویستە ئەوان سەرکردە مەزهەبی و فێرکارییەکانی خۆیان هەوسـار بـکەن و ناچاریـان بکەن واز لە یاریکردن بە توندڕەوی بهێنن. لە میسـردا پێویسـتە داوا لە حوسـنی موبـارەک بکەیـن نەهێڵی چاپەمەنییە دەوڵەتییەکان چیدی هاشەوهووشەی دژە ئەمریکا و دژە جوولەکە بڵاو بکەنەوە و داخوازییەکـانیتری وڵات بـخەنە ڕۆژەڤەوە. هەنـدێ لەم داخوازییـانە خراپتـر دەبـن لەو شـتانەی ئێستە دەیانبیسین و هەندێکیشیان باشتر دەبن. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە خەڵکی ئەم وڵاتانە بەرەبەرە لەو بابەتانە دەدوێن و دەکۆڵنەوە کە بەراستی پێوەندیی بەخۆیانەوە هەیە - ئیـدی تەنیـا بارودۆخی ئۆرشەلیم و سیاسەتەکانی ئەمریکا لە کەنداودا [نابێتە کەڵـکەڵەی مێشـکیان] بەڵـکوو لە رژێمەکانی خۆشیان و سیاسەتەکانیان دەفکرن.

ئیسـراییل بـۆتە بیـانوویەکی گەورە بـۆ بەشـێکی گەورەی دونیـای عەرەب، حکوومەتەکـان بە کەڵکوەرگرتن لەم بیانووە رای گشتی لە لاوازی و لێنەهاتوویی خۆیـان دوور دەخەنەوە. وڵاتـانێکی دیکەشـمان هەیە کە لە سیاسـەتی دەرەوەیانـدا دژایەتـی و ناتەباییـان هەیە، وەک چـین و ژاپـۆن، بەڵام کێشەکانیان وەک کێشەی نێـوان ئیسـراییل و عەرەب بەم رادەیە ریاکـارانە و ژەهـراوی نیـیە. خەباتی دژ بە داگیرکردنـی لێـواری ڕۆژئـاوا و هێڵـی غەزە بە دەسـتی ئیسـراییل، بـۆتە ئامـانجێکی گەورەی دونیـای عەرەب. بەڵام ئەم ئامـانجە ئێسـتە بـۆتە واقیعێکـی حاشـاهەڵنەگر و نـاتوانین پشـتگوێی بخەیـن، ئەڵـبەت دەسـەڵاتدارانی بیـانووگری عەرەبـیش پەرەی پـێ دەدەن. کەنـاڵی ئەلجەزیـرە و چـاتڕوومە ئینتەرنێتییەکـان رێگـایەکی تـازەی پێوەنـدییان لە ڕۆژهەڵاتـی ناوینـدا کردۆتەوە کە سەرجەم باسوخواسی نێو ئەم کەنـاڵانە باسوخواسـی چارەڕەشـیی فەلەسـتینییەکانە.

ئەگەر ئەم بابەتە پشتگوێ بخرێت بێگومان رۆژ لەدوای رۆژ گرنگایەتییەکی زیاتر پەیدا دەکات و پێوەندییەکانی ئەمریکا لەگەڵ سەرجەم جیهانی ئیسلامیدا دەئاڵۆزێنێ و بەدڵنیاییەوە ئاسایشی ئیسراییل دوچاری مەترسییەکی هەمیشەیی و نەبڕاوە دەکات. پێویستە ئەمریکا درێژە بە پشتیوانیکردنی پێداگرانەی لە ئاسایشی ئیسراییل بدات. بەڵام لە هەمان کاتدا پێویستە هەڵسوکەوتی بەجۆرێک بێت کە زیاترین قازانجی بۆ هەر سێ لایەنی ئەمریکا و ئیسراییل و فەلەستینییەکان بەدواوە بێت. واتە بەتوندی لەسەر رێکەوتنی دوولایەنە بوەستێت، دەبێ ئەم رێکەوتنە ئاسایشی ئیسراییل و وڵاتێکی سەقامگرتوو بۆ فەلەستینییەکان بەدی بێنێ. ئاشتیی نێوان ئیسراییل و فەلەستینییەکان کێشەی سەرلێشێواوی و شپرزەیی دونیای عەرەب چارەسەر ناکات، بەڵام هەندێ لە ململانێ توندوتیژەکانی نێوان ئەوان و رۆژئاوا دەسڕێتەوە.

رێگاچارەی پتەوتر و درێژەدارتر ئەنجامدانی ریفۆرمە سیاسی و ئابوورییەکانە. ریفۆرمی ئابووری بنەمایە و پێویستە بکەوێتە ئەولەوییەتەوە. هەرچەند کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوین تەنیا کێشەی ئابووری نییە، بەڵام رەنگە لە رێگای ئابوورییەوە چارەسەر بکرێن. هەروەها کە ئاماژەمان پێکرد دڵنیاترین رێگا بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی بچووک و وەڵامدەر و هەروەها [دروستکردنی] چینێکی مامناوەندیی راستەقینە، هەنگاونانە بەرەو سەرمایەداری. ریفۆرمی ئابووری دەشێت هاوشێوەی ئیسپانیا، پورتەگاڵ، شیلی، تایوان، کۆریای باکوور و مەکسیک، لە رۆژهەڵاتی ناوینیشدا ئاسەواری سیاسیی لێ بکەوێتەوە. ریفۆرمی ئابووری مانای دەسپێکێک بۆ باڵادەستیی راستەقینەی یاسا (سەرمایەداری پێویستی بە پەیمان و رێکەوتنە)، مانای کرانەوە بەرووی جیهاندا، لەبەردەستدابوونی زانیاری و رەنگە لە هەمووی گرنگتر پەرەسەندنی چینێکی خاوەن کار و پیشە. ئەگەر لەگەڵ چینی خاوەن کار و پیشەی دونیای عەرەبدا بدوێن تێدەگەن ئەوان خوازیاری گۆڕینی سیستەمی کۆنن. قازانجی ئەوان لە کرانەوە، یاسا و رێسا و سەقامگرتندایە. ئەوان دەخوازن کۆمەڵگاکەیان لە باتیی قەتیسمان لە دەستەبازی و شەڕدا بەرەو مۆدێرنیزاسیۆن و پێشکەوتن هەنگاو هەڵبگرێ. ئەوان دوای وەهمی ئایدیۆلۆژیا ناکەون بەڵکوو خوازیاری واقیعی پێشکەوتنی مادین. ئەوانەی یەکسەر لە خەون و خولیای سیاسیدا خنکاون لە هەنووکەی رۆژهەڵاتی ناویندا بێشومارن، لە بەرانبەردا کەمتر کەسێکمان هەیە دوای پرۆژە کرداری و پراتیکییەکان کەوتبێ. وەک چۆن وینستۆن چێرچیل سەبارەت بە ناوچەی باڵکان وتوویەتی، ئەم بابەتە بۆتە هۆی ئەوەی رۆژهەڵاتی ناوین زیاتر بەرهەمهێنەری مێژوو بێت تا بەکارهێنەری مێژوو.

ئەڵبەت لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا چینێکی زاڵی مامەڵەچیمان هەیە، بەڵام زیاتر بە ڕێگای نەوت یان پێوەندیی لەگەڵ بنەماڵەی پاشایەتیدا ئەو پلە و پێگەیان بە دەست هێناوە[٩٠]. سەرمایەی ئەم چینە سەرمایەیەکی فیۆدالیستییە نەک کاپیتاڵیستی، هەر بۆیە کاریگەرییە سیاسییەکانیشی هەر لە فۆرمی فیۆدالیدا دەمێنێتەوە. گرنگترین هێزی هاوبەش بۆ گۆڕینی ڕۆژهەڵاتی ناوین و ڕاکێشانی هەموو هێزەکانیتر بەدوای خۆیدا، چینێکی ڕاستەقینەی بازرگانانی کارداهێنە. ئەگەر کولتوور گرنگ بێت بێگومان ڕۆژهەڵاتی ناوین تاقە ناوچەیەکە کولتوور یارمەتیی دەدات. بەدرێژاییی هەزاران ساڵ کولتووری عەرەبی پڕ بووە لە کاسبکاران و بازرگانان و مامەڵەچییان. ڕەنگە بازاڕ کۆنترین دامەزراوەی ڕۆژهەڵاتی ناوین بێت. ئیسلامیش بەدرێژاییی مێژوو پێشوازییەکی گەرمی لە بازرگانی کردووە و پێغەمبەری ئیسلام بۆ خۆی بازرگان بوو. دواجار پێویستە بڵێین خەباتکردن لەپێناو ریفۆرم و چاکسازیدا تاقە خەباتێکە دەبێ خودی خەڵکی ئەم ناوچە بەڕێوەی بەن. هەربۆیە پێویستە لەم کۆمەڵگایانەدا هەندێ گرووپمان هەبێ کە هەم خوازیاری ریفۆرمی سیاسی و ئابووری بن و هەم قازانج و بەرژەوەندییان لەم ریفۆرمانەدا بێت.

ڕەنگە لە ڕوانینی یەکەمدا ئەم ئەندێشەیە وەک شتێکی خەیاڵی بکەوێتە بەرچاو، بەڵام وا نییە. هەر ئێستا لە هەندێ ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا وردەبرووسکەی چالاکیی ڕاستەقینەی ئابووری هەڵگیرساوە. ئەردەن بۆتە ئەندامی ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی[٩١]، ڕێکەوتننامەیەکی بازرگانیی ئازادی لەگەڵ ئەمریکادا ئیمزا کردووە، پیشەسازییە سەرەکییەکانی سپاردۆتە دەست کەرتی تایبەت و تەنانەت دەیەوێ گۆڕینەوەی پڕ لە مەترسی و ریسکی بازرگانیی سنووری لەگەڵ ئیسراییلدا ئەنجام بدات. عەرەبستان داوای ئەندامێتیی لە ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانیدا کردووە. ڕەوتی ریفۆرمەکانی میسر کەمەکێک پێش کەوتووە. لە ناو وڵاتانی نەوتیدا بەحرەین و ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی هەوڵیان داوە کۆتایی بەم وابەستەبوونە بە نەوت بهێنن. دوبەی کە بەشێکە لە ئیمارات هەر ئێستا ڕێژەی داهاتی نەوتی لە سەراپای بەرهەمی ناوخۆییدا دابەزاندووە بۆ لە سەدا ٨ و ڕایگەیاندووە دەیەوێ ببێتە سەنتەرێکی بانکی و بازرگانی - واتە «سەنگاپووری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست» (جێی خۆیەتی ئاسانگیریی سەنگاپوور کە وڵاتێکی پڕ لە کەمایەتیی ئەتنیکی و مەزهەبییە بکاتە سەرچەشنێک بۆخۆی). تەنانەت عەرەبستانی سعوودیش پەی بەو حەقیقەتە بردووە کە ئابووریی نەوتیی ئەم وڵاتە بۆ هەر سێ لاوی سعوودی کە تێکەڵ بە بازاڕی کار دەبن،

---

٩٠. لەم بارەیەوە چەند نموونەیەکی ئاوارتەمان لە وڵاتانی کەنداودا هەیە، بۆ وێنە دوبەی، بەحرەین و تەنانەت عەرەبستانی سعوودی.

91. WTO: world trade organization

تەنیا دەتوانێ یەک دەرفەتی کار بەرهەم بێنێ. سەرکۆماری ئەلجەزایەر، عەبدولعەزیز بووتەفلیقە، بۆ سازدانەوەی ئابووریی داڕووخاو و دڵتەزێنی وڵاتەکەی بەگەرمی پێشوازی لە سەرمایەگوزاریی بیانی دەکات.

ئەگەر بمانەوێ تاقەیەک وڵات هەڵبژێرین و بۆ ریفۆرمیزاسیۆن گوشارێکی توندی بخەینە سەر، بێگومان دەبێ میسر هەڵبژێرین. هەرچەند پادشای ئەردەن مرۆڤێکی پێشکەوتووترە و عەربستانی سعوودی لەبەر نەوتەکەی رۆڵێکی گرنگتری هەیە، بەڵام میسر سەنتەری رۆشنبیریی دونیای عەرەبە. ئەگەر میسر پێشکەوتنی ئابووری و سیاسی بەخۆوە ببینێ ئەم بابەتە زیاتر لە هەر وتار و نووسراوەیەک دەیسەلمێنێ کە ئیسلام لەتەک مۆدێرنیتەدا تەبا دێتەوە و عەرەب دەتوانێ لە دونیای ئەمڕۆدا بەختەوەر بژی. لە رۆژهەڵاتی ئاسیادا سەرکەوتنی ئابووریی ژاپۆن بۆتە سەرچەشنێکی بەهێز بۆ وڵاتانی دیکەی ئەو ناوچەیەش و ئەوانیش هەمان رێچکەی ژاپۆنیان گرتە بەر. دەبێ لە رۆژهەڵاتی ناوینیشدا نموونەیەکی سەرکەوتوو سەرهەڵبدات.

رەنگە وڵاتێکی دیکەیش بتوانێت ئەم رۆڵە بگرێتە ئەستۆ: ئێراق. ئێراق بەرلەوەی ببێتە گاڵتەجاڕی خۆبەزلزانینی سەدام، یەکێک بوو لە پێشکەوتووترین، خوێندەوارترین و سێکۆلارترین وڵاتانی ئەم ناوچەیە. ئەم وڵاتە نەوتی هەیە بەڵام لە نەوت گرنگتر ئاوی هەیە. ئێراق مەڵبەندی یەک لە کۆنترین شارستانییەتە چۆمی ـ دەربەندییەکانی جیهانە. پایتەختی ئێراق واتە بەغداد، مەڵبەندی یەک لە حەوت دیاردە سەیرەکانی جیهانە، واتە باخە هەڵواسراوەکانی بابل، ئەم شارە بەدرێژاییی هەزاران ساڵ شارێکی گرنگ بووە. ئێراقی دەیەی ١٩٥٠ کۆمەڵگایەکی مەدەنیی زۆر پێشکەوتووی هەبوو کە تەژی بوو لە ئەندازیاران، پزیشکان و بیناسازان کە هەژمارێکی زۆریان ژن بوون. ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان رژێمی سەدام بڕووخێنێ و ـ لەوەش گرنگتر ـ دەست بداتە پرۆژەیەکی درێژخایەن و جیدیی وڵاتسازی، بێگومان ئەم وڵاتە دەتوانێ ببێتە یەکەم وڵاتی گرنگی عەرەب کە کولتووری عەرەبی تێکەڵ بە ئاسانگیریی مەزهەبی، سیاسەتی لیبرالی و تێڕوانینی مۆدێرن بۆ جیهان دەکات، پاشان ئەم سەرکەوتنە وەک پەتایەک وڵاتانی دیکەیش دەگرێتەوە[٩٢].

تۆماس ئۆنیل، سیاسەتمەداری لێهاتوو و سەرۆکی پێشووی کۆنگرێسی ئەمریکا، جارێکیان وتی سیاسەت هەمووی خۆماڵییە. سیاسەتی تووڕەییش هەروایە. نائومێدبوونی خەڵکی ئاساییی عەرەب هەڵناگەڕێتەوە بۆ پێکدادانی شارستانییەتەکان یا سەرهەڵدانی مەکدۆناڵد یان هێژمۆنیکبوونی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، بەڵکوو دژکردەوەیەکە لەئاست ژیانکردن لەژێر دەسەڵاتی ئەو رژێمە

---

٩٢ . ئەم کتێبە پێش ٢٠٠٣ و هێرشی ئەمریکا بۆ ئێراق نووسراوە. و.ک

سەرکوتکار و زەبوونانەدا کە مافی رادەربڕینی سیاسییان قەدەغە کردووە. ئەوان ئەمریکا بە خەتابار دەزانن، چونکو پشتیوانی لەم رژێمانە دەکات.

ئەوانەی پێیان وایە ئەم کێشەیە تایبەتە بە دونیای عەرەب یان عەرەب هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت، بیریان نەچێ بیست و پێنج ساڵ لەمەوپێش دوژمنکارانەترین نارەزایەتی و ڕێپێوانەکانی دژ بە ئەمریکا لە وڵاتانێکی وەک شیلی، مەکسیک و کۆریای باشووردا رووی دەدا. هۆکارەکەشیان وەک یەک بوو: خەڵک رقیان بوو لە ڕژێمەکانیان و ئەمریکایان بە پشتیوانی ئەم حکوومەتانە دەزانی. پاشان ئەم ڕژێمە دیکتاتۆرییانە سیاسەتی لیبرالیزاسیۆنیان گرتەبەر؛ دۆخی ژیان باش بوو، ریفۆرمی ئابووری ئەنجام درا و، ئینجا کرانەوەی دیموکراتیک هاتە ئاراوە. دەرئەنجام کەفوکوڵی دژە ئەمریکایی گۆڕدرا بۆ کۆمەڵە نارەزایەتییەکی رۆتین و ئاسایی لەبەرانبەر بەئەمریکاییکردنی کولتووری وڵاتەکەیاندا. ئەگەر لە داهاتوودا تاقە نارەزایەتیی نیگەرانکەری دژەئەمریکایی، خۆپیشاندانەکانی دژ بە مەکدۆناڵد بێت، ئەوا بێگومان رۆژهەڵاتی ناوین بە راستی پێش کەوتووە.

## بەرزەتەکووزی

پەرەپێدانی دیموکراسی سەختە. بەڵام ئەمە بەو واتایە نییە کە رۆژئاوا و بەتایبەت وڵاتە یەکگرتووەکان واز لە یارمەتیدانی هێزەکانی دیموکراسیی لیبرالی بهێنن. بەو واتایەش نایەتەوە کە ڕژێمە ئۆتۆریتەخوازەکان قبووڵ بکەین تەنیا لەبەر ئەوەی کە لە نێو ئەڵتەرناتیڤە خراپەکاندا باشترین ئەڵتەرناتیڤە. بەڵام بە مانای ئەوەی بێگومان [ئەم پرۆسەیە] هەڵگری جۆرێک وردەکاری و ئاڵۆزییە. لە دەساڵی رابردوودا بۆ بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی بەپەلە گوشارمان خستبێتە سەر هەر وڵاتێک، ئاکامی پێچەوانەی لێ کەوتۆتەوە.

لە هەندێ وڵاتی وەکوو بۆسنیدا کە تەنیا یەک ساڵ دوای ڕێکەوتننامەی ئاشتیی دەتیۆن هەڵبژاردن بەڕێوەچوو، دەقاودەق هێزە ئەتنیکییە مەترسیدارەکان بەهێز بوون و بردیانەوە و دۆخەکەیان بەجۆرێک شێواند کە رۆنانی دیموکراسییەکی رەسەنی لیبرالی گەلێ دژوار بوویەوە. جینایەتکارانی ئەتنیکی لەسەرکار مانەوە، هاورێکانی خۆیان لە دادگاکاندا دامەزراند و پۆلیسیان تەیار و بەهێز کردەوە. سیستەمی پێشوو هێشتاکوو زیندووە و پێدەچێ گۆڕانکاریی راستەقینە بۆ چەندین ساڵ و رەنگە چەندین دەیە کەوتبێتە دواوە. لە تیمۆری رۆژهەڵات و ئەفغانستاندا قۆناغی دەوڵەتسازی درێژخایەنتر بووە کە دەستکەوتی باشتریشی لێ کەوتۆتەوە. بەگشتی پێش بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنێکی چەندحیزبی و نەتەوەیی پێویستە لە قۆناغێکی تێپەڕینی پێنج ساڵەدا

ریفۆرمی سیاسی و گەشەپێدانی دامەزراوەیی بەڕێوە بچێت. تێپەڕاندنی ئاوەها قۆناغێک بۆ وڵاتێکی وەک ئێراق کە جیاوازیی ناوچەیی و ئەتنیکی و مەزهەبیی قووڵ و بەرچاوی تێدایە، گەلێ پێویست و ژیانبەخشە. بەم شێوەیە دوای ئەوەی دامەزراوە مەدەنییەکان، دادگاکان، حیزبە سیاسییەکان و ئابووری دەستبەکار بوون ئینجا هەڵبژاردن بەڕێوە دەچێت. وەک هەموو بەستێنەکانی ژیان لەم بەستێنەشدا ناسین و پۆلێنبەندیکردنی زەمەن زۆر گرنگە.

سەپاندنی هەڵبژاردن بەسەر هەموو وڵاتێکدا ئاسانە، بەڵام خستنەگەڕی پرۆسەی لیبرالیزمی یاساخواز گەلێ دژوارترە. پرۆسەی لیبرالیزاسیۆن و دیموکراتیزاسیۆنی راستەقینە کە هەڵبژاردن تەنیا بەشێکیەتی، پرۆسەیەکی وردەوردە و درێژخایەنە. دەوڵەتەکان و رێکخراوە نادەوڵەتییەکان بە لەبەرچاوگرتنی ئەم بابەتە، پشتگیری لەو زنجیرە چالاکییە بەردەوامانە دەکەن کە لیبرالیزمی یاساخواز لە وڵاتانی روو لە گەشەدا پتەو و بەهێز دەکەنەوە. «رێکخراوی نەتەوەییی دیموکراسی» پشتیوانی لە بازاڕە ئازادەکان، بزووتنەوە کرێکارییە سەربەخۆکان و حیزبە سیاسییەکان دەکات. «ئاژانسی ئەمریکایی بۆ گەشەسەندنی نێونەتەوەیی» یارمەتیی دارایی پێشکەش بە دامودەزگا دادوەرییە سەربەخۆکان دەکات. بەڵام دواجار هەڵبژاردن هەموو شتێک دەسڕێتەوە. ئەگەر لە وڵاتێکدا هەڵبژاردن بەڕێوە بچێ، واشینگتۆن و هەموو جیهان زۆر بە نەرمونیانی لەگەڵ دەوڵەتی هەڵبژێردراودا دەجووڵێنەوە. هەروەها کە لە بەرانبەر یێلتسین لە رووسیا، ئاقایەف لە قەزاقستان و کارلۆس مێنێم لە ئارژانتیندا ئاوەها هەڵوێستێکیان وەرگرت. لە ئێستادا کە دیمەنەکان و هێماکان دەور دەگێڕن، پرۆسەی هەڵبژاردن زۆر ئاسان لەسەر کاسێت تۆمار دەکرێت، بەڵام چۆناوچۆن دەکرێت باڵادەستیی یاسا لە تێلەڤیزیۆنەوە بڵاو بکرێتەوە؟ بەهەرحاڵ دوای بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنیش ژیان هەر درێژەی هەیە، بەتایبەت بۆ ئەو خەڵکانەی وا لەوێدا دەژین.

بەپێچەوانەوە، نەبوونی هەڵبژاردنی ئازاد و دادپەروەرانە کەماسییەکی تاقانەی رووتە و بەواتای دیکتاتۆری نییە. هەڵبژاردن فاکتەرێکی گرنگ و پرپایەخە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات، بەڵام تاقە فاکتەر نییە. لەمە گرنگتر نرخاندنی دەوڵەتەکانە بەپێی پێورەکانی لیبرالیزمی یاساخواز. ئازادییەکان و زنجیرە مافە ئابووری و مەدەنی و مەزهەبییەکان گرنگترین فاکتەرەکانی خودموختاری و پێگەی ئینسانین. ئەگەر دەوڵەتێک خاوەن دیموکراسییەکی بەرکورت و بچووک بێ بەڵام بەردەوام ئەم ئازادییانە پەرە پێ بدات، بۆمان نییە بە دەوڵەتێکی دیکتاتۆریی لەقەڵەم بدەین. سەرەڕای ئەوەی وڵاتانی وەک سەنگاپوور، مالێزی، ئەردەن و مەراکش دەرفەتی هەڵبژاردنی سیاسیی هاووڵاتییان بەرکورت دەکەنەوە، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ رژێمە دیکتاتۆرییەکانی ئێراق و لیبی یان دیموکراسییە نالیبرالییەکانی ڤێنێزۆیلا، رووسیا و غەنادا، بارودۆخێکی لەبارتریان بۆ ژیان و ئازادی و شادومانیی

هاووڵاتییانیان خولقاندووە. زەختی سەرمایەداریی جیهانی دەتوانێ پرۆسەی لیبرالیزاسیۆن بەرەو پێشەوە ببات کە ئاوەها کاریگەرییەکی لەسەر چین داناوە. بازاڕی ئازاد و ئەخلاق دەتوانن لە تەنیشت یەکدیدا بژین.

سەختترین کاری ئابووری بەڕێوەبردنی ریفۆرمە لەو وڵاتانەدا کە داهاتیان بە ڕێگای ئاسان و بێزەحمەتدا دەستەبەر دەکەن. دەرکەوتووە دابڕاندنی ئەم وڵاتانە لەو جۆرە داهاتە تا رادەیەک نامومکینە. ساڵی ٢٠٠٢ بانکی جیهانی دەستی دایە تاقیکردنەوەی مۆدێلێکی داهێنەرانە لە وڵاتی چاد لە ئافریقای ناوەندیدا. چاد سەرچاوەیەکی گەورەی نەوتیی هەیە، بەڵام لەبەر باکگراوندی بێسەقامی و بشێوەی سیاسیی ئەم وڵاتە، کۆمپانیا بیانییەکان کەمتر خۆیان لە قەرەی سەرمایەگوزارییەکی گەورە بۆ هەڵکۆزین و هەناردنی نەوتەکەی دەدا. بانکی جیهانی بڕیاری ناوبژیکردنی دا، هەر بۆیە پرۆژەکەی بەهەند وەرگرت و قەرزێکی بەخشییە دەوڵەت تاکوو بە بەشداریکردنی کۆمپانیایەکی فرەنەتەوە بە سەرۆکایەتیی ئێکسۆن مۆبیل گەلاڵەی هەڵکۆزینی نەوت جێبەجێ بکات. هاوکات کۆمەڵە مەرجێکی دیاریکراویشی دەسنیشان کرد؛ دەبا پەرلەمانی چاد یاسایەکی پەسند بکردایە کە بەپێی ئەو یاسایە لە سەدا ٨٠ی داهاتی نەوت تەرخان بکرێ بۆ تەندروستی، فێرکاری و کاروباری ژێرخانی گوندکان، هەروەها لە سەدا ٥ی بۆ ناوچەکانی دەوروبەری بیرە نەوتەکان تەرخان بکرێت و لە سەدا ١٠یشی لە حسێبێکی سێیەمدا پاشەکەت بکرێ بۆ نەوەکانی داهاتوو. ئەویتریشی (لە سەدا ٥) بۆ خودی دەوڵەت بوو و دەیتوانی بەکەیفی خۆی بەکاری بهێنێ. بۆ دڵنیابوون لەوەی کە لە مەیدانی کردەوەشدا پرۆژەکە جێبەجێ دەکرێت بانکی جیهانی بڕیاریدا کۆی داهاتەکانی نەوت بکرێتە بانکێکی بیانییەوە و کۆمیتەیەکی سەربەخۆی چاودێری (کە پێکهاتووە لە دەستەیەک لە هاووڵاتییانی بەرجەستە و ناسراوی چاد) ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەو حسێبە بگرێتە ئەستۆ. هێشتا بۆ نرخاندنی ئەم مۆدێلە زۆر زووە، بەڵام ئەگەر مۆدێلێکی سەرکەوتوو بوو دەتوانین لە شوێنەکانیتریشدا تاقیی بکەینەوە. بەڕێوەبردنی ئەم میتۆدە تەنانەت لەو وڵاتانەشدا کە پێویستیان بە یارمەتیی بانکی جیهانی نییە، دەتوانێت ئاسەوارێکی شانۆیی لەسەر وڵاتانیتر بەجێ بهێڵێ. مۆدێلی چاد دەتوانێ میتۆدێک بخاتە بەردەست کە لە ڕێگای ئەو میتۆدەوە بتوانین کارێک بکەین کە سەرچاوە سروشتییەکان لەباتیی ئەوەی وەک ئێستا ببن بە مایەی کارەسات، بگۆڕدرین بۆ دەرفەتی بەختەوەری و پێشکەوتن.

دواجار پێویستە بڵێین دەبێ باڵادەستیی یاسا بژێنینەوە. یەک لە ئاسەوارەکانی جەختکردنی لەڕادەبەدەر لەسەر دیموکراسیی رووت ئەوەیە کە لە وڵاتانی روو لە تێپەڕیندا کەمتر هەوڵی دروستکردنی پێکهاتەی داهێنەرانە و کاریگەر و بەکەڵک دەدرێت. بەپێی تێگەییشتنی گەورەترین

پەرەپێدەرانی چەمکی باڵادەستیی یاسا لە سەدەی هەژدەمدا ـ کەسانی وەک مۆنتێسکیۆ و مەدیسۆن ـ باڵادەستیی یاسا مانای سیستەمێکی ئاڵۆزی «کۆنترۆڵ و هاوسەنگی» کە بۆ بەرگرتن بە کەڵاکەبوونی دەسەڵات و بەکارهێنانی خراپی پلەوپایە دارێژراوە. ئاوەها ئامانجێک تەنیا لە رێگای نووسین و ریزکردنی مافەکانەوە نایەتەدی، بەڵکوو پێویستە وەها سیستەمێک رۆ بنرێت کە بەر بە پێشێلکردنی ئەم مافانە لە لایەن دەوڵەتەوە بگرێت. هەروەها دەبێ گرووپە جۆراوجۆرەکان لەم سیستەمەدا بەشدار بکرێن و دەسەڵاتیان پێ بدرێت، مەدیسۆن وتەنی: «دەبێ کارێک بکەین کە فرەخوازی بە فرەخوازییەکی بەرانبەر کۆنترۆڵ بکرێت».

ئامانجێکی دیکەی پێکهاتەکان کۆنترۆڵکردنی کەفوکوڵی جەماوەری و دروستکردنی دەوڵەتێکی دیموکراتیک و لەهەمانکاتدا وردبین و رێکوپێک بوو. پێکهاتەی ئافریقای باشوور نموونەی پێکهاتەیەکی نائاسایی و تا رادەیەک نادیموکراتیکە، کەچی ئەم پێکهاتەیە توانیویەتی دەسەڵاتی کەمینەکان دابین بکات، هەم کەمایەتییە ناوچەییەکانی وەک عەشیرەتی زلۆس و هەم کەمینە پرژوبڵاوەکانی وەک سپیپێستان. بەم کارە، سەرەڕای هەموو هەژاری و کارەساتە کۆمەڵایەتییە دڵتەزێنەکان، ئافریقای باشوور ئەگەری سەرکەوتنی دیموکراسیی بەرزتر کردۆتەوە.

بەداخەوە لەورۆدا توێژێکی گەورە و پرپایەخی دامەزراوە هەڵنەبژێردراوەکان ـ دەنگی ناڕاستەوخۆ، یاسا و رێسای فیدراڵی و، کۆنترۆڵ و هاوسەنگی ـ کە سەرەکیترین تایبەتمەندیی زۆری لە پێکهاتە رەسمی و ناڕەسمییەکانی ئەورووپا بوون، کەوتوونەتە بەر شک و گومانەوە. دیاردەیەک کە دەتوانین بە سەندرۆمی وایمار[٩٣] ناوزەدی بکەین ـ ناوی ئەم دیاردەیە لە پێکهاتەی باڵای ئەڵمانیا لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانگیردا گیراوە ـ لە هەمان کاتدا کە نەیتوانی بەر بە سەرهەڵدانی فاشیزم بگرێت ـ بۆتە هۆی ئەوەی کە خەڵک پێکهاتەکانی تەنیا بە چاوی کاغەزبازییەکەوە تماشا بکەن کە کارێکی ئەوتۆش ئەنجام نادەن (دەڵێی هەر سیستەمێکی سیاسی لە ئەڵمانیادا بە ئاسانی دەیتوانی لە شکستی نیزامی، شۆڕشی کۆمەڵایەتی، «قەیرانی گەورە» و ئاوسانی بەربڵاو بە سەلامەت دەرباز بکات). ئەو رەوتانەی کە لەمپەرن لە بەردەم دیموکراسیی راستەوخۆدا بە رەوتگەلێکی بێبایەخ لەقەڵەم دەدەن و پێیان وایە دەرفەتی رادەربڕینی خەڵک بەرکورت دەکەنەوە. ئێستاکە لەملاولای جیهاندا شێوازە جۆراوجۆرەکانی ئەم بنەما زۆرینەخوازە بەدی دەکەین. بەڵام کێشەی ئەم جۆرە سیستەمانە کە لایەنی براوە دەتوانێ هەموو شتێک بکاتە موڵکی خۆی، ئەوەیە کە لە زۆربەی وڵاتانی رووله دیموکراتیزاسیۆندا براوە هەر بەراست هەموو شتێک دەکاتە موڵکی خۆی.

---

٩٣ . کۆماری ئەڵمانیا لە نێوان هەردوو جەنگیجیهانیی یەکەم و دووەمدا. و.ف

ئەڵبەت کولتوورەکان جیاوازن و کۆمەڵگا جیاوازەکان پێویستیان بە چوارچێوەی جیاواز و جۆراوجۆری دەسەڵاتداری هەیە. ئەمە بە مانای بەرگریکردن نییە لە قبووڵکردنی مۆدێلێکی یەکگرتوو بۆ دەوڵەت، بەڵکوو داکۆکیکردنە لەسەر تێگەیشتنێکی رەنگاوڕەنگتر بۆ دیموکراسیی لیبرالی، جۆرە تێگەیشتنێک کە هەر دوو وشەکەی ناو ئەم دەستەواژەیە بپێکێ. دیموکراسیی رەسەن سیستەمێکی تورت و بگۆڕە و نەتەنیا دەبێتە هۆی هێوربوونەوەی ئەم دوو هێزە بەڵکوو دەبێتە هۆی هێوربوونەوەی ئەو هێزانەی‌تریش کە تۆکڤیل بە «دامەزراوە ناوکۆییەکان»[94] ناوزەدی کردوون کە دواجار بەرزەتەکووزییەکی ورد و رێکوپێک دادەمەزرێنێ. بۆ تێگەیشتن لەم سیستەمە پێویستە هەوڵێکی فیکری بۆ ژیاندنەوەی نەریتی لیبرالیزمی یاساخوازانە بخەینەگەڕ، ئەم نەریتە بنەمایی و بونیادییە هەم لە ئەزموونی رۆژئاواییدا دەبینرێ و هەم دەتوانێ پەرەپێدەری حکوومەتی باش بێت لە هەرهەموو جیهاندا.

ئەگەر لە مێشکی خۆماندا ئەم پرۆسەیە ببەستینەوە و کورتی بکەینەوە بەو رووداوانەوە کە لە وڵاتە دوورەکاندا دەقەومێت، ئەو وڵاتانەی کە شپرز و هەژارن و بەتەواوی جیاوازن لە رۆژئاوای دەوڵەمەند و دیموکراتیک، ئەوا ژیاندنەوەکەمان سەقەت و ناتەواو دەردێت. دیموکراسی ئەو شتەیە کە هێشتا لە هەموو شوێنێک درێژەی هەیە. ململانێی نێوان دیموکراسی و لیبرالیزم ململانێیەکە لە رابردووی خودی رۆژئاوادا گەشتە تەشق و لووتکەی خۆی. ئەم ململانێیە هەرچەند فۆرمێکی تەواو جیاوازی وەرگرتووە بەڵام تا ئێستایش لە رۆژئاوادا بەردەوام و روو لە گەشە و پەرەسەندنە. ئەم ململانێیە زیاتر لە هەر شوێنێکی‌تر بەتایبەت لە یەک وڵاتدا زاڵ و بەرچاوە: وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

94. Inter agent institutes

# بەشی پێنجەم

# زیادکەوتەی شتێکی باش

دەڵێن پارە بەدیهێنەری بەختەوەری نییە، بەڵام بێگومان لای خۆتان بیر لەوە دەکەنەوە کە ٥ هەزار میلیارد دۆلار دەتوانێ ژیان ژێرەوژوور بکات. لە چارەکە سەدەی رابردوودا ئەمریکا رێک ئاوەها رێژەیەکی بە سەراپای بەرهەمی ناوخۆیی خۆی زیاد کردووە.[١] کەچی هەموو لێکدانەوە و شیکارییەکانی دەروونناسان نیشاندەری ئەوەیە کە ئەمریکاییەکان لە بیست و پێنج ساڵ لەمەوپێش بەختەوەر نین. ئەم وڵاتە نەتەنیا دەوڵەمەندتر بۆتەوە بەڵکوو لە نزیک بە هەموو رووبەرەکاندا پێگە و جێگەیەکی باشتر و بەرزتریشی بەدەست هێناوە. زۆربەی ئەمریکاییەکان بارودۆخی شپرز و شێواوی وڵاتەکەیان لە دەیەی ١٩٧٠دا لەبیر کردووە. ئەمریکا لەژێر گوشاری دۆڕاندنی شەڕی ڤییەتنامدا سووک و ترۆ بووبوو، هەروەها بەدەست قەیرانی ئاوسان، قەیرانەکانی نەوت، یاخیبوون و شەڕە رەگەزییەکان و پەرەسەندنی رێژەی تاوان و جینایەتەوە بە تەنگ هاتبوو. بەڵام لە دوو دەیەی داهاتوودا ئابوریی ئەمریکا تا رادەیەکی زۆر بە شێوەیەکی بەردەوام و بێ وەستان[٩٥] گەشەی سەند، داهاتی سەرانە لە سەدا ٥٠ زیادی کرد، تاوان و جینایەتەکان کەم بوونەوە، پێوەندییە رەگەزییەکان دۆخێکی باشتری پەیدا کرد، وردە وردە و سەرلەنوێ شارەکان بووژانەوە و هەرهەموو فاکتەکانی بەناو «پارامێتری بەدبەختی»[٩٦] روویان لە کزی دا. لە رووبەری نێونەتەوەییدا ئەم گۆڕانکارییانە تەنانەت بەربڵاوتر لەمەش روویان دا. لە سەرەتای نەوەدەکاندا شەڕی سارد بە قازانجی رۆژئاوا کۆتایی پێهات، کۆمۆنیزم رووخا، سۆسیالیزم لە بایەخ کەوت و لە رووی سیاسی،

---

٩٥ . ئەڵبەت لەم قۆناغەدا کۆمەڵێک قەیرانی ئابووری و دابەزینی بازرگانیش رووی داوە، بەڵام لە گۆشەنیگایەکی مێژووییدا، هەشتاکان و نەوەدەکان بە قۆناغێکی دوور و درێژی گەشەسەندنی ئاشتییانە دێتە ئەژمار. تەنانەت رێژەی داهاتی مامناوەندی کە لە حەفتا و هەشتاکاندا تووشی وەستان و نەگۆڕان هاتبوو لە نەوەدەکاندا بۆ هەرهەموو گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی ئەمریکا، لە دەوڵەمەندترینیانەوە بۆ هەژارترینیان، بەرزبوونەوەی بەخۆوە بینی.

96. Misery index

ئابووری، نیزامی و کولتوورییەوە ئەمریکا بوو بە سەرکوڵ و سەرچەشنی جیهان. مرۆڤ وایدەزانی ئاوەها سەرکەوتنێک هەمووان خۆشحاڵ و شادومان دەکات.

بەڵام ئەمریکاییەکان بەم شێوەیە بیر لە گۆڕانکارییەکان ناکەنەوە. سەرەڕای پێشکەوتن لە هەموو ئەو رووبەرانەدا، ئەوان پێیان وایە وڵاتەکەیان و بەتایبەت سیستەمی سیاسیی وڵاتەکەیان، تووشی کێشەیەکی بنەمایی بووە. بەکورتی ئەمریکاییەکان باوەڕیان بە دیموکراسییەکەی خۆیان نەماوە. ئەگەر لە هۆکارەکانی دڵەخورپەی ئەمریکا ورد بینەوە تێدەگەین کە نیگەرانییەکانی ئەمریکا هاوشێوەی هەمان ئەو نیگەرانییانەیە کە وڵاتەکانیتری جیهانی گرتۆتەوە. رەنگە خەسارەکانی شەپۆلی دیموکراتیک بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان لە هەرهەموو وڵاتە رۆژئاواییەکانیتر توندتر و قووڵتر بووبێ. لە بنەڕەتدا کۆماری ئەمریکا لەسەر ئایدیای هاوسەنگیکردن لە نێوان ئیرادەی زۆرینە و مافی کەمینە ـ یان بە واتایەکی گشتیتر هاوسەنگیی نێوان دیموکراسی و ئازادی ـ دامەزرابوو، کەچی ئەم وڵاتە رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر بەرەو جۆرە پۆپۆلیزمێکی کاڵفامانە دەچێت کە تێیدا پێوەرە سەرەکییەکانی شەرعییەت بریتییە لە ناوبانگ، خۆشەویستی و کراوەیی. بەپێی ئەم ئایدیۆلۆژیایە پێویستە دامەزراوە کۆنەکان بڕووخێنن، ئۆتۆریتەی سوننەتی لاواز بکرێت و گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان زاڵ بن و دواجار هەموو ئەم شتانەش لەژێر ناوی «خەڵک»دا بەڕێوە دەبرێت. ئاکامی ئەم پرۆسەیە بۆتە سڕانەوەی قووڵی هاوسەنگی لە سیستەمی ئەمریکادا، واتە دیموکراسیی زیاتر و ئازادیی کەمتر.

رەنگە کابرایەکی بیانی پێی سەیر بێ کە دەڵێین بەهێزترین دیموکراسیی جیهان باوەڕی بە خۆی نەماوە، بەڵام لە راستیدا ئاوەها قەیرانێک لە ئارادایە. ئەگەر ئەم دەربڕینە بە قسەیەکی رادیکاڵ دەزانن ئاوڕێک بدەنەوە لە ساکارترین و جێباوەڕترین ئاماری بەردەست واتە ئاماری دابەزینی رێژی متمانەکردن بە پایتەخت کە هێمای سیستەمی سیاسیی هەر وڵاتێکە. لە سەرەتای شەستەکاندا لە سەدا زیاتر لە ٧٠ی ئەمریکاییەکان ئەو بۆچوونەیان قبووڵ بوو کە دەیوت «دڵنیاین هەرهەموو کارەکانی دەوڵەت لە واشینگتۆندا هەمیشە یان زۆربەی کات دروستە». ئەم رێژەیە بە درێژاییی سی ساڵ بەردەوام دابەزیوە و ئێستا گەشتۆتە ٣٠ لە سەد. دوابەدوای یازدەی سێپتامبری (ئەیلول) ٢٠٠١ راپرسییەکان نیشاندەری ئەوە بوون کە ئاستی متمانە و باوەڕی خەڵک بە واشینگتۆن زیادی کردووە: بەپێی راپرسییەکەی رێکخراوی گالوپ لە ئۆکتۆبری (تشرینی یەکەم) ٢٠٠١دا، لە سەدا ٦٠ی خەڵک هەمیشە یان زۆربەی کات باوەڕیان بە واشینگتۆن هەیە، بەڵام ئەم رێژەیە لە ژوەنی (حوزەیران) ٢٠٠٢دا گەڕایەوە سەر هەمان هێڵی پێش یازدەی سێپتامبر (ئەیلول). هەرچەند شەڕی دژەتیرۆر هەستی نیگەرانی و دڵەخورپەی ورووژاندووە، بەڵام ئەگەری گەڕانەوەی

ڕێـژەی متمـانەکردن بـۆ هەمـان هێڵـی دەیەکـانی ١٩٤٠، ١٩٥٠ یـان ١٩٦٠ ئەگەرێکـی بچـووکە. لەم بوارەدا ئەمە تاقە ئاماری بەردەست نییە. وەڵامەکـان بـۆ پرسـیاری «کاربەدەسـتانی دەوڵەت گـوێ نـادەنە بیروبۆچـوونی کەسـانی وەک مـن» لە شەسـتەکان بەدواوە دەقـاودەق هەر ئەم ڕەوتەی تێپەڕاندووە. بەپێی لێکدانەوەکانی ڕێکخـراوی ڕاپرسـیی هەریـس «پـارامێتری تـۆران و نـائەکتیڤیی سیاسی»[97] لە شەسـتەکاندا بـە شـێوەی مامناوەنـدی لە سـەدا ٣٤ بـوو کـە لـە نەوەدەکانـدا بـەرز بوویـەوە بـۆ ٦٣ لـە سـەد، پارامێترەکـانیتریش ئاوەهـا ڕەوتێکیـان بڕیـوە. ئاکـامی هـەموو لێکۆڵینەوەکان بۆ نرخاندنی ڕێژەی متمانەی گشتی[98] هەر بەم شێوەیە تاڵ و دڵتەزێنە.[٢]

بە بەراورد لەگەڵ شەستەکاندا ڕێـژەی بەشـداریکردن لـە هەڵبژاردنـەکانی سـەرۆک کۆماریـدا لـە سەدا نزیکەی ٢٠ دابەزیوە. ڕێژەی بەشداریکردنی سپیپێستان گەلێ زیـاتر دابـەزیوە، چونکو دوای شەستەکان و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵە یاسای ڕەگەزپەرستانە کە ئیجازەی بە ڕەشپێستانی باشـوور نەدەدا بەشـداری لـە هەڵبژاردنـدا بکـەن، ڕێـژەی بەشـداریکردنی ڕەشپێسـتان زۆری کـردووە. ئەمە لەحاڵێکدایە کە لە بیست سـاڵی ڕابـردوو و لە ڕێگـای کـۆمەڵە یاسـایەکی دڵگەرمـکەرانەوە هەوڵ و تێکۆشـانێکی بێوچـان بـۆ ڕاکێشـانی خەڵـک و بەشـداریدانیان لە هەڵبژاردنەکانـدا کەوتە گەڕ.[٣] هەنـدێ کەس دەڵـێن بەشـداریکردنی کەمـی خەڵـک لە هەڵبژاردنـدا نیشـاندەری ڕازیبـوون و خۆشحاڵییانە [لە دۆخی هەنـووکە]، کە وایە نـیگەران مەبـن، جێـی خۆشـحاڵییە. بەڵام بەپێـی ئەم بۆچوونە ئەو کاتانەی کە ڕێژەی بەشداریکردنیان لە هەڵبژاردندا زۆر بووە، بۆ وێـنە لە پەنجاکانـدا، حەتـمەن خەڵـک دۆخێکـی شۆڕشـگێڕانە ژیـاون، دیـارە قەت وا نەبـوو. بە هەر شـێوەیەک بیـر لە دەنگدان بکەینەوە و بە باشی بـزانین یـان خـراپ، ئاوەهـا دابەزینێکـی قـووڵ شـیاوی تـوێژینەوە و لێکۆڵینەوەیە.

لە کۆمەڵگایەکی ئازاددا دەنگدان نەتەنیا تاقە کردەی گشـتیی هاووڵاتیـانە، بەڵکـوو یەکێکە لە ساکارترین و ئاسانترین کارەکانیش. هەرهەمووەکەی بریتییە لەوەی چەندساڵ جارێک بچیتە بەردەم سندووقەکانی دەنگدان. ئەرکە مەدەنییەکانیتر کە بەڵێن و بەرپرسایەتییەکی زیاتر دەخوازن ـ وەک بوونە ئەنـدام لە حیزبێکـی سیاسـی یـان ئەنجـومەنی قوتابخـانەدا ـ گەلـێ زیـاتر و فرەتـر تووشـی دابەزیـن هـاتوون. ڕۆبێـرت پۆنتـام، بیرمەنـدی زانسـتە سیاسـییەکان، لە ڕێگـای کـۆمەڵە ئامـارێکی هەژێنەرەوە دەرئەنجامێکی وەهـای خسـتۆتە بەردەسـت کە بە گشـتی لە ناوەڕاسـتی شەسـتەکانەوە ئاستی بەشداریکردن لە کاروباری گشتی و مەدەنیدا بە ڕێژەی لە سەدا ٤٠ دابەزیوە.[٤]

---

97. Tiff and Passivity index
98. Reliance public

دڵساردبوونەوەی ئەمریکاییەکان لە سیستەمی سیاسیی وڵاتەکەیان لە هەموو شتێکدا ڕەنگی داوەتەوە ـ لە دەنگدانیاندا، لە وەڵامدانەوەی ڕاپرسییەکاندا، لە نووسینی نامەدا بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، لە وتووێژە تێلەڤیزیۆنییەکاندا و لەراستیدا لە دووتوێی سەرجەم ڕادەربڕینەکانیان لەسەر هەموو شتێک و لە هەموو شوێنێکدا [ئەم دڵساردبوونەوەیە ڕەنگی داوەتەوە]. ئاوڕێک بدەنەوە لە سەردێڕی هەندێ لە گرنگترین توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکان سەبارەت بە سیاسەتی ئەمریکا لە ساڵانی گەشاوەی دەیەی ١٩٩٠دا: *بۆچی ئەمریکاییەکان ڕقیانە لە سیاسەت، خنکاو لە گەندەڵیدا، پێتەختی خۆبەزلزان، خیانەتی دیموکراسی، دادگاییکردنی دیموکراسی، هەڵاتنی تۆقێنەر، سیاسەتی چەپەڵ، گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان.* چەندەها بەرهەم و نووسراوەی دیکەشمان هەیە کە هەرهەموویان بارودۆخی ئەمریکا دەقاودەق و بە هەمان ڕادە بە دۆخێکی نائومێدکەر وێنا دەکەن. دێرێک باک، سەرۆکی پێشووی زانکۆی هارڤارد، دوا لێکۆڵینەوە تۆکمە و بەپێزەکەی خۆی سەبارەت بە دیموکراسیی ئەمریکا ناو ناوە *کێشەی حکوومەت.* تەنانەت هۆکار و ئاراستەی ورووژانی نیشتمانپەرستی لە دوای یازدەی سێپتامبر(ئەیلول) ئەگەڕایەوە بۆ بەرزڕاگرتنی نیشتمان و ئامانجەکانی و هەروەها خەڵکی ئەمریکا و، پێوەندیی بە سیاسەت یان سیستەمی سیاسیی ئەمریکاوە نەبوو. ئەگەریش ئاوڕێک لە سیستەمی سیاسی درابێتەوە بریتی بووە لە درێژەپێدانی نەریتی دژایەتیکردنی دەسەڵات لە دووتوێی زۆربەی ڕاگەیاندننامە و نامیلکە سیاسییەکاندا، ئەم نەریتە ئێستە ڕۆ چووە بە هەناوی کۆمەڵگادا و بۆتە شتێکی پتەو و بەبنەما. کاتێ مرۆڤ تێدەگات کە گۆڕینی تێڕوانینە گشتییەکان لە ئاست حکوومەتدا لە پۆزەتیڤەوە بۆ نیگەتیڤ، لە هەلومەرجێکدا ڕووی داوە کە بە درێژاییی سی ساڵ گەشەسەندنی ئابووری و سەقامگرتوویی کۆمەڵایەتیی زۆر گەورە ژیاوین، ئەوکات کێشەکەی لا قووڵتر دەبێتەوە و ئەستەمە نەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە دیموکراسیی ئەمریکا تووشی کێشەیەکی جیدی بووە.

بەڵام هۆکاری ئەم داڕووخانە. هەندێ کەس دەیگێڕنەوە بۆ شەڕی ڤیەتنام و ڕووداوی واتێرگەیت، هەندێ کەسیتر دەیخەنە ئەستۆی ئارەزووە هەمیشەیی و ناکۆتاکانی دەوڵەت و کەسانێکی دیکەیش دەیگێڕنەوە بۆ لاوازکەوتن و دابەزینی سیاسەتمەداران لەڕووی ناوەڕۆک و چۆنێتییەوە[99]. بەڵام بەپێی توێژینەوەیەکی وردی توێژەرانی کۆلیژی زانستە سیاسییەکانی کێنێدی لە زانکۆی هارڤارد، هیچکام لەم جۆرە هۆکارانە کە زۆرجار ئاماژەیان پێ دەدرێت دەوریان نەگێڕاوە یان لانیکەم تاقە هۆکار نین.[٥] بۆ وێنە، هەرچەند بێگومان شەڕی ڤیەتنام و ڕووداوی واتێرگەیت ئاسەواری نیگەتیڤیان لەسەر دەوڵەت بەجێ هێشتووە بەڵام بەرلەوەی شەڕی ڤیەتنام دوچاری ئەو

99. Quality

دەرئەنجامە تاڵە بێت ئەم دابەزینەی بۆچوونی گشتی دەستی پێکردبوو و تا ماوەیەکی زۆر دوای کەمڕەنگبوونەوەی یادەوەرییەکانی ڤیەتنام و واتێرگەیتیش هەر درێژەی هەبوو. لە زۆربەی وڵاتە پیشەسازییەکاندا هاوشێوەی ئاوەها دابەزینێکمان لە متمانەی گشتیدا بە ڕێژەیەکی کەمتر بینیوە، هەر بۆیە ئەستەمە هۆکاری ئەم دیاردەیە بەتەواوی ئەمریکایی بێت (بۆ وێنە واتێرگەیت). سەبارەت بە سەرهەڵدانی دەوڵەتی گەورەیش پێویستە بڵێین هەرچەند لە شەست و حەفتاکاندا هەم ڕێژەی فەرمانبەران و هەم ڕێژەی ڕێکخراوە دەوڵەتییەکانی واشینگتۆن گەلێ زیادی کرد، بەڵام لە بیست و پێنج ساڵی ڕابردوودا قەبارەی دەوڵەتی فیدراڵ بەنیسبەت کۆی بەستێنی ئابووری بەزۆری نەگۆڕ و وەک خۆی ماوەتەوە. زیاترین ئاستی گەورەبوونەوەی بەشی دەوڵەتی لە هەندێ گەڵاڵەی وەک بیمەی[100] کۆمەڵایەتی و پزیشکیدا ڕووی داوە کە ئەڵبەت ئەمانەش گەڵاڵەگەلێکی زۆر خۆشەویستن.

سەرەتا نابێ بیرمان بچێ کە سەردەمی جەنگی جیهانیی دووەم و دوای جەنگیش سەردەمێکی ئاوارتە و هەڵاواردە بوو کە بارگاوی بوو بە نیشمانپەرستی، هاوکاری و سۆز و هەستی کۆمەڵایەتی. بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی ڕووناک و پرشکۆی ١٩٥٠دا، ئێستە پێگەی هەموو دامەزراوەکان ـ بنەماڵە، کەلیسا و تەنانەت کۆمپانیا گەورەکان ـ گەلێ دابەزینی بەخۆوە دیوە. ئەم ڕەوتە بەشێکە لە بزاڤێکی بەربڵاو، واتە وازهێنان لە نەزمی جێگیر و کۆییی[101] سەردەمانی پاش جەنگی دووهەمی جیهانی و بزووتن بەرەو کۆمەڵگایەکی بەپەلە، ڕکابەرانە[102] و تاککەرا[103]، واتە کۆمەڵگایەک کە بەدگومانە بەرانبەر هیرارشییەت[104] (زنجیرەپلە) و بەرانبەر جێگیربوون و سەقامگرتوویی[105]. سەرەڕای ژیانەوە و هەڵگیرسانەوەی ڕاستەقینەی هەستی نیشتمانپەرستی پاش ڕووداوی ١١ی سێپتامبر، بەڵام ئەمەش نەیتوانیوە و ناتوانێ ئەم گۆڕانکارییە درێژخایەنە دەسکاری بکات.

کەچی خەڵکی گەلێ باوەڕیان بەو بۆچوونە هەیە کە دەڵێت سەرکردە سیاسییەکان لەڕووی ناوەڕۆک و چۆنێتییەوە بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا دابەزیون. بیرمەندێک کە تەمەنی هەشتاساڵانی پڕ کردۆتەوە بە جوانترین شێوە ئەم بابەتەی بۆ لێک دامەوە: «لە سەردەمی لاوێتیمدا کە سەیری واشینگتۆنم دەکرد، سیما مێژووییەکانی جیهانم دەدیت ـ ڕۆزڤێڵت، مارشاڵ، ئایزێنهاوێر، مەک

100. Insurance
101. Collective
102. Competitive
103. Individual
104. Hierarchy
105. Stable

ئارتۆر، ترۆمەن و ئەچسێن. [بەڵام] ئەمڕۆ ریچارد گێفارت[١٠٦]، دەنیس هێستێرت[١٠٧] و جۆرج دەبلێو بووش دەبینم» (لە کاتی ئەم دیالۆگەدا لە ژوورێکی جوانکیلەی یەک لە تەلارە لۆکس و رازاوەکانی نیۆیۆرکدا خەریکی خواردنی نانی نیوەڕۆ بووین ـ دیمەنێکی تەواو گونجاو بۆ دەربڕینی خۆرگەیەکی لێڵ و پێڵ). بەڵام لە سەردەمی لاوێتیی ئەو واتە لە دەیەکانی ١٩٣٠ و ١٩٤٠دا هەموو شتێک کەوتبووە ژێر سێبەری «قەیرانی گەورە» و جەنگی دووهەمی جیهانییەوە. سەردەمە سەخت و دژوارەکان سەرکردەی گەورە بەرهەم دەهێنن، لە راستیدا ئەم جۆرە سەردەمانە باشترین کەسەکان دێنێتە مەیدان. بیری لێ بکەنەوە رووداوی ١١ی (ئەیلول) سێپتامبر چۆناوچۆن جۆرج دەبلێو بووش و زۆربەی وڵاتی گۆڕی، «گەورەترین نەوە»ی ئەمریکا ـ کە گەلێ ستایشیش ئەکرێ ـ لە سەردەمێکدا تێکەڵ بە بەستێنی کۆمەڵایەتی ببوو کە وڵات پێویستی بە خزمەت و خۆبوردوویییەکی بەردەوام و بێ پسانەوە بوو، شەڕی دژەتیرۆری ئێستا دووپاتبوونەوەی هەمان ئەو سەردەمەیە کە پێویستی بە فیداکاری هەبوو، بەڵام زۆربەی ئەمریکاییەکان هێشتا بە شێوەیەکی ئەوتۆ هەست بە پێویستبوونی خزمەتی راستەقینە ناکەن. ئەوانەی بانگهێشتی خزمەتکاری کران زۆر بوێرانە ئەرکەکانی خۆیان راپەڕاند، کەسانی وەک سەرۆکی شارەوانیی نیۆیۆرک (رۆدۆلف جۆلیانی)، ئەفسەرانی پۆلیس و هێزەکانی ئاگرکوژاندنەوەی نیویۆرک و کۆماندۆکان (ی ئارتەش) لە ئەفغانستاندا.

ئەگەر لەگۆشەنیگایەکی مێژوویی بەربڵاوترەوە لەم بابەتە بڕوانین تێدەگەین ئەو بۆچوونەی پێی وایە سیاسەتمەدارانی ئێستە زیاد لە ئەندازە لاوازن بۆچوونێکی گەمژانەیە. ئەوانەی خۆزگە بۆ سەردەمی باشی ڕابردوو دەخۆن زۆر کەمن، ئەو سەردەمەی کە رادێرفۆردهیس[١٠٨] یان میلارد فیلمۆر[١٠٩] سەرۆک کۆمار بوون. سیاسەتمەداران لەزۆربەی مێژووی ئەمریکادا کەسانێکی ئاسایی و

---

١٠٦ . سەرۆکی زۆرینەی حیزبی دیموکرات لە کۆنگرێس لە نێوان ساڵانی ١٩٨٩–١٩٩٥دا. و.ف

١٠٧ . نوێنەری کۆماریخواز کە ساڵی ١٩٩٩ بوو بە سەرۆکی کۆنگرێس. و.ف

١٠٨ . سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە سەدەی نۆزدەمدا (١٨٧٧ـ١٨٨١) کە قۆناغی ئاوەدانکردنەوەی باشووری پاش شەڕە ناوخۆییەکان گەیاندە ئەنجام. ئەو دوای ٨ ساڵ گەندەڵیی سیاسی و ئابووری لە واشینگتۆندا هەوڵی دا مۆدێلێکی تازەی راستگۆیی و دروستکاریی کاربەدەستانی ڕەسمی و دەوڵەتی بخاتە بەردەست. و.ف

١٠٩ . سێزدەمین سەرۆک کۆماری ئەمریکا (١٨٥٠ـ١٨٥٣) کە پێداگربوونی لە سەر بەڕێوەبردنی یاسای کۆیلە هەڵاتووەکان بوو بە هۆی تەریککەوتنی باکوور و لەناوچوونی حیزبی Whig. و.ف

رکەبەرخواز[110] بوون کە هەوڵیان دەدا لە نێو سیستەمدا هەڵکەن و [لە هەمانکاتدا] پێگەیەکی بەرزتر و باشتر بەدەست بهێنن. دێرێک باک ئەوکات کە سەرۆکی زانکۆی هارڤارد بوو پرسیارێکی ئاراستەی «تۆماس ئۆنیل» سەرۆکی دێرینی ئەنجومەنی نوێنەران کرد و لێی پرسی ئایا بە رای تۆ لە سی ساڵی رابردوودا نوێنەرانی کۆنگرێس لە ڕووی چۆنێتییەوە[111] بەرزتر بوونەتەوە یان دابەزیون؟ ئۆنیل چەند چرکەیەک بیری کردەوە و لە وەڵامدا وتی: «ئاستی چۆنێتییان بەرزتر بۆتەوە، زۆر بەرزتر، بەڵام بێگومان ئاکام خراپتر بووە و دابەزیوە».

ڕاس پێرۆ، میلیاردێری سەیروسەمەر، ئەودەم وا ساویلکانە هەوڵی بوونە سەرۆک کۆماری دەدا، سەبارەت بە ئەزموونی کارکردن لەگەڵ واشینگتۆندا بۆچوونێکی هاوشێوەی دەربڕی: «کەسانی باش، سیستەمی خراپ».

کەوایە چ شتێک بۆتە هۆی دابەزینی سیستەم؟ لە ڕەوتی گۆڕانی متمانەی گشتیدا[112] «زەمەن» خاڵێکی گرنگە. بۆچی لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە بۆچوونە گشتییەکان گۆڕانیان بە سەرداهات و لەو سەردەمە بە دواوە بەردەوام دابەزیوە؟ لەم قۆناغەدا گۆڕانکارییەکی گەورە ڕوویداو بە هەمان ئەو خێراییە گەورەوە درێژەی پەیدا کرد: دیموکراتیزاسیۆنی سیاسەت. ڕەنگە سەیر بێت ئەگەر مرۆڤ باس لە دیموکراتیزاسیۆنی دیموکراسییەک بکات، بەڵام ئەم دەستەواژەیە باشترین پێناسەیە بۆ ئەم دیاردەیە. لە دەیەی ١٩٦٠وە زۆربەی کاراکتەرەکانی سیاسەتی ئەمریکا - حیزبە سیاسییەکان، ئەنجومەنەکانی یاسادانان، سازەو ڕێکخراوە ئیدارییەکان و تەنانەت دادگاکان - لە پێناو دیموکراتیکترکردنەوەی پێکهاتە و ڕۆحی خۆیاندا دەستیان داوەتە هەوڵێکی خۆکرد و خۆویست و زیاتر [لە جاران] خۆیان دەخەنە بەردەست خەڵکەوە و دەکەونە ژێر نفووز و کاریگەریی جەماوەرەوە. سەیر لەوەدایە کە ئەم گۆڕانکارییە هاوهات و یەکانگیر بووە لەگەڵ دابەزینی پێگە و جێگەی خودی ئەم دامەزراوانەدا.

[بەڵام] زۆربەی ئەمریکاییەکان بەم شێوەیە بیرناکەنەوە و زۆرجار گلە و گازندەکانیان دەقاودەق پێچەوانەی ئەو بابەتە دەکەوێتەوە: «کەس گوێ بۆ بیروڕای کەسانی وەک من شل ناکات». بەو بارەدا کە پێیان وایە کۆمەڵە گروپێکی ڕێکخراو - گروپە خاوەن بەرژەوەندییەکان - بەسەر واشینگتۆندا زاڵن، بە هەڵەدا نەچوون، بەڵام ئەوەی زۆرجار لێی نەگەیشتوون ئەوەیە کە ئەم دۆخە بەرهەمی ڕاستەوخۆی گۆڕانکارییەکانی چەند دەیەی ڕابردووە. سیستەم هەرچی کراوەتر

---

3. Competitive
111. Aualitative
112. Reliance public

بێ، پارە، لابی و کەسانی رادیکاڵ و توندڕەو ئاسانتر دزەی تێ دەکەن. ئەوەی لە واشینگتۆندا گۆڕاوە بریتی نییە لەوەی کە سیاسەتمەداران خۆیان بە ڕووی خەڵکدا داخستووە و ئامادە نین داخوازییەکانیان ببیسن، بەڵکوو ئەوەیە کە بە دەگمەن رێ دەکەوێ جیا لە گوێگرتن بۆ قسەکانی خەڵک کارێکیتریش ئەنجام بدەن.

ئەمڕۆ واشینگتۆن بە ئاراستەی بە دواداچوونی ڕای گشتیدا بەڕێوە دەبرێ. بە هەزاران کەس دامەزرێنراون تاکوو بەردەوام و لەسەر هەر بابەتێک بیری لێ بکەیتەوە بۆچوونی ڕای گشتی بنرخێنن. هەندێکیتریان دامەزراندووە بۆ ئەوەی دیاریی بکەن کە خەڵک لە بەرانبەر ئەم بابەتانەدا هەست بە چی دەکەن. مووچەیان بۆ کەسانێکیتر بڕیوەتەوە تاکوو مەزندەی ئەوە بکەن کە ڕەنگە خەڵک سبەێنی چۆناوچۆن بیر بکەنەوە. لۆبییەکان، چالاکان، راوێژکاران و سیاسەتمەداران لەسەر بنەمای ئەم زانیارییانە گەڵاڵەکانیان دادەڕێژن. لە سەرجەم پرۆسەکەدا هەموان بەردەوام ستایشی زانابوون، بوێری، راستگۆیی و مەزنایەتیی هەمەلایەنەی خەڵکی ئەمریکا دەکەن.

تاکە ڕەهەندی ئومێدبەخشی ئەم دیمەنە دڵتەزێنە ئەوەیە کە هەرچەند ئەم زێدەڕۆیی و بێبایەخکردنە زیادی کردووە، کەچی رێژەی متمانەکردنی گشتی بە سیاسەتمەداران کەمی کردووە و ڕووی لە کزی داوە. لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیدا یەک لە هاوکارانی پەرلەمانیی وینستۆن چێرچیلی سەرۆک وەزیرانی بریتانیا ئاگاداری کردەوە کە «بە تەواوی ئاگات لە بارودۆخەکە بێت». چێرچیل لە وەڵامدا وتی: «خەڵکی بریتانیا هێند بە باشی بیر لە ئاوەها سەرکردەیەک ناکەنەوە». لە سی ساڵی رابردوودا سەرکردەکانی ئەمریکا بەردەوام کڕنۆشیان بۆ خەڵکی ئەمریکا بردووە و [هێند لەسەر ئەم کارەیان پێداگر بوون کە] خەڵکیان بە تەواوی ماندوو و نائومێد کردووە. ڕەنگە ئەوان پێیان وابێ دیموکراسی هەمووی هەر ئەمە نییە.

## دیموکراسیی ناڕاستەوخۆ

وەک زۆربەی دونیای رۆژئاوا لە ئەمریکایشدا دیموکراسی بەشێکی مێژوویی بوو لە پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی سیاسی. هەروەها کە لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان پێدا وڵاتە یەکگرتووەکان لە دووتوێی چوارچێوەیەکی دیموکراتیکدا هەڵگری چەندەها دامەزراوە و پرۆسەی ڕەنگاوڕەنگی بەربڵاوە کە بەشی زۆریان پێش [سەرهەڵدانی] دیموکراسی هاتنە چێبوون و بە ئاشکرا نادیموکراتیکن. دیارترین نموونە سیستەمی دادوەرییە کە تیایدا ژنان و پیاوانی هەڵنەبژێردراو[113] کە مافی مانەوەی هەمیشەییان لەسەر کار هەیە، خاوەن دەسەڵاتێکی زۆر گەورەن. لە هەمان کاتدا هەژمارێکی

113. Non-elective

بەرچاوی دامەزراوەی نادەوڵەتی و حیزبی سیاسیشمان هەیە کە دەکەونە نێوان تاک و دەوڵەتەوە و تا ئەم دواییانەش زۆربەیان بە شێوەیەکی نادیموکراتیک بەڕێوە دەبران. بۆ وێنە ئاوڕێ لە حیزبە سیاسییەکان بدەنەوە، [لە رابردوودا] کاندیداتۆرەکان و رێبازە حیزبییەکان لە رێگای سیستەمی زنجیرە پلە و هیرارشیکی حیزبییەوە دیاری دەکران و بە توندی لە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێریدا بوون (ئەم سیستەمە لە ئێستەدا تەنیا بە دەستەواژەی «ژووری پڕدووکەڵ» وێنا دەکرێت، ئەمە خراپترین سووکایەتییە، بەتایبەت لە سەردەمێکدا کە تەندروستی گەلێ گرنگ و بایەخدارە). ئەڵبەت حیزبەکان دەبا سەرنجی خەڵکیان بۆ لای خۆیان راکێشابا، هەر بۆیە لە دیاریکردنی کاندیداتۆرەکان و دارشتنی رێباز و بەرنامەکانیاندا ئەو بابەتەیان (بۆچوونی جەماوەر) لە بەرچاو دەگرت، بەڵام کاندیداتۆرەکە بەرلەوەی بکەوێتە بەردەم هەڵبژاردن و داوەریی خەڵکەوە لە ناو خودی حیزبدا هەڵدەبژێردرا. ئەنجومەنەکانی یاسادانانیش لە سەر مۆدێلی زنجیرەپلەیی و داخراو کاریان دەکرد. نوێنەرانی کۆنگرێس و سێناتۆرەکان لە کۆمیتەکاندا کۆ دەبوونەوە و لەسەر بابەتە جۆراوجۆرەکان دەکەوتنە دەمەتەقێ و مامەڵەوە و [دواجار] لە سەری رێکەوتنیان دەکرد. دەنگدانیان لە سەر دوادەقی دەرکردەکان[114] ئاشکرا بوو بەڵام دەنگدان و باسوخواسە ناوخۆییەکانی کۆمیتەکان بە نهێنی دەمایەوە. ئەمەش لە پێناو ئەوەدا کە دامەزراوەکان سەرەتا لە ئەنجامدان و راپەراندنی کارەکانیاندا ئازاد و سەربەست بن ئینجا خەڵک لە سەر ئاکامەکان داوەری بکەن [نەک لەسەر شێوازی کارکردنیان].

ئەنجومەنی یاسادانان باشترین هێمای ئەندێشەی دیموکراسیی ناڕاستەوخۆیە. خەڵکی ئەمریکا خۆیان هەڵیدەبژێرن چ کەسانێک یاسایان بۆ دانێن؛ ئەوان خۆیان دەرکردەکان نانووسن یان پەسندیان ناکەن. هەر لەبەر ئەمەشە کە جەیمز مەدیسۆن، نووسەری یاسای بنچینەییی ئەمریکا، ئەم وڵاتە بە دیموکراسییەکی تەواو و راستەقینە نازانێت. دیموکراسییەکان راستەوخۆ لە لایەن لیژنەکانی یاساداناني جەماوەرییەوە بەڕێوە دەبرێن، وەک دەوڵەت ـ شارەکانی یۆنانی کەونارا کە مەدیسۆن و زۆربەی دامەزرێنەرانی ئەمریکا بە مۆدێلێکی شپرز، نالیبرالی و *بێسەقامیان* لەقەڵەم دەدا. بە رای مەدیسۆن باشتر وایە ئەمریکا وەک [سیستەمێکی] کۆماری[115] ناوزەد بکەین کە تیایدا هاووڵاتییان ئەرکی بەڕێوە بردنی حکوومەت دەخەنە سەرشانی نوێنەرەکانیان. بە باوەڕی دامەزرێنەرانی ئەمریکا، دیموکراسیی کۆماریخوازی پەرلەمانتاری، هاوسەنگییەکی گونجاو لەنێوان کۆنترۆڵی جەماوەری و بڕیاردانی ورد و دروستدا بەدی دەهێنێ.

114. Bill
115. Republican

زۆربەی تیۆریسیەنە گەورەکانی دیموکراسیش ئەم بابەتەیان پشتڕاست کردۆتەوە. دیارترین ڕاگەیاندن بۆ ئەم ڕوانگە مەدیسۆنییە لە لایەن سیاسەتمەدار و فەیلەسوفی بریتانی و ئەندامی حیزبی ویگەوە،[116] واتە ئێدمۆند بوورک، ئەنجام دراوە کە لە ئاخافتنێکی بەناوبانگ و لەدووتوێی بانگەشەکانی هەڵبژاردن لە پریستۆڵ بەرانبەر بە دەنگدەرانی پارتەکەی وتی: «نوێنەرانی ئێوە نە تەنیا لە هەوڵە بێوچانەکانیان بەڵکوو لە بڕیار و داوەرییەکانیشیاندا قەرزداری ئێوەن، جا ئەگەر بڕیارەکان بکەنە قوربانیی بیروبۆچوونی ئێوە [دڵنیابن] خزمەتیان پێ نەکردوون بەڵکوو خیانەتیان پێ کردوون... لە ڕاستیدا ئێوە نوێنەرێک هەڵدەبژێرن بەڵام کە هەڵتانبژارد ئیدی تەنیا نوێنەری پریستۆڵ نییە بەڵکوو ئەندامێکی پەرلەمانە».[٦]

سێناتۆر جان کێنێدی لە ١٩٥٦دا کتێبێکی لە ژێر ناوی *نەوەی بوێران*دا بڵاو کردەوە و تیایدا ستایشی هەشت سیاسەتمەداری ئەمریکای کردووە کە هەرچەند هەڵوێستی جەماوەرییان وەرنەدەگرت بەڵام هەڵوێستەکانیان دروست و گونجاو بوو. کێنیێدی ئەو بۆچوونەی ڕەت کردەوە کە دەیوت تەنیا ئەرکی ئەو وەک سێناتۆرێک ڕەنگدانەوە و بەرهەمهێنانەوەی هەڵوێستی دەنگدەرانیەتی:

ئاوەها ڕوانگەیەک لەسەر ئەو گریمانەیە ڕۆنراوە کە خەڵکی ماساچۆسێت تەنیا لەبەر ئەوە منیان ڕەوانەی واشینگتۆن کردووە کە وەک تۆمارچییەک ئاڵوگۆڕەکانی ڕای گشتی تۆمار بکەم... دەنگدەران بۆیە ئێمەیان هەڵبژاردووە چونکوو باوەڕیان بە بڕیارەکانمان و بە تواناکانمان لەجێبەجێکردن و ڕاپەڕاندنی بڕیارەکانماندا هەبوو، واتە بڕیاردان لە دووتوێی هەڵوێستێکدا کە دەتوانین دیاریی بکەین لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی وڵاتدا چ شتێک زیاترین بەرژەوەندی بۆ ئەوان بەدی دەهێنێ. ئەمە مانای ئەوەی پێویستە جاروبار ڕای گشتی ڕێنوێنی و ئاگادار بکەینەوە یان [هەڵەکانی] ڕاست بکەینەوە و تەنانەت هەندێ جاریش پشتگوێی بخەین، هەمان ئەو ڕای گشتییەی بۆی هەڵبژێردراوین...

بە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئایا کێنێدی بانگەشە و ئامۆژگارییەکانی خۆی بەڕێوە دەبرد یان نا، مەسەلەی گرنگتر ئەوەیە کە ئەم کتێبە دوابەدوای بڵاوبوونەوەی کەوتە بەر سەرنج و ستایشەوە، بە شێوەیەک کە خەڵاتی پۆلیتزێری بردەوە و کەوتە ڕیزی پڕفرۆشترین کتێبەکانەوە. ڕەنگە ئێستایش ئاوەها ڕوانگەیەک ستایش بکرێ، بەڵام لە هەمانکاتدا مرۆڤ وا هەست دەکات ئەم وێنەیە وێنای دونیایەکی کۆن و خڵەجێنەرە کە سەردەمی بەسەر چووە. بیل برادلی لە سەروبەندی

---

١١٦. پارتی ریفۆرمخوازی بریتانیا لە سەدەکانی ١٨ و ١٩دا کە دەیویست پەرلەمان بکاتە بالاترین دامەزراوەی سیاسیی وڵات. ئەم حیزبە لە سەدەی نۆزدەدا گۆڕدرا بۆ حیزبی لیبراڵ. و.ف

خانەنشینی و بەجێهێشتنی ئەنجومەنی سێنا و لە دووتوێی بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت لە کۆتاییی سەردەمی خزمەتگوزاریی ئەودا ئەگەر سیاسەتمەدارێک بە بێ لەبەرچاوگرتنی ئاستی خۆشەویستبوونی سیاسەتێک ئەو سیاسەتەی هەڵبژاردایە بە مرۆڤێکی گەمژە لەقەڵەم ئەدرا نەک مرۆڤێکی بوێر و نەترس. «ئەمە بەو مانایە دەهاتەوە کە لە سیاسەت نەگەیشتوویت».

لە سی ساڵی رابردوودا گەلێ مرۆڤی بەشەرەف و پایەبەرز ئەندامی ئەنجومەنی سێنا بوون، بەڵام ئەوان تەنیا سیاسەتمەدارن و مرۆڤی پیرۆز و موبارەک نین. ئەوان دەبێ لە سیستەمی سیاسیدا هەڵکەن و پێش کەون، [بەڵام] ئەم سیستەمە لەم ساڵانەی دواییدا لە بنەوە گۆڕدراوە. هەر لەبەر ئەمەشە کە لەم دە ساڵەی دواییدا کۆمەڵێکی زۆر لە باشترین ئەندامانی سێنا بە دڵخوازی خۆیان دەستیان لەکار کێشاوەتەوە. نزیک بە هەمووی ئەو کەسانە لە کاتی وازهێناندا لە سێنا دەیانوت سیستەمی سیاسی لە کۆنترۆڵ دەرچووە. سەیر لەوەدایە کە زۆربەی ئەم ژن و پیاوانە سەرەڕای ئەوەی کەسانێکی ژیر و زانا بوون، بە دەنگدان بۆ کۆمەڵێک ئاڵوگۆڕ سیاسەتی ئەمریکایان گۆڕی بۆ سیستەمێکی لەڕادەبەدەر وەڵامدەر کە لە سەر بنەمای راپرسی دەجووڵێتەوە. ئەوان ئەم کارەیان لە ژێر ناوی دیموکراسیدا بەڕێوە برد - ئەمە نموونەیەکی کلاسیکە لەو مەبەستە باشانەی بە لاڕێدا چوون.

## دەرگای کراوە بۆ مامەڵەکردن

کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتاکانی دەیەی ١٩٧٠ ئیدی ئەمە تەنیا حیزبە سیاسییە کۆنەکان نەبوون کە دەکەوتنە بەر هێرشەوە بەڵکوو هێرشەکان گەلێ شتی دیکەیشی گرتەوە. لەدوای «قەیرانی گەورە»ی دەیەی ١٩٣٠ هیچکات شەرعییەتی سیستەمی ئەمریکا بەم شێوەیە نەکەوتبووە بەر هێرشەوە. لەگەلێ رووداوی جۆراوجۆردا - لە بزاڤی مافە مەدەنییەکانەوە بگرە تا دەگاتە ڤییەتنام، واتێرگەیت و توندوتیژییەکانی «هاوینی گەرم و دوور و درێژ» — زۆرێ لە ئەمریکاییەکان بوونە دژبەری بنەماکانی حکوومەتەکەیان. لە سەرەتای حەفتاکانەوە و دوابەدوای دامرکانەوەی کەف و کوڵی شۆڕشگێڕانە، وردەوردە سیاسەتمەداران و بیرمەندان کەوتنە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ سەرنجدان بە قسەو داخوازییەکانی ڕەخنەگران. زۆرکەس دەترسان ئەگەر بێت و سیستەم ڕێک نەخرێتەوە ئەوا شەرعییەتی بنەماییی خۆی لەدەست دەدات. وەک زۆربەی نموونەکانی دیکەیش لە ئەمریکادا ڕێکخستنەوە مانای دێموکراتیزسێون.

کۆنگرێس کە وەڵامدەرترین لقی دەوڵەت بوو لە ریزی یەکەمینی گۆڕاندا بوو. کۆنگرێس بە دامەزراوەیەکی زۆر داخراو و هیرارشیک دەهاتە ئەژمار و بۆ ئەمەش گەلێ هۆکاری لۆژیکی و پڕ

قەناعەت لە بەردەستدا بوو، کەچی میتۆدی کارکردنی خۆی گۆڕی و دەسەڵاتی لە دەستەی سەرۆکایەتی سەندەوەو بەسەر کۆی ئەندامەکانیدا دابەشی کرد ، دەسپێکی ئەم ئاڵوگۆڕە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٠. کۆنگرێس دەرگاکانی بە رووی هەڵسەنگاندن و پرسیارلێکردنی هەرچی زیاتردا کردەوە و بە چەندەها رێگای جۆراوجۆر خۆی گۆڕی بۆ دامەزراوەیەکی وەڵامدەرتر. کۆنگرێس یاسای کۆکردنەوەی یارمەتییە داراییەکانی هەڵبژاردنیشی گۆڕی. بە گشتی کۆنگرێس خۆی و دواجار سیستەمی سیاسیی ئەمریکای دیموکراتیزە کرد.

سی ساڵ دوای ئەم ئاڵوگۆڕانە، نزیک بەهەرهەموو ئەوانەی پێوەندییان بەم رێفۆرمانەوە هەبوو - سیاسەتمەداران، رۆژنامەنووسان، چالاکان و بیرمەندان - لەسەر ئەو باوەڕەن کە بارودۆخەکەیان خراپتر کردووە. سێناتۆر جۆزێف بایدێن کە لە ١٩٧٣دا بوو بە ئەندامی کۆنگرێس، دەڵێت: «ئێمە دەمانویست چاکسازی لە سیستەمدا بکەین، بەڵام ئەو کێشانەی بەرهەممان هێنان گەلێ زۆرترە لەوانەی چارەسەرمان کردن. یاساکانی یارمەتییە داراییەکانی هەڵبژاردن، پێڕەوی ئەنجومەنی سەربەخۆ، هیچ کام لە ئامانجەکانمان نەپێکا». بێگومان سیستەمی پێشوو سیستەمێکی تەواو و بێ کەموکورتی نەبوو. ئەنجومەنی سێنا لە تەشقی ئۆلیگارشییەتی خۆیدا بۆ نزیکەی سەدەیەک سەرەکیترین لەمپەر بوو لە بەردەم پەسندکردنی یاسای مافە مەدەنییەکاندا. بەڵام سیستەمی تازەیش هەڵگری کۆمەڵە کێشەیەکی ئیفلیجکەری تایبەت بە خۆیەتی.

ئەو ئەندامانەی کۆنگرێس کە لە ١٩٧٤ و لە سەردەمی واتێرگەیتدا بوو بوونە ئەندام، شێوازی هەڵبژاردنی سەرۆکی کۆمیتەکانیان دیموکراتیزە کرد، واتە لە باتی هەڵبژاردنیان لەسەر بنەمای مەزنایەتی و گەورەیی، دەبا لە رێگای هەڵبژاردنە ناوخۆییەکانی حیزبەوە دیاری بکرایەن. سەرۆکی کۆمیتەکان دەسەڵاتیشیان کەم کرایەوە، بۆ وێنە پێشتر دەیانتوانی یاسای پێشنیارکراوی کۆمیتە لاوەکییەکان بە تەواوی پشتگوێ بخەن بەڵام لەمەو بەدوا دەبا لە بەرچاویان گرتبان. هەژماری کۆمیتە لاوەکییەکان نزیکەی لە سەدا ٥٠ زیادی کرد تاکوو بەم شێوەیە هەموو ئەندامانی کۆنگرێس دەرفەتی یاسادانیان بۆ بڕەخسێ. یاسا [ناوخۆییەکانیش] گۆڕدران و بەپێی یاسای تازە بە بێ ئەوەی ئەندامی پێشنیاردەر و ئەندامبوون و ئەندامنەبوونی لە کۆمیتەی پێوەندیداردا لەبەرچاو بگیرێ، دەکرا دەرکردە[117] و پیاچوونەوەی[118] بێشومار پێشکەش بکرێ و هیچ سنوورێک لە بەردەم ئەم بابەتەدا نەدەمایەوە. بۆ ئەوەی ئەم سیستەمە دیموکراتیکترە بتوانێ ئەرکەکانی راپەڕێنێ، هەژماری فەرمانبەرانی کۆنگرێس لە حەفتاکاندا نزیکەی لە سەدا ٥٠ زیادی کرد. هەروەها ئەم

117. Bill
118. Amendment

فەرمانبەرانە لە لایەن ئەندامانی ئاساییەوە دادەمەزرێنران نەک لە لایەن سەرۆک کۆمیتەکانەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە فەرمانبەران وابەستە و گرێدراوی ئەندامانی ئاسایی دەبوون.

کۆنگرێس لە رێکخراوێکەوە کە نزیکەی بیست کەس لە سەرۆکە بەهێزەکانی بە سەردا زاڵ بوو گۆڕدراوە بۆ کۆمەڵەیەک کە پێک هاتووە لە ٥٣٥ کارداهێنی[119] سەربەخۆی سیاسی کە هەرکەسەو سیستەم بە ئاراستەی بەرژەوەندیی تاکیی خۆیدا بەڕێوە دەبات کە گرنگترینیان بریتییە لە [زەمینە خۆشکردن بۆ] بردنەوەی هەڵبژاردنی داهاتوو. بە هەر پێوەرێک بیپێوین - دەرکردەکان، پیاچوونەوەکان، دەرکردە هەڵواسراوەکان - تێدەگەین کە ئەم سیستەمە گەلێ زیاتر لە پێشوو ملکەچی حەز و ئارەزووی دانە بە دانەی ئەندامەکانیەتی. تەنانەت بۆ کەسانێ کە ئەندامیش نین زیاتر لە جاران گوێ شل دەکات. یەک لە گرنگترین ریفۆرمەکانی دەیەی ١٩٧٠ ئەوە بوو کە بەرەبەرە کۆبوونەوەی کۆمیتەکان بە ئاشکرا بە رێوە دەبرا و دەنگی ئەندامان تۆمار دەکرا.

پێشتر سەرۆک کۆمیتەکان کۆبوونەوەکانی نووسینەوەی دوادەقی دەرکردەکانیان بە نهێنی و لە پشت دەرگای داخراوەوە گرێ دەدا و تەنیا ئەندامانی کۆمیتە و هەژمارێکی زۆر کەمی نوێنەرە بەرزەکان دەیانتوانی بەشداری لەو کۆبوونەوانەدا بکەن. لە ١٩٧٣ بەدواوە نەتەنیا دەرگای کۆبوونەوەکان بۆ هەمووان ئاوەڵا و کراوە بوو بەڵکوو دانە بە دانەی دەنگەکانی ئەندامانیش بە شێوەی رەسمی تۆمار دەکرا. بەرلەم بەرواره لە کاتی دەنگداندا بۆ پیاچوونەوەکان ئەندامان دەچوونە نێو کۆریدۆرەکانەوە و لەوێوە دەنگی ئەرێ یان نەخێریان لەسەر دەدا و [تەنیا] دوائاکامی دەنگەکان تۆمار دەکرا و هەڵوێستی دانە بە دانەی ئەندامان بە شاراوەیی دەمایەوە. هەنووکە هەرهەموو ئەندامان دەبێ لەسەر هەموو پیاچوونەوەیەک بە شێوەی ئاشکرا دەنگ بدەن. مەبەست لەم ئاڵوگۆڕانە ئەوە بوو کە کۆنگرێس بکرێتە [دەزگایەکی] کراوەتر و وەڵامدەرتر، بەم شێوەیە کۆنگرێس لە بەرانبەر پارە و لۆبییەکان و گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکانیشدا کراوەتر و وەڵامدەرتر دەردەکەوت.

زۆربەی ئەمریکاییەکان نە کاتی پێویستیان بۆ بەدواداچوون و چاودێریکردنی کاروباری رۆژانەی کۆنگرێس هەیە و نە حەزیش لەم کارە دەکەن، بەڵام لۆبییەکان و چالاکان ئەم تایبەتمەندییانەیان هەیە و دەتوانن لە زانیارییەکان و دەرفەتی لەبەردەستدابوون[ی کۆنگرێس] کەڵک وەربگرن بۆ ئەوەی دڵنیا ببنەوە لەوەی کە ئەو گروپانەی ئەمان نوێنەرایەتییان دەکەن لە بوودجەی فیدراڵ و یاسا و مافەکاندا بە رادەی پێویست ئاوڕیان لێ دراوەتەوە. ئەمە تەنیا تایبەت بەو لۆبییانە نییە کە بە دوای سەرمایەو پارەوەن، لە هەموو رووبەرێکدا - لە یاساکانی زیان و خەسارەتەوە بگرە بۆ

119. entrepreneur

سیاسەتی ئەمریکا لە بەرانبەر کووبادا و تا دەگاتە ڕێژەی تەرخانکراو بۆ دانی پەنابەری ـ گرووپە خاوەن بەرژەوەندییە ڕێکخراوەکان ـ بە بێ ئەوەی ئاستی بچووکبوونی ناوچەی هەڵبژاردنەکانیان گرنگ بێت ـ ئامادەی مەیدانەکەن و دەتوانن دڵنیا ببنەوە لەوەی کە دەوڵەت تەسلیمی داخوازییەکانیان دەبێت. ئەو ریفۆرمانەی لە پێناو پێکهێنانی دەسەڵاتی زۆرینەدا خرابوونە گەڕ بوونە هۆی پێکهاتنی دەسەڵاتی کەمینە.

ڕۆبێرت پەک وود کە لە ١٩٦٩وە تا ئەوکاتەی لە ١٩٩٥دا دەرکرا لە سێنا کاری دەکرد، لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت ئەم ریفۆرمانە بوونەتە هۆی ئەوەی ئەندامانی کۆنگرێس نەتوانن بە ئاسانی بەپێی خاڵە پۆزەتیڤ و نیگەتیڤەکان بڕیار لەسەر دەرکردەکان بدەن:

بە ڕاستی زۆربەی ئەندامان دەیانویست ئەو کارە بکەن کە پێیان وابوو لە چوارچێوەی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکاندایە. کەچی ئەم کارە هەمیشە ئاسان نەبوو. بەڵام پێش ڕاگەیاندنی یاساکانی ریفۆرم[١٢٠] (کە بەو پێیە دەبا کاروباری دەوڵەتی بە ئاشکرا بەڕێوە برایەت) گەلێ ئاسانتر بوو. ئەگەر ئەندامی گرووپێکی خاوەن بەرژەوەندی هاتبا بۆ لات دەتگوت: «زۆرم هەوڵدا پشتگیریتان لێ بکەم بەڵام سەرۆک ڕازی نەبوو». ئینجا بۆ پاراستنی خۆت داوات لە سەرۆک دەکرد ئەگەر چوونە لای پێیان بڵێت تۆ لەسەر بابەتەکەی ئەوان هەوڵێکی گەورە و بێوچانت داوە.

بەڵام دوابەدوای ئەوەی لۆبییەکان ئاگاداری دانەبەدانەی بڕیارەکانت بوونەوە دەیکەنە چەکێک و دژی خۆتی بەکار دەهێنن. داڵ بامپێرز لە ئەندامانی پێشووی ئەنجومەنی سێنا، دەڵێت:

ئەم تاقمانە بۆ بەرنگاربوونەوەی هەر کەسێک لە دژیان وەستابا، شێوازی زۆر توندوتیژیان بەکار دەهێنا. لە پڕ هەموو دەنگێک پێشهات و ئاکامی سیاسیی لێ دەکەوتەوە. وردە وردە کۆنگرێس لە بابەتە دژوارەکاندا دەستی دایە فریوکاری و ئەگەر بەرەورووی لەمپەرێک بوایەتەوە و نەیتوانیبا قەدبڕی بکا و خۆی لێ ڕزگار بکا، هەڵوێستێکی دوولایەنە و لێڵ و پێڵی وەردەگرت... نالێم ئەم گرووپانە خاوەن بەرژەوەندیی ڕەوا نین، بەڵکوو [کێشەکە لەوەدایە کە] ئەوان لەئاست هەموو بابەتێکی بچووکدا بە نانەوەی ئاژاوە و هەرا و زەنا پرۆسەی یاسادانان قەدبڕ دەکەن و لەئاکامدا کاروباری کۆنگرێس پەک دەخەن، جەماوەر بێزار دەکەن و دواجار بشێوەیەکی قۆڕ دەخەنەوە. [٧]

یەک لەو نموونە دەگمەنانەی ئەم دواییانە کە کۆنگرێس بەرنگاری هەموو گوشار و زەختە قورسەکانی گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان بوویەوە و کۆڵی نەدا، پەسندکردنی یاسای ریفۆرمە

---

١٢٠. Lawssunshine: ئەو کۆمەڵە یاسایانەی ئیدارە دەوڵەتییەکانی ئەمریکا مەجبوور ئەکات کراوە بن و خۆیان بخەنە بەردەست هەمووانەوە. و.ف

کشتگیرە ماڵیاتییەکان لە ساڵی ١٩٨٦دا بوو کە بە پشتیوانیی پتەو و بە برستی هەردوو حیزبەکە بە ئەنجام گەیەنرا. ئەم ریفۆرمانە دەرگای سەدان رێگای قەدبڕ کردنی یاسا و سۆبسیدی[121] شاراوەی داخست. دۆن رۆستێنکۆسکی، ئەندامی پێشووی کۆنگرێس و سەرۆکی پێشووی کۆمیتەی «میتۆدەکان و سەرچاوەکان» کە یەکێک بوو لە دارێژەرانی ئەو یاسایە، پێی وایە هۆکاری پەسندکردنی ئەو یاسایە تەنیا و تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو پێی داگرتبوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ نووسینەوەی دوادەقی دەرکردەی یاساکە بە نهێنی و لە پشت دەرگای داخراو بەئەنجام بگەیەنرێت. «ئێمە نامانەوێ خەڵک پشتگوێ بخەین، بەڵکوو کێشەکە ئەوەیە کە لۆبییەکان، گروپە خاوەن بەرژەوەندییەکان و تاقمە بازرگانییەکان هەرکامەو پرۆژە و گەلاڵەی دڵخوازی خۆیان هەیە. ئەگەر نووسینەوەی گەلاڵەیەک بە ئاشکرا ئەنجام بدرێ نوێنەرانی کۆنگرێس ئاوڕ لە ئەندامانی لۆبییەکان دەدەنەوە و ئەوانیش بە ئاماژەی سەر، دەنگی ئەرێ یان نەخێریان بۆ دیاری دەکەن»[122].

## چەقبەستوو لە رابردوودا

هاوکات لەگەڵ گەورەتربوونەوە و کرانەوەی زیاتری دەوڵەتی ئەمریکادا، ئەو گروپانەش کە داخوازییەکانیان دەبەنە بەردەم دەوڵەت - واتە لۆبییەکان - بوونەتە بە پیت و بەرەکەتترین بازرگانی لە واشینگتۆندا. وەک هەموو مەسەلە پێوەندیدارەکانیتر لەم بابەتەوە، دەسپێکی پەرەسەندنی لۆبییەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ شەستەکان و تا ئێستایش هەر بەردەوامە. لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا رێژەی ئەندامانی تۆمارکراوی لۆبییەکان لە واشینگتۆندا ٥٠٠٠ کەس بوو. ئەم رێژەیە

---

121. Subsidy

١٢٢ . ئەڵبەت لۆبییەکان دوای نووسینی یاساکە هەموو هەوڵێکیان خستە گەڕ بەڵام نەیانتوانی کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە سەر دانێن. جەیمز تێربێر، توێژەری زانستە سیاسییەکان، لە بیرەوەرییەکانیدا چیرۆکی ئەوکاتانە دەگێڕێتەوە کە لە ١٩٨٦ لە کۆبوونەوەی یاسای پیاچوونەوەی ماڵیاتەکان لە کۆنگرێسدا سەیری ئەندامانی لۆبییەکانی دەکرد کە بە مۆبایلەکانیانەوە ئامادەی کۆبوونەوەکە دەبوون: «ئەوان رێک لەو ساتە وەختانەدا کە نوێنەرێک تەنانەت بیری لە پێشنیاری گۆڕینی یەک لە ئیمتیازە ماڵیاتییەکانیش ( Tax privileges) ئەکەردەوە دەستیان دەکرد بە تەلەفۆنکردن. ئەوان بە تەلەفۆن لایەنە خاوەن بەرژەوەندییەکانیان ئاگادار دەکردەوە و دوابەدوای ئەمەش شەپۆلێکی گەورەی نارەزایی بە هەناردنی نامە و فاکس و پێوەندیی تەلەفۆنی دروست دەبوو. هیچ دەرفەتێک بۆ بیرکردنەوەی نوێنەران لە پێشهاتەکان و لەوەی خەریکە دەقەومێ نەماوەتەوە. پێشتر چەند مانگ یان چەند حەفتە و لانیکەم چەند رۆژ دەرفەتت هەبوو، بەڵام ئێستا رەنگە تەنیا چەند چرکەیەک دەرفەتت هەبێ و ئیدی ئەم شەپۆلە تۆیش دەگرێتەوە».

تاکوو ساڵی ١٩٧٠ دووقات بوویەوە و تا ساڵی ١٩٩٠ سەرلەنوێ دووقات بوویەوە. هەموو یاسایەکی پێشنیاردراو وەک [شتێکی] پڕ پێچ و قەمچی بێسەروبەر دەبوو بە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵە لۆبییەکی تازە کە ئامانجیان بەدەستهێنانی بەشێک لە بوودجەی فیدراڵ یان پاراستنی بەشی تەرخانکراوی پێشوویان بوو. یەک لە باشترین رۆژنامەنووسانی واشینگتۆن، جاناتان راچ، لە راپۆرتەکەیدا وتوویەتی لە ساڵی ١٩٧٩دا ١١٧ گرووپی چالاک لە بەستێنی کاروباری تەندروستی و دەوا و دەرماندا لەواشینگتۆن کاریان دەکرد. لە ١٩٩٣ و دوابەدوای یاسای پێشنیاردراوی دەوڵەتی کلینتۆن سەبارەت بە ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لەم رووبەرەدا، ئەم رێژەیە حەوت قات زیادی کرد. تەنانەت سەرەڕای پەسندنەکردنی یاسای پێشنیاردراوی کلینتۆن، نزیک بە هەموو ئەم تاقمە تازە هەڵتۆقیوانە درێژەیان بە کار دا و لە بابەتە دڵخوازەکانی خۆیاندا کۆنگرێسیان دەخستە ژێر زەخت و گوشارەوە.

راچ لە دووتوێی کتێبە گرنگەکەیدا بە ناوی *گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان*[١٢٣] و لەبەر رۆشنایی بۆچوونی «مەنکۆر ئۆلسێن»ی ئابووریزان و لە رێگای پەرەپێدانی[١٢٤] ئەو بۆچوونانەوە، پێی وایە فرەبوونی هەژماری گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان دەوڵەتی ئەمریکای بەتەواوی شپرزە کردووە. واشینگتۆن تەنانەت ناتوانێ بۆ هیچ کام لەگەڵاڵە دەوڵەتییەکان [بەرنامەی] هاوسەنگیکردن و دابەزاندن[١٢٥] بەرێوە بەرێ چ بگا بەوەی لایانبەرێ، جا گرنگ نییە ئەو گەڵاڵانە چەند سواو و بێکەڵک بن. نموونەیەکی رۆتینی ئەم بابەتە کە راچ ئاماژەی پێ داوە، سۆبسیدی مۆهایرە.[١٢٦]

لە ١٩٥٤دا خوری لە جلوبەرگی نیزامیدا بەکار دەهێنرا، هەر بۆیە بە «کاڵایەکی ژیانبەخشی ستراتیژیک» دەهاتە ئەژمار. بەم شێوەیە دەوڵەت سۆبسیدی تایبەتیی بۆ بەرهەمهێنەرانی خوری تەرخان کردبوو و زیاتر لە سەد میلیۆن دۆلاری دەبەخشییە خاوەن رانەکان و بەرهەمهێنەرانی خوری کە نیوەی کۆی ئەم برە پارەیە تەرخان کرابوو بۆ تەنیا یەک لە سەدی ئەو کەسانە.

وەک زۆربەی سۆبسیدە هاوشێوەکانیتر ئەم سۆبسیدەیش بە هیچ شێوەیەک سەرکەوتوو نەبوو و بوو بە هۆی پەککەوتنی هەرچی زیاتری پیشەسازیی خوری. بەڵام ئەمە تەنیا دەسپێکی ئەم

---

١٢٣: Demosclerosis گرووپە خاوەن بەرژەوەندییە تازەکان (بنەچەی ئەم وشەیە یۆنانییە) کە ئامانجیان بەدەستهێنانی بوودجە گشتییەکانی دەوڵەتە. و.ف

124. To expand

125. Balance andadjustment

١٢٦: Mohair جۆرە خورییەکە لە تووکی بزنە کێوی بەرهەم دێت.

چیرۆکەیە. شەش ساڵ دواتـر تـاڵە دەسـتکردەکانی[١٢٧] وەک لاکـرۆن جێـی خورییـان گـرتەوە و بەم شێوەیە خوری ئیدی لە ریزی کالا ستراتیژیکەکانی پێنتاگۆندا نەما. بەڵام لۆبیی خـوری کەوتە خـۆ و کۆنگرێسی گەیاندە ئەو قەناعەتەی درێژە بە بەخشینی سۆبسید بدات. هەرچەند لە هەمان ساڵی ١٩٦٠دا سۆبسیدی خوری هەموو ماناکانی خۆی لەدەستدا، بەڵام تا سێ دەیە دواتـریش بە هەمـان ئاست و رێژەی پێشوو درێژەی پەیدا کرد. دواجار کـۆنگرێس کە لەم هەمـوو هەڵەخەرجییە تەریـق دەبوویەوە ـ بیرمان نەچێ ئەم بابەتە کەوتبووە بەر سـەرنجی فراوانـی رای گشـتییەوە ـ لە ١٩٩٣دا یاسای ئەو سۆبسیدەی هەڵوەشاندەوە بەڵام نەیتوانی لۆبییەکەی هەڵبوەشێنێتەوە. هەوڵ و تەقالای بێوچانی لۆبیی خوری دوای چەند سـاڵ هـاتە بەرهەم و بە بـێ ئەوەی بێـتە مـایەی سەرسـوورمانی هـیچکەس سـەر لە نـوێ یاسـای سۆبسـیدی خـوری دامەزرایەوە. [هەرچەنـد] ئەم جـارە رێژەیەکـی کەمترە و پێویستیشـە هەمـوو سـاڵێک سـەر لە نـوێ پەسـند بکرێتەوە، بەڵام وادیـارە ئەم بـابەتە نەبـۆتە هـۆی نیگەرانیـی لـۆبیی خـوری. کەمتـرین سـوودی ئەوەیەکە ئەم لـۆبییە کارێکیـان هەیە ئەنجامی بدەن.

ئەم نموونەیە سەد هەزار قـات گەورەتـر بـکەنەوە ئینجا کەمێـک لەو وتەیەی راچ تێـدەگەن کە دەڵێت دەوڵەتی ئەمریکا «بۆتە کۆمەڵە گەلالەیەکی نەگۆڕ و کەڵەکەکراوی زۆر مەزن و بەستوو کە گیرۆدەی قەیرانێکی دارایی هەمیشـەیی و ئەبەدییە». [بەمەشـەوە] سۆبسـیدی خـوری بە مانـایەک نموونەیەکی نائاساییە، چونکـوو دواجـار هەڵوەشـێنرایەوە و ئینجا کەم کـرایەوە. وەرزێڕانـی لـۆکە گەلێ باشتر جووڵاونەتەوە؛ لە ئەمریکادا تەنیا ٢٥٠٠ وەرزێڕی لۆکەمـان هەیە کە کـۆی داهاتیـان بە شێوەی مامناوەنـدی[١٢٨] ٨٠٠هەزار دۆلارە، بەڵام دوو میلیـارد دۆلار سۆبسـید لە دەوڵەت وەردەگـرن. ئەورۆکە زۆربەی گەلالە دەوڵەتییەکان گەلاڵەگەلێکی هەمیشەیین.

زیاتر لە ٢٠٠ ساڵە سۆبسید دەدرێتە کەشتیوانی[١٢٩]، ئەمە لە حاڵێکدایە کە پێنتـاگۆن دەمێکە خـاوەن کـاروانی دەریـاییی خـۆیەتی و هەر خۆیشـی بەرێـوەی دەبـات. سۆبسـیدی وەرزێـڕی لە سەردەمی «قەیرانی گەورە» و لە دەیەی ١٩٣٠دا بە شێوەی کاتی پەسند کرا، کەچی تا ئەمرۆیش هەر درێـژەی پەیـداکردووە و هەنـووکە هێنـد پرکێشـە و گاڵتەجـارە [مـرۆڤ بـاوەڕ ناکـات]؛ پـارە دەدرێـتە وەرزێـڕان تـاکوو دەغـڵ و دان بەرهەم بهێـنن و پاشـان لە نـاوی بەرن. بەم دوایيـانە گەلاڵەیەک خرایە بەردەست کە پشتیوانیی هەر دوو حیـزبەکەی لەگەڵـدا بـوو، بەپێـی ئەم گەلاڵەیە

127. Unnatural fibers
128. On the average
129. Shipping

دەوڵەتی جۆرج بووش کە لایەنگری بازاڕی ئازادە و کۆنگرێس کە لە ئاست کاروباری داراییدا خۆی بە بەرپرسیار و وەڵامدەر دەزانێ، سەرەڕای هەموو زەختە بوودجەیی و بازرگانییە فراوانەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم سۆبسیدانە، کەچی بەربڵاوتریان کردەوە.

بە درێژاییی مێژووی ئەمریکا هەمیشە بە جۆرێک لە جۆرەکان لابیمان هەبووە و سەرۆک کۆمارەکانی ئەو وڵاتەش ـ لە گرۆڤێرکۆلیولەندەوە بگرە تا دەگاتە کالڤین کۆلیج ـ سەرکۆنەیان کردووە. هۆکاری بەرزبوونەوەی لەڕادەبەدەری هەژمار و کاریگەریی لۆبییەکان لە سەرەتای شەستەکان بەدواوە تا رادەیەک دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستییەی کە لەم سی چل ساڵەی رابردوودا دەوڵەت زۆر گەورەتر بۆتەوە و بڕە پارەیەک کە دەتوانی لە رێگای لابیکردنی کاریگەرەوە کۆی بکەیتەوە بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە. هۆکارێکیتر کە بە هەمان ئەندازە گرنگە ئەوەیە کە ئێستە [هەمووان] دەتوانن بە شێوەیەکی بێوێنە کۆنگرێس بخەنە ژێر چاودێرییەوە و کاریگەریی لەسەر دانێن. هەر بۆیە لۆبییەکان کە زیاتر لە هەموان کۆنگرێس دەخەنە ژێر چاودێرییەوە و کاریگەریی لەسەر دادەنێن، بە بەراورد لەگەڵ لایەنی بەرانبەردا، واتە دەوڵەت، دەسەڵاتێکی زیاتریان بەدەست هێناوە.

لیبراڵ بین یان کۆنسێرڤاتیست، بێگومان ئاوەها دۆخێک نیگەرانمان دەکات. ئەم دۆخە لای کۆنەپارێزان مانای ئەوەیە کەمکردنەوەی خەرجەکانی دەوڵەتی فیدراڵ ئامانجێکی دوورە و نایەتە دی. لە سەرەتای هەشتاکانەوە سێ سەرۆک کۆماری کۆماریخواز (رۆناڵد رەیگان، جۆرج بووش و جۆرج دەبلیۆ بووش)، سەرۆک کۆنگرەیەکی کۆماریخواز (نیوت گینگریچ) و سەرۆک کۆمارێکی دیموکرات (بیل کلینتۆن) هەوڵی کەمکردنەوەی خەرجەکانی دەوڵەتی فیدراڵیان داوە، بەڵام واقیعی دەسەڵاتی گروپە خاوەن بەرژەوەندییەکان کۆسپی بەردەم هەرهەموویان بووە. رۆناڵد رەیگان بە درێژاییی هەشت ساڵ هەرچی هەوڵیدا تەنیا لە راگرتنی چوار گەڵاڵەی دەوڵەتیدا سەرکەوتوو بوو و هیچیتر. دەیڤید ستاکمەن، بەرپرسی بوودجەی [دەوڵەتی] رەیگان کە زۆر پیداگرانە بەدوای بەئەقڵانیکردنی[130] بوودجەی فیدراڵەوە بوو، لەوپەڕی نائومێدیدا گەشتە وەها دەرئەنجامێک کە لە ساڵی ١٩٨٤ەوە «کۆشکی سپیی رەیگان تەقریبەن هیچ جۆرە سیاسەتێکی تۆکمەی بۆ بەرنگاربوونەوەی خەرجەکان پێ نەبوو». بووشی باوک کە دوای رەیگان لە ١٩٨٩دا بوو بە سەرکۆماری ئەو وڵاتە تاکتیکێکی جیاوازی گرتە بەر و کۆمەڵە یاسایەکی بۆ راگرتنی ٢٤٦ گەڵاڵەی بچووکی دەوڵەتی پێشکەش کرد. ئەوەی لەم رێگایەوە دەگەڕایەوە زۆر کەم و نزیکەی ٣/٥ میلیارد دۆلار بوو کە دەیکردە لە سەدا ٢٥/٠ی کۆی خەرجەکانی دەوڵەتی فیدراڵ. کەچی بەمەشەوە دواتر

130. Rationalization

دەرکەوت کە جۆرج بووش گەلێ بەرزەفڕ بووە، دوای تاوتوێکردنی پێشنیارەکان لە کۆنگرێسدا تەنیا هەشت گەڵاڵە راگیرا کە کۆی ئەو برە پارەی لەم رێگایەوە دەگەڕایەوە تەنیا ٥٨ میلیۆن دۆلار بوو. هەروەها بوودجەی پێشنیار دراوی ساڵی ١٩٩٤ی بیل کلینتۆنیش کە بە خاڵی وەرچەرخان و بوودجەیەکی سەرکەوتوو دەهاتە ئەژمار، [تەنیا] ٤١ گەڵاڵەی بچووکی راگرت کە بە گشتی دەیکردە لە سەدا ٠/٠١ی بوودجەی فیدراڵ.

شۆڕشی ١٩٩٤ی کۆماریخوازان تاقیکارییەکی جیدی بوو بۆ تیۆرییەکەی راچ. نیوت گینگریچ و هاوڕێ تازە نەفەسەکانی بەو رێبازە حیزبییەوە هاتنە سەرکار کە دەیانەوێ میتۆدی کارکردنی واشینگتۆن بگۆڕن و بەتایبەت سۆبسیدە بێکەڵکەکان هەڵبوەشێننەوە. پاش چوار ساڵ شۆڕشی کۆماریخوازان کەوتە ئاویلکە، گینگریچ وازی لە سەرۆکایەتیی کۆنگرێس و تەنانەت لە نوێنەرایەتیش هێنا. گینگریچ کە سەردەمانێ بەهێزترین سیاسەتمەداری ئەمریکا بوو ئێستا بۆتە لێکۆڵەری کەناڵی دەنگوباسی فۆکس نیوز. ئەو هەرچەند تووشی چەندین هەڵەی سیاسی بوو، بەڵام هەم خۆی و هەم کۆماریخوازان زۆر باش لەو حەقیقەتە گەیشتن کە گۆڕینی واشینگتۆن بەو ئاسانییەش نەبوو کە بیریان لێ دەکردەوە.

دەسپێکی کاری کۆماریخوازان لە ١٩٩٥دا پێشکەشکردنی بوودجەیەک بوو کە [بڕیار بوو] ٣٠٠ گەڵاڵەی دەوڵەتی رابگرێت کە زۆربەیان گەڵاڵەگەلی «خۆشگوزەرانیی گشتی»[١٣١] بوون و ئەگەر راگیرابان ١٥ میلیارد دۆلار دەگەڕایەوە. لۆبییەکان خێرا کەوتنە خۆ. لایەنگرانی ئەم جۆرە «هەڵەخەرجییانە»ی بوودجەی فیدراڵ لە پێناو پاراستنی ژیانی خۆیان یان لە راستیدا بۆ پاراستنی سەرچاوەی بژیویان خەباتێکی بێوچانیان خستە گەڕ. لە بەرانبەردا جەماوەر کە دەبا نووسینگەکانی کۆنگرێسیان پڕ کردبا لە فاکس و داخوازینامەی کەمکردنەوەی خەرجەکان، ئەم کارەیان نەکرد. ئەمە نیشاندەری ئەوە بوو کە زۆربەی ئەمریکاییەکان لە دونیای تیۆردا خوازیاری دەوڵەتێکی بچووکترن بەڵام ئامادە نین تەلەفۆن بۆ ئەندامانی کۆنگرێس بکەن. بەڵام ئەوانەی بەرژەوەندییان لە سۆبسیدە دەوڵەتییەکاندا بوو بە کۆمەڵ و بە لێشاو ئەم کارەیان کرد. چەند مانگ دواتر کۆماریخوازان کارەکانی خۆیان تەواو کرد کە لە بوودجەی پەسندکراویاندا تەنیا ١/٥ میلیارد دۆلار گەڕایەوە، واتە تەنیا یەک بە دەی ئەوەی پێشبینی کرابوو کە دەیکردە لە سەدا ٠/٠٠١ی کۆی بوودجەی وڵات[١٣٢] لەو بەڕوارە بەدوا کۆنگرێس تەنیا تۆسقاڵێک باشتر جووڵاوەتەوە و

131. General welfare

١٣٢ . وا دیارە ئەم رێژەیە بە هەڵە تۆمار کراوە، بەتایبەت کە لە دێڕی دواتردا رێژەی کۆی بوودجە ١٨٠٠ میلیارد دۆلار تۆمار کراوە و بەم پێیە لە سەدا ٠/١ گونجاوترە. و.ف

دوو میلیارد دۆلاری لە خەرجەکان کەم کردۆتەوە (لە کۆی ١٨٠٠ میلیارد دۆلاری بوودجەی فیدراڵ). کاتێک پەرەسەندنی چاوەڕواننەکراوی ئابووری بوو بە هۆی زیادبوونی بێوێنەی بوودجە، وردە وردە بۆچوونێک پەیدا بوو کە دەیوت پێویست نییە خەرجەکان کۆنترۆڵ بکەین؛ لە ئابووریی نوێدا هەمیشە پارە دەچێتە خەزێنەی دەوڵەتەوە.

ساڵی ٢٠٠٠ جۆرج بووش بە ڕاگەیاندنی دوو بەڵێنی ماڵی هاتە سەر دەسەڵات: کەمکردنەوەی پیتاک و دابەزاندنی خەرجەکان. وەک هەمیشە [ئەمجارەش] دەرکەوت کە کەمکردنەوەی پیتاک گەلێ ئاسانترە لە کەمکردنەوەی خەرجەکان. لەوکاتەوە کە جۆرج بووش هاتۆتە سەرکار، تەنانەت ئەگەر خەرجە نیزامییەکانی پەیوەست بە ١١ی سێپتامبریش لەبەرچاو نەگرین، بەپێی ڕێژەیەک لە سەراپای بەرهەمی ناوخۆیی خەرجەکانی دەوڵەتی فیدراڵ بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە. خەرجەکانی دەوڵەتی فیدراڵ لە دوو ساڵی یەکەمی سەرۆک کۆماریی بووشدا زیاتر بوو لە پێنج ساڵی یەکەمی سەرۆک کۆماریی کلینتۆن. کێڤین هاسێت ئەندامی ڕێکخراوی ئەمریکاییی ئینتەرپرایز سەبارەت بە گەڵاڵەی دەوڵەتی بووش بۆ کەمکردنەوەی پیتاکەکان ئەڵێت: «دەیانوت ئەم کارە دێوە برسییەکە لە پێ دەخات، بەڵام ئێمە گیرۆدەی دێوێکین بە هەر شێوەیەک بێت خواردنی خۆی دابین دەکات». [٨]

ئەم شکستە لای لیبراڵەکان مانای ئەوەیە لە ئەمریکادا هەوڵدان بۆ [سڕینەوەی] کێشەکان یان دۆخە نوێیەکان بە ڕادەیەکی زۆر بۆتە کارێکی مەحاڵ و نامومکین. فرەتر کردنەوەی پیتاکەکان کارێکی نەکردە و نەشیاوە، چونکوو ئەمریکاییەکان کاتێ پیتاکی ئەیالەتی، ناوچەیی و داهاتی[١٣٣]، لەسەر یەک کۆ دەکەنەوە پێیان وایە پیتاکێکی زۆریان لێ وەردەگیرێ کە هێندەش دوور لە ئەقڵ نییە. بەم شێوەیە هەر تاکە دۆلارێک کە تەرخان دەکرێ بۆ سۆبسیدی خوری یان لێکۆڵینەوەی ململانێی ئاسپاراگوس[١٣٤] لە ڕاستیدا بە مانای ئەوەیە کە دۆلارێک کەمتر بۆ فێرکاری، کۆپۆنی خواردنی هەژاران یان ژێرخانە نوێیەکان[١٣٥] تەرخان دەکرێت. هەروەها هەمووان دەزانن کە گەڵاڵە تازەکان قەت ڕاناگیرێن، هەربۆیە خواستی ئافراندنی گەڵاڵەی تازە بەردەوام زیاتر و زیاتر پەرە دەسێنێ. فرانکلین ڕۆزڤێڵت، پێی وابوو پێویستە دەوڵەت خۆ لە قەرەی «تاقیکاریی بوێرانە و درێژخایەن» بدات. بەڵام وەک چۆن ڕاچ ئاماژەی پێداوە، لەو سەردەمەدا ئەو گرووپە خاوەن بەرژەوەندییانەی دەرگایان بە ڕۆزڤێڵت دەگرت زۆرکەم بوون، ڕۆزڤێڵت لەبەر ئەوە دەیتوانی

---

133. Incomtax

١٣٤. جۆرە گیایەکە (asparagus struggle).

135. Newbases

گەلاڵەی نوێی فراوان بکاتەوە کە هاوکات دەیشیتوانی گەلاڵە سەرنەکەوتووەکان رابگرێت. لە دەوڵەتی ئەورۆدا هەوڵدان و هەڵەکردن شتێکی مەحاڵە، چونکوو ئیدی ناتوانی هەڵەکان قەرەبوو بکەیتەوە. دەوڵەتی فیدراڵ رۆڵی پارێزڤانی هەمیشەییی دۆخی هەنووکە دەگێرێ. پیشەسازی و کێشە و دەرفەتەکانی داهاتوو خاوەن لابی نین؛ بەڵام ئەوانەی هی رابردوون لۆبییان هەیە.

ئەگەر خەڵک پێیان وابێ دەوڵەت ناتوانێ خەرجەکان و ئەولەوییەتەکانی لەسەر بنەمای هیچجۆرە هۆکار یان لۆژیکێک بەڕێوە ببات، ئەوکات بۆ چارەسەرکردنی کێشە تازەکان متمانەی پێ ناکەن. یەک لە دیارترین گۆڕانکارییەکانی چەند دەیەی رابردوو بریتییە لە سەرهەڵدانی بەربڵاوی جۆرە بۆچوونێک لە ناو لاواندا کە پێی وایە بێگومان سەرچاوەی گۆڕانکاریی راستەقینەی کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی [چوارچێوەی] دەوڵەتدایە لە رێکخراوە نادەوڵەتییەکاندا، ناوەندەکانی توێژینەوە، چاپەمەنییەکان یان تەنانەت لەکۆمپانیاکانی کەرتی تایبەتدا. ئەورۆ لە ئەمریکادا دەوڵەت وەک دێوەزمەیەک وێنا کراوە کە هێند زەبەلاحە توانای بزووتنی نییە و لە رابردووی خۆیدا قەتیس ماوە و [هیچ] پەرچەکردارێکی بۆ کێشەکانی داهاتوو پێ نییە. ئایا پێتان سەیرە ئەگەر لاوانی زیرەک و ئینێرژیک خۆیانی لێ دوور بخەنەوە؟

خودی راچ دان بەوەدا دەنێت کە «رەنگە دەوڵەتی ئەمریکا گەشتبێتە قۆناغێک و ئیدی هەر لەو قۆناغەدا قەتیس بمێنێ: پێکهاتەیەکی پان و پۆڕ و زۆرجار شپرز و نەرم هەڵنەگر کە لە سەدا ١٠ تا ٢٠ی لە ژێر کۆنترۆڵی سیاسەتمەداران و دەنگدەراندایە و لە سەدا ٨٠ تا ٩٠یشی کەوتۆتە ژێر کۆنترۆڵی هەزاران هەزار تاقمی نانخۆرەوە. گۆڕانکارییەکان تەنیا پەراوێزەکانی دەگرێتەوە کە ئەوانەش زۆربەیان بەپێی ویستی هەمان ئەو تاقمە نانخۆرانە روو دەدەن. بەڵام هیچ جۆرە ئاڵوگۆڕێکی میتۆدیک یان ئاڵوگۆڕێک کە بەرژەوەندییەکانی کەمینەیەک لەم گروپانە بخاتە بەر مەترسییەوە قەت روو نادات». ئەمە سەرەکیترین کێشەی ئەورۆی ئەمریکایە. ئەمریکاییەکان وادەزانن هیچ جۆرە کۆنترۆڵێکیان بەسەر دەوڵەتەکەیاندا نەماوە، بەڵام نازانن کە خودی سیاسەتمەدارانیش کۆنترۆڵی دەوڵەتیان لەدەست دەرچووە. زۆربەی نوێنەرانی کۆنگرێس و سێناتۆرەکان لەسەر ئەو باوەڕەن لە سیستەمێکی سیاسیدا دەژین کە هەر چەشنە هەوڵێکی جیدی بۆ گۆڕانکاریکردن، بەرەورووی دژایەتیی خێرا و یەکگرتووی ئەو کەمینە بچووکانە دەبێتەوە کە گۆڕان زیانیان لێ دەدات. لە راستیشدا هەر ئەم کەمینانە واشینگتۆن بەڕێوە دەبەن.

## خەسارەکانی دەستەبازی[136]

دامەزرێنەرانی ئەمریکا زۆر نیگەران بوون لەوەی کەمینە بچووک و پرۆفێشنالەکان [دونیای] سیاسەت قۆرخ بکەنە دەست خۆیان. مەدیسۆن بە باشترین شێوە ئەم ئەگەرەی دەسنیشان کردبوو و ناوی نابوو «خەسارەکانی دەستەبازی»، ئەمە دیاردەیەکە دەبێتە هۆی «بێسەقامی، ناعەدالەتی و بشێوی... کە لە راستیدا کۆمەڵە نەخۆشییەکی کوشندەن و لە هەر شوێنێکدا سەریان هەڵدابێ بوونەتە هۆی لەناوچوونی دەوڵەتە خەڵکییەکان». ئەو لە وتارە بەناوبانگەکەی لە ژمارە ٥١ی گۆڤاری *فێدرالیست* پەیپێرزدا وتبووی تاکە رێگا چارەی کاریگەر بۆ ئەم کێشەیە بەرکورتکردنەوەی ئازادیی رێکخراوەکان و ئازادیی رادەربڕینە، ئەم تاقمانە لە رێگای ئەم ئازادییانەوە سەرهەڵدەدەن («ئازادی بۆ دەستەبازی وەکوو هەوا بۆ ئاگر وایە»). بەلام ئەم دەرمانە لە خودی نەخۆشینەکە خراپترە و خودی مەدیسۆنیش زۆر خێرا رەتی کردەوە.

مەدیسۆن لەباتیی ئەو کارە پشتی بە گەورەیی و ئالۆزیی ئەمریکا بەست. ئەو پێی وابوو بە ئاستی یەکەم ئەو قوڵ و لایەنانەی دەکەونە کەمایەتییەوە ناتوانن بگەنە ئاواتەکانیان، چونکوو دەستەکانیتر کە هەژماریان لە کەمایەتییەکان زۆرترە رادەبن و بەریان پێ دەگرن. تەنانەت ئەگەر ئەم دەستانە بەهێزیش بن لە ولاتێکی بەربلاو و فرەچەشنی وەک ئەمریکادا لایەنە بەرانبەرەکان رابوون دەکەن و هەموویان یەکتر بێکاریگەر دەخەن. مخابن مەدیسۆن لەم بابەتە گرنگەدا بە هەڵەدا چووبوو. رەنگە ئەو قەت وێنای وەها شتێکی نەکردبێت کە رۆژێک لە رۆژان دەوڵەت خەزێنەیەکی هێند مەزنی دەبێت کە هەژمارێکی فراوان لەو تاقمانەی توند بە بەرژەوەندییەکانیانەوە نووساون بەرەو لای خۆی رادەکێشێ. ئەڵبەت بەڵگاندنەکەی مەدیسۆن کێشەیەکی تیۆریکیشی لەگەڵدایە. ئۆلسێن جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە پێکهێنانی گرووپە خاوەن بەرژەوەندییە بچووکەکان زۆر ئاسانە، چونکوو ئەندامانی ئەو گرووپانە دەتوانن سوودی فراوان کۆ بکەنەوە لەحاڵێکدا کە شتێکی ئەوتۆ لە هاوولاتییانیتر کەم نابێتەوە. ئەمە بەشێکە لەو شتەی ناوی لێ ناوە «لۆژیکی کاری دەستە بەکۆمەڵ». ئەگەر سەد وەرزێڕ لە چوارچێوەی گرووپێکی رێکخراودا یەک بگرن و داوای دە میلیۆن دۆلار لە دەوڵەت بکەن، هەر یەکەو سەدهەزار دۆلاریان بەردەکەوێت. ئەگەر ئەم بڕە پارەیە دابشکێنین بەسەر کۆی هاوولاتییاندا هەرکەسەو [تەنیا] چوار سێنتی خەرج کردووە. جا بە رای ئێوە رەنگە کام لایەن دەست بداتە لابی دروستکردن، وەرزێڕان یان ئێمە؟ ئەم نموونەیە چەند هەزار قات گەورە بکەنەوە ئینجا لە کێشەی سەرەکیی دیموکراسیی ئەمڕۆی ئەمریکا دەگەن.

---

136. Factionalism

بابەتێکیتر ئەوەیە کە لە راستیدا دەستەکان و بەرەکان یەکدی لەناو نابەن. زۆربەی گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان حەز دەکەن کاروباری گرووپەکانیتر گەشە بسێنێ و ببووژێتەوە. کاتێ ئەو پرسیارەیان خستە بەردەم باگ بێرگلەند - ئەندامی [کۆمپانیای] هەرەوەزیی [١٣٧] ((Cooperativesociety نەتەوەیی کارەبای ناوچە ناشارییەکان - کە ئایا حەز بە بڕانی سۆبسیدی گرووپە رکەبەرەکان دەکات یان نا، لە وەڵامدا وتی: «ئێمە پێمان وایە دەتوانین داکۆکی لەسەر بەرفراوانکردنەوەی پشتگیرییەکان بۆ گشت لایەنەکان بکەین».[٩] ئەم بابەتە دەبێتە هۆی بەهێزبوونەوەی هەڵوێستی دانەبەدانەی گرووپەکان، چونکوو ئەوان [لەم حاڵەتەدا] دەڵێن گرووپەکانیتر بوودجە وەردەگرن، نابێ هیچ هەڵاواردنێک بکرێ. هەرچی زیاتر، باشتر. بێگومان ئەگەر پشتگیری لەو رێگایە بکەن کە گرووپەکانیتر بۆ خۆدزینەوە لە [دانی] پیتاک دۆزیویانەتەوە، خۆیشتان ئاسانتر رێگایەک دەدۆزنەوە. دواجار و پێچەوانەی بۆچوونەکەی مەدیسۆن سیاسەتی دەوڵەت بەرهەمی ئەو گرووپە خاوەن بەرژەوەندییانە نییە کە یەکدی بێکاریگەر دەخەن و دەگەنە رێژەیەکی مامناوەندی لە ئەقڵانییەت، بەڵکوو سیاسەتی دەوڵەت گۆڕدراوە بۆ زیادکردنی پێشکەشی و بەخشینەکان کە یەک لەدوای یەک بە ئاراستەیەکی سەرەولێژی رووخێنەردا سەرهەڵدەدەن. زۆر جار لە سیاسەتدا ئەو رێگایە دەگیرێتە بەر کە کەمترین بەرخۆدانی لە بەرانبەردا دەکرێ.

تەنانەت لەو سیاسەتانەشدا کە پێوەندییان بە پارەوە نییە ئەم بابەتە دەبینرێت. ئاوڕێک بدەنەوە لە سیاسەتی ئەمریکا لە بەرانبەر کووبادا. دە ساڵ دوای رووخانی کۆمۆنیزم دەبێ [لانیکەم] دوو شتمان بۆ دەرکەوتبێ، بە ئاستی یەکەم کۆمۆنیزمی کووبا ئیدی بە هیچ شێوەیەک بۆ ئەمریکا هەڕەشەیەکی ژێئۆپۆلەتیک نییە. بە ئاستی دووەم بە هەر رادەیەکیش کە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لە لایەن کاسترۆوە شەرمەزار بکەین، گرتنەبەری [سیاسەتی] تەریکخستنی ئابووری لە رێگای گەمارۆکانەوە تەنیا و تەنیا بیانوویەکی پێشکەش دەکات تاکوو جەماوەر لە دژی هان بدات و بەم شێوەیە دەسەڵاتی خۆی زیاتر بەسەر وڵاتدا بسەپێنێ. بەپێی ئەزموونە مێژووییەکان باشترین کار بۆ هاندانی کووبا بەرەو دیموکراسیی لیبراڵی خستنەبەردەستی گەڵاڵەیەکە بۆ پێوەندیکردن و بازرگانیکردنی ئەو وڵاتە لەگەڵ جیهاندا و زۆربەی ئەمریکاییەکانیش لایەنگری ئاوەها رێگایەکن.

وڵاتە یەکگرتووەکان لە بەرانبەر هەردوو رژێمی کۆمۆنیستی چین و ڤیەتنامدا ئەم میتۆدەی پێڕەو کرد، ئەی بۆ لە بەرانبەر کووبادا بەڕێوەی نەبات؟ وەڵامی ئەم پرسیارە یەک شتە: دەستەبازی. نەیارە کووبایی - ئەمریکاییەکانی کاسترۆ ئەم پرسەیان خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی

---

137. Cooperativesociety

خۆیانەوە، چونکوو زیاتر لە هەموو کەسێکیتر پێیان لەسەر داگرتووە و هەروەها نیشتەجێی هەردوو ئەیالەتی فلۆریدا و نیۆجێرسین کە لە هەڵبژاردندا دەورێکی بەرچاو دەگێڕن. هەرچەند ڕەنگە زۆربەی ئەمریکاییەکان بۆچوونێکی دیکەیان لەم بارەیەوە هەبێ، بەڵام کووبایی - ئەمریکاییەکان تەنیا کەسانێکن کە لەم پێناوەدا هەوڵ دەدەن و ڕێکخستن دروست دەکەن و بەرنامەگەلی کۆکردنەوەی یارمەتی گرێ دەدەن و، وزەی دەنگدانی خۆیان بە کار دەهێنن. بەم شێوەیە هەژمارێکی زۆر کەم لە دانیشتوانی دوو ئەیالەت توانیویانە بیروبۆچوونی خۆیان بەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا بسەپێنن. وەک هەموو نموونە هاوشێوەکانیتر کە کەمایەتییەکی پڕهەراوهوریا بەسەر زۆرینەیەکی بێدەنگدا زاڵ دەبن، ئەم نموونەیەش زەبرێکی کەمی لە بەرژەوەندییە گشتییەکان داوە، بەڵام ئەم زەبرە کەمانە لەسەر یەک کەڵەکە دەبن.

گەورەترین دامەزراوەیەک تا ئەم دواییانە تا ڕادەیەک وەک پردێک [ی پێوەندی] کەوتبووە نێوان ئەم گروپانە و سیاسەتمەدارانەوە، حیزبی سیاسی بوو. حیزبە سیاسییە بەهێزەکان دەتوانن ببنە پردی نێوان گروپە خاوەن بەرژەوەندییە جۆراوجۆرەکان و بە کۆکردنەوەیان لە ژێر چەترێکدا وەها دۆخێک بئافرێنن کە حیزب وەک کۆمەڵەیەکی یەکگرتوو بێتە ئەژمار. دەشیا ئەم دۆخە گۆڕدرابا، بەڵام هەر جۆرە گۆڕانێک دەبا لەناو حیزبدا مشتومڕ و دیالۆگی لەسەر کرابا، [واتە] لەو شوێنەدا کە لەسەر دان و ستانەکان[138] قسە دەکرا و بەرژەوەندییە گشتیترەکانی حیزب لەبەرچاو دەگیرا. هەر ئەمەشە وادەکا توێژەری بەرجەستەی سیاسەتی ئەمریکا، کلینتۆن ڕاسیتێر، بڵێت: «ئەمریکا بەبێ دیموکراسی، دیموکراسی بەبێ سیاسەت و سیاسەت بە بێ حیزب بوونی نییە». ئەڵبەت هەمیشە بەم شێوەیە نەجووڵاونەتەوە. بە درێژایی زیاتر لە دوو سەدە حیزبەکان هەست و بەرژەوەندییە گشتییەکانیان بە باشترین شێوە بەرەو جۆرە سیستەمێکی سیاسەتی دیموکراتیک پاڵ پێوە دەنا و ئەم سیستەمە لە کردەوە و پراتیکدا کارامە بوو. وەک چۆن ئەمریکا لەگەڵ هەموو گۆڕانکارییە گەورە تەکنۆلۆژیکی، ئابووری و حەشیمەتیەکانی بەردەمیدا درێژەی بە ڕێگای خۆی داوە، حیزبەکانیش دەتوانن لە داهاتوودا هەر بەم مێتۆدە بژین - تەنیا جیاوازییەکە لەوەدایە کە لە ڕاستیدا ئیدی حیزبی سیاسی لە ئەمریکادا نەماوە.

### فەشەلهێنانی حیزبەکان

دێسامبری (کانونی یەکەم) ٢٠٠٠، چەند ڕۆژ دوای تەواوبوونی ململانێی ژماردنەوەی دەنگەکانی فلۆریدا، پرسیارێکم ئاراستەی جۆرج ستێفانۆ پۆلس، بەرهەمهێنەری دەنگوباسی ڕادیۆ -

---

138. Give and take

تێلەڤیزیۆنی و ستراتیژیستی پێشووی سیاسی، کرد و لێم پرسی ئایا بە ڕای تۆ حیزبی دیموکرات لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماریی ساڵی ٢٠٠٤دا ئال‌گۆر کاندیدا دەکاتەوە یان نا؟ ڕۆژنامەکانی ئەو حەفتەیە پڕبوون لە مەزەندەی دەرپەڕاندنی ئال‌گۆر لە لایەن سیما دیار و ناسراوەکانی حیزبی دیموکراتەوە. ستێفانۆپۆڵس وەڵامێکی ڕۆشنگەرانەی پێ دامەوە: «شتێکمان بە ناوی حیزبی دیموکرات نییە. ئەگەر ئال‌گۆر بیهەوێ خۆی کاندیدا بکاتەوە پێویستە پارە کۆ بکاتەوە، ناو و ناوبانگ بەیەکەوە بنێ و لە ڕاپرسییەکاندا خۆی بەرەوسەر هەڵکێشێ، بەدەستهێنانی ئەمانە مانای دەستەبەرکردنی پارەیەکی زۆرتر و پشتگیریی چاپەمەنییەکان. تێفکرینی گەورەپیاوانی حیزب هیچ گرنگ نییە، چونکوو ئیدی حیزبێکمان نییە. ئەوانەی خۆیان بە «سەرگەورەکان» ناوزەد دەکەن تەنیا و تەنیا کۆمەڵێ سیاسەتمەدارن بۆ کارێک دەگەڕێن ئەنجامی بدەن».

لە ڕاستیدا لەمڕۆی ئەمریکادا حیزبە سیاسییەکان بایەخێکیان نەماوە. بە درێژاییی [سەرهەڵدانی] بەرەی ڕابردوو حیزبە سیاسییەکان هێند کراوە و ناسانترال بوونەتەوە کەس ناتوانێ کۆنترۆڵیان بکات. ڕێکخراوە سیاسییەکانی ناوخۆی حیزب و سەرکردەکانیان، ڕێکخستنی حیزبی، کادرە خۆپاڵێوراوەکانی حیزب و سەرگەورەکانی حیزب، هەرهەموویان لە بایەخ کەوتوون. حیزبی سیاسی لە باشترین حاڵەتدا بۆتە ماشینێکی کۆکردنەوەی یارمەتییە داراییەکان بۆ کاندیداتۆرێکی ناسراو و خۆشناو. ئەگەر کەسێکی خۆشەویست بتوانێ کاندیداتۆریی حیزب بەدەست بهێنێ حیزبیش پشتگیریی لێ دەکات. ئینجا کۆمەڵە پوەنێکی کەمی پێ دەبەخشرێ، وەک سەرچاوەی زیاتری دارایی، پشتیوانیی ڕێکخراوەیی و ڕەنگە یارمەتیدەرانی تازەی دارایی. لە ڕاستیدا هەندێ جار کاندیداتۆرەکانی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان پێیان باشترە دژ بە ڕێکخستنە حیزبییەکەی خۆیان تێکەڵ بە ململانێکانی هەڵبژاردن بن. ئەوان بەم کارە سیمای ئەو ستەملێکراوانە وەردەگرن کە دژ بە ڕێکخستنی حیزبی ئەجەنگن و بەم شێوەیە سەرنجێکی زیاتر بەرەو لای خۆیان ڕادەکێشن. ئەم میتۆدە بۆ جۆرج مەک گارۆن، ڕۆناڵد ڕەیگان و جیمی کارتێر کاریگەر بوو. لەگەڵ ئەمەشدا هەنووکە بەکارهێنانی ئەم ستراتیژە گەلێ دژواترە، چونکوو ئیدی ڕێکخستنێک نەماوە تا دژی بجەنگن. ساڵی ١٩٩٢ کێ کاندیدای ڕێکخستنی حیزبی دیموکرات بوو؟ بیل کلینتۆن، باب کێری یان پۆل سۆنگاس؟ هیچکامیان[١٣٩] سەرکەوتنی جۆرج بووش لەبەر ئەوە نەبوو کە کاندیدای ڕێکخستنی

---

١٣٩ . تاقە نموونەی ئاوارتە کە ئەم ڕێسایەمان بۆ دەسەلمێنێ، سێناتۆر ڕۆبێرت داڵ بوو کە لە ١٩٩٦دا لەبەر ئەوەی ساڵانێکی دوور و درێژ بوو خزمەتی حیزبی کۆماریخوازی دەکرد، دەتوانین بڵێین کاندیداتۆریی حیزبی پێ پێشکەش کرا.

حیزب بوو، بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو کەکاندیدای بنەماڵەکەی خۆی بوو؛ بووش دوو تایبەتمەندیی هەبوو کە لە سیستەمێکی بێ حیزبدا گەلێ پێویستن ـ ناوبانگ و ماشینێکی پارەکۆکردنەوە. هەرکەس ئەم دوو شتەی هەبێ، بەدەر لەوەی لە سیاسەتدا خاوەن ئەزموون بێ یان نا، پەوەنێکی گەورەی بەدەست هێناوە. بەم شێوەیە لەم سیستەمە تازە و «دیموکراتیکتر»ەدا زیاتر لە هەمیشە عەشیرەتە سیاسییەکان، سیاسەتمەدارانی بەناوبانگ و میلیاردێرانی سیاسەتمەدار دەبینین. ئەمەش هێشتا دەسپێکی چیرۆکەکەیە. هەرچی حیزبە سیاسییەکان زیاتر فەشەل بهێنن و لاواز بکەون، مانای ئەوەی رۆژ لەدوای رۆژ سەرمایە یان ناوبانگ ـ یان هەردووکیان ـ زیاتر دەبنە رێگای ئاسایی و باوی بەدەستەوەگرتنی پۆستە باڵاکانی نێو پرۆسەی هەڵبژاردن.

کاندیداکانی سەرۆک کۆماری لە زۆربەی مێژووی ئەمریکادا رەنگدانەوەی حیزبە سیاسییەکانی خۆیان بوون، بەڵام ئێستە [بە پیچەوانەوە] حیزبەکان بوونەتە رەنگدانەوەی کاندیداکانیان. ئەگەر کاندیداکەی حیزب بەرەو سەنتەری گۆڕەپانی سیاسەت بڕوات حیزبیش هەمان ئاراستە دەگرێتە بەر، ئەگەریش بەرەو چەپ جووتە بهاوێژێ حیزبیش هەمان ئەو کارە دەکات. دوابەدوای ئەوەی کلینتۆن لەژێر ناوی «دیموکراتێکی تازە»دا هەڵبژاردنی بردەوە، ئیدی نەتدەتوانی لە واشینگتۆندا دیموکراتێکی کۆن بدۆزیتەوە. هەروەها دوابەدوای ئەوەی بووش رایگەیاند کۆنسێرڤاتیستێکی میهرەبانە، هەموو ئەندامانیتری حیزبی کۆماریخوازیش پەییان بەوە برد کە ئەوان هەر لە سەرەتاوە ئاوەها بوون. هەنووکە حیزبی سیاسی بۆتە قاپێکی بۆش و چاوەڕوانی ئەوەیە بە سەرکردەیەکی خەڵکی پڕ بکرێتەوە.

هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان دوا گوللە بوو بەر جەستەی حیزبی سیاسیی ئەمریکا کەوت [وکوشتی]. لە بنەڕەتدا فەلسەفەی پێکهێنانی حیزبی سیاسی ئەوەیە کە لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا بەشداری و رکابەری بکات. هەر بۆیە دیاریکردنی کاندیداتۆر بۆ هەر حیزبێک گرنگترین بڕیارە. دوابەدوای ئەوەی ئەم پرۆسەیە لە حیزب سەنرایەوە و سپێردرایە دەست دەنگدەران، رێکخستنی حیزب لە ناوەڕا بۆش وبەتاڵ بوویەوە. لەبەر ئەمەیە لە سیستەمە دیموکراسییەکانیتردا هیچ حیزبێک وازی لە مافی هەڵبژاردنی کانیداکان نەهێناوە. هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان دیاردەیەکی تازە و تەنیا تایبەت بە ئەمریکایە. هۆکار و چۆنیەتیی دروستبوونی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان بۆ خۆی چیرۆکێکی سەرنجراکێشە. بەڵام ئەگەر بڵێین حیزبی سیاسیی ئەمریکایی کوژرا، [بێگومان] نەمانتوانیوە بە تەواوی خاڵەکە بپێکین، لە راستیدا حیزبی سیاسی خۆی کوشت. [١٠]

هەڵبژاردنە سەرەتاییە راستەوخۆکان لە چارەکە سەدەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کتوپڕ لە رووبەرێکی بەربڵاودا سەری هەڵدا، ئەم هەڵبژاردنانە بەشێک بوون لەهەڵمەتی سەردەمی

پێشکەوتوو[140] بۆ سەر ڕێکخستنە حیزبییە گەندەڵەکان. («با دەنگدەران بڕیار بدەن نەک کاربەدەستان»). [ئایدیای] هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان داخوازیی ئەمریکاییەکانی بۆ دیموکراسیی «فرەتر» کردە بەردەبازێک بۆ خۆی. بەڵام یەکەم هەوڵدان بۆ بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی سەرەتایی نەبوو بە هۆی گۆڕینی تایبەتمەندیی سیستەمی حیزب، لە نێوان ساڵانی ١٩١٢ و ١٩٦٨دا لە کۆی ئەو ٢٣ کەسەی هەڵبژاردنە سەرەتاییە ڕاستەوخۆکانیان بردەوە تەنیا ١٠ کەسیان بوون بە کاندیدای حیزبەکەیان (ئەم ئامارە خودی سەرۆک کۆمارەکان ناگرێتەوە کە هەمیشە بۆ جاری دووهەمیش دەبوون بە کاندیدای حیزبەکەیان). لە ١٩٦٠دا تەنیا لە ١٦ ئەیالەتدا هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانی حیزبی دیموکرات و لە ١٥ ئەیالەتدا هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانی حیزبی کۆماریخواز بەڕێوە چوو. تەنیا لە سەدا ٣٨ی نوێنەرانی حیزب لە کۆنفرانسی نەتەوەییی حیزبدا بە هەڵبژاردنی سەرەتایی هەڵبژێردران. دەستەکانی سەرۆکایەتیی پراتیکی و ئەکتیڤ [ی حیزب] - واتە کار بە دەستە هەڵبژێردراوەکان، بەرپرسە ناوچەیی و هەرێمییەکانی حیزب و ڕێکخەران - هێشتا لە حیزبدا خاوەن زیاترین دەنگ و دەسەڵات بوون. هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان ڕێگایەک بوو بۆ تاقیکردنەوە و نرخاندنی ئاستی خۆشەویستیی کاندیدایەکی تایبەت لە ناو دەنگەرانی ئاساییدا. جان کێنێدی بە بردنەوەی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان لە ڤیرجینیای ڕۆژئاوادا ئەوەی سەلماند کە کاتۆلیکێکیش دەتوانێ لە باشووردا دەنگێکی بەرچاو بەدەست بهێنێ. بەڵام ئەستێس کێفاوێر سەرەڕای بردنەوەی چەند هەڵبژاردنێکی سەرەتایی لە ١٩٥٢دا، دیسان نەیتوانی ببێتە کاندیدای حیزبی دیموکرات، چونکوو سەرکردەکانی حیزب لایەنگری ئادڵای ستیڤانسێن بوون. وێندێل ویکی تەنانەت لە هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانی ١٩٤٠یشدا بەشداریی نەکرد بەڵام بوو بە کاندیدای حیزبی کۆماریخواز.

یەک لەو بابەتانەی لە زنجیرە نارەزایەتییەکانی دەیەی ١٩٦٠دا هەمیشە و بەردەوام دەکەوتە بەر سەرنجەوە، داوای بەشدارییانە کردنەوەی[141] هەرچی زیاتری سیاسەت بوو - ئەم داواکارییە بۆ وێنە لە بزاڤی مافە مەدەنییەکان، خۆپیشاندانەکانی دژ بە شەڕی ڤیەتنام، ئاژاوەکانی دەرەوەی هۆڵی کۆنفرانسی ١٩٦٨ی حیزبی دیموکرات لە شیکاگۆ و تەنانەت لە وۆدستاکدا ڕەنگی دایەوە. حیزبی دیموکرات دەیویست ئەم داواکارییانە لەبەرچاو بگرێت، هەر بۆیە بڕیاریدا خۆی

140. Progressive era . ١٤٠ قۆناغێکی مێژووی ئەمریکا لە نێوان ساڵانی ١٨٩٠ تا ١٩٢٤، لەو قۆناغەدا چەندەها گەلاڵەی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەڕێوە برا، بۆ وێنە: مافی دەنگدانی ژنان، قەدەغەکردنی بەرهەمهێنان و فرۆشتنی خواردنەوە ئەلکولییەکان، یاساکانی دژ بە پاوانکاری، کەمکردنەوەی سەعاتەکانی کارکردن، قەدەغەکردنی کاری منداڵان و پاراستنی سەرچاوە سروشتییەکان. و.ف

141. Participatory

دیموکراتیکتر بکاتەوە: ئەو حیزبە میتۆدی هەڵبژاردنی نوێنەرەکانی لە بنەوە گۆڕی. هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان زۆر خێرا بوو بە ئەڵتەرناتیڤی هەموو ئەو میتۆدانەی [تا ئەودەم] بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی حیزب لە کۆبوونەوەی نەتەوەییدا بەکار دەهێنران، [بە شێوەیەک کە] تا ساڵی ١٩٨٠، زیاتر لە ٧٠ لە سەدی ئەم نوێنەرانە لە ڕێگای هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانەوە دیاری کران. کۆماریخوازانیش هەمان ڕێچکەی دیموکراتەکانیان گرتە بەر: تا ساڵی ١٩٨٠، لە سەدا ٧٥ی نوێنەرانی کۆماریخواز لە کۆبوونەوەی نەتەوەیی حیزبدا لە ڕێگای هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانەوە هەڵبژێردران. هەنووکە ئەم ڕێژەیە لە هەردوو حیزبەکەدا بەرز بۆتەوە بۆ زیاتر لە ٨٠ لە سەدی کۆی نوێنەران و پاشماوەی ٢٠ لە سەدی دیکەیش زۆرجار بە هەمان ئەو کەسە دەنگ دەدەن کە هەڵبژاردنی سەرەتایی بردۆتەوە (لە ڕاستیدا ئەگەر بڕیار بوایە نوێنەرانی حیزب لە کۆبوونەوەی نەتەوەییدا بەپێی شایستەبوونی نوێنەران دەنگیان دابا، حەیایان دەچوو).[١٤٢]

بەشداریکەرانی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان تەنانەت زۆرینەی حیزبیش نین چ بگا بەوەی زۆرینەی ئەمریکا بن (لە هەڵبژاردنی پێشووی سەرۆک کۆماریدا تەنیا لە سەدا ٢٣ی دەنگدەرانی ناونووسکراو لە هەڵبژاردنی سەرەتاییدا بەشدارییان کرد، واتە نزیکەی لە سەدا ١٨ی کۆی ئەو ئەمریکاییانەی مافی دەنگدانیان هەبوو). هەر بۆیە نوێنەرانی کۆبوونەوەی نیشتمانیی هەر دوو حیزب زۆرجار لە ئەندامانی ئاساییی حیزبەکانیان ڕادیکاڵترن. ئەمە لەگەڵ لۆژیک و ئەقڵیشدا دێتەوە، چونکوو بەشداربووانی کۆبوونەوەی نیشتمانیی حیزب نوێنەری بیر و بۆچوونی ئەندامانی ئاسایی حیزب نین بەڵکوو نوێنەری بیر و بۆچوونی ئەو ئەندامە کارا و چالاکانەن وا لە هەڵبژاردنە سەرەتاییەکاندا بەشداری دەکەن (بیر بکەنەوە بزانن چەند کەس دەناسن کە خۆویست و لەسەر داوای خۆیان لە حیزبدا کار دەکەن و لە هەرهەموو هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانیشدا بەشداری دەکەن). بۆ وێنە تەنیا لە سەدا ١٠ی نوێنەرانی کۆبوونەوەی نەتەوەیی ساڵی ٢٠٠٠ی حیزبی کۆماریخواز لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە دەبێ پاشماوەی بوودجە تەرخان بکرێ بۆ بەشی پاراستنی تەندروستی و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان، بە بەراورد لەگەڵ ئەمەدا، لە سەدا ٤٦ی کۆی دەنگدەرانی حیزبی کۆماریخواز ئاوەها بۆچوونێکیان هەبوو. تەنیا لە سەدا ٢٤ی نوێنەرانی کۆبوونەوەی نەتەوەیی حیزبی کۆماریخواز پێیان وابوو یارمەتییە داراییە گشتییەکانی کۆمپانیاکان بۆ حیزبەکان دەبێ قەدەغە بکرێ، لە حاڵێکدا کە لە سەدا ٦٠ی کۆی دەنگدەرانی حیزبی

---

١٤٢ . چونکوو ڕەنگ بوو ئەو کەسەی وا هەڵبژاردنی سەرەتایی بردۆتەوە وەک نوێنەری حیزب بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماری هەڵنەبژێردرایە، ئەمەش ئەرکی (Function) هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانی دەخستە ژێر پرسیارەوە. و.ف.

کۆمــاریخواز ئەو بۆچوونەیــان قبــووڵ بــوو. بە هەمــان شــێوە، ســەرەڕای ئەوەی لە ســەدا ٤١ی دەنگــدەرانی حیزبــی دیمــوکرات لایەنگــری کۆپــۆنی[١٤٣] قوتابخانەکــان بــوون تەنیــا لە ســەدا ١٠ی نوێنەرانی کۆبوونەوەی نەتەوەییی ئەم حیزبە پشتگیرییان لێ دەکرد. هەروەها لە حاڵێکدا کە تەنیا لە سەددا ٢٠ی نوێنەرانی کۆبوونەوەی نەتەوەییی حیزبی دیموکرات لایەنگری حوکمی لەسێدارەدان بوون لە سەدا ٤٦ی کۆی دەنگدەرانی ئەو حیزبە لایەنگرییان لە حوکمی لەسێدارەدان دەکرد. [١١] ئەم جیاوازییە و ئەم درزە قووڵەی نێوان نوێنەرانی کۆبوونەوەی نیشتمانی و کۆی دەنگدەران، لە هەردوو حیزبەکە و لە ئاست نزیک بە هەموو بابەتەکاندا دەبینرێ. سەیر لەوەدایە کە دەستەبژێرانی ئەوسا گەلێ زیاتر لە چالاکە پرۆفیشناڵەکانی ئێستە نوێنەری دید و بۆچوونی ئەندامانی ئاسایی حیزب ـ و هەروەها وڵات ـ بوون. «پێگە»ی نوێی سیاسی گەلێ بەرکورت و سنووردارە.

هەڵبژاردنــی ســەرۆک کۆمــاری رووداوێکــی بــاوە و ئەوانەی وەک کاندیــدای ئەم ململانێیــانە هەڵئەبژێردرێن هەمیشە لە ناوەند و چەقی لایەنە سیاسییەکانەوە سەر هەڵدەدەن. بەڵام ئەوانەی وا سیاســەتمدارانیتر هەڵــدەبژێرن و کاریگەرییــان لەســەر دادەنــێن، ئەو کەســانەن وا لە هەڵبــژارنە سەرەتاییەکاندا بە شێوەیەکی چالاک و ئەکتیڤ بەشداری دەکەن. بەم شێوەیە حیزبە سیاسییەکان کەمتر رەنگدانەوەی ئەندێشە و روانگەی داڕێژەرانی سیاسەت و کار بە دەستە ناونجییەکانی خۆیانن و زیاتر نوێنەری بەهێزترین گروپە چالاکەکان و رێکخەرانــی خۆیــانن ـ [واتە] هەمــان ئەو کەســانەی کە لە هەڵبژاردنە سەرەتاییەکاندا هەوڵێکــی بێوچــان بــۆ کــۆکردنەوەی دەنگەکــان دەخەنە گەڕ. لەم واتــایەدا ریفــۆرمی «دیمــوکراتیزەکەر»[١٤٤] دەســتەبژێرانی لەنــاو نەبــردووە، بەڵکــوو تەنیــا گۆڕیویانیەتەوە، ئەڵبەت نەیشـیگۆڕیونەتەوە بە شـتێکی بە ئاشـکرا باشـتر. حیزبـی ئەوسا لەسـەر بنەمــای گەڕەکەکــان، دەوڵەتە خۆماڵییەکــان و هەنــدێ رێکخــراوەی گشــتگیری وەک ســەندیکا کرێکارییەکــان و ئەنجــومەنە بازرگانییەکــان ئــاوا کرابــوو. حیزبــی ئێســتە کەوتــۆتە ژێــر رکێفــی پرۆفیشـناڵەکانی واشـینگتۆنەوە ـ واتە چالاکـان، ئایـدیۆلۆگەکان، کـۆکەرەوانی یارمەتییەکـان و راپرســیکەران. هەر ئەمەشــە وای کــردووە بە بەراورد لەگەڵ کــۆی وڵاتــدا واشــینگتۆن زۆر جەمســەرگەراتر[١٤٥] بێــت و مــامەڵە و تەبــایی و ســازانی نێــوان حیزبەکــان گەلــێ دژوارتــر بێــتەوە. سیستەمی سیاسیی ئەمڕۆ بونبەستی لە مامەڵەکردن پێ باشترە؛ بونبەست لە رەوتی کۆکردنەوەی یارمەتییە داراییەکاندا بەکەڵکترە.

143. Coupon
144. Democratizer
145. Polarity

## ماشینی پارە

سیستەمی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان پارادۆکسێکی دیموکراتیکی لێ کەوتۆتەوە کە لە مێژووی ئەم دواییانەی ریفۆرم و چاکسازیدا چەندەها جار دووپات بۆتەوە، لەم پارادۆکسەدا باڵادەستیی زۆرینە دەگۆڕدرێت بۆ باڵادەستیی کەمینە. لە پرسی پیاچوونەوەی [یاسای] دابینکردنی سەرچاوە داراییەکانی هەڵبژاردندا ئەم پارادۆکسە بۆ جارێکیتر دووپات بوویەوە. وا بڕیار بوو پیاچوونەوەی یاسای یارمەتییە داراییەکانی هەڵبژاردن کە لە حەفتاکاندا بەڕێوە چوو، بەجۆرێک بێت کە هەژمارێکی زیاتری خەڵک دەستیان بەسیستەم رابگات. بەپێی یاسای نوێ و لە پێناو ئەوەدا کە ئیدی سیاسەتمەداران تەنیا پشت بە یارمەتییە داراییەکانی چەند کەسێکی کەم نەبەستن، هەرکەسەو دەیتوانی ئەوپەڕی ١٠٠٠ دۆلار ببەخشێتە کاندیدای دڵخوازی خۆی، [هەروەها] حیزبە سیاسییەکانیش بۆ هەر کاندیدایەک تەنیا دەیانتوانی ٥٠٠٠ دۆلار پێشکەش بکەن. ئەم یاسایە ئیجازەی بە پێکهێنانی «کۆمیتەکانی چالاکیی سیاسی»ی هاوبەش دەدا کە دەرفەتێک بوون بۆ ئەوەی یارمەتیدەرانی بچووک لە پێناو خستنەگەڕی ئامانجێکی هاوبەشی سیاسیدا سەرمایەکانیان لەسەر یەک کۆ بکەنەوە. هەرکەسەو دەیتوانی ئەو پەڕی ٥٠٠٠ دۆلار پێشکەش بەم جۆرە کۆمیتانە بکات. سەرەڕای هەموو ریفۆرم و پیاچوونەوەکان، «کۆمیتەکانی چالاکیی سیاسی» بوونەتە هێمای سەرجەم کەموکوڕییەکانی سیستەمی دارایی ئەمڕۆی هەڵبژاردن لە ئەمریکادا.

دیموکراتیزاسیۆنی دابینکردنی [سەرچاوە] داراییەکانی هەڵبژاردن بۆتە هۆی گۆڕینی ناوەڕۆکی سیاسەتی ئەمریکا کە ئەڵبەت گۆڕانێکی پۆزەتیڤ نەبووە. ئێستە ئیدی کاندیداتۆرەکان ناتوانن تەنیا پشت بە هەژمارێکی کەم لە یارمەتیدەرە گەورەکان ببەستن کە ناسراوی خەڵک و هەمیشەیش لە ژێر چاودێریی رای گشتیدا بوون. لەباتیی ئەمە کاندیداکان دەبێ چاوەڕێی یارمەتیە ورد و بچووکەکانی دەیان هەزار یارمەتیدەر و «کۆمیتەی چالاکیی سیاسی» بن کە مانیفیست و بەرنامەی کارییان کەمتر لای خەڵک ناسراوە و کەمتریش دەکەونە ژێر چاودێریی رای گشتییەوە. ئەمەش بۆتە هۆی دروستبوونی تاقمێکی تازە لە دەڵاڵانی (Mediator) دەسەڵات: کۆکەرەوانی یارمەتییە داراییەکان. وەک چۆن دەیڤید فرۆمی رۆژنامەوان و نووسەری پێشووی ئاخافتنەکانی کۆشکی سپی نووسیویەتی:

دەسنیشانکردنی سنووری ١٠٠٠ دۆلاری بۆ یارمەتیدەران و [هەروەها] بەرکورتکردنەوەی خەرجەکان بۆ ٣٦ میلیۆن دۆلار، وای کردووە دۆزینەوەی چەند میلیۆنێرێکی سەیروسەمەر نەتوانێ دابینکەری پێداویستییەکان بێت. کاندیداکان دەبێ ساڵێک پێش هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان ـ کە ئێستە ئیدی گەلێ گرنگ و پڕبایەخن ـ بکەونە خۆ و بەدوای راکێشانی هەزاران یارمەتیدەر و

پێشکەشکەری دەوڵەمەنددا بسووڕێنەوە. ئەم کارە وەک پڕکردنی وانێکی ئاو بە کەوچک وایە. دیارە تەنانەت پێداگرترین کاندیدایش ناتوانێ پشتیوانیی دانەبەدانەی خەڵک بۆ لای خۆی رابکێشێ، [هەر بۆیە] پێویستە سەرەتا پشتیوانیی چەند سەد دەلاڵی پسپۆڕ و لێهاتوو بەدەست بهێنێ. ئەم کەسانە توانا و لێهاتوویی خۆیان سەلماندووە و دەتوانن بە سازدانی جێژنەکانی پارەتی کۆکردنەوە، میوانییەکان و ئێوارە خوانە تایبەتییەکان لە هەر دێمۆکرات یان کۆماریخوازێکی دارا و دەوڵەمەند پارەی پێویست کۆ بکەنەوە. [۱۲]

دواجار پارەکۆکردنەوە بۆتە سەرەکیترین چالاکیی ناو ململانێکانی هەڵبژاردن و باش بەڕێوەبردنی بەرنامەکانی پارەکۆکردنەوەیش بۆتە یەکەم توانای پێویست بۆ سیاسەتمەدارانی مۆدێرنی ئەمریکایی. ئەگەریش هێشتا شتێک بە ناوی سەرگەورەکانی حیزب مابێتەوە [بێگومان هەمان ئەو دەلاڵە پسپۆڕانە دەگرێتەوە کە لە نەبوونی ئەواندا ستارتی هیچ جۆرە ململانێیەکی هەڵبژاردن لێ نادرێت. هەموو ئەم گۆڕانکارییانە بوونەتە هۆی لاوازکەوتنی حیزبە سیاسییەکان.

تازەترین شەپۆلی پیاچوونەوە بە [یاسای] دابینکردنی سەرچاوە داراییەکانی هەڵبژاردندا تەنیا ئەم رەوتە توندتر و خێراتر دەکاتەوە، چونکوو تەنانەت زیاتر لە جاران حیزبە سیاسییەکان لاواز دەکات. بەرلەم دوا پیاچوونەوەیە تاقە سەرچاوەیەکی ئابووری بۆ حیزبەکان مابوویەوە بریتی بوو لەو یارمەتییە داراییە گشتییانەی پێشکەش بە حیزب دەکرا [نەک بە کاندیدایەکی تایبەت] کە حیزبەکان دەیانتوانی ئەو پارەیە تەرخان بکەن بۆ پشتگیریکردنی کاندیدایەک.[۱٤٦] ئێستە ئەم پارەیەش خەرج دەکرێت، چونکوو خەرج دەکرێت، بەڵام نەک لە لایەن حیزبەکانەوە بەڵکوو لە لایەن کۆمەڵە گروپ و رێکخراوەگەلێکی لێڵ و پێڵ و نەناسراوەوە کە زۆر کەم ئاشکرا و دیار و وەڵامدەرن. لە ژیانی سیاسیی وڵاتدا دەلاڵانی پسپۆڕ دەورێکی ئێجگار گرنگتریشیان پەیدا کردووە.

پڕخەسارترین کاریگەریی ئەم گۆڕانکارییانەی نێو سیستەمی دابینکردنی [سەرچاوە داراییەکانی هەڵبژاردن ئەوەیە کە سیاسەتمەداران زیاتر [لە جاران] کەوتوونەتە بەر خەسار و مەترسییەوە. دڵەخورپەی سیاسەتمداران لە ئاست هەڵنەبژاردنەوەی دووبارەیاندا پێویستە نیگەرانییەکی ئاوەزمەند و ئەقڵانی بێت. لەڕاستیدا کۆی دیموکراسی هەر ئەمەیە - ئەڵبەت بە رادەیەکی دیاریکراو [و لۆژیکاڵ]. کەچی سیاسەتمدارانی ئێستە تووشی بەدگومانییەکی راڕایی، تەواو رووخێنەر و هەمیشەیی بوون نەکا لە بەردەم شکست و دۆڕاندابن. بیرمەندی زانستە سیاسییەکانی بریتانیا، ئەنتۆنی کینگ، وتەنی، سیاسەتمدارانی ئەمریکایی کە پشتگیریی حیزبەکانیان لە دەست داوە «بە تەنێ دەچنە نێو دونیای هەڵبژاردنەوە». دەسەڵات و هێزی

---

۱٤٦ . کۆنگرێس لە ساڵی ۲۰۰۲دا ئەم جۆرە یارمەتییانەی بۆ حیزبەکان قەدەغە کرد. و.ف

کاندیداکانی هەڵبژاردن پێشتر دەگەڕایەوە بۆ [کۆمەڵە فاکتەرێکی وەک] پێگە و خۆشەویستییان لە نێو حیزبدا، سەرکەوتنە گەورەکانی خودی خۆیان و هاودەنگییان لەگەڵ سەرگەورەکانی حیزبدا، بەڵام ئێستە ئەم دەسەڵاتە لە ڕێگای پسپۆڕبوونی بویرانە لە ڕاپرسییەکاندا، پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بە هەرێمەکانی [نێو پرۆسەی] هەڵبژاردن، کۆنترۆڵکردنی گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان و کۆکردنەوەی یارمەتییە داراییەکانەوە بە دەست دەهێنن. لە هەمان کاتدا ئەمە بەو مانایەش دێتەوە کە کاندیداتۆرەکان تەنیا و بێکەس کەوتوون و هەمیشە تەنیا تاقەیەک هەنگاو لە هەڵکشان و لەدەستدانی دەسەڵات دوورن. ئەگەر بۆ یەک جار پێچەوانەی ویستی جەماوەر بجووڵنەوە، ئیدی نە حیزب پشتیوانییان لێ دەکات نە کۆنگرێس و نە میدیاگشتییەکان. بە وتەی کینگ: «دەتوانین دانە بە دانەیان فەشەل پێ بهێنین، بۆ خۆشیان بەم شتە دەزانن، هەر بۆیە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دۆخەکەدا دەگونجێنن». [١٣]

کەڵکەڵەی دوارۆژی هەڵبژاردن هەر سیاسەتمەدارێک گیرۆدەی خۆی دەکات. تاقە شتێک لەمڕۆدا سیاسەتمەدارانی ئەمریکایی بیری لێ دەکەنەوە سەرکەوتنە لە هەڵبژاردنی داهاتوودا، بە جۆرێک هەموو شتێکیتر دەکەنە قوربانیی ئەم داخوازییە. ئەمە بەو واتایە نایەتەوە کە ئەوان بە بەراورد لەگەڵ سیاسەتمەدارانی پێشوودا کەسانێکی خراپترن، بەڵکوو ئەمە سیستەمە ناچاریان دەکا بەم چەشنە بجووڵێنەوە. دیمەنی دڵتەزێنی سیاسەتی مۆدێرنی ئەمریکا ئاوەها دیمەنێکە؛ سیاسەتمەداران هەمیشە تەسلیمی خواستی لۆبییەکان دەبن، ڕاپرسی لە دەنگدەران دەکەن، کرنۆش بۆ گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان دەبەن و سەرقاڵی کۆکردنەوەی یارمەتیی داراییەن. پێچەوانەی بۆچوونی باو، ئەم ڕەوتە نابێتە هۆی پێکهاتنی دەوڵەتێکی باش، هەر بۆیە هەوڵەکان بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی باش هەر درێژەی هەیە. ئەم هەوڵە لە ئەمریکادا مانای هەوڵدان بۆ بە دەستهێنانی دیموکراسیی «فرەتر»، ئەم جارە لە ڕێگای ڕیفراندۆمەوە.

## دیموکراسیی ڕاستەوخۆ

مێژووی هزری گەڕانەوەی ڕاستەوخۆی دەوڵەت بۆ لای خەڵک یەکانگیرە لەگەڵ مێژووی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا. لە ڕاستیدا لەویش کۆنترە: یەکەم ڕیفراندۆم لە ١٦٤٠ و لە کۆچبەرنشینی بەی[١٤٧] لە ماساچوسێت بەڕێوە چوو. هەروەها لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە و سەرانسەری سەدەی نۆزدەمدا یاسا بنچینەییە فیدراڵ و ئەیالەتییەکان بۆ پەسندکردن دەخرانە بەردەم دەنگدانی خەڵکەوە. بەڵام دوای پەسندکران و پێکهاتنی سیستەمی دەوڵەت، ڕیفراندۆم

147. Settlement Bay

هەڵپێچـرا. بە درێژاییـی سـەدەی نـۆزدە دادگاکـان بە گشـتی لەسـەر ئەو بـاوەڕە بـوون کە ریفراندۆمەکان پێچەوانەی یاسای بنچینەیین و بۆ ئەمەش پشتیان بەو پرەنسیپە دێرینە دەبەست کە دەیوت ئەگەر خەڵک مافی یاسادانان بسپێرنە نوێنەرانی خۆیان دواتر بۆیان نییە بە دڵخوازی خۆیان هەندێ بەشی ئەو مافە دابڕن و لە نوێنەرانی بسێننەوە. بەپێی روانگە [باوەکانی] سەدەی نـۆزدەم ئەگەر دیموکراسیی نـوێنەرایەتی[١٤٨] مەودای قەدبڕکردنـی دابـا نەیـدەتوانی بە باشـی ئامانجەکانی بپێکێ.

هەموو ئەم شتانە گۆڕدران، دەسپێکی ئەم گۆڕانە ساڵی ١٨٩٨ و لە داکوتای باشووردا بوو. قۆناغی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم کە بە *سەردەمی زێڕین*[١٤٩] ناوبانگی دەرکردووە، بوو بە هۆکاری [سەرهەڵدانی] کۆمپانیای گەورەگەورە و سەرووەت و سامانی فراوان. کۆمپانیا گەورەکان و بەتایبەت کۆمپانیاکانی هێڵی ئاسن[١٥٠] زۆرجار پێوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ ئەنجومەنە ئەیالەتییەکاندا هەبوو کە ئەمەش دەبووە هۆی دروستبوونی پێوەندییەکی قووڵ و نزیک لە نێوان پارە و سیاسەتدا. (چەند دەیە دواتر کاتێ ئەمریکاییەکان تێگەیشتن ئابوورییە تازە سەرهەڵداوەکانی ئاسیا رەوتێکی هاوشێوە دەژین، گەلێ سەرسام بوون و سەرمایەداریی رانتی - هاورێیانەی[١٥١] ئەوانیان شەرمەزار و پرۆتێستۆ دەکرد). ریفۆرمخوازانی سەردەمی پێشکەوتنخوازی کە بەم گەندەڵییە قووڵ و بنەڕەتییە گەلێ پەست و نائومێد ببوون، بڕیاریان دا ئەنجومەنەکانی یاسادانان بە تەواوی قەدبڕ بکەن و دارشتنی سیاسەتە گشتییەکان راستەوخۆ بسپێرنە دەست جەماوەری خەڵک. بۆ ئەم مەبەستەش زەختێکی باشیان خستە گەڕ و کۆمەڵە پیاچوونەوەیەکیان بە یاسای بنچینەییی ئەیالەتەکاندا کرد تاکوو دەرفەت و ئیمکانی ریفراندۆم، یاسادانانی راستەوخۆ و لابردنی کاربەدەستە هەڵبژێردراوەکان لە رێگای دەنگدانی خەڵکەوە برەخسێ. هەموو ئەمانەش لە پێناو ئەوەدا بوو کە خەڵک بتوانن هێز و دەسەڵاتی گرۆپە خاوەن بەرژەوەندییەکان، واتە لە راستیدا هەمان ئەو هێزانەی وا بەڕێوەبەری [راستەقینەی] ئەنجومەنە ئەیالەتییەکان بوون، بێکاریگەر بخەن. (یەکێکیتر لە ریفۆرمە گرنگەکانی ئەم قۆناغە زیادکردنی خاڵێک بوو بە یاسای بنچینەییی ئەمریکا کە بەپێی ئەو خاڵە دەبا نوێنەرانی ئەنجومەنی سێنا بە دەنگدانی راستەوخۆ [ی خەڵک] هەڵبژێردرایەن، تا سەرەتای دەیەی ١٩١٠ ئەم نوێنەرانە لە لایەن ئەنجومەنە

148. Representative democracy

١٤٩. Gilded Age: قۆناغێکی مێژووی ئەمریکا لەدەیەی ١٨٧٠دا کە پارەپەرستی و مادیگەراییی هەمەلایەنە و گەندەڵیی بێسنووری سیاسی [دیارترین] تایبەتمەندییەکانی بوون. و.ف

150. RailRoad

151. Friendly Rentier

ئەیالەتییەکـــانەوە هەڵـــدەبژێردران) ریفۆرمخـــوازانی ئەو ســـەردەمە وایانـــدەزانی خەریکـــی خاوێنترکردنەوەی سیاسەت و سرینەوەی گەندەڵین، چونکوو [بەم شێوەیە] دەسـەڵات لە دەسـتی کەمایەتییەکی دەوڵەمەندا نامێنێ و دەگەڕێتەوە بۆ خەڵکی ئاسایی.

ریچارد هۆفستاتێری مێژوونووس دەڵـێ بونیـادی سـەرەکیی ئەم ریفۆرمـانە «مرۆڤـی مەبەسـت چاک بـوو... مرۆڤـی مەبەسـت چـاک دەتوانێـت وەک تـاکێکی خێرخـواز بفکرێـت و هەڵسـووڕێت، پـێچەوانەی هەمـوو گـروپە خـاوەن بەرژەوەنـدییەکان کە بۆسـەیان بـۆ ئەم جـۆرە کەسـانە دانـاوە بیـانکەنە قوربـانیی خۆیـان... وەهـا مرۆڤێـک قەت لە پێنـاو دەسـتەبەرکردنی بەرژەوەنـدیی تـاکە کەسیدا تەقلی هیچ رێکخراوێک نابێت و... لەوپەڕی بەرپرسـایەتی و بەڵێنـی ئەخلاقیـدا راسـتەوخۆ هەڵوێستە لەسەر کێشەکانی دەوڵەت دەکات».

زۆربەی ئەیالەتەکـان تـاکوو دەیەی ١٩٢٠ یاسـاگەلێکیان دارِشـت کە بە جۆرێـک لە جۆرەکـان دەرفەتی دیموکراسیی راستەوخۆی دەڕەخساند. بەڵام هەرچی سیاسەت زیـاتر خـاوێن دەکـرایەوە و سـەردەمی پێشـکەوتنخوازی رووی لە تەواوبـوون دەکـرد، ئـارەزووی ریفرانـدۆمیش کەمتـر و کەمتـر دەبوویەوە و گەشتە ساتەوەختی کۆتایی. لە دەیەی ١٩٣٠یەوە تـا سـەرەتای شەسـتەکان هەژمـاری ریفرانـــدۆمەکان رووی لە کـــزی دا و وردە وردە ریفرانـــدۆم لەبـــایەخ کەوت. بەڵام لە کۆتـــاییی شەستەکانەوە هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی هێرشەکاندا بـۆ سـەر «دەسـەڵات»[١٥٢] و بەرزکـردنەوەی دروشـمی دیموکراسـیی بەشـدارییانە[١٥٣] سـەرلەنوێ بیرۆکـەی گەڕانەوەی راسـتەوخۆ بـۆ لای خەڵـک بووژایەوە. قۆلی چەپی حیزبی دیموکرات زیاتر لە هەموان و بە گـوڕ و تینێکـی بەرچـاو بانگەشـەی ئایدیای گەڕانەوەی راسـتەوخۆ بـۆ لای خەڵکـی دەکـرد. هەرچەنـد زۆربەی لایەنگرانـی فیکریـی ئەم بزاڤە لە ناو بەرەی چەپدا بوون، بەڵام دە ساڵ دواتر راستەکان بوونە گەورەترین یارمەتیـدەری ئەو رەوتە. هاوارد جارویس ساڵـی ١٩٧٨ بە ئامـادەکردنی پێداویسـتییە سـەرەتاییەکانی گەڵاڵەی ژمـارە ١٣ی کالیفۆرنیا[١٥٤] ئاراستەی مێژووی ئەمریکای گۆڕی.

---

152. Government
153. Participatory Democracy

١٥٤. Proposition: جـۆرە ریفرانـدۆمێکی تـایبەت کە زیـاتر لە سویسـرا و کالیفۆرنیـادا و بـۆ دانـانی راستەوخۆی یاسا بەڕێوە دەبرێ. مەرجی خستنەبەر یفراندۆمی گەڵاڵەکان لە کالیفۆرنیادا ئەوەیە کە لانیکەم لە سەدا ٥ی دەنگدەران ئیمزای بکەن و بینێرن بۆ لای پارێزگار. و.ف

گەلاڵەی ژمارە ١٣ دوو بابەتی تەواو جیاوازی تێکەڵ بە یەکتر کرد: پیتاک و ریفراندۆم. لە شەست و حەفتاکاندا و هاوکات لەگەڵ بووژانەوەی بەرنامەکانی «کۆمەڵگای گەورە»[١٥٥]ی لیندۆن جانسۆن و پەرەسەندنی سەرمایەگوزارییە دەوڵەتییەکان و یاساداناني راستەوخۆ لە شارەکاندا، پیتاکە جۆراوجۆرەکانیش بە شێوەیەکی بەرچاو زیادیان کردبوو (باوەڕ بکەن یا نەیکەن، لە شەستەکاندا دەتانتوانی بە هەڵکردنی دروشمی بەرزکردنەوەی [رێژەی] پیتاکەکان و خەرجکردنیان بۆ پرۆژەگەلی گشتیی بەرزەفرانە، هەڵبژاردنەکان ببەنەوە). بەرزبوونەوەی بێوێنەی دروستکردنی خانووبەرە لە کالیفۆرنیای کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٧٠دا، وای کردبوو رێژەی پیتاکی ماڵ و موڵک سەر لە ئاسمان بساوێ، کەچی سەرەڕای ئەوەی پاشەکەوتی بوودجە گەشتبووە میلیارەها دۆلار بە رواڵەت ئەنجومەنی ئەیالەتیش نەیدەویست پیتاکی ماڵ و موڵک کەم بکاتەوە. لە گەلاڵەی ژمارە ١٣دا پێشنیاری کەمکردنەوەی بەربڵاوی رێژەی پیتاک خرابووە بەردەست، بەم پێیە پیتاکەکان دەگەڕایەوە بۆ هەمان ئاستی ١٩٧٥ و سنووریێکیش بۆ بەرزکردنەوەی دەسنیشان کرابوو.

سەرەڕای نارەزایەتیی قووڵی خەڵک بەرانبەر رێژەی زۆری پیتاکەکان، بەمەشەوە چاوەڕوان نەدەکرا گەلاڵەی ژمارە ١٣ پەسند بکرێت و جارویس وەک مرۆڤێکی گەمژەو ساویلکە لەقەڵەم دەدرا. رۆژنامەی *سان فرانسیسکۆ کرۆنیکێل* ئاوەها پێناسەی ئەو پیاوەی دەکرد: «مێشەگانەیەکی حەفتا و پێنج ساڵەی نەپۆڕ کە پێی وایە پیتاک دزیکردنی مۆڵەتپێدراوی دەوڵەتە».[١٤] هەرهەموو سیما سیاسییە ناسراوەکانی کالیفۆرنیا دژی ئەو گەلاڵەیە بوون، یەک لەوان بەرجەستەترین کۆنسێرڤالێستی کالیفۆرنیا و پارێزگاری پێشووی ئەو ئەیالەتە واتە رەیگان بوو کە بە گەلاڵەیەکی زۆر توندڕەوانەی لەقەڵەم دەدا. بەپێی راپرسییەکان مانگێک پێش ریفراندۆم هەژماری لایەنگران و دژبەرانی گەلاڵەکە یەکسان بوو و لە سەدا ٢٠ی دەنگدەرانیش هێشتا دوودڵ بوون. ئینجا سێ حەفتە پێش ریفراندۆمەکەی مانگی ژوەن (حوزەیران) ئیدارەی نرخاندنی پیتاکەکانی لۆس ئانجلێس راپۆرتی ساڵانەی خۆی بڵاو کردەوە و بەپێی ئەو راپۆرتە پیتاکی ماڵ و موڵک بە شێوەیەکی سەرسامکەر زیادی کردبوو. ئەم رووداوە لە ساتەوەختێکی گونجاودا قەوما و بوو بە هۆی تووڕەبوونی جەماوەر، [هەر بۆیە] گەلاڵەی ژمارە ١٣ دەنگی لە سەدا ٦٥ی دەنگدەرانی وەرگرت و پەسند کرا.

---

١٥٥: Great society . لیندۆن جانسۆنی سەرۆک کۆماری ئەمریکا (١٩٦٣-١٩٦٩) ئەم نازناوەی بڕیبوو بە باڵای بەرنامە بەربڵاوەکانی خۆی لە رووبەری خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکاندا. ئەم بەرنامانە کە بە مەبەستی «شەڕکردن دژی هەژاری» بەڕێوە دەبران، کۆمەڵە خزمەتگوزارییەکی بەربڵاوی لە بەستێنەکانی فێرکاری، تەندروستی. کار و خانوو و بەرەدا پێشکەش بە هاووڵاتییان دەکرد. و.ف

دوابەدوای ریفراندۆمەکە لە پڕ هەموو شتێ بە سوودی کاربەدەستانی دەسەڵاتدار شکایەوە، جارویسی قەشمەر بوو بە بلیمەتێکی سیاسی؛ وێنەکانی لەسەر بەرگی هەردوو گۆڤاری *تایم* و *نیۆزویک* چاپ کرا و لەگەڵ سەرکردە سیاسییە بیانییەکانی وەک مارگارێت تاچێر و ژاک شیراکدا دیدار و کۆبوونەوەی کرد. رەیگان چەند حەفتەیەک دوای ریفراندۆمەکە داوای لە کۆماریخوازان کرد «دەنگدانی کالیفۆرنیا بۆ گەڵاڵەی ژمارە ١٣ بە ئاراستەی هەڵگیرساندنی ئاگری دژایەتیکردنی بەربڵاو لەگەڵ دەوڵەتی پڕ خەرج و دەسەڵاتخوازدا بە کار بهێنن». ئەوانیش بەگوێیان کرد و گەڵاڵەی ژمارە ١٣ بووە هۆی ئەوەی گەڵاڵەی کەمکردنەوەی رێژەی پیتاک بکەوێتە چەق و سەنتەری مانیفێستی کۆماریخوازانەوە. زۆرێ لە دیموکراتەکانیش بە باوەشی ئاوەڵاوە پێشوازییان لە پەیامی ئەو گەڵاڵەیە کرد. پارێزگاری لیبرالی کالیفۆرنیا، جێری براون، خۆی بە لایەنگری فاناتیک و شەشدانگی کەمکردنەوەی پیتاک ناوزەد کرد. لەکون و قوژبنی وڵاتدا سیاسەتمەداران کەوتنە خۆ و دەستیان دایە دارشتنی گەڵاڵەی کەمکردنەوەی پیتاکەکان. بیل برادلی، کاندیدای حیزبی دیموکرات بۆ ئەنجومەنی سێنا لە ئەیالەتی نیۆجێرسی، کۆی بەرنامەکانی خۆی لەسەر ئەو بەڵێنە چڕ کردەوە کە هەوڵ دەدات رێژەی پیتاکەکانی دەوڵەتی فیدراڵ ٢٥ میلیۆن دۆلار کەم بکاتەوە. پێنج مانگ دوای پەسندکرانی گەڵاڵەی ژمارە ١٣ و لە نۆڤامبری (تشرینی دووەم) ١٩٧٨دا، ١٦ ئەیالەت بۆ دیاردیکردنی سیاسەتەماڵیاتییەکان ریفراندۆمیان بەرێوە برد.

ئەڵبەت گەڵاڵەی ژمارە ١٣ کە دوای چوارساڵ یەکەم ریفراندۆمی کالیفۆرنیا بوو، میراتێکی گەورەی دیکەشی بەدواوە بوو. ئەم گەڵاڵەیە مێتۆدێکی سادە و سیحرئامێزی بۆ گۆڕینی سیاسەتەکانی دەوڵەت خستە بەردەست، میتۆدێک کە پێچەوانەی پرۆسەی پڕ لە کۆسپ و هیواشی ئەو دەم بوو. ئایا باشتر وا نییە لەباتیی لەسەر کار لابردنی هەژمارێکی زۆر لە نوێنەران لە رێی دەنگدانەوە یاکوو لابیکردن بۆ پەسندکردنی گەڵاڵە و دەرکردەیەک، خۆمان راستەوخۆ یاساکان دابرێژین؟ تا حەفتاکانیش هەژماری ریفراندۆمەکان هەر زیادی ئەکرد بەڵام دوای ١٩٧٨ وەک ئاگرەکەی رەیگان هەموو شوێنێکی گرتەوە. لە شەستەکاندا بریاردان لەسەر ٨٨ بابەت سپێردرایە خەڵک و بۆ خۆیان راستەوخۆ [لەو بابەتانەدا] یاساکانیان دارشت. ئەم رێژەیە لە حەفتاکاندا گەشتە ١٨١ و لە هەشتاکاندا بەرز بوویەوە بۆ ٢٥٧ بابەت. تاکوو دەیەی ١٩٩٠ رێژەی یاسادانانی راستەوخۆ گەشتە ٣٧٨ جار، واتە نزیکەی پێنج قات بوویەوە. تەنیا لە ساڵی ٢٠٠٠دا دەنگدەران بۆ ٢٠٤ بابەت یاسایان دارشت کە هەموو شتێکی دەگرتەوە، لە تەندروستی و دەوا و دەرمانەوە بگرە بۆ ریفۆرمکردن لە [سیستەمی] فێرکاریدا یان مافی هێمۆسێکسواڵەکان[١٥٦] و خۆکوشتن بە یارمەتیی پزیشک[١٥٧].

156. Hemosexuals

ئایا ئەم میتۆدە توانیویەتی سەرکەوتوو بێ؟ لەم دوو دەیەی دواییدا بەردەوام میکانیزمەکانی ریفراندۆم، یاسادانانی راستەوخۆ و لەسەرکارلابردنی کاربەدەستانی هەڵبژێردراو بەدەنگی خەڵکمان ئەزموون کردووە.[١٥] بێگومان بە ئاسانی دەتوانین ئاوڕێک لە دانە دانەی ئەو بابەتانە بدەینەوە کە بە رواڵەت خەڵک بەدروستی دەنگیان بۆ داون و [ئینجا] بڵێین: «ئەم سیستەمە گەلێ باشترە، چونکوو ئاکامی باشی لێ کەوتۆتەوە؛ قەت پەرلەمان ئەم یاسایەی پەسند نەدەکرد». لەبەر ئەمەیە لەم چەند دەیەی دواییدا راستگەراکان ئاوا شەیدای یاسادانانی راستەوخۆ ببوون، کێ حەز لە کەمبوونەوەی پیتاکەکان ناکات؟ بەڵام بریاردان لەسەر گۆڕانکارییەکی سیستەمیک لەبەر رۆشنایی ئاکامی تاقەیەک نموونەی یاسادانانی راستەوخۆدا کارێکی گەمژانەیە. بیرمان نەچێ ئەگەری ئەوەش دەچێ کە دەنگدەران دەنگ بۆ چەندەها شتی دیکەیش بدەن کە قەت نەتوانین قبووڵیان بکەین. چەپگەراکان سەرکەوتوو بوون و لە ریفراندۆمەکانا ئامانجەکانی خۆیان بەرەوپێش بردووە. لە بەرانبەردا کۆنەپارێزان لە پیاچوونەوەیەکی گاڵتەئامێزدا بۆچوونی خۆیان دەربارەی کالیفۆڕنیا گۆڕیوە. لە سەردەمی نیکسۆن و رەیگانەوە کە سەردەمی سەرکەوتنی کۆنەپارێزان بوو لەم ئەیالەتەدا، راستگەراکان ئەوەیان بە شتێکی ئاشکرا و روون دەزانی کە کالیفۆڕنیا پێشەنگی نیشتمانە و ریفراندۆمەکانی دەتوانن ئاسۆی گۆڕانکارییەکانی دوارۆژمان نیشان بدەن. بەڵام ئێستە کە زۆرینەی لیبرال جڵەوەی دەسەڵاتی کالیفۆڕنیایان گرتۆتە دەست و وردە وردە سیاسەتە دڵخوازەکانی خۆیان دادەرێژن و پەسندی دەکەن، کۆنسێرڤاتیستەکان پێیان وایە پرچەشیمەتترین ئەیالەتی ئەمریکا لە راستیدا مەملەکەتێکی سەیر و سەمەر و خولیاییە و لەئەمریکا دواکەوتووە. ئێستە لە باوەڕی کۆنەپارێزاندا ریفراندۆمەکانی کالیفۆڕنیا هێمای رابردوون. [١٦] بەڵام لەگەڵ بەردەوامبوونی رەوتی سەرکەوتنی لیبرالەکان لە ئەیالەتەکانیتردا، رەنگە کۆنەپارێزان ئەو پرسیارەیان لا بوروژێ کە بۆچی لە سەرەتادا ببوونە لایەنگری پرۆسەی سەیری یاسادانانی راستەوخۆ؟ لەولاشەوە لیبرالەکان کە هەر لە کۆنەوە رقیان بوو لە یاسادانانی پۆپۆلیستی، وردە وردە تێدەگەن کە شەیدای ریفراندۆمن؛ ئەڵبەت تا ئەو دەمەی وا دۆخەکە دیسان وەردەسووڕێتەوە.[١٥٨]

---

157. Euthanasia

١٥٨ . لە هەڵبژاردنە ئەیالەتییەکانی ساڵی ٢٠٠٤دا کاندیدای کۆنسێرڤاتیستەکان واتە ئارنۆڵد شوارتزێنگێرسەرکەوتنی بەدەست هێنا و بەم شێوەیە ئەندامێکی حیزبی کۆماریخواز بوو بە پارێزگاری کالیفۆڕنیا . و.ف

ڕەنــگە کەســانێ بڵــێن ریفرانــدۆمەکان لانــیکەم کــۆمەڵە باسوخواســێکیان ورووژانــدووە کە دەستەبژێرانی سیاسی خۆیانی لێ نادەن، بەڵام لە راستیدا وا نییە. بۆ وێنە ئاوڕێک لە [پرسـی] پیتاک بدەنەوە. ڕەنگە گەڵاڵەی ژمارە ١٣ بووبێتە هۆی ئەوەی کەمکردنەوەی رێژەی پیتـاک زووتـر بچێتە نێو بەرنامە کـارییە نیشـتمانییەکانەوە، بەڵام ئەم رەوتە هەر لە هەمـان ئەو سەردەمەشـەوە کەوتبـــووە رۆژەڤەوە و سیاســـەتمەدارانی ســـەرقاڵی خـــۆی کردبـــوو. نیشـــانەکانی نائومێـــدبوونی ئـەمریکاییەکان لە دەوڵەتـی گەورە لە کۆتـاییی حەفتاکـانەوە خـۆی نیشـان دا و ئەوان لە هەمـوو ئاستەکاندا دەنگیان بۆ سیاسەتمەدارانی کۆنسێرڤاتیست دەدا. لە کۆتاییی حەفتاکاندا هیچ بابەتێک بە قەدەر پرسـی پیتـاک لە سیاسـەتی ئـەمریکادا رەنگدانەوەی نەبوو، ئەم بـابەتە گەلـێ زیـاتر لە سەرە دووروودرێژەکانی بەردەم بەنزینخانەکان، قەیرانی ئاوسان[159]، راپەڕینە کولتوورییەکـانی دەیەی ١٩٦٠ و تەنانەت بگرە زیاتر لە مەترسیی داگیرکاریی[160] سۆڤییەت کەوتبووە رۆژەڤەوە.

یەک لە راپرسیکەران بە ناوی ریچارد وۆرتلین دەڵـێ: »تەنیا لە سـەردەمی شـەڕی ڤیەتنامـدا جەماوەر بەم شێوەیە لەسـەر بـابەتێکی تاقـانەی هـاوبەش چڕ ببـوونەوە»[١٧] هەرچەنـد گەڵاڵەی ژمــارە ١٣ هێزوبرســـتێکی باشـــی بەخشـــییە پـــرۆژەی کەمکـــردنەوەی پیتاکەکـــان، بەڵام حیزبـــی کۆماریخواز پێش ئەم گەڵاڵەیەش سـەودای ئاوەهـا ئامـانجێکی لەسـەردا هەبـوو و دیموکراتەکـانیش دەترسان لەم بابەتەدا تووشی کێشە بن و [هەڵوێسـتی] رای گشـتیش بەرانـبەر بەم بـابەتە روون و ئاشکرا بوو. ڕەنگە تەنانەت ئەگەر ئەو گەڵاڵەیەش نەبایەت کەمکردنەوەی پیتاکەکان بە هەمان ئەو خێراییە بەرەوپێش چووبا.

پێـوەرێکی باشـتر بـۆ نرخانـدنی یاسـادانانی راسـتەوخۆ [وەڵامـدانەوەیە بەو پرسـیارە] کە ئایـا یاسـادانان لە رێگـای ریفرانـدۆمەوە ئیمتیـازێکی بە سـەر یاسـادانان لە رێگـای پەرلەمـانەوە هەیە؟ هەروەها ئەم سیستەمە نوێیەی دیموکراسیی راستەوخۆ چ ئاسەوار و کاریگەرییەکی لێ کەوتۆتەوە؟ کالیفۆرنیـا باشـترین شـوێنە بـۆ گەڕان بەدوای وەڵامـی ئەم پرسـیارەدا. ئەزمـوونی کالیفۆرنیـا لە خستنە بەر ریفراندۆمی چەندەها بابەتی گچکە و مەزنـدا گشـتگیرترین ئەزمـوونە و لە زۆر لایەنەوە بەدیهـاتنی [ئایـدیای] دیموکراسـیی راسـتەوخۆیە. جیـا لەمەش ڕەنـگە کالیفۆرنیـا ئـاڵاهەڵگری پێشـهاتەکانی بەردەمـان بێـت. کالیفۆرنیـا پڕحەشـیمەتترین ئەیـالەتی ئـەمریکایە، ئـابووریی ئەم ئەیالەتە تێکەڵکردێکە لە وەرزێڕی، ئـابووریی نـوێ و پیشەسـازییە نیـزامییە کۆنەکـان، کالیفۆرنیـا هەڵگری پێکهاتێکی حەشیمەتیی فرە ئەتنیکی، فرە ڕەگەزی، فرە ئایینی و تەنـانەت فـرە زمـانییە.

---

159. Inflation stagnation
160. Expansionism

لە هەمووشی گرنگتر زۆر وەخت کالیفۆڕنیا پێشەنگی ئەمریکا و لە راستیدا جیهان بووە، ئەم ئەیالەتە لە تەکنۆلۆژیا، بەکارهێنان[161]، رەوتە تازەکان، شێوازەکانی ژیان و بەتایبەت لە رابواردنە گشتییەکاندا دەوری پێشەنگی گێڕاوە. یەکەم و کامڵترین دەرکەوتنی ئۆتۆمبیل لەم ئەیالەتەدا هاتە دی، زنجیرە شارۆچکەکان[162] لێرەدا گەشەیان سەند و هەر لێرەشدا بوو کە رۆشتن بۆ هۆڵی وەرزش جێی کەلیسا رۆشتنی گرتەوە. هەروەها سەرجەم ئەو هێزە تەکنۆلۆژیک و ئایدیۆلۆژیکانەی زۆر کەسیان گەیاندە ئەو قەناعەتەی دیموکراسیی راستەوخۆ شەپۆلی داهاتووە، زیاتر لە هەموو شوێنێ لەم ئەیالەتە بەربڵاوەدا سەریان هەڵدا - واتە دیاردەگەلێکی وەک فەشەلهێنانی حیزبە سیاسییەکان، کارکردن لە ماڵی خۆتدا [لەباتیی شوێنی کار]، تەکنۆلۆژیای نوێ و نەوەی ئینتەرنێتی.

جیا لە سویسرا کە نموونەیەکی سەیر و سەمەرەیە نەک پێشەنگ، کالیفۆڕنیا کامڵترین و تەواوترین دەرکەوتەی دیموکراسیی راستەوخۆیە لە دونیای ئەوڕۆدا و ئەگەر بێت و بە راستی کالیفۆڕنیا شەپۆلی داهاتوو بێت ئەوا ئەم داهاتوویەمان دیتووە و [بێگومان] داهاتوویەکی لێڵ و ناڕەوونە.

## خەونی کالیفۆڕنیا

کەس لەگەڵ واقیعدا بەشەڕ نایەت. لە پەنجاکان و سەرەتای شەستەکاندا کالیفۆڕنیا یەکێک بوو لە بەدیسیپلینترین و رێکوپێکترین ئەیالەتەکانی ئەمریکا و ناوبانگێکی هەبوو هەموان ئێرەییان[163] پێ دەبرد. لە سەر بەرگی یەکێک لە ژمارەکانی ساڵی ١٩٦٢ی *نیۆزویک* ئەم رستەیە نووسرابوو: «ئەیالەتی ژمارە یەک»؛ گۆڤاری *تایم*یش ئاوای نووسیبوو: «کالیفۆڕنیای گەشاوە و جوان»؛ لە سەر بەرگەکەیشی نووسرابوو: «کالیفۆڕنیا: ئەیالەتێکی ورووژێنەر». کالیفۆڕنیا شتی ورووژێنەری گەلێ زۆر بوو. ئابوورییەکی گەشاوە و دەوڵەمەندی هەبوو و بە دیاریکردنی رێژەیەکی مامناوەندی و گونجاو بۆ پیتاکەکان گەلێ خزمەتگوزاریی گشتیی زۆر سەرنجراکێش و دەست و دڵبازانەی پێشکەش [بە خەڵک] کردبوو، لە ئۆتۆبانەکان و سیستەمی پێشکەوتووی ئاودێریکردنەوە بگرە تا دەگاتە پۆلیسی کارا و چەندین و چەند پارک و باخی ئاژەڵانی سەرسامکەر. سیستەمی فێرکاریی کالیفۆڕنیا کە لە جیهاندا بێوێنە بوو بە گەورەترین سەرکەوتنی ئەم ئەیالەتە دەهاتە

161. Consumption
162. Conurbations
163. Jealousy

ئەژمار، لەم سیستەمەدا پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە باخچەی ساوایانەوە دەستی پێ دەکرد و لە زانکۆ ئەیالەتییە پڕبایەخ و ناسراوەکانی کالیفۆرنیادا دەگەشتە کۆتایی. دانیشتووانی کالیفۆرنیا هێند سەرخۆش و ئاسوودە دیاربوون کە ببوونە هۆی زیزبوونی لەڕادەبەدەری رۆشنبیرانی دەڤەرە ساردوسڕ و شکەلاتووەکانی باکووری رۆژهەلاتی ئەمریکا. (وودی ئالێن دەیوت: «هەموو ئەو خەلکە سەرخۆش و بەکەلک نەهاتووە»). بەلام لای خەلکانیتری دونیا کالیفۆرنیای روو لە هەتاو، ئاسوودە و بە دیسیپلین، هێمای داهاتووی سەرسامکەری ولاتە یەکگرتووەکان بوو. کالیفۆرنیا [هەمان] خەونی ئەمریکایی بوو.

کالیفۆرنیای ئەورۆ چیرۆکێکیتر دەژی. بەهاری ٢٠٠١ کالیفۆرنیا نوقمی کوژانەوە و بڕانی کارەبا بوو، ئەم دیمەنە هێندستانی بیر دەهێنامەوە (لە راستیدا بڕانی کارەبا ناخۆشترین ئەزموونی سەردەمی مندالیم بوو). ئەلبەت دەربەندی سیلیکۆن[١٦٤] و هۆلیوود کەوتوونەتە کالیفۆرنیاوە کە دوو سەنتەری مەزنی پیشەسازی و داهێنانی ئەمریکان. بەلام ئەمە کەرتی تایبەتیی[١٦٥] کالیفۆرنیایە. کەرتی دەولەتی[١٦٦] یان باشترە بلێین کەرتی ژیانبەخشی دەولەتی، بە تەواوی هەلاهەلا بووە. هەموو سالێ دەولەتە ئەیالەتی و خۆمالییەکان[١٦٧] هەول دەدەن خۆیان لە قەیرانی دارایی بپارێزن. ئەو ئۆتۆبان (جووتساید) و شارێیانەی سەردەمانێ سەرچەشنی جیهان بوون [هەنووکە] بە راستی لە رووخاندن و داخرانی رێگاکان بۆتە دێوەزمە و لە هەمانکاتدا خەرجێکی قورسی بەسەر ئابووریدا سەپاندووە. لە پەنجاکاندا لە سەدا ٢٢ی بوودجەی کالیفۆرنیا تەرخان ئەکرا بۆ کاروباری ژێرخانەکان[١٦٨] بەلام ئەم رێژەیە ئێستە دابەزیوە بۆ لە سەدا کەمتر لە ٥ی کۆی بوودجە. پارکە گشتییەکان تەنیا بە بڕینەوەی پسوولەی قورس درێژە بە ژیانیان دەدەن. سیستەمی فێرکاریی ئەیالەتی داڕووخاوە و قوتابخانەکان لە رووی بوودجە، پلەی وانەکان[١٦٩] و لێهاتوویی[١٧٠] قوتابییانەوە کەوتوونەتە خوارترین پلەی پۆلێنبەندییەکانی ئەمریکاوە.

سەرەڕای دووقاتبوونەوەی حەشیمەتی کالیفۆرنیا، سیستەمی زانکۆ ئەیالەتییەکان نەیتوانیوە لە دە سالی رابردوودا تەنانەت تاقەیەک زانکۆی تازەیش بکاتەوە. کەچی لە هەمان کاتدا وەک چۆن رۆژنامەنووسی دێرین، پیتێر شراگ، لە کتێبە کاریگەرەکەیدا بە ناوی *بەهەشتی ونبوو* ئاماژەی پێ

---

١٦٤ . سەنتەری تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووی کالیفۆرنیا. و.ف

165. Private sector
166. Government sector
167. LocalGovernments
168. bases
169. Mark
170. Competence

داوه، لە بیست ساڵی رابردوودا کالیفۆرنیا بە ناچار بیست بەندیخانەی تازەی کردۆتەوە. گۆڤاری ئێکۆنۆمیست لە ١٩٩٣دا ئاوەها ئەنجامگیرییەکی دا بەدەستەوە کە «سەرجەم سیستەمی دەوڵەتی کالیفۆرنیا شپرز و شێواوە». بەپێی راپۆرتی کۆنفرانسی بازرگانی و خوێندنی باڵا ـ کە بە بەشداریکردنی هەردوو حیزبەکە و بە ئامادەبوونی بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکان و بەرپرسەکانی پەروەردە و فێرکردن لە ١٩٩٦دا بەڕێوە چوو ـ ئەگەر گۆڕانکارییەکی بنەمایی روو نەدات «بە لەبەرچاوگرتنی کێشە روو لە پەرەکانی بواری هاتوچۆ، بەرزبوونەوەی تاوان و جینایەت و بشێوییە کۆمەڵایەتییەکان و، کۆچکردنی کۆمپانیاکان لەم ئەیالەتە، ئاستی ژیان[١٧١] لەمەش زیاتر دادەبەزێ». ئەم راپۆرتە لە سەردەمێکدا نووسراوە کە ئاستی ئابووریی ئەمریکا لە بەرزترین پلەی سی ساڵی رابردوویدا بوو. باشترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی دۆخی هیوابڕی کالیفۆرنیا هاودەنگیی هەردوو بەرەی چەپگەرا و راستگەرایە لەسەر ئەم بابەتە. راڤەکاری کۆنەپارێز، فرێد بارنێز، لە دووتوێی وتارێک لە گۆڤاری ویکلی ستاندارد و هاوشێوەی بۆچوونەکەی شراگی لیبرال، پێی وایە دەوڵەتی ئەیالەتی ئیدی توانای راپەڕاندنی ئەرکەکانی خۆیی نەماوە: «کالیفۆرنیا پێگەی بەرزی [جارانی] لە دەست داوە، ئەیالەتێک کە دەوڵەتی هێند کارا و قوتابخانەکانی هێند دانسقە و بێوێنە و سیستەمی هاتوچۆ و گواستنەوەی هێند بە دیسیپلین بوو هەموان ئێرەییان پێ دەبرد».[١٨]

ناتوانین ریفراندۆم و یاسادانانی راستەوخۆ بە سەرچاوەی هەموو کێشەکانی کالیفۆرنیا لەقەڵەم بدەین. بەڵام بەشی هەرەزۆری شپرزەیی و شێواویی ئەم ئەیالەتە بەرهەمی [بەکارهێنانی] شێوازی زێدەڕۆیانەی دیموکراسییە کراوە و ناهیرارشیکەکەی بوو، سیستەمێک کە پشت بە حیزب نابەستێ و تێیدا یاسادانانی راستەوخۆ باوە. ئەو سیستەمە سیاسییەی کالیفۆرنیا بەرهەمی هێناوە زیاتر لە هەر کۆمەڵگایەکی شارستانی لە ئانارشیزمەوە نزیکە. ئاوڕێک بدەنەوە لە کاریگەرییەکانی شەپۆلی ئەم دواییانەی یاسادانانی راستەوخۆ [با لەم راستییە بگەن]. دوای پەسندکردنی گەڵاڵەی ژمارە ١٣، بە دەیان گەڵاڵەی دیکە لە رێگای ریفراندۆمەوە لەم ئەیالەتەدا پەسند کراوە، بۆ وێنە گەڵاڵەی ژمارە ٤ (کە سنوورێکی کۆنکرێتی بۆ خەرجە ئەیالەتییەکان دیاری دەکرد و نەیدەهێشت ئەو سنوورە ببەزێنێ)، گەڵاڵەی ژمارە ٦٢ (کە هەرجۆرە بەرزکردنەوەیەکی رێژەی پیتاکی دەبەستەوە بە دەنگی زۆرینەی رەهای جەماوەرەوە)، گەڵاڵەی ٩٨ (کە لە سەدا ٤٠ی بوودجەی ئەیالەتیی تەرخان دەکرد بۆ فێرکاری)، هەروەها گەڵاڵەی ٢١٨ (کە مەرجەکانی گەڵاڵەی ژمارە ١٣ی بەسەر نرخەکان و پیتاکە خۆماڵی

171. Quality oflive

و لۆکاڵەکانیشدا گشتاندووە). بەم پێیە ئەنجومەنی ئەیالەتی لە ئاست بوودجەدا هیچ دەسەلاتێکی بۆ نەماوەتەوە، چونکوو بۆ دابەشکردنی بوودجەکان ناچارە بەپێی بڕیاری ریفراندۆمەکان و یاسای فیدراڵ بجووڵێتەوە. ئەمێستا لە سەدا ٨٥ی بوودجە ئەیالەتییەکانی کالیفۆڕنیا لە کۆنترۆڵی ئەنجومەنی ئەیالەتی یان پارێزگاردا نەماوە ـ رەنگە ئاوەها دۆخێک لە وڵاتە یەککگرتووەکان و تەنانەت لە جیهانیشدا بێوێنە بێت. بەشی هەرەزۆری بوودجەی کالیفۆڕنیا «لە پێشترەوە» دابەش کراوە و ئەنجومەنی ئەیالەتی تەنیا لەسەر پاشماوەی لە سەدا ١٥ی کۆی بوودجەکە دەسەلاتی بڕیاردانی هەیە. لە کالیفۆڕنیای ئەمڕۆدا دەسەلاتی راستەقینە لە هیچ شوێنێکدا نییە، دەسەلات لە فەزادا بڵاو بۆتەوە، چونکوو زۆربەی کاروبارەکانی دەوڵەت لە رێگای کۆمەڵێ یاسا و بەرنامەی وشک و ناپراتیکییەوە بەڕێوە دەبرێن. شراگ وتەنی، وا دیارە هەموو هیوادارن «دەوڵەت وەک ماشینێکی نیوتۆنی بەڕێوە ببرێ، [واتە] لە هەر چەشنە کۆنترۆڵ یان دەنگ و بۆچوونێکی شیاو و جێی سەرنجی نوێنەرانی هەڵبژێردراو پارێزاو بێت. ئەم کارە نەتەنیا دیموکراسی دەگۆڕێ بۆ شتێکی گاڵتەجاڕ کە هیچی لە نموونە ئایدیالەکەی ناچێ، بەڵکوو بەجۆرێک لە جۆرەکان دەبێتە هۆی لە کۆنترۆڵ دەرچوونی دیموکراسی». [١٩]

سەرەڕای ئەوەی ریفراندۆمەکان جۆری هەکار و هەڵسوکەوتی سیاسەتمەداران دیاری دەکەن، بەمەشەوە هێشتا پێویستە ئەوان ئەم بڕیارە خەیاڵییانە بگۆڕن بۆ واقیع. یاسادانانی راستەوخۆ ئەم پرۆسەیەی بە تەواوی تێک داوە، چونکوو بەرپرسایەتی دەخاتە ئەستۆی سیاسەتمەداران بەڵام دەسەلاتیان پێ نابەخشێ. ئەزموونی ریفراندۆمی شوێنەکانیتریش نیشاندەری ئەو راستییەیە کە کێشەکە تەنیا تایبەت بە ئەیالەتی زێڕین نییە. بەپێی [بەڵگەنامەکانی] کۆنفرانسی شارەوانییەکانی ئەیالەتی کانتیکات لە کۆی ١٦٩ شارەوانیی ئەم ئەیالەتە ٧٢ شارەوانی بوودجەی پێشنیاردراوی بەرپرسانی بەڕێوەبەرایەتیی شارەکانیان بۆ پەسندکردن خستۆتە بەر ریفراندۆمەوە. لەم ٧٢ شارە ٥٢ شاریان بە ناچار سەرلەنوێ ریفراندۆمەکەیان بەڕێوە بردبێوە کە زۆربەشیان زیاتر لە یەک جار دووپاتیان کردبۆوە، چونکوو بوودجەی پێشنیارکراو رەت کرابوویەوە و دەنگی نەهێنابوو. بەپێی زۆربەی ئەم ریفراندۆمانە بەرپرسە خۆماڵییەکان دەبا رێژەی پیتاکیان کەم بکردایەتەوە و لە هەمان کاتدا خزمەتگوزارییە شارییەکانیان پەرە پێ بدایەت. جەیمز فینلی، بەرپرسی کاروباری یاسایی کۆنفرانسەکە، دەڵێت: «ئەگەر بتهەوێ هەردووکی ئەم کارانە پێکەوە جێبەجێ بکەیت [بێگومان] دەبێ سیحرباز بیت».[٢٠]

لافاوی روو لە پەر و رۆژانەی دەستووره پیرۆزەکانی جەماوەر، جۆرە چێشتێکی مجێوری یاساکانی پێک هێناوە کە [یاساکان] زۆربەیان پێچەوانە و دژی یەکترن و هیچ جۆرە باسوخواس،

وردبینی، تەبایی و پێکەوەسازانێکیان[١٧٢] تێدا نییە کە تایبەتمەندییەکانی پرۆسەی یاسادانانن. سروشتی وشکی «ئەرێ یان نە»ی ریفراندۆم وا دەکا وردەکارییەکان یان واقیعی پراتیکی هێند لە بەرچاو نەگیرێن. بۆ وێنە ئەگەر لە ساڵێکی دیاریکراودا لە باتیی لە سەدا ٤٠ی بوودجەی پەسندکراوی ریفراندۆم بۆ کاروباری فێرکاری و قوتابخانەکان باشتر و ئاقڵانەتر ئەوە بێت کە تەنیا لە سەدا ٣٦ی بوودجەی کالیفۆرنیا بۆ ئەم کارە تەرخان بکرێ، [بێگومان] ئەگەر لەبەر ریفراندۆمەکە نەتوانین ئەم کارە ژیرانە ئەنجام بدەین، دوچاری خەسارێکی قورس دەبین.

یەکێکی دی لە پێشهاتە نەخوازراوەکانی بزووتنەوەی ریفراندۆم لەناوچوونی لۆژیکی وەڵامدانەوەیە کە سەردەمانێ لای سیاسەتمەداران و لە سیاسەتە دەوڵەتییەکاندا دەماندیت. دەنگدەرانی کالیفۆرنیایی کۆلێکسیۆنێک[١٧٣] لە کۆت و بەند و مەرجگەلی بیزانسییان لە بەرانبەر پرۆسەی دانانی پیتاک و خەرجەکاندا کردۆتەوە و بەم شێوەیە دەسەڵاتی نرخاندنی هەڵسوکەوتی سیاسەتمەدارانیان لە خۆیان زەوت کردووە. دوای تەواوبوونی بوودجەی تەرخانکراو بۆ گەڵاڵەیەکی تایبەت، کەس نازانێ ئایا پەرلەمان بوودجەیەکی کەمی بۆ تەرخان کردووە یا ناوچە ئەیالەتییەکان زیاد لە ئەندازەیان خەرج کردووە، یاکوو ریفراندۆمە ئەیالەتییەکان دەستی بەستوون؟ بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە کالیفۆرنیا لە ٥٨ مەڵبەند و ٤٤٧ شار و ٥٠٠٠ دەڤەری تایبەت پێک هاتووە، دەتوانین وێنای ئەو دۆخ شپرز و شێواوە بکەین کە هەر خۆی بە شێوەیەکی سروشتی و ئاسایی دێتە خۆلقان، چونکوو هەرکەسەو بەرپرسایەتی [ی کێشەکان] دەخاتە ئەستۆی کەسانی‌دی. بێگومان نەمان و سڕانەوەی دەسەڵات یەکانگیرە لەگەڵ نەمان و سڕانەوەی رێز و حورمەتدا. لە رووی رەزامەندیی گشتییەوە دەوڵەت و ئەنجومەنی ئەیالەتیی کالیفۆرنیا لە نێو ئەیالەتەکانی ئەمریکادا خوارترین پلەکانیان بە دەست هێناوە. خەڵکی کالیفۆرنیا سەرکردە هەڵبژێردراوەکانی خۆیان خەساندووە، کەچی پێیان سەیرە چما سەرکردەکانیان رێگا چارەیەک بۆ کێشەکانی ئەیالەت نادۆزنەوە!

بۆ وێنە ئاورێک بدەنەوە لەوەی کە دەوڵەتی کالیفۆرنیا چۆناوچۆن دەیویست لە هەردوو پرسی کۆچبەریی نایاسایی و گەڵاڵەی پشتگیریکردنی کەمایەتییەکان بکۆڵێتەوە و لە بەرانبەردا دەوڵەتی فیدراڵ چۆناوچۆن هەوڵی خستنە رۆژەڤی پرسی ریفۆرمکردن لە یاساکانی دابینکردنی کۆمەڵایەتیی[١٧٤] دەدا. لەکالیفۆرنیادا هەردوو بابەتەکە خرانە بەر ریفراندۆمەوە کە پرسی

---

172. Compromise
173. Collection
174. Socialsecurity

ریفۆرمکردن لە یاساکانی دابینکردنی کۆمەڵایەتیدا لە ڕێگای پرۆسەی یاسادانانەوە گەشتە ئەنجام و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بێگومان پیاچوونەوە بە یاساکانی دابینکردنی کۆمەڵایەتیدا ڕێگایەکی سەغڵەتتر و دوور و درێژتری دەبڕی. لایەنگرانی ئەو گەڵاڵەیە مەجبوور بوون باسەکە لە رووبەری نیشتمانیدا بکەنەوە و بیخەنە گەڕ، [ئینجا] لە هەردوو پەرلەمانەکەدا دەنگی پێویستی بۆ کۆ بکەنەوە و دواجار کلینتۆن رازی بە ئیمزاکردنی بکەن، کلینتۆن دوای ئەوەی سێ جار گەڵاڵەکەی بۆ نێردرا ئینجا ئیمزای کرد. بەڵام لە دووتوێی ئەم پرۆسەیەدا - پرۆسەی دیالۆگ و وتووێژ، هەناردن و هەناردنەوەی گەڵاڵەکە و پێکەوەسازان و تەبایی[175] - ڕێگا چارەیەک دۆزرایەوە کە هەردوو حیزبەکە پشتیوانییان لێ دەکرد و تیایدا هەندێ لە داخوازییەکانی هەردوولا لە بەرچاو گیرابوو. ئەم ڕێگایە هەنگاو بە هەنگاو و وردە وردەش هاتە بەرهەم کە [بێگومان] بۆ گۆڕانکارییەکی گەورەی یاسایی لە وڵاتێکی مەزندا هەر دەبێ ئاوەها میتۆدێک پێڕەو بکرێت. هەر بۆیە ریفۆرمیزاسیۆنی یاساکانی دابینکردنی کۆمەڵایەتی پشتیوانییەکی سیاسیی بەربڵاوی کۆ کردەوە، لۆژیکاڵ و شایانی بەرگریلێکردن بوو، دەرفەت و سەرچاوەی دارایی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی تەرخان کرابوو و بە شێوەیەکیش بەڕێوە برا کە [هیچ جۆرە] پەرچەکردارێکی توندوتیژی لێ نەکەوتەوە. ئێستە ئەم ریفۆرمانە زۆر جار بە سەرکەوتنێک [ی بەرچاو] لەقەڵەم دەدرێن و هەم کۆماریخوازانی کۆنگریس و هەم کلینتۆن بە یەکێ لە پڕ شانازیترین سەرکەوتنەکانی خۆیانی لەقەڵەم دەدەن.

ئەم نموونەیە بەراورد بکەن بە گەڵاڵەی ژمارە ١٨٧ (سەبارەت بەکۆچبەری) و گەڵاڵەی ژمارە ٢٠٩ (سەبارەت بە دابینکردنی ژیانی کەمایەتییەکان). گروپە ڕێکخراوەکان بە پشتیوانیی هەندێ لە سیاسەتمەداران هەردوو بابەتەکەیان لە ژێر کۆنترۆڵی حیزبە سیاسییەکان و پەرلەمان دەرهێنا و بە بردنیان بۆ نێو پرۆسەیەکی جیاواز لە پرۆسەی باوی سیاسی، ململانێیەکی پڕ خەرجی تێلەڤیزیۆنییان خستە گەڕ. ئەوان [ململانێکەیان] بردەوە و هەردوو گەڵاڵەکە پەسند کران و بوون بە یاسا. بەڵام ئەم کارە لە دەرەوەی پرۆسەی یاسادانان [واتە] بە بێ ئەنجامدانی تەبایی و ڕێکەوتن و، بە بێ هیچ جۆرە لێکدانەوەیەک، گەشتە ئەنجام، هەربۆیە هەردوو گەڵاڵەکە دوژمنکاری و رقێکی گەورەیان خستەوە. سەرکەوتنی کۆماریخوازان لە [ململانێی] گەڵاڵەی ژمارە ١٨٧دا بەتەواوی بە باری پێچەوانەدا شکایەوە، چونکوو بوو بە هۆی تۆمەتباربوونیان بە ئەتیکێتی[176] وەک بەدڕەسەن، دژە پەنابەر و دژە کەمایەتی - ئەتیکێتی دژە کەمایەتی تۆمەتێکی

175. Compromise
176. Label

خراپە و لە کالیفۆرنیا و، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە ناوچەکانیتری ئەمریکایشدا، مرۆڤ بە سەختی ئەتوانێ خۆی لەم تۆمەتە پاک بکاتەوە. ئەڵبەت ئەم دوو گەڵاڵەیە گەلێ خراپیش داڕێژرابوون، بە شێوەیەک کە لەو کاتە بەدواوە زۆربەی بەشەکانی گەڵاڵەی ژمارە ١٨٧ لە لایەن دادگاکانەوە بێکاریگەر خراوە. وارد کایەرلی، داڕێژەری یەکەمی گەڵاڵەی ٢٠٩، ئێستە دان بەو ڕاستییەدا دەنێت کە هەڵوەشاندنەوە و داخستنی کاروباری پشتیوانیکردن و دابینکردنی ژیانی کەمایەتییەکان دەبا هەنگاو بە هەنگاو جێبەجێ کرابا تاکوو زەبرێکی کەمتری لە سیستەم بدایە. تەنانەت ئەگەر لەگەڵ هەردوو گەڵاڵەکەشدا بین [نابێ ئەو ڕاستییە پشتگوێ بخەین] کە میتۆدی بەیاساکردنی ئەو گەڵاڵانە میتۆدێکی ساوا و کاڵ و کرچ بوو و بە باری پێچەوانەدا شکایەوە. میتۆدی دێرین و سەدان ساڵەی یاسادانانی پەرلەمانی میتۆدێکە پێویستی بە دیالۆگ و قووڵبوونەوەیە، ڕوانگەکانی حیزبی دژبەر لە بەرچاو دەگیرێ، تەبایی و ڕێکەوتنی بۆ دەکرێ و بەم شێوەیە یاسایەک دێتە بەرهەم کە تەنانەت لای بەرهەڵستکارانیش بە یاسایەکی لۆژیکاڵ و شیاوی بەرگریلێکردن دێتە ئەژمار. کاتێ پادشاکان بە دەرکردنی فەرمان دەسەڵاتیان بەڕێوە دەبرد نەیانتوانی سیاسەتێکی سەرکەوتوو بژین، [بێگومان] ئەگەر خەڵکیش هەر بەم میتۆدە بجووڵێنەوە ناتوانن سەرکەوتن مسۆگەر بکەن.

ڕەنگە گەورەترین پارادۆکسی بزووتنەوەی ریفراندۆم و یاسادانانی ڕاستەوخۆ هەڵگەڕێتەوە بۆ پێوەندیی کتوپڕ و چاوەڕواننەکراوی لەگەڵ پارەدا. دیموکراسیی ڕاستەوخۆ کە سەرەتا بە مەبەستی سڕینەوەی ئاسەوارە نەگونجاوەکانی کۆمپانیا گەورەکان لەسەر سیاسەتەکانی دەوڵەت هاتە ئافراندن، [ئێستە] گۆڕدراوە بۆ گۆڕەپانێکی جیاواز و تەنیا دەوڵەمەندترین کەسەکان و گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان دەوری تێدا دەگێڕن. ئەگەر بڕیاریش بێ گەڵاڵەیەک بگاتە قۆناغی ریفراندۆم پێویستە هاوشێوەی سیاسەتمەداران بخرێتە نێو ململانێکانی هەڵبژاردنەوە. بەرلە هەر شتێ پێویستە گەڵاڵەکە دابڕێژرێت و بیچمبەندی بکرێ کە ئەم کارە بە شێوەی ئاسایی پێویستی بە ڕاوێژکاریی سیاسی هەیە و دەبێ لە لایەن گرووپە توێژەرەکان و ئەکیپێک لە یاسازانانەوە تاوتوێ بکرێت. ئینجا دەبێ بخرێتە بەر ریفراندۆمەوە. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ لە ماوەیەکی کورتدا ئیمزایەکی زۆر کۆ بکرێتەوە. کە بۆ ئاوەها کارێک لە نزیک بە هەموو نموونەکاندا پێویستە پەنا ببەینە بەردەم خزمەتگوزارییەکانی کۆمپانیا پسپۆڕەکانی کۆکردنەوەی ئیمزاوە. (کە بە زمانێکی نیوە شۆخی و نیوە جیدی بە «کۆمەڵەی یاسادانەری ـ پیشەسازی» ناوبانگیان دەرکردووە). پاشان دەبێ ڕەزامەندی و قەناعەتی خەڵک بە دەست بهێنین و گەڵاڵەکەیان پێ بقەبووڵێنین کە بۆ ئەمەش پێویستە دیسان پارەیەکی زۆرگەورە بۆ بانگەشە و

پڕوپاگەندە تەرخان بکەین. دواجار کۆی ئەو بڕە پارەی بۆپەسندکردن یان دژایەتیکردنی گەڵاڵەکانی ریفراندۆم سەرف دەکرێ لەگەڵ بڕەپارەی سەرفکراوی کاندیداتۆرەکان بۆ هەڵبژاردنەکانی پەرلەماندا هاوتەریب و چۆنیەک دێتەوە، کەچی زۆرجار تۆمەتی گەندەڵی، زیاتر ئاراستەی کاندیداتۆرەکان دەکرێ [تاکوو ریفراندۆم]. دەیڤید برۆدێر لە کتێبی *داخرانی دیموکراسی: یاسادانانی راستەوخۆ و هێزی پارە*دا ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە لە دووتوێی پرۆسەی یاسادانانی سالانی ١٩٩٧ و ١٩٩٨دا لەسەرانسەری ئەمریکادا زیاتر لە ٢٥٧ میلیۆن دۆلار خەرجی ریفراندۆمەکان کراوە، واتە زیاتر لە یەک بە سێی ئەو ٧٤٠ میلیۆن دۆلارەی لە لایەن سەرجەم کاندیداتۆرانی ئەنجومەنی نوێنەران و سێناوە خەرج کراوە. لە کالیفۆرنیا تەنیا لە ١٩٩٦دا زیاتر لە ١٤١ میلیۆن دۆلار بۆ یاسادانانی راستەوخۆ خەرج کراوە، کە بە بەراورد لەگەڵ خەرجەکانی کاندیداتۆرەکانی ئەنجومەنی ئەیالەتیدا لە سەدا ٣٣ زیاتر خەرج کراوە، کەچی زۆر بە خراپیش باسی ئەو کاندیداتۆرانە دەکرێت.

دەرئەنجامی تێکەڵبوونی بڕە پارەیەکی زۆر بە پرۆسەی یاسادانانی راستەوخۆ بە شێوەیەکی دڵتەزێن هاوشێوەی هەمان ئەو دۆخەیە کە ئێستە لە ئەنجومەنی یاسادانانداندا روو دەدات: گرووپە خاوەن بەرژەوەندییە رێکخراوەکان بە کەڵکوەرگرتن لە پشتیوانییەکی گەورەی دارایی، پارێزگاری لە پێگە [و بەرژەوەندیی] خۆیان دەکەن. بۆ وێنە کاتێ گرووپە کارییەکان[١٧٧] گەڵاڵەی «پارێزگاریکردن لە چێکی[١٧٨] مووچە» یان خستە بەر ریفراندۆمەوە، سەندیکا کرێکارییەکانی کالیفۆرنیا یەکیان گرت و فەشەلیان پێ هێنا. سەندیکاکانی مامۆستایان نەیانهێشتووە هیچکام لە ریفراندۆمەکان سەبارەت بە کۆپۆنی قوتابخانەکان سەرکەوتن بەدەست بهێنێ کە بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بدەینە هەر سێ ریفراندۆمەکەی ساڵی ٢٠٠٠ کە پشتیوانییەکی دارایی گەورەیشیان لە پشت بوو. لە ئەیالەتەکانی میزۆری و ئۆرگۆندا هاوپەیمانییە بازرگانییەکان کە بە پارە و سەرمایەی زۆر تەیار کراون و بە ریز نازناوی «پارەی پیتاک هی سیاسەتمەداران نییە» و «پارەی پیتاکدەران[١٧٩] بە سەدەقە مەدەن بە سیاسەتمەداران» یان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو، هەر هەموو ریفراندۆمەکانیان کە لەسەر دابینکردنی سەرچاوە داراییەکانی ململانێکانی هەڵبژاردن بەڕێوە دەچوون، بە جیاوازییەکی زۆرەوە فەشەل پێ هێنا. بەڵام ئەم رووداوە هەڵگری شتێکی تازەیشە. هاوکات لەگەڵ رووڵەگەشەبوونی گرووپە خاوەن بەرژەوەندییە

177. Works Group
178. Check
179. Tax. Payers

[زۆر] دەوڵەمەندەکان لە سەردەمی دیموکراسیی ڕاستەوخۆدا، پرۆسەی یاسادانانی ڕاستەوخۆ کاراکتەرێکی چاوەڕواننەکراوی دیکەیشی تێکەڵ بە مەیدانی سیاسەت کردووە: میلیاردێری سیاسەتداهێن. جۆرج سۆرۆس (سەرمایەگوزار)، ریچارد دیوێس (لە دامەزرێنەرانی کۆمپانیای ئاموی)، تیمۆتی دراپێر (سەرمایەگوزار)، پاڤێل ئالێن (لە دامەزرێنەرانی مایکرۆسافت) و چەندەها کەسی دیکە لە ریزی ئەو کەسانەدان کە لە سەرانسەری ئەمریکادا پرۆسەی یاسادانانی ڕاستەوخۆیان بە ئاراستەی پەسندکردنی بابەتە دڵخوازەکانی خۆیاندا خستۆتە گەڕ. بە بارێکدا ناتوانین بە ئاسانی لۆمەیان بکەین: ئەوانیش وەک هەموو کەسێکیتر خاوەن ڕوانگەی سیاسیی تایبەت بە خۆیانن و ئەوەی پێیان دروستە ئەنجامی دەدەن. بەڵام سەدەیەک لەمەوپێش کە سەرکردەکانی بزاڤی پێشکەوتووی دیموکراسیی ڕاستەوخۆ بە مەبەستی سەندنەوەی دەسەڵات لە سەرمایەدارە دڵڕەقەکان ئەو بزاڤەیان خستە گەڕ، ئایا قەت بە مێشکیاندا دەهات ڕۆژێک لە ڕۆژان گرووپە خاوەن بەرژەوەندییە بەهێزەکان و میلیاردێرە سیاسەت داهێنەکان جڵەوەی ئەم سیستەمە بگرنە دەست؟

ریفراندۆم و یاسادانانی ڕاستەوخۆ بۆتە هۆی خێراتربوونەوەی پرۆسەی سەندنەوەی دەسەڵات لە سیاسەتمەداران و ئەسپاردنی بە «خەڵک»، بەڵام [ئەم کارە] هەمیشە لە ڕێگای دەستەیەک لە ڕاوێژکاران، لۆبییەکان، ڕاپرسیکەران و چالاکانەوە بەڕێوە براوە کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر پەرە دەسێنن و گەورە دەبێتەوە. ئێمە لەژێر ناوی دیموکراسیدا چینێکی تازە لە دەستەبژێرانی زۆر بەهێزمان بەرهەم هێناوە. بەو پێیەش کە پێناسەی دەوڵەت گۆڕدراوە بۆ ژیانکردنی هەمیشەیی لە نێو ململانێکانی هەڵبژاردندا، چالاکی و کاریگەریی ئەم دەستەبژێرانەش قەت دوایی نایەت. هەرچی ئەم شۆڕشە گەشە و نەشەیەکی فرەتری بووبێ دامەزراوەکانی دیموکراسیی نوێنەرایەتیش[180] پاشەکشێیەکی زیاتریان کردووە: کۆنگرێس، سیاسەتمەداران، حیزبە سیاسییەکان، ڕێکخستنە ئیدارییەکان و، خودی دەوڵەت. دەستەبژێرانی نوێ بە بەراورد لەگەڵ دەستەبژێرانی کۆندا کۆت و بەند و سنووری کەمتریش لە بەردەم خۆیاندا دەبینن. حیزبی سیاسیی کۆن لەسەر بنەما و نەریتێکی فەلسەفی ڕۆ نرابوو و وەڵامدەر و لە بەردەستدا بوو - واتە دامەزراوەیەکی گشتاسایی[181] بوو، بەڕێوەبەرانی لای خەڵک ناسراو بوون، چالاکییەکانی ئاشکرا بوو و دەبا ئاگایان لە ناو و ناوبانگی خۆیان هەبایە. بەڵام کێ چاودێری بەسەر ڕاوێژکاران، کۆکەرانی یارمەتیی دارایی، ڕاپرسیکەران و لۆبییەکاندا دەکات؟ هەنووکە سیاسەتی

180. Representative democracy
181. Pseudo public

ئەمریکا کەوتۆتە ژێر کۆنترۆڵی ئەم گروپانەوە. ئێمە بە راگەیاندنی شەڕ لە دژی دەستەبژێر سالاری (بالادەستیی دەستەبژێران/ elitism) سیاسەتێکمان بەرهەم هێناوە لەسەر بنەمای دەستەبژێرانی شاراوە دامەزراوە، ئەمانە کەسانێکن بەرپرسیار و وەلامدەر نین و زۆربەی کات هیچ گرێدانێکیان بە بەرژەوەندییە گشتییە گەورەترەکانەوە نییە. سەرچاوەی گۆڕانی کۆمەڵگای ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ فەشەلهێنانی دەستەبژێران و دامەزراوە سوننەتییەکانی ئەمریکا، ئەمە تەنیا دەستەبژێران و دامەزراوە سیاسییەکان نین کە فەشەلیان هێناوە بەڵکوو دەستەبژێران و دامەزراوە کولتووری و ئابووری و مەزهەبییەکانیش هەر بەم دەردە چوون. لە بەشی داهاتوودا لەم چیرۆکە دەدوێین.

## بەشی شەشەم

## مەرگی ئۆتۆریتە

پاییزی ساڵی ٢٠٠٠ بانکی «چێیس مەنهەتەن» لەگەڵ «جی.پی. مۆرگان»دا تێکەڵ بە یەک کران. وەک هەموو تێکەڵکردنێک لە راستیدا ئەمجارەش کۆمپانیایەک دەستی بەسەر کۆمپانیاکەی دیکەدا دەگرت؛ چێیس، مۆرگانی کڕیبوو. لە یەکەم روانیندا ئەم تێکەڵکردنەش رێک وەک هەموو مامەڵەیەکی دیکەی نێوان کۆمپانیاکان وا بوو ـ ئەڵبەت مامەڵەیەکی گەورە ـ هەروەها وەک بەشێ لە هەراوزەنا شاراوەکانی ئەو سەردەمە پڕ شەڕوشۆڕە دەکەوتە بەرچاو. [بەڵام] لە راستیدا ئەم تێکەڵکردنە خاڵێکی وەرچەرخان[١٨٢] بوو لە سەرمایەداریی ئەمریکاییدا و چیرۆکی دوا لەناوچوونی واڵستریتی دێرین و سەرکەوتنی تەکووزییەکی[١٨٣] نوێی دەگێڕایەوە.

بانکی مۆرگان ـ نازناوی جی.پی. مۆرگان ـ لە زۆربەی ساڵانی سەدەی بیستەمدا گرنگترین بانکی ئەمریکایی بوو. لە زۆربەی قەیران و بشێوییەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستی بازاڕە داراییەکانی ئەمریکادا، ئەم بانکە دوا رێگاچارەی ئابووریی ئەمریکا بوو و بە پێشکەشکردنی قەرز[١٨٤] ئەرکەکانی خۆی رادەپەڕاند و تا ١٩١٣ کە بانکی ناوەندیی ئەمریکا ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆ مۆرگان درێژەی بەو کارە دەدا. مۆرگان لە هەڵبژاردنی کڕیارەکانیدا[١٨٥] گەلێ سەختگیر بوو و کۆی کاروبارەکانی لەسەر بنەمای ئەم سەختگیرییە دارشتبوو، بە شێوەیەک کە نزیک بە هەموو خزمەتگوزارییەکانی خۆی تەنیا پێشکەش بە دەوڵەتەکان، کۆمپانیا فرەنەتەوەییە گەورەکان و کەسانی زۆر زۆر دەوڵەمەند دەکرد. ران چێرنۆ کە مێژووی ئەم بانکەی نووسیوەتەوە لە کتێبەکەیدا دەڵێت: «سەردەمانێک حسێبە بانکییە شەخسییەکانی[١٨٦] بانکی مۆرگان وەک پێناسەی ئەندامێتی لە

182. Milestone
183. Order
184. Loan
185. Customer
186. Personalbank account

ئاریستۆکراسیی ئەمریکاییدا وا بوو». لە راستیدا ئەم بانکە لێکچوونێکی زۆری لەگەڵ کلوپدا[187] هەبوو، ئەمەش شتێکی فۆرماڵیتە و بە رواڵەت نەبوو بەڵکوو کلیلی سەرەکی و یەکەمی سوودە گەورە و مەزنەکانی ئەو بانکە بوو. سەرۆک و بەرپرسیارانی مۆرگان پێوەندییەکی چڕوپڕ و نزیکیان لەتەک کۆمپانیا ناسراوەکان و هەروەها دەوڵەتە بەهێزەکاندا دروست کردبوو و لە هەموو ئاستەکاندا پێوەندییەکی شەخسیی توندوتۆڵیان لەگەڵ دامەزراندبوون. کاتێ لە ١٩١٢دا یەک لە کۆمیتەکانی کۆنگرێس سەبارەت بە شێوازی کاروباریان پرسیارێکی ئاراستەی جی.پییەرپۆنت مۆرگان کرد لە وەڵامدا وتی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە بنەما و بنەڕەتی متمانە[188] «بەرلەوەی پارە یان ماڵومولک یان هەر شتێکیتر بێت... کەسایەتییە... ئەگەر باوەڕ و متمانە بە کەسێک نەکەم تەنانەت هەموو دونیای مەسیحییەتیش ببنە کەفیلی ناتوانێ پارەم لێ وەربگرێ».[١]

لە لایەکیترەوە *نیۆیۆرک تایمز* وتەنی، کولتووری چێیس مەنهەتەن کولتوورێک بوو کە «زیاتر بەرهەمی کۆڵان و بازاڕەکانی نیۆیۆرک بوو و زۆر دوور بوو لە فیز و دەماری مۆرگانییەکان». چێیس کە خاوەن مێژوویەکی گەش و رووناک بوو لە نەوەدەکانەوە گۆڕدرا بۆ کۆمەڵە بانکێکی شپرز و کەمبایەخ. ئەم بانکە زیاتر لە رووبەرە کەمبایەخەکانی بازاڕدا چالاک بوو، واتە لە رووبەری وەک قەرزی[189] خانووکڕین، قەرزی ئۆتۆمبیل و حسێبی بچووکی بانکیدا کاری دەکرد. بەڵام رۆژ لەدوای رۆژ داهاتەکانی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بە جەماوەری خەڵک زیاتر و زیاتر پەرەی دەسەند. لە هەشتاکانەوە وردکردنەوەی قەرزە گەورەکان بۆ قەرزی بچووک بچووک و پێشکەشکردنی بە سەرمایەگوزارە ئاساییەکان بوو بە میتۆدێک بۆ کۆکردنەوەی سوود و داهاتی گەورە. لەم بازاڕە نوێیەدا میتۆدگەلی داخراو و سەختگیرانە هێند بەکەڵک نەبوون. جی.پی. مۆرگان هەوڵیدا خۆی لەگەڵ ئەم دونیا روو لە سەرهەڵدانەدا بگونجێنێ، بەڵام دواجار دۆڕا و شکستی خوارد. بە واتای گۆڤاری *تایمز*، «لە دونیایەکی داراییدا کە دەسەڵات لەدەستی جەماوەردایە نەک لەدەستی چینەکاندا، ئیدی بانکی مۆرگان بەو جۆرە سیاسەتە تایبەتییانەوە بێمانا و بێکاریگەرە».[٢] بۆ تێگەییشتن لە مەزنایەتیی ئەو شۆڕشەی دونیای داراییی ئەمریکای تەنیوە با ئاوڕێک بدەینەوە لەو راستییەی کە لە نەوەدەکاندا بازاڕی جی.پی. مۆرگان لە هەموو بانکەکانی واڵستریت پڕبایەختر بوو و دە قاتی بازاڕی سیتی بانک بەها و بایەخی هەبوو، [بەڵام] تەنیا دوای دە ساڵ بایەخی بازاڕی مۆرگان دابەزی بۆ یەک بە دەی سیتیکۆرپ. هۆکاری سەرکەوتن و بەدەستهێنانی پلەی بەرزتر لە لایەن سیتیکۆرپەوە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە سەن فۆرد

187. Club
188. Credit
189. Loan

ویلی سکرتێری سیتیکۆرپ، کۆمپانیاکەی گۆڕی بۆ کۆمەڵەیەکی[١٩٠] ماڵی کە هاوکات هەم کاروباری داراییی بەرز و گەورەی رادەپەڕاند هەم کاروباری داراییی جەماوەری.

بۆ شیکردنەوەی ئەوەی کە دیموکراتیزاسیۆن چۆناوچۆن کۆمەڵگای ئەمریکای گۆڕیوە و ئەم گۆڕانە لە رووبەرێکی رووتی سیاسیدا قەتیس نەماوە و گەلێ سەرتر لەو رووبەرەی گرتۆتەوە ـ کە بابەتی ئەم بەشەی کتێبەکەیە ـ باشتر وایە لە بازاڕە داراییەکانەوە دەست پێ بکەین. ئەم پیشەسازییە لە بنەوە گۆڕدراوە و زۆربەی ئەمریکاییەکان و بە دەیان میلیۆن کەسی لە دەرەوەی ئەمریکادا خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. هەرکەس خاوەن حسێبی خانەنشینی بێ ئەوە دەزانێ کە لەوڕۆدا سەرجەم بازاڕی کاروباری دارایی لەسەر بنەمای فرۆشتنی بەرهەمەکانی[١٩١] بە کەسانی وەک ئەو راوەستاوە. هەرکەس بینەری کەناڵی CNBC بێت ـ کەناڵێکی تێلەڤیزیۆنیی کابلییە[١٩٢] کە لەسەر شێوازی کێبەرکێ و یارییە وەرزشییەکان راپۆرت و دەنگوباسی بازاڕە داراییەکان بڵاو دەکاتەوە ـ باش دەزانێ کە بازاڕی بوورس[١٩٣] ئێستە خوی لەگەڵ سەرمایەگوزارە ئاساییەکاندا رێک دەخات. ئێستە گەورەترین سەرمایەگوزارییەکانی بازاڕی بوورس و قەواڵەی قەرز[١٩٤] هی بنەماڵەی پاشایەتیی سعوود یان بانکێکی سویسرایی نییە، بەڵکوو هی سندووقی خانەنشینیی مامۆستایانی زانکۆ و فەرمانبەرانی رێکخراوە نادەوڵەتییەکانە (TIAA – CREF). یەکێ لە پۆپۆلیستەکانی ئەیالەتە باشوورییەکان بە ناوی هیوی لانگ رایگەیاند کە «هەموان پاشان». ئەڵبەت بە تەواوی ئاوەهای لێ نەهاتووە بەڵام لە بەستێنی ئابووریدا هەموان، پادشا بن یان خەڵکی ئاسایی، بوونەتە سەرمایەدار.

ئاسەوارەکانی شەپۆلی دیموکراتیک تەنیا بە کاروباری داراییەوە نەوەستاوە؛ ئەم شەپۆلە چەندەها رووبەر و رەهەندی دیکەی کۆمەڵگای ئەمریکایشی خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە ـ بازرگانی، ماف و یاسا، پزیشکی و تەنانەت مەزهەب کە دواتر ئاماژەی پێ دەدەین. ئەم پرۆسەیەش وەک سیاسەت لە کۆتاییی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکانەوە پەرەی سەند و هەر وەک سیاسەتیش شۆڕشێکی تەواونەبووی روو لە رووداوە و هێشتا قۆناغە سەرەتاییەکانی تێدەپەڕێنێ. ئەم پرۆسەیە دوو گۆڕانکاریی[١٩٥] کۆمەڵایەتیی بەربڵاوی لێ کەوتۆتەوە. یەکەمینیان بریتییە لە کرانەوەی دەرگای زۆرێک لە پیشەسازی و کار و کەسابەتەکانی ئەمریکا بە رووی هەمواندا و داڕووخانی پێکهاتە کۆنەکانی دەسەڵات و کۆنترۆڵ. دووەم گۆڕانکاریش کە گرێدراوی یەکەم گۆڕانکارییە، بریتییە لە فەشەلهێنانی ئەو چینە

190. Complex
191. Products
192. Cable TV
193. Bourse
194. Bonds, debentures
195. Evolution

دەســتەبژێرەی بەڕێــوەبەری ئەم دامەزراوانە بــوو. ئەم فەشــەلهێنانە تەنــانەت خــودی «ئەندێشــەی» ئامــادەبوونی دەستەبژێرانیشــی گرتــۆتەوە ـ ئەڵــبەت لە ئەرزی واقعیــدا بەو شــێوەیە نیــیە. ئەم دوو گۆڕانکــارییە بەشــێکن لەو گۆڕانکــارییە گشــتی و هەمەگیرتــرەی کۆمەڵگــای ئــەمریکا کە دەتــوانین نــاوی فەشــەلهێنان [یــان مەرگ]ی ئۆتــۆریتەی[196] لەســەر دانێــین. لە راســتیدا ئەم دیــاردەیە گەورەتــرە لە فەشــەلهێنان و زیــاتر وەک هەڵمەتبردنێــک وایە. هەرچەنــد ئۆتــۆریتە لە ئــەمریکادا هەمیشــە کەتــۆتە بەر گۆمان و پرسیارەوە، بەڵام لە شەستەکان بەدواوە لە هەمــوو لایەکەوە، هەم لە چەپ و هەم لە راســتەوە، بەردەوام لە بەردەم هێرشێکی نەبڕاوەدا بووە.

هۆکــارێکی گرنگــی دیــکە بــۆ ئەوەی پــارە بکەیــنە دەســپێکی ئەم بەشــەی کتێــبەکە، ئەوەیە کە ئەم بابەتە خاڵێکی زۆر گرنگمــان بــۆ تێگەیشــتن لە شــەپۆلی دیموکراتیــک لا زەق دەکــاتەوە. لە زۆر لایەنەوە دیموکراتیزاســیۆن هێزێکــی بەرجەســتە و بەهێــز بــووە کە بە ئاراســتەی چــاکە و باشــیدا کــاری کــردووە ـ رووخاندنی ئۆلیگارشەکان، گۆڕانکاریکردنی شۆڕشگێڕانە لە کــار و پیشــەدا، دۆزینــەوەی لاوە پــڕ بەهــرە و لێهاتووەکان و رێزگرتن لێیان، پێکهێنانی پیشەسازییە تازەکان و رەنگە لە هەمووشــی گرنگتــر بەخشــینی دەســـەڵات بە تاکەکــان. ئــێمە خوازیــاری گەڕانەوە بــۆ تەکــووزیی کــۆن و داخــراوی پێشــوو نــین. دیموکراتیزاسیۆن هەرچەند توانیویەتی کێشە کۆنەکان چارەسەر بکات ـ کێشەکانی لە بەردەستدا بــوون و لەمپەردانان[197] ـ بەڵام هاوکات کۆمەڵێک کێشەی تازەیشــی بەرهەم هێنــاوە. رکابەرانــەبوون[198]، بــزووتن و دینــامیزمی[199] سیســتەمی کــراوەی ئێســتە بــۆتە هــۆی ســڕینەوەی و لاوازکەوتنــی هەنــدێ لە هێڵەکــانی رێنوێنی[200] و [میکانیزمەکانی] کۆنترۆڵ و هاوسەنگی[201]. ســەیر لەوەدایە کە ئەم ئــانۆمییە نــوێیە[202] زیــاتر لە هەموو کەس زەبری لە سەرمایەگوزاری مامناوەندی داوە، واتە لەو هاووڵاتییە ئاساییەی هێــز و برســتی بۆ پەرینەوە لە دەریا نەناسراو و پڕشەپۆلەکان گەلێ کەمتر و لاوازترە. ئێستایش دەتــوانین وێنــای جــۆرە سیستەمێکی سیاسی، ئابووری و کــۆمەڵایەتیی دیمــوکراتیزە بکەیــن کە هێشــتا لە نێــو خۆیــدا هەنــدێ لە مەرج و کــۆت و بەنــدە رەســمی و نارەســمییەکانی پاراســتووە و بەشــێک لە بــزووتن و دینــامیزمی خــۆی فیدای چاکەکانیتر[203] دەکات، چاکەی وەک شــەفافییەت[204]، راســتگۆیی، بەویژدانــی[205] و ســەقامگیری[206].

196. Authority
197. Access and prohibition
198. Competitive
199. Dynamism
200. Guidelines
201. Control and balance
202. New Anomie
203. Virtue
204. Translucence

بەڵام بۆ ئەم مەبەستە پێویستە بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەو دامەزراو و دەستەبژێرانەی بە درێژاییی سی ساڵ هەڵمانوەشاندوونەتەوە، سەرلەنوێ بژیەنینەوە و ڕێکیان بخەینەوە.

## پارەم نیشان بدە

جۆزێف نووسرا لە کتێبە سەرنجراکێشەکەیدا بە ناوی *دیمەنێکی ڕووداوەکە: چۆناوچۆن چینی مامناوەندی تەقلی چینی دەوڵەمەند بوو*، دەڵێ: «دەسپێکی گۆڕانەکانی ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژێکی ناوەڕاستی مانگی سێپتامبری (ئەیلول) ۱۹۵۸». مەبەستی هەمان ئەو ڕۆژەیە کە بانکی ئەمریکا[۲۰۷] شەست هەزار کرێدیت کارتی[۲۰۸] لە شاری فێرسنۆی کالیفۆرنیادا «خاڵی کرد» و بەم شێوەیە بنەمای کرێدیت کارتی فرەکارەی[۲۰۹] دامەزراند. ئەمە ئەندێشەیەکی تازە و داهێنەرانە بوو کە نزیک بە هەموو هاووڵاتییان دەیانتوانی بەبێ ئەوەی بارمتە[۲۱۰] دانێن ببنە خاوەن هورم و کرێدیت. لە پەنجاکاندا تازە بە تازە ئەمریکاییەکان فێری وەرگرتنی قەرز[۲۱۱] بۆ کڕینی ئامێرگەلی بەکارهێن[۲۱۲] وەک ئۆتۆمبیل و سەلاجە و تێلەڤیزیۆن، ببوون. بەڵام قەرز هێشتا وەک شتێکی خراپ چاوی لێ دەکرا. ئەگەر پارەی پێویستت بۆ کڕینی شتێک نەبایە، هێند پارەت کۆ دەکردەوە کە بەشی کڕینی ئەو شتەی بکردایە. هەروەها وەرگرتنی قەرزی بانکیش ئاسان نەبوو. زۆربەی بانکەکان ـ «بانکی ئەمریکا»ی لێ بەدەر ـ پێیان وابوو بەخشینی قەرزی بچووک بە بنەماڵەیەکی مامناوەندی بە وەخت و زەحمەتەکەی ناژێ. دامەزرێنەری بانکی ئەمریکا، ئا.پی.جانینی، کە منداڵی کابرایەکی پەنابەر بوو، دەیویست دۆخێک بئافرێنێ کە «خەڵکەکەی» دەستیان بە پارە بگات. ئەو لە ۱۹۰٤دا بە گۆڕینی جۆری مۆڵەتنامەی[۲۱۳] تەلارێک بانکەکەی خۆی لەو تەلارەدا کردەوە کە دەسپێک ناوی «بانکی ئیتالیا» بوو و دواتر لە ۱۹۲۸دا گۆڕدرا بۆ «بانکی ئەمریکا». ئەودەم بانکەکانیتر خۆیان لە پێشکەشکردنی قەرزی بەکارهێن[۲۱٤] دەدزییەوە و ئەم کارەیان ئەسپاردە کۆمپانیا داراییەکان، بەڵام «بانکی ئەمریکا» لەوپەڕی خۆشحاڵیدا قبووڵی کردبوو بکەوێتە

---

205. Fairness
206. Stability
207. Bank of America
208. Credit cart
209. Multipurpose
210. Collateral
211. Loan
212. Consumer goods
213. Utilization
214. Consumer Loan

خزمەت چینی مامناوەندییەوە کە چینێکی زۆر گەورە و بەربڵاو بوو. هەر بۆیە لە حەفتاکانەوە ئەم بانکە بوو بە گەورەترین بانکی ئەمریکا.

کرێدیت کارتەکان دەرگای جیهانی کرێدیتی دارایی[215] بەسەر جەماوەردا دەکردەوە و وەها دەرفەتێکی بۆ خەڵکانی ئاسایی دەڕەخساند کە پێشوەخت لە داهاتی داهاتوویان خەرج بکەن، دەوڵەمەندان هەمیشە و هەمووکات دەیانتوانی ئەم کارە بکەن و کردبوویان. لەوڕۆدا زۆر سەختە مرۆڤ وێنای ژیانێک بکات کرێدیت کارتی تێدا نەبێ، کەچی چل ساڵ لەمەوپێش ئەم کارتانە تا رادەیەکی زۆر شتێکی نەناسراو بوون. ئەوەی لە چل ساڵی رابردوو و بەتایبەت لەم بیستوپێنج ساڵەی دواییدا قەوماوە، لە زۆر لایەنەوە بە بەراورد لەگەڵ هەموو رووداوە هاوکاتەکانی دیکەی مێژووی مۆدێرنی داراییدا، بنەماییتر و گەورەترە. سەرمایەداری گۆڕدرا بۆ سەرمایەداریی دیموکراتیک.

کرێدیت کارتەکان هێشتا دەسپێکی ئەم چیرۆکە بوون. لە حەفتاکانەوە زانستی ئابووری، تەکنۆلۆژیا و سیاسەتەکانی دەوڵەت هەرهەموویان یەک ئاراستەی چونیەک و هاوشێوەیان گرتەبەر، ئاراستەی رێساسڕینەوە[216]، ناوەندسڕینەوە[217] و دیموکراتیزاسیۆنی ئابووری. دەستبەکارکردنی بازاڕی قەواڵەی قەرزی کورتخایەن لە حەفتاکاندا بوو بە هۆی ئەوەی بوورس ببێتە کاڵایەکی گشتی. لە ۱۹۵۱دا تەنیا لە سەدا ۹ی ئەمریکاییەکان خاوەن پشک (سەهام)[218] بوون و سەهام هی دەوڵەمەندان بوو. زۆربەی ئەمریکاییەکان پارەکانیان دەخستە حسێبی پاشەکەوتەوە[219] کە رێژەی سوودەکەی دیاریکراو و بەپێی یاسا بوو. یەک لە هۆکارە گرنگەکانی ئەم بابەتە دەگەڕایەوە بۆ یادەوەریی داڕووخانی بازاڕی بوورس لە ۱۹۲۹دا و هەروەها ئەو باوەڕە تۆکمەیەش لە نێو کۆمەڵگادا هەبوو کە واڵستریت، واتە کۆی سیستەمی دەڵاڵان و بانکەکان، بایەخێکی ئەوتۆ ناداتە کەسانی ئاسایی (کە لە راستیدا بۆچوونێکی دروست بوو). بەڵام رەنگە گرنگترین هۆکار بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خەڵکانی ئاسایی قەت چاوەڕوانیان نەدەکرد پارەی پاشەکەوتکراویان سوودێکی زۆریان پێ ببەخشێ. ئامانجی ئەم کەسانە پاراستنی پارەکەیان بوو نەک بەدەستهێنانی داهاتێکی زیاتر. بەڵام دوابەدوای بەرزبوونەوەی ئاستی گرانی و ئاوسان[220] لە حەفتاکاندا چینی مامناوەندی[221] لەو حەقیقەتە گەشتن کە پاشەکەوتە بانکییەکانیان کە رێژەیەکی دیاریکراوی سوودیان پێ دەبەخشێ، بەرەو لەبایەخکەوتن دەچێ. وردە وردە خەڵک لە پێناو

215. Financial credit
216. Deregulation
217. Decentralize
218. Share
219. Saving account
220. Inflation
221. Middle class

بەدەستهێنانی سوودێکی زیاتردا کەوتنە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگا و شێوازی دیکە. یەک لەو ڕێگایانەی چینی مامناوەندی دۆزییانەوە بازاڕی قەواڵەی قەرزی کورتخایەن[٢٢٢] بوو، ئەم بەرهەمە داراییە نوێیە بە کەڵکوەرگرتنی ئامێرییانە لە دزەڕێگایەکی نێو یاسای فیدراڵ دەرفەت و ئیمکانی کڕینی سەهامی کۆمپانیاکانی سەرمایەگوزاریی[٢٢٣] بۆ خەڵک دەڕەخساند. ئەم کۆمپانیانە سەرەتا قەواڵە نرخدارە[٢٢٤] دەوڵەتییە کورتخایەنەکانیان دەکڕی کە بە بەراورد لەگەڵ حسێبی پاشەکەوتدا سوودێکی زیاتریان پێ بوو. ئینجا فیدێلیتی[٢٢٥] کۆمەڵە کۆمپانیایەکی سەرمایەگوزاریی دامەزراند کە لە بازاڕێ بوورسدا سەرمایەگوزارییان دەکرد. ئەم کۆمپانیانە ئەو دەرفەتەشیان بۆ خەڵک دەڕەخساند کە بتوانن هەر وەک حسێبە بانکییە ئاساییەکان لەو بڕە سەرمایەی لای ئەوان دایانناوە کەڵک وەربگرن، واتە ئیمکانی نووسینی چێک[٢٢٦] و پارە خستنە حسێبیان بۆ خەڵک فەراهەم دەکرد. لە پڕ دۆخەکە بە بارێکدا شکایەوە کە کرێکارێکی سادە کە بە هەموو تەمەنی خۆی تەنیا حسێبێکی پاشەکەوتی سادەی هەبوو، دەیتوانی ببێتە خاوەن سەهامی کۆمپانیاگەلی ناسراوی وەک جێنێراڵ ئێلێکتریک و فۆرد و ئای.بی.ئێم.

با دوو گەڵاڵەی دیکەی کۆنگرێس بەم شەپۆلە زیاد کەین؛ حسێبی خانەنشینیی تاکەکەسی و گەڵاڵەی ناسراو بە ٤٠١[٢٢٧] . هەردووکی ئەم گەڵاڵانە وەها دەرفەتێکیان بۆ خەڵک دەڕەخساند کە بەرلەوەی پیتاکی داهاتەکانیان دەرکەن بیخەنە حسێبێکی پاشەکەوتەوە، بەم شێوەیە بە بێ ئەوەی هیچ پیتاکێکی لەسەر دابنرێ سوود و بەهای [داهاتیان] گەشەی دەکرد. ئەم گەڵاڵانە پاڵنەرێکی بەهێز بوون و بوونە هۆی ئەوەی پارەی پاشەکەوت لەو جێگایەدا سەرمایەگوزاری بکرێ کە سوودێکی زیاتری بەدواوەیە. ئەگەر داهاتی پیشەکەی خۆت ١٠٠٠ دۆلار زیادی کردبا دەبا پیتاکەکەیت دەرکردایە، بەڵام ئەگەر پارەی حسێبی خانەنشینیی تاکەکەسیت کە لە بازاڕی بوورسدا سەرمایەگوزاری کرابوو ١٠٠٠ دۆلار زیادی بکردایە هیچ پیتاکێکی لەسەر دیاری نەدەکرا (تا ئەوکاتەی پارەکەت وەردەگرتەوە). ئەمە لێکدانەوەیەکی سادە و ساکار بوو - واتە فرەبوونەوەی پارە بەر لە دەرکردنی پیتاکەکەی - بەڵام هەر ئەم کارە [سادە] دەیان میلیۆن کەسی پاشەکەوتخەری گۆڕی بۆ کەسانی سەرمایەگوزار. حسێبی خانەنشینیی تاکەکەسی و گەڵاڵەی ٤٠١ کە تەنیا ٢٥ ساڵ لەمەوبەر خرانە بەردەست، ئێستە بوونەتە میکانیزمی بەشداریکردنی زۆربەی ئەمریکاییەکان لە بازاڕی بوورس و قەواڵە نرخدارەکاندا.

---

222. Debentures/bonds
223. Investment corporates
224. Valuable papers
٢٢٥ . گەورەترین کۆمپانیای سەرمایەگوزاری و قەواڵەی قەرزی [کەرتی] تایبەت لە ئەمریکادا.و.ف
226. Check
٢٢٧ . گەڵاڵەی خانەنشینی کە خاوەنکار بەشێ لە مووچەی فەرمانبەرانی بۆ تەرخان دەکات.و.ف

پاشان دەڵاڵیی هەرزانبەهای سەهام کەوتە ڕۆژەڤ. ساڵی ١٩٧٥ دەوڵەت بـازاڕی بوورسـی نیۆیـۆرکی مەجبوور کرد واز لە دیاریکردنی نرخی دەڵاڵیکردنی کـڕین و فرۆشـتنی سـەهام بهێنـێ و لـێگەڕێ بـازاڕی ئازاد خۆی ئەو نرخە دیاری بکات، بەم چەشنە تەمەنی ١٨٣ساڵەی نرخ بـڕینەوەی نەگـۆڕ هـاتە دوایـی. ماوەیەکی کورت دوای ئەم ڕووداوە هەمـوو کەس دەیتـوانی بە ئاسـانی ڕێژەیەکـی کەمـی سـەهام مـامەڵە بکات. لە ١٩٧٥دا نرخی ناوینی[٢٢٨] دەڵاڵیکردنـی سـەهام ٥٠٠ دۆلار بـوو (بە دۆلاری ئەمـڕۆ)، ئێسـتە ئەم نـرخە لە دەڵاڵـیـیە هەرزانبەهاکانـدا کەمتـر لە ٢٠ دۆلارە و لە ڕێگـای تـۆڕی ئینتەرنێـتەوە [تەنیـا] چـوار دۆلارە. کۆی ئەم گۆڕانکارییانە بوونە هـۆی ئەوەی تـا سـاڵی ٢٠٠٠ زیـاتر لە نیـوەی ئـەمریکاییەکان ببـنە خاوەن سەهام. لەم نێوانەدا بازاڕی سەهام لە کارتێلێکی دەستەبژێرەوە[٢٢٩] گۆڕدرا بۆ شـێوە بازرگـانییەک کە خزمەتگوزارییەکـانی خـۆی پێشـکەش بە تـوێژێکی بەربـڵاوی هاووڵاتییـان دەکـرد. ئەگەر هێمـای تەکووزیی کۆن کلوپێکی واڵستریت بوو کە جێگەی خواردنی نیـوەڕۆانی دەڵاڵە بەهێزەکـان بـوو، کەنـاڵی CNBC هێمای تەکووزیی نوێیە، واتە ئەو شوێنەی بەرپرسانی کۆمپانیاکـان لەسـەر وەرگرتنـی کـات بـۆ ئاخافتن لەگەڵ گوێگرانی بێشوماریدا کەوتوونەتە رکەبەرەی یەکترەوە.[٣]

ڕەنگە شـتێکی سـەیر و دوور لە بـاوەڕ بـێ ئەگەر بڵێـین مایکـڵ میلکـێن، بانکدار و سـەرمایەگوزاری ئەفسانەییی هەشـتاکان کە دواجـار بە تـاوانی سـاختەکاری[٢٣٠] دەسـتگیر و زینـدانی کـرا، یەکێـک بـوو لە هۆکارەکانی ئەم پرۆسەی دیموکراتیزاسیۆنە. ئەو بـوو کە قەواڵەی قەرزی «بۆنجـۆل[٢٣١]»ی داهێنـا و بەم کارە دەرفەتی ئەوەی بۆ کۆمەڵە کۆمپانیا بچووکەکان، کە بێشومار و فراوان بـوون، ڕەخسـاند کە بتـوانن کەڵـک لە کرێـدیتی دارایـی وەربگـرن، ئەم کۆمپانیـانە تـاکوو ئەودەم قەت وەهـا دەرفەت و ئیمکانێکیـان نەبوو. کۆمپانیا تازە دامەزراوەکان و کۆمپانیا بچووکەکـانیتر هـیچ کـات نەیانـدەتوانی بە سـانایی گەشـە بسێنن، چونکوو لەگەڵ کێشـەیەکی بێچارەسـەردا دەسـتەویەخە بـوون: ئێـوە نـاتوانن قەواڵەی قەرز بـڵاو بـکەنەوە مەگەر ئەوەی پێشـتر ئەم کارەتـان کردبـێ. ئەوەی جـانینی بـۆ خەڵکـی کـرد میلکـێن بـۆ کۆمپانیاکـانی کـرد: بە رای ئەو جەمـاوەریش وەک بەدەسـەڵاتان و خـاوەن هێـزان شـایانی وەرگرتنـی کریـدێتی دارایـین. (لە ڕاسـتیدا میلکـێن کەمە تـوێژینەوەیەکی ئاکادێمیکیشـی ئەنجـام دابـوو کە ئەو گریمـانەی پشتڕاسـت دەکـردەوە). هەروەهـا هەردووکیشـیان پەییـان بەو ڕاسـتییە بردبـوو کە بە ئاسانکاریکردن بۆ تێکەڵبوونی ڕاستەوخۆی خەڵـک یـان ئەو کۆمپانیـانەی پێشـینەی کرێـدیتیان نییە بە بـازاڕی قەرز ـ ئەڵـبەت کەمێـک بە نرخـی زیـاتر ـ دەتـوانن پـارەیەکی زۆر چـاک کـۆ بـکەنەوە. قەواڵەی

---

228. Average rate
229. Elite cartel
230. Fraud

٢٣١. Junk bond : قەواڵەی قەرزی کەمبەها و پڕ لە ریسک. و.ف

قەرزی بۆنجۆلی میلکێن بۆ کۆمپانیا تازەکارەکان وەک دیارییەکی خودایی وابوو. ئەم قەوالانە سەرمایەی بۆ کۆمپانیاکان دەستەبەر دەکرد، نەبوونی سەرمایە تاقە شتێک بوو نەیدەهێشت تەنانەت باشترین کۆمپانیاکانیش گەشە بسێنن. هەروەها ئەم قەوالانە دەرفەتێکی یەکسانیان بۆ هەموو کۆمپانیاکان دەخولقاند و یەک لەو هۆکارە سەرەکییانەی لەمپەر بوو لە بەردەم رکەبەرییان لەگەڵ کۆمپانیا زەبەلاحەکاندا، واتە نەبوونی سەرمایە، لە کۆڵیان دەخستەوە. لەدەیەی ١٩٨٠دا بە دەیان کۆمپانیای وەکCNNوMCIدامەزران کە بە رێگای قەواڵەی نرخداری بۆنجۆڵدا بوونە کۆمپانیای زەبەلاحی جیهانی. داهێنانەکەی میلکێن لە نزیک بە هەموو لایەنەکانی کاروباری داراییدا رەنگی دایەوە، تەنانەت قەرزە بیانییەکانی دەوڵەتیشی گرتەوە. لێرە بەدواوە هەموو ئاسانکارییە داراییەکان لە رێگای کۆمپانیاگەلی سەرمایەگوزاری یان سندووقەکانی خانەنشینی و بە مەبەستی ئەوەی هەموان بتوانن بیانکڕن و لێیان بەهرەمەند بن، دابەش دەکران بەسەر کەرتگەلێکی بچووک بچووکدا، ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی جێگۆڕکێیەکی زۆر گەورە لە [رووبەری] دەسەڵاتدا بێتە قەومان. ئیدی تەنیا کۆمپانیاکان نەبوون کە لەگەڵ چینێکی قەرزدەری زۆرگەورەی نوێدا بەرەورِوو دەبوونەوە؛ بەڵکوو هەرکەس پێویستی بە پارە بایە - بۆ وێنە دەوڵەتان و وڵاتان - ئاوەها توێژ و چینێکیان دەدیتەوە [و مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن]. لە هێمای مۆدێلی کۆندا سەرۆک وەزیرانی بریتانیا، بێنجامین دیزراییلی، بۆ کڕینی کەناڵی سوێز دەچوو بۆ دیداری لۆرد رۆچیلد و داوای قەرزی لێ دەکرد، بەڵام هێمای مۆدێلی نوێ گۆڕدراوە. ئێستە ئەو هەموو چیرۆکە بێشومارە بوونەتە هێمای مۆدێلی نوێ کە بەسەرهاتی وەزیرانی ئابووریی وڵاتانی جۆراوجۆر دەگێڕنەوە کە بە هیوای ئەوەی دۆخی ئابووری و دارایی وڵاتەکەیان باشتر بکەن، تەلەفۆن بۆ دەیان و دەیان بەرپرس و سکرتێری کۆمپانیاگەلی سەرمایەگوزاری دەکەن [و داوای قەرزیان لێ دەکەن]. تۆماس فریدمەن، رۆژنامەوانی رۆژنامەی *نیۆیۆرک تایمز*، دەڵێت لە نەوەدەکان بەدواوە ئەگەر وڵاتێک قەرزی وەربگرتایە «لە باتیی ئەوەی... تەنیا لەگەڵ بیست بانکی گەورەدا پێوەندیی هەبێت، لە پڕ خۆی لە بەردەم مامەڵەی هەزاران سەرمایەگوزار و هەزاران کۆمپانیای سەرمایەگوزاریدا دەبینییەوە».[٤] خوێندکارانی ناڕازی لە دەیەی ١٩٦٠دا داوای ئاوەها شتێکیان نەدەکرد، بەڵام دەسەڵات گواسترابوویەوە بۆ خەڵک.

## سەرووتر لە پارە

ئەگەر لەم گۆشەنیگایەوە ورد بینەوە تێدەگەین کە شەپۆلی دیموکراتیک کاریگەریی لەسەر نزیک بە هەموو لایەن و رووبەرەکانی ژیانی ئەمریکایی بەجێهێشتووە. بۆ تێگەییشتن لە ئاستی کاریگەریی شەپۆلی دیموکراتیک، با ئاورێک لە دوورترین شتی مومکین لە پارە و سیاسەت بدەینەوە: مەزهەب. گرنگترین گۆڕانکاریی ناو مەزهەبی ئەمریکایی لە سی ساڵی رابردوودا بریتی بووە لەوەی کە دەسەڵاتی

سانترالٚ و چەقبەستووی کەلیسا سوننەتییەکان ـ کەلیسای ئەپیسکۆپالٚ[٢٣٢]، کەلیسای مێتۆدیست[٢٣٣]، کەلیسای پرێسبیتری[٢٣٤] ـ بە نێو گروپە بەربلاٚوە ئێڤانجلییەکاندا[٢٣٥] بلاٚو بوویەوە، ئەم گروپانە لای جەماوەری خەلٚک گەلێ خۆشەویست و جێی سەرنج بوون. بابەتێکی گرنگتر کە ئاوڕی کەمتریشی لێ دراوەتەوە ئەوەیە کە ئەم ئاینزا و تاقمانە هاوکات لەگەلٚ گەورەبوون و پەرەسەندنیاندا خۆیان لەگەلٚ لایەنگران و پێڕەوانی بێشوماریاندا دەگونجێنن. بە واتایەکی دیکە ئەوان پرۆتستانیزمی ئەمریکاییان دیموکراتیزە کردووە.

کەلیسا سەرەکییەکان ـ وەک کەلیساکانی ئەپیسکۆپالٚ و پرێسبیتری ـ کە نەیانتوانیبوو خۆیان لەگەلٚ هەلومەرجی سەردەمی پۆپۆلیستیدا یەک بخەن، زۆر ماقوولاٚنە چوونە پەراوێزەوە. کەشیشەکان نەیانتوانی پێگە و جێگەی تەکووزیی کۆنیان بپارێزن و لە تەکووزیی نوێیشدا هیچ پێگەیەکیان نییە. بۆ وێنە ئەمڕۆ زۆر سەختە وێنای پێگەی بەرز و بالاٚی ئۆسقۆفەکانی کەلیسای ئەپیسکۆپالٚ لە کۆمەلٚگای رابردوودا بکەین.

بەڕێز ئۆسقۆف ئەندیکات پیبۆدی، دامەزرێنەری قوتابخانەی گرۆتۆن، وەک سەرۆکێکی نەتەوەیی چاوی لێ دەکرا و تەنانەت بگرە هاوشانی سەرۆک کۆمار بوو. ئەم پێگە بەرزەی کەشیشەکان تا ئەم دواییانەش درێژەی هەبوو. بۆ وێنە لە حەفتاکان و هەشتاکاندا سەرۆکی دەستەی ئەمینداری زانکۆی یەیل[٢٣٦] ئۆسقۆفێکی کەلیسای ئەپیسکۆپالٚ بوو. لەمڕۆدا قەت ناتوانین چاوەڕێی ئەوە بین ئاوا بەرز بسپێردرێتە دەست کەشیشێک. ئێستە تێڕوانینی ئەمریکاییەکان بۆ کەشیشێکی سوننەتی کە خاوەن شەرعییەتی دیموکراتیک و خاوەن سەرمایە (شەرعییەتی کاپیتالٚیستی) نییە، گۆڕدراوە و وەک سیمایەکی کۆن و سەرنجراکێش چاوی لێ دەکەن کە [هەرچەند] رێز و حورمەتێکی لێلٚ و پێلٚی هەیە بەلاٚم پێگە و دەسەلاٚتێکی ئەوتۆی نییە. ئەو کەشیشانەی دەسەلاٚتیان هەیە و سەرۆک کۆمارەکان و

---

٢٣٢ . Episcopal: ئاینزایەکی (Sect) پرۆتستانی.و.ف

٢٣٣ . Methodist: ئاینزایەکی پرۆتستانییە کە لە سەدەی هەژدەدا دامەزرا و جەخت لەسەر گرنگبوونی ئەزموونە تاکییەکان دەکات.و.ف

٢٣٤ . Presbyterians: ئاینزایەکی پرۆتستانییە کە لە سەردەمی ریفۆرمی ئایینی لە بریتانیای سەدەی شازدەدا دامەزرا و لە لایەن ئەنجومەنێکی ریش سپییانەوە بەڕێوە دەبرێ.و.ف

٢٣٥ . Evanglic: ئاینزایەکی پرۆتستانییە کە پێی وایە ئیمان و باوەڕی راستەقینە بە مەسیح تاقە رێگای رزگاریی مرۆڤە و قوربانیبوونی مەسح لە پێناو رزگاری و سەربەستیی مرۆڤدا بوو. لای ئێڤانجلیکەکان ئیمانی راستەقینە بە مەسیح و ئێنجیل گەلێ گرنگترە لە پاراستنی داب و نەریت و ئەرکە مەزهەبییەکان.و.ف

236. Yail

پارێزگاران و پێشکەشکەرانی تێلەڤیزیۆن دەورەیان داون، کۆمەڵە کەشیشێکی پۆپۆلیستی وەک بیلی گراهامن کە ئیدیعا دەکەن هێند لە مەزهەب نادوێن، بەڵکوو لەسەر خەڵک قسە دەکەن. لەم بارەیەوە بەراستی دەنگی خەڵک دەنگی خودایە[٢٣٧].

رەنگە هەندێ کەس ئەمە بە گۆڕانکارییەکی نوێ نەزانن. مەزهەب لە ئەمریکادا هەمیشە دژی ئۆتۆریتەخوازی بووە. زۆرێ لە کۆچبەرانی ئەورووپی کە لە رووی مەزهەبییەوە جودابیر بوون، لە دەست ئۆتۆریتەی مەزهەبی هەڵدەهاتن و پەنایان بۆ ئەمریکا دەبرد. لەمەش گرنگتر ئەوە بوو کە دووەم براقی ژیانەوەی ئایینی[٢٣٨] لە نێوان سالانی ١٧٨٠ تا ١٨٣٠ رۆحی یەکسانخوازانەی شۆڕشی ئەمریکای تێکەڵ بە مەزهەب کرد. نەوەیەکی نوێی ئێڤانجلیکەکان بە نێو خەڵکدا دەسووڕانەوە و لەسەر میتۆدێکی راستەقینەی جێفێرسۆنی خۆیان لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا بە یەکسان لەقەڵەم دەدا. هاوکات لەگەڵ لاوازکەوتنی کەلیسا کۆنتر و هیرارشیکترەکانی وەک «کەلیسای کانگرگشناڵیست»[٢٣٩] تاقم و ئایینزا یەکسانخوازەکانی وەک کەلیسای بەپتیست[٢٤٠] و مێتۆدیست زۆر خێرا گەشەیان دەسەند. لە ١٧٧٥دا هەژماری کانگرگشناڵیستەکان دووقاتی لایەنگرانی هەرکام لە تاقمە مەزهەبییەکانیتر بوون، [بەڵام] لە ١٨٤٥دا هەژماریان دابەزی بۆ کەمتر لە یەک بە دەی پێڕەوانی کەلیسای مێتۆدیست. تاکوو ئەمڕۆیش زۆربەی هەرەزۆری مەسیحییانی ئەمریکا بریتین لە پێڕەوانی کەلیساکانی بەپتیست و مێتۆدیست. ئەلێکسی دۆتۆکڤیل ئەوکاتەی لە دوایین سالانی دەیەی ١٨٢٠ و سەرەتای دەیەی ١٨٣٠ بە ئەمریکادا دەگەڕا، بەم دیاردەی زانی و ئەو جۆرە مەسیحییەتەی بە «مەزهەبێکی دیموکراتیک و کۆماریخواز» ناوزەد کرد.

بەڵام تۆکڤیل زیاتر لەسەر رێکخستنی سیاسیی مەزهەب چڕ بووبۆوە. زۆرجار کەشیشەکان لە لایەن کۆی دانیشتووانی شارەوە هەڵدەبژێردران، هەر بۆیە بە واتایەکی گشتی لە بەرانبەر هاووڵاتییاندا بەرپرس

---

٢٣٧ . ئاماژەیە بۆ وتەیەکی ماکیاڤێلی کە بە پشتبەستن بە دروشمێکی سەدەناوەڕاستی دەنگی خەڵکی بە دەنگی خودا دەزانی.و.ف

٢٣٨ . براقی ژیانەوەی ئایینی لە کۆچبەرنشینەکانی ئەمریکا لە سەدەی هەژدەدا، کەشیشان و زانایانی ئایینی ئەم براقە دەچوونە نێو جەماوەری خەڵکەوە و ئامۆژگارییان دەکردن. ئەم بزاڤە دژ کردەوەیەک بوو لە بەرانبەر سێکۆلاریزاسیۆنی بەربڵاوی کۆمەڵگا و ماتریالیزمی کەلیسا ئەمریکاییەکاندا.و.ف

٢٣٩: Congregationalists شێوازێک لە رێکخستنی کەلیسایی کە لایەنگری سەربەخۆیی کەلیساکانە و بە رادەیەکی زۆر سەربەخۆیان دەکاتەوە. و.ف

٢٤٠ . Baptists: ئەم ئایینزایە پێی وایە غوسڵی تەعمید (Baptism) تەنیا بۆ ئەو کەسانە رەوایە کە تەمەنی باڵغبوونیان تێپەڕاندووە. و.ک

و وەڵامدەری کردەی خۆیان بوون. پێکهاتی کەلیسا پێکهاتێکی یەکسانخوازانە[241] بـوو و بە رادەیەکـی زۆر دوور بـوو لە ئۆتـۆریتە و دابـونەریتی ئیـداری[242]. بەڵام زۆربەی تـاقمە مەزهەبییەکـانی ئـەمریکا لە رووی دۆکترینەوە[243] بە قووڵی ئۆتۆریتەخواز بـوون. زۆربەی تەفسـیر و شـیکارییەکانی ئەم تاقمـانە بـۆ کتێبـی پیرۆز تەفسیرگەلێکی زۆر وشک و دەمـارگرژانە بـوون و ئامـادە نەبـوون دان بە تـاقمە بەرانبەرەکـان یـان کەسـانی جـودابیردا بنـێن[244]. زۆربەی ئەو ئـازادبیرانەی هـاتوچۆی کەلیسـایان دەکـرد بەرەورووی سـزای قورسـی وەک مەنفـا و دوورخسـتنەوە، زینـدانیکردن یـان مەرگ دەبـوونەوە. یەک لە نمـوونە دیـار و بەناوبانگەکان چیرۆکی ژنە ئیمانداری بریتانی، ئێن هاچینسۆن، بوو کە لە ١٦٣٤دا باروبنەی کـۆ کـردەوە و رووی لە بۆستۆن کرد، ئەو لەوێندەر و لە دووتوێی زنجیرە ئاخافتنێکدا پێـی لەسـەر تـاکیبوونی رێگـای گەییشـتن بە خـودا داگـرت. هاچینسـۆن تەکفیـر کـرا و لەسـەر فەرمـانی پارێزگـاری ماساچۆسـێت، جـان وینترۆپ، لەو ئەیالەتە دەرکرا.

مەسـیحییەتی ئـەمریکایی بە درێژاییـی سـێ سـەدە دوای وینتـرۆپ زۆر گـۆڕدراوە، بەڵام لە رووی دوکترینەوە تا ئەم دواییـانەش هەر سـەختگیر بـوو. بیرمـان نەچـێ کتێبـی پرۆتسـتانیی *بونیادەکان*[245] ـ دەستەواژەی بونیادگەرایی[246] لەم کتێبەوە وەرگیراوە ـ لە سـەرەتای سـەدەی بیسـتدا بەو مەبەسـتە بـڵاو کرایەوە کە لە بەرانبەر ئەو کەسانەدا کە خوازیاری مۆڵەتـدان ـ بە تەفسـیر و لێکدانەوەی لیبراڵییـانەتری تاکەکان بۆ دەقە مەزهەبییەکان بوون، پارێزگاری لە رەسەنایەتیی کتێبی پیرۆز بکـات. چەنـد دەیە دواتـر لە دادگای ئەسکۆپێس[247] لە سـاڵی ١٩٢٥دا ـ سـەرەکیترین دۆسـیە و بـابەتی ئەم دادگایە دۆسیەی ئەو تاقمە بوو کەوتنەوە و فێرکردنی گریمـانەی تەکامولیـان[248] لە پۆلەکـانی خوێندنـدا قەدەغە کردبـوو ـ ئەو

---

241. Egalitarian
242. Bureaucratic formalities
243. Doctrine
٢٤٤ . ئەڵبەت هەمیشە کۆمەڵە بۆچوونێکی سەربەخۆی بەرچاو و بەرجەستەی دیکەیش ئامادە بوونە، وەک تۆماس پین، تۆماس جێفێرسۆن، رۆڵف ڤاڵدۆ ئێمێرسۆن، هێنری دەیڤید سۆرۆ و، واڵـت ویـتمەن بەڵام ئەم جۆرە جودابیرییە دیاردەیەکی سێکۆلار و دەستەبژێرگەرا (نوخبەوییانە/ Elitist) بوو.
245. Foundations
246. Fundamentalism
٢٤٧ . ئەم دادگایە بە قووڵی سەرنجی جەماوەری بۆ لای خۆی راکێشا. مامۆستایەکی دواناوەنـدی بە نـاوی جان ئەسکۆپێس (١٩٧٠ ـ ١٩٠٠) تاوانبار کرا بەوەی پێچەوانەی یاسای ئایالەتی تیـۆریی تەکـامولی چـارلز داروینی وتۆتەوە، بە پێی ئەم تیۆرە خودا ئافرێنەری مرۆڤ نییە. دادگـا سـەرەتا سـەد دۆلار غەرامەی بـۆ بڕییەوە بەڵام ئەم بڕیارە دواتر هەڵوەشایەوە .و.ف
248. Theory of evolution

حەقــیقەتە ئاشــکرا بــوو کە زۆربەی بونیادگەرایــانی مەســیحی خوازیــاری پاراســتنی ئۆتــۆریتەی دۆکترینەکەیانن[249]، تەنانەت ئەگەر ئەم کارە بە تەواوی پێچەوانەی رەوتی گشتیی کۆمەڵگای ئـەمریکایش بێت. بە رای ئەوان تەفسیر و لێکدانەوەی تاکی لە مەسیحییەتدا بوونی نییە.

ئێستەش هەندێ جار لەسەر فێرکردنی گریمانەی تەکامولْ دەبێتە مشتومڕ، بەڵام ئەم مشـتومڕانە بە لاڕێماندا دەبەن و حەقیقەت و واقیعـی ئەو ئایینەمـان لـێ دەشـارنەوە کە دوچـاری گـۆڕان هـاتووە. دوای قۆناغی بزووتنەوەی رابوونی ئـایینی لە سـەدەی حەڤدەمـدا، بنەمـاییترین گۆڕانکـارییە مەزهەبییەکـان لەم سی ساڵەی دووایید ا روویان داوە. زۆرجار ئاییندارییی زێدەڕۆیانە و رادیکالْ بە [سەرەکیترین] تایبەتمەنـدیی ئەم دەیە دواییــانەی ئـەمریکا لەقەڵەم دەدرێ، رەنــگە ئەم بۆچــوونە لەو گۆشــەنیگایەوە کە هەژمــاری ئەندامانی هەندێ لە کەلیسا کۆنەپارێز و کۆنسێرڤاتیستەکان زیادیان کردووە بۆچـوونێکی راسـت بێـت[250]، بەڵام رەهەنـدی دیـارتر و بەرچـاوتر[ی ئەم قۆنـاغە] ئەوەیە کە لەم مـاوەیەدا مەسـیحییەتی ئـەمریکایی ـ بەتایبەت پرۆتستانیزم ـ لە رووی دوکترینەوە گۆڕدراوە بۆ ئایینێکی پلـۆرالْ و فرەچەشـنی[251] و سـەرنج و بـایەخی زۆر بە بیروبۆچـوون و، خولیـا و ئاواتەکـانی لایەنگـران و پێڕەوانـی خـۆی دەدات. بونیـادگەرایی ناوەرۆکە مەزهەبیـیەکەی خـۆی لە دەسـت داوە و هەنـووکە زیـاتر وەک دیـاردەیەکی سیاسـی بەرجەسـتە دەبێتەوە. ئاییندارانی ئاسایی گەلێ بەهێز بوونەتەوە، هێنـد بەهێـز کە دارِشـتنی رێکخسـتن و دۆکتـرین و باوەڕەکانی ئایینیـان گرتـۆتە دەسـت خۆیـان. سـەیر لەوەدایە کە زیـاترین رەنگدانەوەی ئەم گۆڕانکـارییە دیموکراتیکە لەو ئایینزایەدا رووی داوە کە زۆرجار بە ئایینزایەکی پاشڤەڕۆ لەقەڵەم دەدرێت: بـزووتنەوەی ئێڤانجلیک. مەسیحییەتی ئێڤانجلیک پێچەوانەی ئامانج و ئایـدیالە سـەرەتا و یەکەمەکـانی، خـۆی گۆڕیـوە بۆ ئایینزایەکی پۆپۆلیست و دیموکراتیک. سـەرەکیترین هۆکـاری ئەم کـارەش دەگەڕێـتەوە بـۆ ئەوەی کە تاقە رێگا بـۆ دەرچـوون و خـۆ رزگـارکردن لە قەدەر و چارەنووسـی کەلیسا سـوننەتییەکانی‌تر، هەر ئەم خۆگۆڕینە بـوو. وردبـوونەوە و لێکـدانەوەی رەوتـی گـۆڕانی مەسـیحییەتی ئێڤـانجلی رێگـایەکی باشـە بـۆ تێگەییشتنی باشتر لە [چۆنیەتیی] شکست و فەشەلهێنانی بەربڵاوی ئۆتۆریتەی مەزهەبی لە ئەمریکادا.

---

249. Doctrinal authority

٢٥٠ . زۆربەی ئەم ئیدیعایانە لەسەر بنەمـای توێژینەوەکـانی رێکخـراوی گـالوپ دامەزراون و لە راسـتیدا بە پێـی ئەو تـوێژینەوانە رێـژەی ئەو ئـەمریکاییانەی هـاتوچۆی کەلیسـا دەکەن بە زۆری نەگـۆڕ و وەک خـۆی مـاوەتەوە، واتە نـزیکەی لە سـەدا ٤٠ی خەڵـک [هەمیشـە هـاتوچۆی کەلیسـایان کـردووە]. ئەڵـبەت دەیەی ١٩٥٠ی لێ بەدەر کە ئەم رێژەیە بەرز بوویەوە بۆ لە سەدا ٤٩. بەپێی نزیک بە هەمـوو پێوەرەکـانی‌تر، بـۆ وێنە ئەو پرسیارانەی‌تر کە رێکخراوی گالوپ بە درێژاییی چەندین دەیە ئاراستەی کردوون، رۆڵی مەزهەب لە ژیانی ئەمریکاییەکاندا تۆزێ دابەزیوە.

251. Plural

## کلێسای من کلێسای تۆیە

ڕێکخراوی گالوپ لە ساڵی ١٩٧٦دا بە ڕاگەیاندنی ئامارێکی سەرسووڕهێنەر کۆمەڵگای ئەمریکایان لە ڕاستیدا دەستەبژێرانی پەراوێزکەوتووی ئەو وڵاتەی سەرسام کرد، گالوپ ڕایگەیاند کە لە سەدا ٣١ی ئەمریکاییەکان خۆیان بە مەسیحییەکی «ئیمان نوێکردوو»[٢٥٢] یان ئێڤانجلی دەزانن. پاشان لە هەمان ساڵ و لە دووتوێی بانگەشەکانی هەڵبژاردندا جیمی کارتێر بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە پێڕەوی مەزهەبی بەپتیستی ئێڤانجلیکی باشوورە. تا ساڵی ٢٠٠٠ هەژماری مەسیحییانی «ئیمان نوێکردوو» و ئێڤانجلی بەرز بوویەوە بۆ لە سەدا ٤٦[ی کۆی حەشیمەتی ئەمریکا]، هەردوو کاندیداتۆرەکەی هەڵبژاردنی سەرۆک کۆماریش دەکەوتنە نێو ئەم پێڕستەوە (کە هەردووکیشیان پێڕەوی بەپتیستی باشوور بوون). بەتایبەت یەک لەو دووانە، واتە جۆرج دەبلیۆ بووش، بووە بە هێمای گۆڕانکارییەکانی مەسیحییەتی ئەمریکایی لە چەند دەیەی ڕابردوودا. بووش مەزهەبی خۆی گۆڕیوە و باوکیشی وەک نەوەکانی ڕابردوو نەجیبزادەیەکی پێڕەوی کەلیسای ئەپیسکۆپاڵە. بەڵام ئەمریکا هەمان ئەو ڕێگایەی هەڵبژارد کە بنەماڵەی بووش گرتیانە بەر؛ پێکهاتی کۆنی ئۆتۆریتەی مەزهەبی تەسلیم بەم پێکهاتە تازەیە بووە.

سەرهەڵدانی مەسیحییەتی ئێڤانجلیک مرۆڤ تووشی سەرسووڕمان دەکات و ئەو پرسیارە دێنێتە گۆڕێ کە لە سەردەمی زاڵبوونی تاکخوازی[٢٥٣] و ئاسانگیریدا[٢٥٤] بۆچی ئاوەها مەزهەبێکی سوننەتی و سەختگیر گەشە دەسێنێ؟ وەڵامی زۆرکەس و تەنانەت زۆربەی ئەندامانی کەلیسا ئەوەیە کە هۆکاری گەشەسەندنی مەزهەبی ئێڤانجلیک [دەقاودەق] سەختگیربوونی ئەو مەزهەبەیە، چونکوو ئەڵتەرناتیڤێکی ڕادیکاڵ و توندڕەو لە بەرانبەر کولتووری مۆدێرندا پێشکەش دەکات و بێگومان لە دونیای شپرز و ئانارشیکی ئەوڕۆدا پێوەر و سنوورە ئەخلاقییەکان لە ڕووی دەروونییەوە بە قووڵی سەرنجەکان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن. بەڵام قبووڵکردنی ئەم بەڵگاندنە مانای پشتگوێخستنی هۆکاری گۆڕانکاریی بنەمایی پرۆتستانیزم.

بیلی گراهام پێشەنگی ئەم گۆڕانە بوو. گراهام دوای ئەوەی لە چلەکاندا خوێندنی باڵای لە زانکۆی بونیادگەرای باب جۆنزدا تەواو کرد بە پیشکەشکردنی زنجیرە ئامۆژگارییەک سەبارەت بە گوناە و جەهەننەم چالاکییەکانی دەست پێ کرد. باب جۆنزی باوک (١٨٨٣ ـ ١٩٦٨) کە لە یەکەم بونیادگەراکان بوو، لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ڕزگاربوون تەنیا و تەنیا بۆ پرۆتستانە کۆنەپارێزەکانە و

---

٢٥٢. Born again: کەسێک کە مەسیحی بووە بەڵام مەسیحییەکی پاسیڤ و نائەکتیڤ بووە و ئێستە هەوڵی پەرەپێدان و بانگەشەی ئایینی مەسیحی دەدات. و.ف

253. Individualism

254. Tolerance

ئەوانیتر ـ جوولەکەکان، کاتۆلیکەکان و مۆرمۆنەکان[٢٥٥] ــ هەرهەموویان جەهەننەمین. بە رای ئەو بەتایبەت مەزهەبی کاتۆلیک ئایینزایەک بوو کە سەرۆکەکەی واتە پاپا بە راستی «دەجاڵ» بوو ـ زانکۆی باب جۆنز تا ساڵی ٢٠٠٠ بە ئاشکرا لەسەر ئەم هەڵوێستەی مایەوە بەڵام سێناتۆر جان مەککەین لە ناوبەری هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانی ئەودەمی کارۆلینای باشووردا سەرنجی رای گشتیی بەرەولای ئەو بابەتە راکێشا. بە باوەڕی جۆنز کولتووری گشتیی ئەمریکا کولتوورێکی بێ خودا و گەندەڵە و لە ناوچوونی وڵاتی ئەمریکا چارەنووسێکی رەها و بێچەندوچوونە. ئەم بابەتە دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی ١٩٢٠، جۆنز لە ساڵی ١٩٢٧دا و بە مەبەستی رزگارکردنی مەسیحییە «راستەقینە»کان لە دۆزەخی ئەمریکای مۆدێرن زانکۆکەی خۆی دامەزراند. ئەو خولیای گۆڕینی وڵاتی نەبوو و لە هەمان کاتدا ئامادەش نەبوو لە پێناو بەرفراوانکردنی ژمارەی لایەنگرانیدا بۆچوونەکانی خۆی هێمن بکاتەوە. بە قووڵیش باوەڕی بەو شتە هێنابوو کە ناوی لێ دەنا «رەزامەندیی قووڵی رۆحی» و بە رای ئەو کاتێ دێتە بەرهەم کە «ببێتە ئەندامی ئەو گروپە کەمینەی لە کتێبی پیرۆزدا ئاماژەی پێ دراوە».

بیلیگراهام وەک وتاربێژ و بە ئاوەها بۆچوونگەلێکەوە دەستی بە کار کرد؛ ئەو کۆمەڵە وتار و ئاخافتنێکی رەق و سەختگیرانەی پێشکەش دەکرد و تێیدا زۆربەی رەهەندەکانی ژیانی مۆدێرنی بە گوناهکارانە لەقەڵەم دەدا و شەرمەزاری دەکردن. بەڵام هەرچی هەژماری گوێگرانی زیاتر و زیاتری دەکرد و بە رێگای رادیۆ و تێلەڤیزیۆندا دەچووە ماڵی خەڵکەوە، دەربڕینەکانیشی گەلێ نەرمتر و نەرمتر دەبوونەوە. لە چەند دەیەیەکدا لە کەسێکەوە کە وتار و ئامۆژگاریی توندوتیژی سەبارەت بە سزای هەرمێن و هەمیشەیی مرۆڤ پێشکەش دەکرد، گۆڕدرا بۆ سیمایەکی باوکانە و میهرەبان بۆ هەموو ئەمریکاییەکان و دۆستایەتیکردنی لەگەڵ هەموو سەرۆک کۆمارانی دوای ریچارد نیکسۆن و ئامۆژگاریکردنی ئەو سەرکۆمارانە، بوو بە هۆی پتەوبوونەوەی [هەرچی زیاتری] پێگەی بیلیگراهام. گەلێ سەیر و جێی سەرسوڕمانە کە گراهام گۆڕدراوە بۆ مرۆڤێکی هێند لێبووردوو و دڵڕەحم: نە نیکسۆنی لەدوای واتێرگەیت لۆمە کرد و نە کلینتۆنی دوای مۆنیکا گەیت شەرمەزار کرد. تیۆلۆژیستێک بە ناوی ریچارد جان تۆهاس لە ١٩٩٩دا وتی: «بیلی گراهام لە دەسپێکی کارەکانی لە دەیەی ١٩٤٠دا بە بێ هیچ دوودڵییەک باسی ئاگری دۆزەخ و سزا و عەزابی هەمیشەیی دەکرد بۆ هەموو ئەوانەی مەسیحییەتیان قبووڵ نەکردووە. بەڵام ماوەیەکی زۆرە وازی لەم قسانە هێناوە، ئاشکرا بڵێم، وا دیارە بەڕێز گراهام چاک دەزانێ چ شتێ کڕیاری هەیە و چی نییەتی».

خۆشەویستبوونی گراهام بوو بە هۆکارێک بۆ بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا بە ئاراستەی پەرەپێدانی پەیامێکی بەربڵاوی مەزهەبیدا. لەم رەوتەدا تەکنۆلۆژیا جێگای پێوەندیی شەخسیی نێوان ئەندامانی

---

٢٥٥: Mormon ئایینزایەکی مەسیحییە. و.ف

گرۆپە مەزهەبییە لۆکاڵ و خۆماڵییەکانی گرتەوە، ئەڵبەت لە راستیدا دەوری ئەو پێوەندییانەی گەلێ کەمڕەنگ کردەوە. سەرهەڵدانی ئەو کەشیشە میدیاییانەی دوای گراهام هاتنە مەیدان بوو بە هۆی زەبرلێکەوتنی بەرچاوی کەلیسا خۆماڵییەکان، [چونکوو] ئەو کەلیسایانە بە وردی ئەندامان و لایەنگرانی خۆیان دەخستە ژێر چاودێرییەوە و گەلێ سەختگیرانەتر دەجووڵانەوە. ئەم گۆڕانە دیارترین و بەرچاوترین گۆڕانی مەزهەبی بوو، لە دووتوێی ئەم ئالوگۆڕەدا ئۆتۆریتەی نەریتخوازی مەزهەبی کە لەسەر مۆدێلی کەلیسای ئەپیسکۆپاڵ دامەزرابوو و تیایدا کەشیشی خۆماڵی رۆڵی رێپیشاندەرێکی ئەخلاقی دەگێڕێ، گۆڕدرا بۆ جۆرە مۆدێلێکی نوێی ئێڤانجلی کە تیایدا رێنوێنییە ئەخلاقییەکان لە شاشەی تێلەڤیزیۆنەوە پێشکەش دەکرێت. ئەگەر ئەندامی کەلیسای خۆماڵی بیت ناتوانی لە نێو هاورێیانتا بە ئاسانی پرەنسیپە ئەخلاقییەکان پێشێل بکەیت، بەڵام ئەگەر هەموو کاروبارەکانت کورت بێتەوە بۆ سەیرکردنی بەرنامەی تێلەڤیزیۆنیی کەشیشێک، ئەوکات ئیدی کەس نییە ئاگای لێت بێ و بتخاتە ژێر چاودێرییەوە.

هەرچەند بیلی گراهام پێشەنگی دیموکراتیزاسیۆنی نەریتی ئێڤانجلی بوو، بەڵام جێری فالوێڵ گەورەترین دەوری گێڕا. رەنگە ئەم بۆچوونەتان پێ سەیر بێ، بەڵام گەورەترین هۆکاری ئەوەی فال وێڵ وەک کەسێکی پاشڤەڕۆ ناوبانگی دەرکردووە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چالاکییە سیاسییانەی لە بیست ساڵی رابردوودا و وەک دامەزرێنەری گرووپی سیاسی و کۆنسێرڤاتیستی «زۆرینەی ئەخلاقی» ئەنجامی داون. ئەگەر ئاورێک لە سەرتابەری کارەکانی رابردووی بدەینەوە زیاتر لە سروشتی هەلپەرستانەی ئەو کابرایە دەگەین، سەرەکیترین ئامانجی فال وێل خۆشەویستکردنی کەلیساکەی لای جەماوەری خەڵک بوو. فال وێل کار و کەسابەتی خۆی لا گرنگ بوو و گوێی بە ئۆتۆریتەی مەزهەبی نەدەدا، هەر بۆیە پێوەندییەکانی لەگەڵ سەرکردایەتیی کەلیسای بەپتیستی خۆیدا پچڕاند و لە ١٩٦٥ و بە سیوپێنج ئەندامەوە کەلیسای بەپتیستی «سەنت تۆماس رۆد[٢٥٦]»ی دامەزراند. ئەو کە ستایشی مامەڵەچییان و بازرگانانی دەکرد و باوکی خۆیشی بازرگان بوو، لە ١٩٧١دا وتی: «ئەگەر کەلیسا بۆ ئەو کارە نوێیانەی رەنگە لە داهاتوودا ئەنجامی بدات بیر لە کار و کەسابەتیش بکاتەوە، ئەوا گەلێ ژیرانە و ئاقڵانە جووڵاوەتەوە». یەک لە دەربڕینە ناوازە و نەستەقەکانی ئەوە بوو کە «گەورەترین داهێنانی بیست ساڵی رابردوو کردنەوە و سەرهەڵدانی سۆپەرمارکێتە گەورەکانە... رەمزی سەرکەوتنی سۆپەرمارکێتەکان[٢٥٧] تێکەڵکردنی خزمەتگوزارییەکانی دوو کۆمپانیای گەورە بوو لەگەڵ خزمەتگوزارییەکانی فرۆشگە بچووک و پەراوێزییەکاندا. بە باوەڕی کەلیسای بەپتیستی سەنت تۆماس

---

256. St. thomas Road
257. Shoppingcenter

ڕۆد، تێکەڵکردنی کەشیشەکانی ڕێکخراوە جیاجیاکان لە کەلیسایەکی هاوبەش و یەکگرتوودا دەتوانێ... جەماوەری خەڵک بەرەو وانەکانی مەسیح رابکێشێ». ئەم ستراتیژە گەلێ سوودمەند و پڕئاکام بوو و سەرهەڵدانی «هەرەکەلیسا[258]»ی لێ کەوتەوە. فال وێل لە ئاخافتنێکی ئەم دوایانەیدا بەرنامەکانی خۆی بۆ کردنەوەی سۆپەرمارکێتێکی نوێ بە گەورەیی ٥٦٠ هێکتار و لە ژێر ناوی «نووسینگەی جیهانیی کەشیشیی فال وێل»دا ڕاگەیاند. وا بڕیارە ئەم سەنتەرە گەلێ کەرەستە و ئیمکاناتی بەرفراوانی هەبێ، بۆ وێنە: زانکۆیەک، چەند ڕێکخراوێکی فێرکاری، کەلیسایەکی دوازدە هەزار کەسی، سەنتەرێکی خزمەتگوزاریی تەلەفۆنیی ٢٤ کاتژمێری بۆ نزا و پاڕانەوە، سەنتەرێکی کاروباری قبووڵکردنی سەرپەرشتیی منداڵان، بوورسێکی خوێندن تایبەت بە دامەزراندنی کەلیسا، «سەنتەرێکی هەرەگەورەی یاری و ڕابواردنی منداڵان»، ئامێر و کەرەستەی وەرزشیی داخراو و سەرئاوەڵا، پێشکەوتووترین سەنتەری بەرهەمهێنانی [بەرنامەی] تێلەڤیزیۆنی، پارکینگی ئۆتۆمبیلە کاروانییەکان و کاسپێکی «زۆر پیشکەوتوو» بۆ لاوان. [٥]

فال وێل و کەسانی وەک فال وێل لە دووتوێی پرۆسەی گەشەسەندندا[259] سادەترین ڕێگای ڕاکێشانی زیاترین ڕێژەی گوێگرانیان دۆزییەوە، لەم ڕێگایەدا کولتوور و بەها باو و بەردەستەکان بە ئاراستەی پێشکەشکردنی هەمان ئەو شتەی خەڵک داوای دەکەن، کەڵکیان لێ وەردەگیرێت، واتە جۆرە مەسیحییەتێک پێشکەش بە جەماوەر دەکرێت کە لە ڕووی مەزهەبییەوە کەمتر سەختگیرە و زیاتر مەزهەبێکی هاوڕێیانە و خزمەتگوزارانەیە. بێگومان ئەمەش بە مانای ڕەتکردنەوەی تەواوی ڕۆحی فەندەمەنتالی پیاوانێکی وەک باب جۆنز و ئۆراڵ ڕۆبێرتس دێتەوە. هەنووکە بەرنامەکانی کەلیسا ئێڤانجلیکەکان بە جۆرێک دادەڕێژرێن کە لەگەڵ ئەمریکای مۆدێرنی بەکارهێنەردا[260] بە تەواوی تەبا بێنەوە. ئاورێک لە «ڕاکی مەسیحی» بدەنەوە، زۆرجار ئەم جۆرە مۆسیقایە بە هێمای پەرەسەندنی مەزهەب دێتە ئەژمار، بەڵام بە دڵنیاییەوە ڕاکی مەسیحی یەکێکە لە نیشانەکانی بێناوەرۆکی و بێهوودەیی ئەو جۆرە پەرەسەندنە[ی مەزهەب]. کۆمپانیاکانی تۆمارکردنی مۆسیقای مەسیحی هەمەجۆرە مۆسیقایەکی پاپ تۆمار دەکەن ـ هارد ڕاک، هێڤی مێتاڵ، جاز، ئەیزی لیسنینگ، گرانج، فانک و هیپ هۆپ کە ئێستا لە ڕیزی پڕفرۆشترین مۆسیقاکاندایە. نیکۆلاس داڤیرۆفی ڕۆژنامەوان دەڵێت: «دەنگی مۆسیقای مەسیحی لە هەرهەموو نموونەکانیدا دەقاودەق وەک نموونە سێکۆلارە هاوشێوەکانی وایە [و ڕێک لە یەک دەچن]. زۆربەی دەرکەوتەکانی دیکەشی هەر ئاوەهان، لە تەلارەکانی

258. Super church
259. Development process
260. Consumer

سەمای «مۆش»ی[٢٦١] مەسیحییەوە بگرە بۆ کەناڵی مۆسیقای Z کە کەناڵێکی ٢٤کاتژمێرییە و تەنیا شۆوی مۆسیقای مەسیحی بڵاو دەکاتەوە».[٦] یان با ئاوڕێک بدەینەوە لە گەورەپیاوی ئێڤانجلیست و کۆنەپارێز واتە پێت رۆبێرسۆن[٢٦٢]؛ میتۆدی بەرنامە تێلەڤیزیۆنییەکەی بە ناوی «کلوپی ٧٠٠» و «سەنتەری راوێژکاری»یە ٢٤کاتژمێرییەکەی کە بەشێکە لە هەمان ئەو کلوپە، لە ئاست کێشە ئینسانییەکاندا، میتۆدێکە تەنیا و تەنیا نیشانە دیار و ئاشکراکانی کێشەکان لەبەرچاو دەگرێت و هەوڵی ناسینی هۆکارەکان نادات، دیارە ئەمەش هەمان میتۆدی باو و ناسراوی ئەمریکاییە. خەڵک ستایش دەکرێن، هەوڵی سرەوتن و هێورکردنەوەیان دەدرێت، دڵیان دەدرێتەوە، بەڵام قەت لۆمە ناکرێن. ئەگەری ئەوەی رۆبێرسۆن کەسێک لە بەر گوناهەکانی لۆمە بکات بە قەدەر ئەوەیە ئۆپێرا وینفری[٢٦٣] ئاوەها کارێک بکات. بەرنامەکانی رۆبێرستۆن ئێستە لە «کەناڵی بنەماڵە» و لە نێوان بەرنامەی منداڵان و فیلمە کۆمێدییەکاندا بڵاو دەبێتەوە، [بە راستی] ئەم دۆخە هەر شیاو و شایستەی ئەو جۆرە بەرنامانەشە.

ئەگەر لای رۆبێرسۆن ئایین وەک مەرهەم و سارێژکەر چاوی لێ کراوە، پەیامی پاڵەکی[٢٦٤] و نەستئارای[٢٦٥] دوو ئێڤانجلیستی پێنتیکاستاڵی[٢٦٦] دیکە، واتە جیم و تامی فی باکێر، ئەوەیە کە ئایین بە مانای چێژخوازییە[٢٦٧]. باکێر جارێکیان بە گوڕ و تینەوە رایگەیاند: «پێویستە مەسیحییەت ئایینێکی پڕ لە شادی و رابواردن بێت... رزگاری و سەربەستی شتێک نییە مرۆڤ بێتاقەت بکات!». ئەوان لە پێناو جێبەجێکردن و پراکتیزەکردنی ئامۆژگاری و بۆچوونەکانیاندا دەستیان دایە دروستکردنی پارکێکی تایبەتی ٩٣٠٠ هێکتاری لەژێر ناوی «هەریتێج یو.ئێس.ئەی»دا و لەوپەڕی شکۆ و شانازیدا بە «دیزنی لەندی مەسیحی» پێناسەیان کرد. ئەم پارکە پێک هاتووە لە ئۆتێلێکی ٥٠٤ ژووری، پارکێکی ئاوی، سۆپەرمارکێتێک، سەنتەرێکی راوێژکاری، «سەنتەرێکی مۆدێرنی شانۆی مەزهەبی لە ئامفیتیاتری هەریتێجدا» و بینایەکی نموونەیی هاوشێوەی ماڵەکەی سەردەمی منداڵیی بیلی گراهام[٢٦٨] لە ١٩٨٦دا

---

٢٦١ . جۆرە سەمایەکی توندوتیژ لەگەڵ مۆسیقای راکدا. و.ف

٢٦٢ . کەشیشێکی تێلەڤیزیۆنی لە ئەمریکادا کە وتاری تێلەڤیزیۆنی پێشکەش دەکات. و.ف

٢٦٣ . پێشکەشکاری بەرنامەگەلی خەڵکپەسەندی تێلەڤیزیۆنی لە ئەمریکادا کە ناوبانگ و سەروەت و سامانی بەرچاوی کۆ کردۆتەوە. و.ف

264. Implicit

265. Unself conscious

266 . (Pentecostal) ئایینزایەکی ئێڤانجلیکی . و.ف

267. Hedonism

٢٦٨ . هەرچەند گراهام خۆی مەسیحییەکی پێنتیکاستاڵ نەبوو بەڵام ئێستە زۆرێک لە ئێڤانجلیکەکان بە دامەزرێنەری ئەم بزاڤەی دەزانن.

شەش میلیۆن کەس سەردانی ئەم پارکەیان کرد، واتە دوای هەر دوو پارکەکەی دیزنی سێیەمین پارکی پڕبینەری ئەمریکا بوو.

باکێر جارێکیان لە وتوویژێکی ڕۆژنامەی *نیۆیۆرک تایمز*دا بە ئاماژەدان بە پارکە هەرە مەزنە ئاوییەکەی کە هەشت میلیۆن دۆلار ئەژێ، دانی بەوەدا نا کە «خەڵک پرسیارم لێ دەکەن ئەرێ بۆ دەبێ سەنتەرێکی مەسیحی پارکی ئاویی هەبێت؟ جا باشە کاتێک کە ئینجیل دەستووری پێ داوین مرۆڤەکان ڕاو بکەین، بێگومان پارکی ئاوی [باشترین] داوە... من بەکارهێنانی داوێکی ڕازاوەی پڕ باق و بریق بە هیچ شێوەیەک بە خراپ نازانم».[٧]

جەیمز دەیڤیسێن هانتێر، کۆمەڵناسی زانکۆی ڤیرجینیا، کە زۆر بە وردی بزاڤی ئێڤانجلیکی تاوتوێ کردووە، لە کتێبە گرنگەکەیدا بە ناوی *مەزهەبی ئێڤانجلی لە ئەمریکادا* ئەوەمان بۆ شی دەکاتەوە کە ئێڤانجلیکەکان لەو ڕاستییە گەشتن کە گرنگترین خاڵ بۆ بەرفراوانکردنەوەی ڕێژەی لایەنگرانیان ئەوەیە کە «نە تەنیا دەبێ لە ئاست بیروبۆچوون، ڕوانگە و شێوازی ژیانی کەسانیتردا ئاسانگیربین و قبووڵیان بکەین، بەڵکوو گرنگتر لەمەش ئەوەیە کە لە ئاست خودی خۆیشیاندا ئاسانگیر بین و لای خۆمان جێیان بکەینەوە. نەڕەنجاندن [ی ئەویدی] خاڵی ژیانبەخش و بنەماییە... ئەمەش دەخوازێت کەمتر جەخت لەسەر ڕەهەندە ناحەزترەکانی مەزهەب بکەین، ڕەهەندگەلێکی وەک تۆمەتی کوفر (تەکفیر)، گوناە، هەرمێنی[٢٦٩]، لامەزهەبی و، [هەروەها] بابەتگەلێکی وەک قەدەری خوداوەند، سزای خوداوەند، عەزاب و سزای هەمیشەیی و جەهەننەم. هەموو جۆرە ئاماژەیەک بۆ ڕەهاگەری و دەمارگرژیی ئەخلاقی کەمڕەنگ دەکرێتەوە». یەکێکیتر لە توێژەرانی بواری مەسیحییەتی ئەمریکایی لە زانکۆی کالیفۆرنیا بە ناوی سۆزان فرێند هاردینگ، سەبارەت بە پارکی «هەریتێج یو.ئێس.ئەی» کۆمەڵە بۆچوونێکی هەیە کە بۆ زۆربەی کەلیسا ئێڤانجلیکە مۆدێرنەکانیش دەشێت، بە ڕای ئەو ئەم پارکە «ڕەخنەیەکی بەردەوام بەڵام پاڵەکی بوو لە ئاست سەختگیرییە ئەخلاقییەکانی فەندەمەنتالیزم و لۆژیکی فەندەمەنتالی کە لەسەر بنەمای لەخۆبوردوویی و فیداکاری دامەزراوە و [هەروەها] جەختکردنی بێئەندازە و لە ڕادەبەدەری ئەو بۆچوونە لەسەر ئۆتۆریتە، هیرارشییەت و پرەنسیپەکان... باکێرەکان بەڵێنی سەروەت و بەختەوەری بە هاوڕێیانیان دەدەن، بەڵام لە ڕاستیدا فێرکاری و وانەکانی ئەوان لەسەر بنەمای بەخشندەیی و لێبوردنی بێسنوور ڕۆنراوە، ئەمە جۆرە تیۆلۆژییەکی جەماوەرییە و مرۆڤ وا دەزانێ لێبوردنی هەمیشەیی و پێشوەختی خوداوەند گەرەنتی دەکات و بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین ڕێگە بە گوناهکردن دەدات».[٨] لەمەوبەدوا چیدی دابەزاندنی ئۆتۆریتە بە شێوازە سوننەتییەکان شتێکی نەکردە و مەحاڵ بوو، هەر بۆیە پێکەوەسازان و خۆگونجاندن بوو بە تاقە ڕێگای مانەوە و سەرکەوتن.

---

269. Eternity

باشترین ڕێگا بۆ تێگەیشتن لە هۆکاری تێکەڵبوونی بونیادگەراکان بە سیاسەت ئەوەیە کە ئەم دیاردەیە وەک پەرچەکردارێک لە ئاست لاوازکەوتنی ئۆتۆریتە و پێگەی مەزهەبیدا لێک بدەینەوە. فال وێڵ کە ئالاهەڵگری ئەم ڕەوتە بوو، بە درێژایی سەرجەم سالانی پەنجاکان و شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان خۆی لە قەرەی سیاسەت نەدەدا. فال وێل لە ١٩٦٥دا وتارێکی تایبەتیی لەم بارەیەوە پێشکەش کرد: «زۆر سادە و لە دووتوێی چەند وشەیەکدا دەتوانین پێوەندیی نێوان کەلیسا و دونیا ڕوون بکەینەوە، ئەمە هەمان وتەکانی پۆلسی حەوارییە بۆ تیمۆتاس: بانگەشەی وتەکانی خودا بکە. لە هیچ شوێنێکدا دەستوورمان پێ نەدراوە چاکسازی لە ڕواڵەتە مادییەکاندا بکەین، دەستوورمان پێ نەدراوە دژی قاچاخچییان، فرۆشیارانی خواردنەوە ئەلکولییەکان، قوماربازان، جینایەتکاران، سۆزانییەکان، ساختەچییان، مرۆڤ یاکوو دامەزراوە دەمارگرژەکان، یان هەر جۆرە خراپەیەکیتر، شەڕ بکەین».[٩] ئەو هەمیشە دژایەتیی لەگەڵ خۆتێکەڵکردنی کەشیشەکان لە سیاسەتدا دەکرد.

لە پەنجاکان و شەستەکاندا چالاکیی سیاسی بە واتای خەباتکردن بوو لە پێناو مافە مەدەنییەکاندا، نە فال وێڵ و نە لایەنگرانی هێند حەزیان لەم بابەتە نەدەکرد. لە ڕاستیدا ڕۆڵی کەلیساکانی پرۆتستان لە بزاڤی مافە مەدەنییەکاندا مۆدێلێکی تەواو و کۆنکرێت بوو لەو ئۆتۆریتە مەزهەبییەی لەسەر شێوازی کۆن و بە مەبەستی فێرکردن و ڕازیکردنی لایەنگران بە کار دەهێنرا، [بەلام] فال وێل ئەم شتەی نەدەویست. بەلام لایەنگرانی فال وێل لە حەفتاکان و بەتایبەت لە باشووری ئەمریکادا تێکەڵ بە سیاسەت بوون و لە زۆربەی بابەتە کۆمەلایەتییەکاندا تەقلی بەرەی ڕاستگەرا بوون. ئەوان وازیان لە پێگە سوننەتییەکەی خۆیان لە حیزبی دیموکراتدا هێنا و دەنگیان بە نیکسۆن دا. بەلام خودی فال وێل پێنج سال دوای پشتگیریکردنی یاسایی دیوانی بالا لە پرسی لەباربردنی منداڵ ـ واتە لە ١٩٧٨دا تازە بەتازە کەوتە خۆ و دەستی دایە ئاواکردنی گروپێکی پشتیوانیی سیاسی و لۆبییەک لە ژێر ناوی «زۆرینەی ئەخلاقی»دا. بەم کارەش بۆ جارێکیتر بوو بە هۆی نارەحەتی و تووڕەبوونی بونیادگەرا توندڕەوەکان. «زۆرینەی ئەخلاقی» بە ئاشکرا دەیهەویست پشتیوانیی کاتۆلیکەکان، جووەکان، مۆرمۆنەکان و لە ڕاستیدا هەر کەس و گروپێک کە بەرنامەکانی ئەو تاقمەی قبووڵ بێت، بەدەست بهێنێ. ئەم گوناهە بوو بە هۆی ئەوەی باب جۆنزی کوڕ (جێگری باب جۆنزی باوک) فال وێڵ بە «مەترسیدارترین پیاوی ئەمریکا» پێناسە بکات. دەتوانین بڵێین هۆکاری ئەوەی فال وێل ڕێبازی کۆنسێرڤاتیزمی ئەکتیڤی سیاسیی هەڵبژارد دەگەڕایەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە ئیدی کەس لایەنگری کۆنسێرڤاتیزمی مەزهەبی نەبوو، بیرمان نەچێ تایبەتمەندییەکانی کۆنسێرڤاتیزمی مەزهەبی بریتی بوون لە پاکژێتیی دۆکترین، دوژمنایەتیکردنی ئایینزاکانی تر، شەرمەزارکردنی هەندێ گوناهی وەک زینا و، دوورکەوتنەوەی ئیماندارانە لە کولتووری ماتریالیستی. ئەوەی لە بونیادگەرایی کۆنی پرۆتستانی دەمایەوە سیاسەت بوو: لەباربردنی منداڵ، هێمۆسێکسوالەکان،

تیۆریی تەکامولّ (گەشەی چەشنەکان)ی داروین. ئەم کۆمەڵە بابەتە لایەنگرانی بەربڵاوی بونیادگەراییی پێکەوە گرێ داوە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە ئەمریکاییەکان لە ئاست زۆرێک لەم تابۆ کۆمەڵایەتییانەدا ئاسانگیرتر بوونەتەوە، کەچی ئەم رووبەرەش نەیتوانیوە خۆی لەگۆڕان بپارێزێ. زۆرێک لە کەلیسا بونیادگەراکان بە رواڵەت و لە قسەدا لە بەرانبەر هەندێ بابەتی وەک هێمۆسێکسواڵیتەدا هەڵوێستێکی توند وەردەگرن، بەڵام لەبەر نەرەنجانی دڵی ئیماندارانی ئاسایی کە یەک لە توێژەران ناوی «مرۆڤی کەلیسا نەچوو»ی لەسەر داناون، هیچ کارێکیتر ناکەن. بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێکی بونیادگەرا تەنیا شتێک پێویستە بیکەیت ئەوەیە کە سەیری بەرنامە و شانۆ مەسیحییەکانی تێلەڤیزیۆن بکەیت، سەردان و هاتوچۆی پارکە تایبەتییەکان بکەیت، راکی مەسیحی بکڕیت و [لە هەڵبژاردنەکاندا] دەنگ بۆ کۆماریخوازان بدەیت.

مارک شیبلیی کۆمەڵناس ئەم دیاردەی ناو ناوە «بە کالیفۆرنیاییکردنی پرۆتستانیزمی کۆنسێرڤاتیست». بونیادگەراکان هۆکارەکانی پێکەوەگرێدان و وروژاندنی لایەنگرانیان واتە ئامانجەکان و دوژمنەکانیان لەدەست داوە، هەر بۆیە دوای یازدەی سێپتامبر (ئەیلول) کەوتنە خۆ و دوژمنێکی نوێیان دۆزییەوە؛ ئیسلام. وردە وردە فال وێل، رۆبێرتسۆن و فرانکلین گراهام (کوڕی بیل گراهام) هەر هەموویان هەڵیانکوتایە سەر ئیسلام و [هەنووکە] بە دەستەواژە و دەربڕینی سووک و رووخێنەر لەم ئایینە دەدوێن و ئیسلام بە ئایینی «شەیتان» و پێغەمبەرەکەیشی وەک تیرۆریستێک پێناسە دەکەن.

سەردەمانێک ئەم شێوە دەربڕینە بۆ پێناسەکردنی لایەنگرانی لەباربردنی منداڵ، هێمۆسێکسواڵەکان و «سەندیکای ئازادییە مەدەنییەکانی ئەمریکا» بە کار دەهێنرا، بەڵام ئێستە بۆ پێناسەکردنی موسوڵمانان بە کار دەهێنرێ. هێشتا دیار نییە ئەم تێکۆشانە نوییەی لە پێناو بڵاوکردنەوەی رق و نەفرەتدا کەوتۆتە گەڕ ئایا لە هەوڵەکانی پێشوو کاریگەرتر دەبێت یا خود نەخێر.

ئەگەر جیا لە تاقمە ئێڤانجلیکەکان هەندێ شتی گرنگی دیکەیش لە بەرچاو بگرین ئەوکات زیاتر لە فەشەلهێنانی ئۆتۆریتە لە مەسیحییەتی ئەمریکاییدا دەگەین. ئالێن وۆڵفی کۆمەڵناس پێی وایە ئەو کەلیسایانەی وا بە کەلیساکانی *پارادایمی نوێ* ناویان دەرکردووە خێراتر لە کەلیسا ئەمریکاییەکانیتر گەشە دەسێنن، ئەم کەلیسایانە ئایدیای بارەگایەکی ناوەندی بۆ [بەڕێوەبردنی] مەزهەبیان قبوول نییە. ئەم جۆرە بزووتنەوانە بە تەواوی دیموکراتیک و چەقنەبەستوون[٢٧٠]. وۆڵف لە زمانی مامۆستایەکی زانکۆوە دەیگێڕێتەوە کە وتوویەتی: «عیسا و حەوارییەکانی لەسەر بنەمای جۆرە مۆدێلێکی «تۆپی و پەڕە»[٢٧١]

270. Decentralized

٢٧١ . جۆرە سیستەمێکی کۆنترۆڵکردنی ترافیکی ئاسمانی کە تیایدا فرۆکەخانەیەکی گەورە ئەرکی بەڕێوەبردن و هەماهەنگکردنی فرۆکەی فرۆکەخانەکانی تر دەگرێتە ئەستۆ. و.ف

دەجووڵانەوە کە هاوشێوەی ئەو میتۆدەیە کە کۆمپانیاکانی فرۆکەوانی لەوڕۆدا کەڵکی لێ وەردەگرن، ئەم میتۆدە بە مەبەستی خۆگونجاندن لەگەڵ دۆخی پۆست مۆدێرندا هاتۆتە ئافراندن، واتە دۆخی ڕێسا سڕینەوە[272] و ڕکابەرێتیی قووڵ». دەرکەوتەیەکی دیکەی سیمای نوێی مەزهەب بریتییە لە سەرهەڵدانی «خوازیارانی مەعنەوییەت». ئەم خوازیارانە لەسەر ئەو باوەڕەن کە مەزهەب بە تەواوی بابەتێکی تاکییە کە هەڵگری هیچ جۆرە ئیجبار یان دەستوورێکی خوداوەند نییە و هەرکەسەو دەبێ خۆی ئایینی خۆی ڕۆ بنێت. ئەگەر هێشتا هیوی لانگ زیندوو بایە دەیوت هەموان کەشیشن. زۆربەی کەلیساکانی ئەم تاقمە لە کەلیساکانی ڤان نۆسیی کالیفۆرنیا دەچن کە بەڕێز جێس مۆدی بەڕێوەیان دەبات، ئەو پیاوەی وا «بە شێوازێکی نوێ وانە و ئامۆژگارییەکانی پێشکەش دەکا و لە وتارەکانیدا هەر چەشنە ئاماژەیەکی بۆ ئاگری دۆزەخ و عەزابی خوداوەند قەدەغە کردووە». هەروەها هەندێ لە دەستەواژە باوەکانی تیۆلۆژیی مەسیحیش سڕاونەتەوە و خراونەتە لاوە. مۆدی دەڵێت: «ئەگەر ئێمە هەندێ وشەی وەک ڕزگاری یان گۆڕینی مەزهەب بەکار بهێنین [خەڵک] وادەزانن باسی قەواڵەی قەرزیان بۆ دەکەین».[١٠]

کۆمەڵگای مۆدێرن تەژییە لەم جۆرە گەڕانانە بەدوای «مەعنەوییەت» و شوناسدا و ڕەنگە هۆکارەکەشی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم میتۆدە مۆدێرنە دەتوانێ ببێتە ڕێگایەک بۆ وەڵامدانەوە بەداوای کۆن و دێرینی ئاسایش و ئایین. بەڵام لەوڕۆدا جەختکردن لەسەر هەڵبژاردنی تاکی و دیموکراتیکبوونی ستروکتۆر و پێکهاتەکان سەرەکیترین تایبەتمەندیی هەر هەموو ئایینزا بێشومارە سەرکەوتوو و ڕوو لە گەشەکانی مەسیحییەتە. بێگومان هەموو گرووپە مەزهەبییەکان لە بەرانبەر ئەم ڕەوتەدا هەڵوێستێکی توندیان وەرگرتووە، بەڵام ئەگەر هەموو ئەم گرووپە ئۆرتۆدۆکسە تازانە لەسەر یەککۆ بکەینەوە دەکاتە نزیکەی لە سەدا ٥ی کۆی ئەمریکاییەکان. ڕەوتی دیموکراتیزاسیۆن ڕەوتێکی کاریگەرتر و بەرچاوترە کە بۆتە هۆی لەناوچوونی ئەو شتەی وا هانتێر ناوی «چەسپی پێکەوەگرێدان»ی لەسەر دانابوو، واتە بۆتە هۆی لەناوچوونی دەسەڵاتی کتێبی پیرۆز، ئۆتۆریتە و سوننەت. کۆنەپارێزترین بزووتنەوەی کۆمەڵایەتیی ئەمریکا واتە مەسیحییەتی ئیڤانجلی، بە درێژاییی چل ساڵی ڕابردوو بە گژ کولتووری دیموکراتیکی مۆدێرندا چۆتەوە و بە تەواوی ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە. چیرۆکی مەسیحییەتی ئیڤانجلی چیرۆکی فەشەلهێنانی خێراتر و بەربڵاوتری کۆی ئۆتۆریتەی مەزهەبییە لە ژیانی ئەمریکاییدا. باشبوون یان خراپبوونی ئەم دیاردەیە بەستراوەتەوە بە ڕوانگە و دیدی خۆتانەوە، بەڵام بێگومان ئەم ڕووداوە قەوماوە.

---

272. deregulation

## باشترین شتگەلێک دەیانزانی و فێری دەبوون

هێری شێرمەن شانۆنامەنووسێکی لاواز و خراپ بوو بەڵام بازرگانێکی باشی لێ دەرهات. شێرمەن دوای خوێندنەوەی چەندەها ساڵەی شانۆنامەی جۆراوجۆر، لە ساڵی ١٩٢٦دا هەستا بە کردنەوە و دەسپێکردنی پرۆژەیەک لە ژێر ناوی «کولوپی کتێبی مانگ»دا. شێرمەن ئامانجێکی سادە و ساکاری هەبوو: ناساندنی لەزەتی خوێندنەوەی بەرهەمە ئەدەبییە گەورەکان بە تازە خوێندەوارانی چینی مامناوەندیی ئەمریکا. جێنیس رادوەی، نووسەری مێژووی ئەم کلوپە، دەڵێت ئەم کلوپە هاوکات هەوڵێک بوو بۆ «کۆنترۆڵکردنی لافاوی کتێبە تازەکان و... دواجار دڵنیاکردنەوەی کڕیاران کە دەتوانن پێ بەپێی ڕەوتی بەرهەمە فەرهەنگییە مۆدێرنەکان هەنگاو بنێن و دڵنیایش بن کە کلوپ هەڵسەنگاندن و نرخاندنەکانی خۆی فیدای ناوبانگ و پێشوازی [ی جەماوەر] ناکات»[١١] کتێبەکان لە ژێر چاودێریی ستافێکی پێنج کەسیدا بە ناوی «داوەران» هەڵدەبژێردران کە هەموویان نووسەری پایەبەرز بوون. ئەندامانی یەکەم ستافی سەرنووسەری بریتی بوون لە مامۆستایەکی زمانی ئینگلیزیی زانکۆی یەیل، ڕۆماننووسێکی سەرکەوتوو، سەرنووسەری ڕۆژنامەیەکی ئەیالەتە ناوەندییەکانی ئەمریکا و دوو کەس لە وتارنووسانی ناسراوی ڕۆژنامەکان. ئەم ستافە لە هەڵبژاردنی کتێبەکاندا پۆتانسیەلی بازرگانیی بەرهەمەکانی لە بەرچاو نەدەگرت. هەندێ لە کتێبەکانی جۆرج ئۆروێل، ئارتۆر میلێر، ترۆمەن کاپۆتی و ئێرنێست هەمینگوەی لە ڕیزی کتێبە هەڵبژێردراوەکانی ئەم ستافە لە دەیەکانی ١٩٣٠ و ١٩٤٠دا بوون، کەچی هێشتا ئەم کلوپە لای کۆمەڵگای ئەدەبیی نیۆیۆرک گەلێ سووک و کەمبایەخ بوو. ڕەخنەگرێک بە ناوی دوایت مەک دۆناڵد ساڵی ١٩٦٠ وتارێکی بەناوبانگی لە ژێر سەردێڕی «کولتووری جەماوەری و کولتووری مامناوەندی»دا نووسی و تیایدا گاڵتەی بەم کلوپە دەکرد کە «باشترین لێکدانەوە بۆ ئەو کتێبانەی لە ١٩٢٦ەوە خستوویەتە بەردەست ئەندامەکانی ئەوەیە کە بڵێین بێگومان دەیتوانی کتێبی لەمە خراپتریش هەڵبژێرێ». لە ڕاستیدا کتێبی *زۆر خراپتر* لەمەیش لە بەردەستدا بوون. هەرچەند کلوپی کتێبی مانگ هیچکات بە ئاشکرا کلوپێکی ڕۆشنبیری یان ئاکادیمیک نەبوو بەڵام کۆمەڵە بەرهەمێکی بەنرخی دەدۆزییەوە کە دەیانتوانی سەرنجی جەماوەرێکی بەربڵاو بۆ لای خۆیان رابکێشن. ئەم کلوپە پێی لەسەر دیموکراتیزاسیۆنی کولتوور دادەگرت و لە ڕاستیدا پێشەنگی ئەم کارەش بوو، بەڵام ئەم کارەی لە ڕێگای دابەزاندنی پێوەرەکانەوە ئەنجام نەدەدا، بەڵکوو ئاستی پەسنکرد[٢٧٣] و داخوازییەکانی خەڵکی بەرز دەکردەوە.

پاشان دەیەی ١٩٦٠ دەستی پێکرد. هێرشکردنە سەر ئۆتۆریتە کە سەرجەم کۆن و قوژبنەکانی کۆمەڵگای تەنیبوو دونیای بچووک بەڵام پڕکاریگەری بازرگانیی کتێبیشی گرتەوە. ڕۆژنامەی نیویۆرک

273. Taste

تایمز ئاوەهای نووسی: «ئایدیای داوەرانی کلوپی کتێبی مانگ وەک گروپێک کە بە جۆرێک لە جۆرەکان بەڕێوەبەری ئەدەبیاتی وڵات بوون... ئایدیایەکی بە تەواوی سواو و بێبایەخ بوو». وردە وردە رۆژە خۆشەکانی کلوپ تەواو بوون و لە ساڵی ١٩٧٧دا زنجیرە کۆمپانیای میدیاییی تایم کلوپەکەی کڕی. دوای ماوەیەکی کورت داوەرەکان بە تەواوی سەربەخۆییی خۆیان لەدەستدا و لقی فرۆشیاری و بازاڕدۆزینەوەی[274] تایم کاریگەرییەکی گەورەی کردە سەر کلوپەکە و ئەمەش وای کردبوو تەنیا ئەو کتێبانە هەڵبژێردرێن کە ئەگەری سەرکەوتنی بازرگانی و فرۆشتنیان زۆرترە. ستێفان کینگ، تام کلێنسی، مایکڵ کراتیۆن و تێری مەک میلان[275] بوون بە ناسراوترین سیماکانی نێو پێرستی کلوپی کتێبی مانگ. هەژماری کلوپەکانی کتێب هەڵبژاردن بە شێوەیەکی سەیر زیادیان کرد و لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠ تا ١٩٩٨دا نزیکەو سێقات بوونەوە. هەر کتێبێک ئەگەری کڕینی لە لایەن خەڵکەوە بوایە دەچووە نێو پێرستەکانی ئەو کلوپانەوە ـ لە کتێبی چێشتلێنانەوە بگرە بۆ رێنومای هاوسەرێتی و رۆمانی ئەوینداری. ئایدیای سەرەتا و دەسپێکی دانانی کلوپ[ی کتێب هەڵبژاردن] بە تەواوی بە باری پێچەوانەدا شکابوویەوە. کلوپی کتێبی مانگ لە باتی ئەوەی هەوڵی رەنگرێژکردنی حەز و پەسنکردی گشتی[276] بدات هەوڵی دەدا ببێتە ئاوێنەی رەنگدانەوەی ئەو حەز و پەسنکردانە.[277]

بەسەرهاتی کلوپی کتێبی مانگ چیرۆکی بەسەرهاتی کولتووری ئەمریکاییە. جان سیبرۆک، لە نووسەرانی پێشووی گۆڤاری نیۆیۆرکێر، ئەم دیاردەیە بە گۆڕانێکی کولتووری «لە ماڵێکی بچووکەوە بۆ فرۆشگەیەکی گەورە» پێناسە ئەکات. ماڵی بچووک، کە تا چەند دەیە لەمەوپێش بەسەر کولتووری ئەمریکاییدا زاڵ بوو، مێتافۆرێکە[278] بۆ پێوەرە کولتوورییە کۆنەکانی بەکار دەهێنێ، ئەو پێوەرانەی کە لە لایەن ئەو دەستەبژێرانەوە دیاری دەکران کە جەختیان لەسەر چۆنێتی[279] دەکرد. بەڵام لە فرۆشگە گەورە فەرهەنگییەکەی ئەوڕۆدا ئەندێشە و ئایدیای وەک حەز، پێوەر و هیرارشییەت لە مانا خاڵی

---

274. Marketing

٢٧٥ . هەرهەموویان لە ریزی نووسەرانی خەڵکپەسەندی ئەمریکادان. و.ف

276. Public taste

٢٧٧ . ئەم ستراتیژە شکستی خوارد و کلوپی کتێبی مانگ ئێستە هەوڵی گەڕانەوە بۆ شوناسی راستەقینەی خۆی دەدات. کلوپ ستافێکی تازەی بۆ هەڵبژاردنی کتێبەکان دەسنیشان کردووە کە هەندێ نووسەری بە ناوبانگی وەک ئێما کۆییندلێن لە نێو ئەو ستافەدان. ژیانەوەی دووبارە و روو لە گەشەبوونی مۆدێلی کۆن نیشاندەری ئەو راستییەیە کە لانیکەم لە بەستێنی کولتووریدا خەڵک خوازیاری یارمەتی و رێنوێنین.

278. Metaphor
279. Quality

بوونەتەوە. هەموو شتێک پاک بۆتەوە خۆشەویستبوون[٢٨٠] نەبێ، مـاڵی بچووک لە لایەن ئەو کەسانەوە بەڕێوە دەبرا کە فێری پرەنسیپەکان ببوون، بەڵام فرۆشگەی گەورە لە لایەن کەسانێکەوە بەڕێوە دەچێ کە زۆر چاک دەزانن هەر شتێ «هەرا» بنێتەوە لای خەڵک خۆشەویست و پڕبایەخە. سـەمبول و هێمای تەکووزیی[٢٨١] کۆن پیاوانێکی وەک هارۆڵد راس، سەرنووسەری ئەفسانەییی *نیۆیۆرکێر*، بوون بەڵام هێمای تەکـووزیی نـوێ کەسـێکی وەک دەیڤیـد گێفێـنە کە لە لایەنگرانـی مۆسـیقای پـاپە. هەرچەنـد راس رۆشـنبیرێکی کەشـیش خەسـڵەتیش نەبـوو بەڵام بە باشـی لە تێربـوونی کولتـووری[٢٨٢] گەشـتبوو؛ [لە بەرانـبەردا] گێفـێن بە باشـی لە پەسـنکردی جەمـاوەری خەڵـک گەشـتووە. هەروەک چـۆن سـیبرۆکیش ئاماژەی پێ داوە ئەرکی دەستەبژێرە کولتوورییە کۆنەکـان دیـاریکردنی شـتە «بـاش»ەکـان بـوو لەسـەر بنەما و مانای «بەهادار بوون»، بەڵام لە باتیی ئەوان جۆرە دەسـتەبژێرێک سـەریان هەڵـداوە کە کاریـان دیاریکردنی شتە «باش»ەکانە لەسەر بنەمـای «خۆشەویسـتبوون». ئەم گۆڕانکـارییە قـووڵ و بەربـڵاوە کە لەنـاو ژیـاری[٢٨٣] ئـێمەدا رووی داوە لە زۆربەی هەرە زۆری مۆزەخـانە، کتێبخـانە، زانکـۆ، چاپخـانە، گۆڤار، رۆژنامە و کەناڵە تێلەڤیزیۆنییەکاندا رەنگی داوەتەوە.[١٢]

چەند ساڵ لەمەوپێش رۆژنامەی *نیۆیۆرک تایمز* داوای لە دوو بەرپرسیاری بەناوبـانگی مۆزەخانەکـانی ئەمریکا کرد تایبەتمەندی و فاکتەرەکانی مۆزەخانەیەکی زۆرباش لە سـەدەی بیست و یەکدا دەسنیشـان بـکەن. فیلیـپ دۆ مۆنتبێلـۆ، بەڕێـوەبەری ئەفسـانەییی مۆزەخـانەی هـونەری سـێترۆ پـۆلیتەنی شـاری نیۆیۆرک، بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: بەرهەم و ئاسەواری هـونەریی گەورە گەورە، نمایشـدان و پیشـاندانی ژیـرانە و سەرنجڕاکێشــەر، فەرمــانبەرانی دڵســۆز، وەرگرتنــی یــارمەتیی دارایــی بە ئەنــدازەیەک کە یەکپارچەبوون و بێنیازبوون [ی مۆزەخانە] لە بڕیارەکانی بازاڕ گەرەنتی بکـات، دەسـتەیەکی ئەمینـدار کە بە تەواوی بەڵێندەری و بەرپرسایەتیی خۆیـان بپـارێزن، فەرمانبەرانێـک کە لەسـەر ئەو بـاوەڕە بـن کە لە نمایشدانی بەرهەمە هونەرییەکاندا دەبێ رەچـاوی ئۆتـۆریتە و پەسـنکرد بکرێـت، دواجـاریش «بـاوەڕێکی توندوتۆڵ بە گرنگتر بوونی ئەزموونکردنی هونەر لە بەرانبەر ئەزموونکردنی بازاڕی مۆزەخـانەدا». تۆمـاس کێرنز، بەڕێوەبەری مۆدی رۆژی مۆزەخانەی گوگێنهایمی نیۆیـۆرک، پێرسـتێکی تەواو جیـاوازی پێشـکەش کرد. ئەڵبەت لە دەسپێکی پێشنیارەکانیدا بە شێوەیەکی سـەرپێیی ئامـاژەی بە کۆلۆکسـیۆنێکی بەنـرخ» کردبوو، بەڵام پاشان بەم شێوەیە درێـژەی پـێ دا: «بیناسـازییەکی[٢٨٤] زۆربـاش، پێشـانگایەکی بەنـرخ و

280. Popularity
281. Order
282. Quenchingculture
283. Civilization
284. Architecture

تاقانە، پێشانگایەکی بەنرخ و تاقانەی دیکە، دوو ریستۆرانی بە نرخ، دوو سۆپەرمارکێت، ئینتەرنێت و، [هەروەها] دابەزاندنی نرخەکان بە فرۆشتنی بەکۆ لە رێگای تۆڕێکی جیهانییەوە». ئەمە دیمەنێکی ئاشکرایە لە جیاوازییەکانی نێوان تەکووزیی کۆن و تەکووزیی نوێ.

کێرنز لە نێو بەرەی نوێی بەڕێوەبەرانی مۆزەخانەکاندا سیمایەکی دیار و ناسراوە، ئەم نەوەیە لە هەر شتێ کە سەرنجڕاکێش بێ و جەماوەری خەڵک راپێچی هۆڵی مۆزەخانەکان بکات، کەڵک وەردەگرن. کێرنز بەم دواییانە لە هۆتێل و گازینۆی ڤێنتیان لە شەقامی لاس ڤێگاس لقێک لە مۆزەخانەی گوگێنهایمی کردۆتەوە. ئەم جۆرە کارانە کۆمەڵێک فێڵ و تەڵەکەی پڕیاق و بریقن و زۆرجار خودی هونەرەکەیش دەخەنە ژێر سێبەری خۆیانەوە. مەبەست لەم کارانە نمایشدانی بەرهەمە هونەرییەکان نییە بەڵکوو مەبەست نمایشدانی خودی مۆزەخانەکەیە. ئەگەر خەڵک سەردانی مۆزەخانە بکەن رەنگە سەردانێکی یەکێک یان هەردوو «سۆپەرمارکێت»ی مۆزەخانەکەیش بکەن. وەک چۆن جێد پێرل، رەخنەگری هونەریی گۆڤاری *نیو ریپابلیک*، دەربارەی بەناوبانگترین پرۆژەی کێرنز کە بنیای مۆزەخانەیەکی سەرسووڕهێنەرە لە ئیسپانیادا و فرانک جێری نەخشەی بۆ داڕشتووە، نووسیویەتی، «کەس بۆ بینینی بەرهەمە هونەرییەکان سەردانی مۆزەخانەی گوگێنهایمی بیلبائۆ ناکات، لە پڕ بیرتان دەکەوێتەوە مادام لەوێن با سەیرێکی بەرهەمە هونەرییە نوێیەکانیش بکەن، رێک وەک ئەوەی بیری چوونە ئاودەس یان خواردنی حەبی ڤیتامینتان بکەوێتەوە». بەرهەمە هونەرییەکانی ئەم جۆرە مۆزەخانە لە رووی تایبەتمەندیشەوە جیاوازن. کێرنز پیشانگایەکی تایبەتی بۆ نمایشدانی «هونەری ماتۆڕ سکلێت» و جلوبەرگەکانی جۆرجۆ ئارمێنی کردۆتەوە. نمایشدانی بەرهەمی مۆدێرن و بازرگانی لە بەشێکی پێشانگای هونەری مۆدێرندا کارێکی مومکین و شیاوە، بەڵام پێرل بە جوانی ئەو بابەتەی شی کردۆتەوە کە ئەم جۆرە مۆزەخانانە هەوڵی پێناسەکردنی ژانرێک[٢٨٥] یان قۆناغێکی هونەرییان نەداوە و نایدەن، بەڵکوو کاریان تەنیاو تەنیا نمایشدانی ئەو شتانەیە کە هەر لە کۆنەوە لە نێو کولتوور و فۆلکلۆری خەڵکدا سەمبولگەلێکی خۆشەویست و ناسراو بوون: «ئەوان خولقێنەری پەسنکرد[٢٨٦][ی تازە] نین؛ بەڵکوو هەر پەسنکردێک لەوڕۆدا باو بێت ئەوانیش قبووڵی دەکەن و پێی لەسەر دادەگرن. ئەوان هیچ ئەندێشەیەک پێشکەش ناکەن کە رەنگە دواتر لە لایەن گرافیستەکان یان بەرهەمهێنەرانی کەناڵی MTVیەوە لە بەردەم هەژمارێکی زیاتری خەڵکدا نمایش بکرێ (جا رەنگە ببێتە ئەندێشەیەکی خۆشەویست و رەنگە نەشبێت)؛ ئەوان تەنیا رەنگدانەوە و زایەڵەی ئەو کۆمەڵە شتانەن کە هەر لە

---

285. Genre
286. Taste

کۆنەوە لە نێو کولتووردا پێناسە کراون، پیرۆزبایی لە خەڵکیش دەکەن کە ئاگاداری ئەو شتانە هەن».[١٣] بە کورتی ئەوان پێشەنگ نین بەڵکوو شوێنکەوتوون.

شتێکی تر. کۆمپانیای BMW کە زیاترین ڕێژەی ماتۆڕی لە پێشانگای ماتۆڕسیکلێتدا دانابوو خەرجی بەڕێوەبردنی پێشانگاکەشی گرتە ئەستۆ. کەچی سەرەڕای ئەمەش پێشانگای [جلوبەرگەکانی] ئارمێنی هێشتا هەر هەشت مانگ دوای ئەوە کرایەوە کە خودی ئارمێنی بەڵێنیدا ١٥ ملیۆن دۆلار بە گوگێنهایم بدات. هونەر و بازرگانی هەمیشە پێکەوە ژیاون، بەڵام ئەوەی ئێستا دەیبینین بە بازرگانیبوونی هونەرە و جیاوازە لەوانی تر، چونکوو هەم پۆپۆلیستییە و هەم بەکارهێنەرییانەیە.[٢٨٧] بە درێژایی چەندین سەدە لایەنگرانی هونەر ئەو بەرهەمانەیان کۆ دەکردەوە کە خۆشیان دەویستن یان پسپۆڕان[ی هونەر] فێریان کردبوون کە خۆشیان بوێن. بە دەگمەن ڕێ بکەوتایە بیریان لەوە بکردایەتەوە کە ئایا کۆلێکسیۆنەکەیان لای خەڵک خۆشەویستیە یا خود خۆشەویست نییە، [چونکوو کۆکردنەوەی بەرهەمە هونەرییەکان] بۆ ئەوان بەشێک بوو لە حەز و چێژی دەوڵەمەندی. بەڵام پشتیوانییەداراییەکانی ئەمڕۆی کۆمپانیاکان شتێکی تەواو جیاوازە، پشتیوانیکردنی کۆمپانیاکان لە هونەر بەشێکە لە ستراتیژی بازرگانییان. جەیمز تویچێڵ، توێژەر و کۆمەڵناسی داهێنەری ئەمریکایی لە بواری بازاڕدۆزینەوەدا[٢٨٨]، پێی وایە دواجار کۆمپانیاکان زۆربەی کات «ڕێسا و پرەنسیپی ناهونەری بەکار دەهێنن، ئەمەش دەبێتە هۆی کردنەوەی پێشانگاگەلێ کە یان لە ژێر کاریگەریی بۆچوونی زاڵی سیاسیدان یان لانیکەم ناتوانن هیچ باسوخواسێک بورووژێنن». تویچێڵ لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەوەی لەوێدا بۆ نمایشکردن و پیشاندان دەشێت بە زۆری ئەو شتانەن کە دەرفەت و توانای وەرگرتنی پشتیوانیی کۆمپانیاکانیان هەیە. مۆزەخانەی گوگێنهایم بە ناچار وازی لە پرۆژەی بەڕێوەبردنی پێشانگایەک لەژێر ناوی «پیکاسۆ و سەردەمی ئاسن»دا هێنا، چونکوو کەس نەیدەویست خۆ لە بابەتێکی سواو و دێمۆدەی وەک ئاسنەوە بگلێنێ. کۆمپانیای BMW ئامادە نەبوو پشتیوانی لە پێشانگای «شاکارەکانی مۆنیخ» بکات، چونکوو «مۆنیخ زۆر سێکسی نییە». پێشانگای بەرهەمەکانی هونەرمەندی داهێنەر و کلاسیستی سەدەی حەڤدە واتە گیدۆ رینۆ کەنسێل کرایەوە و بەڕێوە نەچوو، چونکوو کەس نەبوو سوودێکی بازرگانی و مادیی تێدا ببینێتەوە. ئەگەر پشتیوانان و لایەنگرانی رابردووی دونیای هونەریش ئاوەها هەڵوێستێکیان بایە ڕەنگ بوو مێژووی هونەر زۆر جیاواز لەمەی ئێستا بوایە.

287. Consumerism
288. Marketing

گریمان «سێکسیبوون» و «هەرانانەوە» وەک تۆژەنبوون و داهێنان هەڵگری تایبەتمەندیگەلێکی جەوهەرین، بێگومان دەتوانین لای خۆمان ئاوەها بیر بکەینەوە، بەڵام لە راستیدا ئەم چەمکانە تەنیاوتەنیا هاوواتای دەستەواژەی «خۆشەویستبوون» دێنەوە کە ئەو دەستەواژەیەش رێک بە واتای سوود و بەرژەوەندی دێتەوە. ئەم رەوتە کولتوورییە پرسی گرنگ و پڕ بایەخی پێوەندیی نێوان دیموکراتیزاسیۆن و بە بازاڕیکردنمان[289] بۆ روون دەکاتەوە. لەوڕۆدا زیاتر خەڵک وەک بەکارهێنەر[290] لەقەڵەم دەدرێن و خەڵکیش هەر لە رێگای ئەم پێناسەیەوە[291] دەسەڵاتی خۆیان دەخەنە گەڕ، هەر بۆیە بە بازاڕیکردن بۆتە هاوڕێی گیانیبەگیانیی دیموکراتیزاسیۆن. ئەم دوو هێزە پێکەوە شەپۆلی دیموکراتیک بەرەو پێشەوە دەبەن. سروشتی دوولایەنەی[292] دیموکراتیزاسیۆن ـ واتە بەخشینی هاوکاتی دەسەڵات بە هاووڵاتییان و بەکارهێنەران ـ وەڵامی ئەو پرسیارەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە بۆچی ئەوانەی دەوێرن ئەم ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتییە بخەنە بەر رەخنەوە هێند کەمهەژمار و دەگمەنن. بۆ چەپگەراکان ئەستەمە کولتووری سەرجەم خەڵک رەت بکەنەوە و راستگەراکانیش ناتوانن دان بەوەدا بنێن کە دەشێ سەرمایەداری ئاکامی خراپیشی لێ بکەوێتەوە، ئەوان تەنانەت لە ئاست بەستێنی کولتووریشدا ئەم شتەیان پێ قبووڵ ناکرێت. هیچکامیان پێیان خۆش نییە ئەو راستییە قبووڵ بکەن کە ئەگەر خەڵک رێنوێنی نەکرێن یان سەرچاوەی ئۆتۆریتەیان لە بەردەستدا نەبێ، رەنگە شتێکی خراپ هەڵبژێرن. ئەڵبەت پێداویستیی رێنوێنیکردن تەنیا بریتی نییە لە حەزکردنی خەڵک لە شوێنکەوتن و گوێشلکردن، بەڵکوو هاوکات پێویستە کەسێکیش هەبێ کە حەز لە سەرۆکایەتیکردن بکات.

## ئەشرافییەتی[293] ئەمریکایی

بیل لیۆنارد، بەڕێوەبەری بەشی هەواڵی کەناڵی CBS،ساڵی ١٩٦٧ پێشنیارێکی خستە بەردەم بەرهەمهێنەرێکی لاو بە ناوی دان هێویت و رایگەیاند دەیانەوێ پرۆگرامێکی دەنگوباسی تێلەڤیزیۆنی لە ژێر ناوی *شەست دەقەدا* بکەنەوە. هێویت داوای لێ کرد ئامانجی ئەم پرۆگرامەی بۆ روون بکاتەوە. لیۆنارد چاوەڕوانییەکی سادە و ساکاری هەبوو: «سەربەرزمان بکە». ئەم بەرنامە ئەفسانەییە تا ئێستایش درێژەی هەیە و هەر خودی هێویت بەرهەمهێنەریەتی، ئەو دوای گێڕانەوەی ئەو دیالۆگەی

289. Marketization
290. Consumer
291. Identity
292. Double
293. Aristocracy

نێوانیـان وتـی وا دەزانـم ئەمە دواهەمـین جارێـک بـوو کەسـێک لە تێلەڤیزیۆنـدا بە هاوکـارەکەی بڵـێ سەربەرزمان بکە».

بە دەیان چیرۆکی هاوشێوەی ئەم چیرۆکەمـان دەربـارەی پیشـەکانیتری وەک رۆژنـامەوانی، چـاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب، پارێزەری، ژمێریاری و پزیشکیش بیستووە. لە راسـتیدا ئەم چیرۆکـانە زیـاتر لەوەی تەنیا کۆمەڵە چیرۆکێکی نۆستالۆژیکی نەوەی ئەوسا بێـت نیشـاندەری ئـاڵوگۆڕی قـووڵ و گرنگـی رۆڵـی دەسـتەبژێرانە لە کۆمەڵگـای ئەمریکاییـدا. بەرپرسـیارانی چـاپ و بڵاوکـردنەوەی کتێـب، بەرهەمهێنەرانـی دەنگوباسـی تێلەڤیزیـۆنی، بەڕێـوەبەرانی دامەزراوەکـانی بەسـتێنی مـاف و یاسـا[٢٩٤] و سەرپەرشـتیارانی نەخۆشخانەکان، تا سی سـاڵ لەمەوپـێش کـار و پیشـەکانی خۆیـان دابەش کردبـوو بەسـەر دوو کەرتـدا، بەشێکیان تەرخان کردبوو بۆ سوود و بەرژەوەندی و بەشەکەی تریش بۆ پێشکەشـکردنی خزمەتگـوزارییە کۆمەڵایەتییەکـان. بـۆ وێـنە دەرهێنەرانـی تێلەڤیزیـۆن بە تەواوی دەیـانزانی لە بەرانـبەر کەڵکـوەرگرتن لە کەرەستە و ئیمکانـاتە گشـتییەکاندا[٢٩٥] پێویسـتە بەرنـامەی بەنـرخ و پڕپـایەخ بەرهەم بهێـنن. ئەم جـۆرە کەسانە زیـاتر لەوەی خۆیـان بە بازرگـان و مـامەڵەچی بـزانن خۆیـان بە کەسـێکی پسـپۆڕ و پرۆفیشـناڵ دەزانی. بە واتای رۆشنبیری بریتانی واتە ئارـئێچـتاونێی، «ئەمانە کەسانێک بوون کە بەپێی ئەو یاسـا و پرەنسیپانە دەجووڵانەوە کە بە مەبەستی دابەزاندنی کۆمەڵە پێوەرێکی دیاریکراو دارێژرابـوون کە هاوکـات هەم ئاسـتی پاراسـتنی ئەنـدامانی گـروپ بەرز بکـاتەوە و هەمـیش بتـوانێ خزمەتگـوزارییەکی باشـتر پێشـکەش بە خەڵـک بکـات» .[١٤] بە درێژاییـی زۆربەی سـاڵانی سـەدەی بیسـتەم کەسـانی پرۆفیشـناڵ جـۆرە ئەشـرافییەتێکی مۆدێرنیـان پێـک هێنـابوو، ئەوان لە پـێگە و جـێگەی خۆیـان دڵنیـا بـوون و دەیانویست خۆشگوزەرانی و ئاسوودەیی[ی هاوولاتییـان] و بەرژەوەنـدییە گەورەترەکـانی وڵات دەسـتەبەر بکەن. ئەم جۆرە کەسـانە و هەروەهـا هـاوولاتییە پێشـەنگ و ئاوانگاردەکـانی تـر ئەرک و بەرپرسـایەتییە کـۆمەڵایەتییە گەورەترەکانیـان دەگـرتە ئەسـتۆی خۆیـانەوە. زۆربەی مۆزەخانەکـان، ئۆرکێسـترا سەمفۆنیکەکان، کۆمپانیاکانی ئۆپێرا، پارکە گشـتییەکان و کتێبخانەکـانی شـار و شـارۆچکەکانی ئـەمریکا لە لایەن دەوڵەتەوە نەدەکـرانەوە، بەڵکـوو لە لایەن ئەم جـۆرە هـۆگر و دڵسـۆزانەی کۆمەڵگـاوە ئـاوا دەکـران. ئەم کەسـانە کەڵـکەڵەی سـەروەت و سـامان یـاکوو پـێگە و جێگەیـان نەبـوو و هەرچەنـد لەو کـارانەدا بەرژەوەنـدیی مادیشـیان بەردەکەوت بەڵام لە ئاسـت شـار یـان وڵاتەکەی خۆیانـدا خـاوەن تێڕوانینێکـی دووربینـانە بـوون. سـەرەڕای ئەوەی ئاوەهـا دونیـایەک دەسـتەبژێرگەرایی[٢٩٦] و پـوەن و

294. Legalinstitutes
295. General abilities
296. Elitism

ئیمتیازی چینایەتیشی[٢٩٧] لێ دەکەوتەوە، بەڵام هاوکات دیموکراسیی ئەمریکاییش بەرژەوەندیی تەواو و گەورەی لە خزمەتگوزارییەکانی ئەم دەستەبژێرە دڵسۆز و خێرخوازانە وەردەگرت.

یەک لە توخمە هەرەدیار و بەرجەستەکانی کۆمەڵگای ئەنگلۆ ـ ئەمریکایی بریتی بووە لەوەی کە هەمیشە کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان خراوەتە ئەستۆی دەستەبژێران و ڕێکخراوە نادەوڵەتی و تایبەتییەکانەوە.[٢٩٨] ئەم دیاردەیە دیاردەیەکی ڕۆتین و باو نییە؛ زۆربەی وڵاتان مۆدێلی فەرەنسی ـ ئەوروپاییان هەڵبژاردووە کە تیایدا بەرپرسایەتیی هەر هەموو ڕەهەند و لایەنەکانی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەکەوێتە ئەستۆی ڕێکخراوە و کاربەدەستانی دەوڵەتەوە. ئەگەر ئاوڕێک لە ڕێگا و میتۆدە جۆراوجۆرەکانی ڕێکخستنی بازاڕە داراییەکانی ئەمریکا بدەینەوە ـ بورسی نیویۆرک و بانکە ناوەندییە ئەیالەتییەکان ـ لەو ڕاستییە دەگەین کە زۆربەی ئەم ڕێکخراوانە لە سەرەتادا هەرچەند ڕێکخراوەی تایبەتی و نادەوڵەتی بوون بەڵام هاوکات هەڵگری ئەرک و فانکشێنی کۆمەڵایەتیش بوون. لە نموونەیەکی بچووکتردا بەڕێوەبەرایەتیی هەردوو پارکە گەورەکەی مەنهەتەن واتە پارکی ناوەندی و پارکی ڕیڤێرساید لە دەستی گروپگەلێکی نیوە دەوڵەتی و نیوە تایبەتیدایە. بەڵام وێناکردنی بەڕێوەبردنی پارکەکانی پاریس لە لایەن هاووڵاتییانی کەرتی تایبەتەوە[٢٩٩] وێناکردنێکی نەکردە و مەحاڵە. یان ئاوڕێک بدەینەوە لە ئەنجومەنی پارێزەرانی یاساییی ئەمریکا و ئەنجومەنی پزیشکانی ئەمریکا، ئەم گروپە تایبەتییانە[٣٠٠] بە کەڵکوەرگرتن لەو ئۆتۆریتەی دەوڵەت پێی بەخشیون کاروبارەکانی خۆیان بەڕێوە دەبەن.

ئەم جۆرە بەشداریکردنە بە قووڵی بە ناخ و هەناوی مێژووی ئەنگلۆ ـ ئەمریکاییدا ڕۆچووە و خاوەن رابردوویەکی دیار و بەرجەستەیە. دەسپێکی ئاوەها بەشداریکردنێک دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەرهەڵدانی ئەشرافییەتی بریتانی، وەک چۆن لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا بینیمان ئەشرافە ئینگلیزییەکان هێند پێشکەوتنیان بە خۆوە بینی کە سەرەتا لە ناوچەکانی دەوروبەری خۆیاندا و پاشان لە دەرەوەی ئەو ناوچانەشدا کاروبارە دەوڵەتییەکانیان ڕادەپەڕاند. دواتر ئەم بەشداریکردنە گواسترایەوە بۆ کۆچبەرنشینەکان و دوای ئەوەش گواسترایەوە بۆ کۆماری ئەمریکا، واتە بۆ ئەو شوێنەی کە پیاوانی دەوڵەمەند بە بێ ئەوەی چاوەڕێی ئەوە بن کە سیاسەت ببێتە پێشە و کاریان، لە سیاسەت و [کاروباری] دەوڵەتدا بەشدارییان دەکرد. جۆرج واشینگتۆن دوای دوو خولی سەرکۆماری گەڕایەوە سەر مەزراکەی و [لە هەمان کاتدا] هەر ئەو کارەی ئەنجامدا کە ئاوەها کەسانێ ئەنجامی دەدەن. ئەو لە

297. Classprivileges
298. Privateinstitutes
299. Privatesector
300. Privategroups

دەستەبژێرانی زەمیداری ڤیرجینیا بوو، ئەوەی لەم جۆرە کەسانە چاوەڕوان دەکرا ئەوە بوو کە بەبێ هیچ چەشنە چاوەڕوانی و مەبەستێکی مادی لە هەندێ لە خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکاندا بەشداری بکەن، وەک سەرپەرشتیاری کاروباری ئیداریی کەلیسا، ئەمیندار و پاسەوانی ئاشتی، فەرماندەی هێزی نیزامیی ناوچەکە و نوێنەری پەرلەمانی ناوچەیی. پیاوانێکی وەک تۆماس جێفێرسۆن، جەیمز مەدیسۆن، جەیمز مۆنرۆ، ویلیام هێنری هەریسۆن، جان تایلۆر، بێنجامین هەریسۆن و تیۆدۆر و فرانکلین رۆزڤێلت ئەم نەریتەیان درێژە پێدا. رەنگە خاڵی گرنگتر ئەوە بێت کە هەژمارێکی بەرچاو و فراوان لە چینی ئەشرافی ئەمریکایی کە بە بەراورد لەگەڵ ئەم سیما ئەفسانەییانەدا پلە و پایەیەکی خوارتریشیان هەبوو، لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە خزمەتگوزارییە دەوڵەتییەکان بەشێکە لە ژیانیان و بە درێژاییی تەمەنی خۆیان چەندین و چەند جار هەم لە ئاستە باڵا و بەرزەکان و هەم لە ئاستە خوار و نزمەکاندا (ناوچەیی) بەشدارییان لە کاروباری دەوڵەتیدا دەکرد. هەندێکیان دەوڵەمەند بوون بەڵام زۆربەیان پارێزەر یاخود فەرمانبەرێکی پایەبەرزی بانک بوون. لە بەرانبەردا کاروباری دەوڵەتی لە ئەورووپای کیشوەریدا[301] (واتە جیا لە بریتانیا) وەک پیشەیەکی لێ هات کە فەرمانبەرە پرۆفیشناڵەکانی دەوڵەت بەرزترین پۆستەکانیان بەڕێوە دەبرد. بۆ وێنە لە فەرەنسادا تێکەڵبوونی کاربەدەستێکی خۆشناوی دەوڵەتی بە کاروباری تایبەتی و نادەوڵەتی شتێکی ئاساییە، بەڵام کەس نەیبیستووە بازرگانێک لە نێو دەوڵەتدا دابمەزرێت.

تاکە پرۆفیشناڵەکان هەمیشە لە ئەمریکادا جێگایەکی تایبەتییان بووە. ئەلێکساندێر هەمیلتۆن لە سەردەمی دامەزرانی ئەمریکادا ئەم شتەی پێشبینی کردبوو و لە *فێدراڵیست پاپێرز*دا ئەم بۆچوونەی تۆمارکرد و وتی کەشیشەکان، پارێزەران و مامۆستایان[ی زانکۆ] بێلایەن دەمێننەوە، هەر بۆیە دەوری «داوەرێکی باڵا» لە نێوان پیشەسازییەکان و بەرەولایەنە جۆراوجۆرەکاندا دەگرنە ئەستۆ. نەفسی ئامادەبوونی رووتی ئەوان دەتوانێ بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگا دەستەبەر بکات. بەڵام کار و پیشەکان ئێستە لە رابردووی خۆیان دوور کەوتوونەتەوە و لە ژێر زەختی هێرشێکی قورسدا چەماونەتەوە، لە جەمسەرێکی ئەم هێرشەدا رکابەریی روو لە پەرەی بازاڕ وەستاوە و لەو جەمسەرەکەی دیکەشیدا دەوڵەتێک وەستاوە کە بەشێکی زۆر لە ئەرک و فانکشێنی کار و پیشە تایبەتییەکانیشی خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. ماکس ڤێبێر ساڵی ١٩٠٥ و لە کتێبی *ئەخلاقی پرۆتستانی و رۆحی سەرمایەداری*دا نووسیویەتی: «چینی ئەشراف گێچەڵی بۆرۆکراسییان لە کۆڵ بریتانیا خستەوە، [بەڵام] ئەم گێچەڵە قەدەرێک بوو بە ناوچاوانی وڵاتانی دیکەی ئەورووپاوە و هەر هەموویانی گرتەوە». ئەم جیاوازییەی نێوان دونیای ئەنگلۆ ـ ئەمریکایی و وڵاتانی دیکەی ئەورووپا ئێستا گەلێ کەمڕەنگتر بۆتەوە.

---

301. ContinentalEurope

لەم چـل سـاڵەی رابـردوودا دەوڵەت زۆربەی ئەرکە رێکـخەری[302] و رەخنەییەکـانی[303] رێکخـراوە پرۆفیشـناڵەکان[304] و هەروەهـا زۆربەی دەسـەڵاتە هەرەگەورەکـانی کۆمپانیـا تایبەتییەکـان[305]، رێکخـراوە خێرخوازە گشتییەکان و تاکەکانی گرتۆتە دەست خۆی. [لە بیرمان بێ] ئەو لایەنانە ئەم دەسـەڵاتانەیان لە ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگادا بە کار دەهێنا. ئەنـدرۆ کـارێنگی بـاوەرێکی قـووڵی بە فێرکـاری هەبـوو، هەر بۆیە لە پێکهێنانی سیستەمی کتێبخانە گشتییەکانی ئەمریکادا دەورێکی باشی گێڕا. ئێسـتە پێشـنیار و گەڵاڵەی لەم جۆرە لە نێو زەلکاوی کاغەزبازی و بۆرۆکراسیی ئیداریدا قەتیس دەمێنـێ، چونکـوو دەبـێ کۆی پرۆسەکە لە رێگـای ئیـدارییەوە بەڕێـوە ببرێـت. لە زۆر لایەنەوە گەورە بـوونەوەی دەوڵەت سـوودی فراوانی لێ کەوتۆتەوە، چونکوو خزمەتگوزارییەکی زیـاتری پێشـکەش بە هەژمـارێکی زیـاتری هاووڵاتییـان کـردووە، بەڵام لە هەمـان کاتـدا بـۆتە هـۆی ئەوەی ئـەمریکاییەکان دەوڵەت وەک کەرەسـتەیەکی بـاش و گونجـاو بـۆ کاروبـاری کـۆمەڵایەتیش لەقەڵەم بـدەن. خەڵـک وادەزانــن بە دانــی پیتــاک ئەرکە کۆمەڵایەتییەکـانی خۆیـان جێبەجـێ کـردووە و ئیـدی پێویسـت ناکـا خۆیـان گیـرۆدەی خزمەتگـوزارییە کۆمەڵایەتییەکـان بـکەن. ئەم جـۆرە بۆچـوونە لە ئەوروپـادا گەلـێ بەربڵاوتـرە، ئەوروپاییەکـان سـەرەڕای ئەوەی سەروەت و سامانیان وەک خەڵکی ئەمریکا دێتەوە کەچی پارە و کاتێکی زۆر کەمتر بـۆ رێکخـراوە خێرخوازە تایبەتییەکان تەرخان دەکەن. تەنـانەت لە ئەمریکایشـدا تێڕوانینـی خەڵـک بـۆ خزمەتگـوزارییە کۆمەڵایەتییە راستەقینەکان ـ واتە دەوڵەتی خۆماڵی یان تەنـانەت شـۆرا خۆماڵییەکـان ـ رۆژ لە دوای رۆژ زیـاتر گـۆڕانی بەسـەردا دێـت و وەک بەسـتێنێک چـاوی لـێ دەکـرێ کە تـایبەتە بە سیاسـەتمەدارانی پرۆفیشـناڵ نەک هاووڵاتییـانی خوازیـار. گـۆڕدرانی پێوەنـدییەکانی نێـوان دەسـتەبژێران و کۆمەڵگـا کاریگەریی لەسەر کـارامەیی و سـەرکەوتنی دەوڵەتـیش دانـاوە. بەپێـی راپـۆرتی گەورەتـرین کۆلیژەکـانی یاسـا و بازرگـانی، لە سـی سـاڵی رابـردوودا هەژمـاری ئەو خوێنـدەوارە بەرجەسـتانەی خوازیـاری بەشداریکردن لە خزمەتگوزارییە دەوڵەتییەکاندان، رۆژ لە دوای رۆژ و بەردەوام رووی لە کزیی داوە.

رەنگە پیشەی پـارێزەری باشـترین نمـوونە بێـت بـۆ ئەو پیشـە تایبەتییـانەی[306] کە هەمیشـە ئەرکێکـی کۆمەڵایەتیشیان بەسەرشانەوە بووە، تەنانەت لەمڕۆیشدا پارێزەر وەک «ئەفسەرێکی دادگا» لەقەڵەم دەدرێت. ئاوەها پێناسەکردنێک دەربڕینێکی پڕباق و بریق نییە، بەڵکوو رێک ئاماژەیە بۆ ئەو حەقیقەتەی کە پارێزەران لە ئاست پارێزگـاریکردن لە سیسـتەمی یاسـادا کۆمەڵێـک ئەرک و بەرپرسـایەتییان لەسـەر شـانە. دەوڵەت

302. Regulatory functions
303. Criticalfunctions
304. Professionalinstitutes
305. Privatecompanys
306. Privateemployment

لەسەری فەرز کردوون لە بەرانبەر مۆڵەتنامەی پارێزەریدا ڕەچاوی کۆمەڵە پرەنسیپێکی کاریی[٣٠٧] دیاریکراو بکەن و کۆمەڵە ئەرکێکی دیاریکراویش بەڕێوە بەرن. بەڵام هاوکات خودی ئەو پیشەیەش کۆمەڵێک مەرج و ئەرکی زۆر زۆرتری بۆ ئەندامەکانی دیاری کردووە و داوایان لێ دەکا هاوکات لەگەڵ پرەنسیپە یاساییەکاندا[٣٠٨] ڕەچاوی پرەنسیپە ئەخلاقییەکانیش[٣٠٩] بکەن. مەبەست لە داڕشتنی پرەنسیپەکانی هەڵسوکەوتی کاری و پیشەیی کە لە لایەن هەندێ ڕێکخراوی وەک «ئەنجومەنی پارێزەرانی ئەمریکا»وە بەڕێوە دەبرێ، ئەوە بوو کە کۆمەڵێک لە یاسا ناوخۆییەکان بەسەر پارێزەراندا فەرز بکرێ، ئەم پرەنسیپانە پارێزەرانی دەکردە کەسانێکی پرۆفیشناڵی بەڕێز و باوەڕپێکراو و نەیدەهێشت ببنە کەسانێکی ساختەچی و درۆزن. پارێزەران هەڵگری ڕۆڵێکی مێژوویی بوون و دەوری ڕاوێژکار یان ڕاوێژکاری باڵایان بۆ موشتەرییەکانی خۆیان دەگێڕا و بەرژەوەندییە درێژخایەنەکانی ئەوانیان لەبەرچاو دەگرت. ئەم کارە زۆر جار بە مانای ئەوە دەهاتەوە کە پێچەوانەی بەرژەوەندیی خۆیان داوا لە موشتەرییەکان بکەن خۆیان تووشی داواکاریی یاسایی یان کاروباری یاساییی درێژخایەن نەکەن، ئەمە لە حاڵێکدا بوو کە ئەگەر موشتەرییەکان ئاوەها کارگەلێکیان ئەنجام دابا بەرژەوەندی و سوودی فراوانی بۆ پارێزەران بەدواوە دەبوو. ئێلیهۆ ڕۆت، لە بەرپرسانی ئەنجومەنی پارێزەرانی نیۆیۆرک کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بوو بە وەزیری دەرەوە و وەزیری بەرگریی ئەمریکا و هەروەها سێناتۆری نیۆیۆرک، سەردەمانێک دەیوت «نیوەی ئەرکی سەرشانی پارێزەرێکی بەڕێز ئەوەیە بە موشتەرییەکەی بڵێت تۆ کابرایەکی گەمژەیت و دەبێ واز بهێنی».

پارێزەران لە کۆمەڵگای ئەمریکادا جێگایەکی بێوێنەیان هەبوو.[١٥] لە وڵاتێکدا کە ئەشرافی زەمینداری نەبوو پارێزەران ببوونە دەستەبژێرانی خاوەن ئیمتیاز بەڵام خێرخواز. ئەوان لە هەموو شار و شارۆچکەکانی ئەمریکادا هاووڵاتییەکی پێشەنگ بوون کە یارمەتییان بە دروستکردنی مۆزەخانە و نەخۆشخانەکان دەدا، دامەزراوە مەدەنییەکانیان دادەمەزراند و چەندین جار لە هەموو ئاستەکاندا بەشدارییان لە خزمەتگوزارییە دەوڵەتییەکاندا دەکرد. بۆ وێنە ئاوڕێک بدەنەوە لە جەیمز سی کارتێر کە لە دوا ساڵەکانی سەدەی نۆزدەدا یەکێک بوو لە ناسراوترین پارێزەرانی نیۆیۆرک؛ ئەو لە ڕۆنانی ئەنجومەنی پارێزەرانی نیۆیۆرکدا خاوەن ڕۆڵ بوو و لە [سەرجەم] بزاڤە ریفۆرمخوازەکانی شار و ئەیالەتی نیۆیۆرکیشدا دەورێکی زۆر گرنگ و کاریگەری هەبوو کە دەتوانین ئاماژە بدەینە هەندێ لەو بزاڤانە، وەک کۆمیسیۆنی تیلدەن[٣١٠]، کۆمیتەی بەگژاچوونەوەی گەندەڵیی سیاسی، «سەندیکای نەتەوەییی

---

307. Vocationalstandards
308. Legalstandards
309. Moralstandards

٣١٠ . ئەم کۆمیسیۆنە بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی نێوان دیموکراتەکان و کۆماریخوازان لەسەر هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماریی ١٨٧٦ دامەزرا. سەرەڕای ئەوەی کاندیدای دیموکراتەکان واتە ساموێل تیلدێن

شارەوانییەکان»، «سەندیکای هاووڵاتییان»، «کلوپی شار» و «کلوپی دەوڵەتی باش». بە واتایەکیتر ژیانی دەوڵەتیی کارتێر بەشێکی هەرە گەورەی کۆی ژیانی کاریی ئەوی داگیر کردبوو. کارتێر نموونەیەکی تاقانە نەبوو و لە نیۆیۆرک و هەرهەموو ئەمریکادا بە سەدان کەسی وەک ئەومان هەبوو. هێنری ستیمسۆن کە یەکێک بوو لەو پارێزەرانەی لە ژێردەستی رۆتدا پەروەردە کرابوون و لە کابینەکانی تیۆدۆر و فرانکلین رۆزڤێلتدا وەزیری بەرگری و لە کابینەی هێربێرت هۆڤێریشدا وەزیری دەرەوە بوو، لە بیرەوەرییەکانیدا وتوویەتی: «پارێزەری ئەمریکایی دەبێ خۆی بە فەرمانبەرێکی زاتی و ڤایرچواڵی[311] دەوڵەتەکەی بزانێ... ئەگەر بێت و لە سەردەمێکدا ئەم نەریتە کاڵ بێتەوە و ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزەران تەنیا و تەنیا لە خزمەت کار و کەسابەتدا بن، بێگومان دەشێت داهاتووی ئازادییەکان داهاتوویەکی لێڵ و تاریک بێت». ئەم پێوەندییەی ستیمسۆن لە نێوان پارێزەران و ئازادیدا دایناوە پێوەندییەکی خۆڕایی و بێبنەما نییە. ئەوکات کە تۆکڤیل لە دەربڕینە بەناوبانگەکەیدا رایگەیاند کە دەتوانین ئەشرافییەتی ئەمریکا لە «لە ئەنجومەنی پارێزەران یان لە نێو دادگاکاندا» بدۆزینەوە، تەنیا مەبەستی ئەوە نەبوو کە لە ئەمریکادا پارێزەران دەسەڵاتی یەکەمن و لە سەری سەرەوەدان. تۆکڤیل پێی وابوو گەورەترین مەترسیی سەر ئەمریکا مەترسیی «دیکتاتۆریی زۆرینە»یە. ئەم وڵاتە وەک وڵاتانی ئەوروپایی خاوەن پێکهاتێکی کۆمەڵایەتی نەبوو، تۆکڤیل لەوە دەترسا کە نەبوونی چینی ئەشراف کە دەتوانێ رۆڵی سەقامگیرکەرێکی کۆمەڵایەتی[312] بگێڕێ، ئەمریکا بکاتە قوربانیی دەستی دیماگۆژەکان و پۆپۆلیستەکان و هێزە نالیبرالییەکانیتر. بە رای تۆکڤیل پارێزەزان ئەیانتوانی دەقاودەق رۆڵی چینی ئەشراف بگێڕن، ئەویش وەک هەمیلتۆن لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە پارێزەران قەرزداری کەس نین و دەتوانن چاودێر و پاسەوانی بەرژەوەندییە گشتییەکان[313] بن. ئەو نووسیویەتی پارێزەران «شێوازێک لە وەڵامدەربوونی کۆمەڵایەتی دەئافرێنن کە یارمەتیمان دەدات دەستکەوتەکانی دیموکراسی بپارێزین و هاوکات ئیجازە بە خۆ دەرخستنی خراپە ناکۆتا و نەبڕاوەکانیشی نەدەین».

ئەم دیمەنە تا رادەیەک دیمەنێکی ئایدیالە، بەڵام تا سی ساڵ لەمەوپێش هەر ئەم دیمەنە کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر کردار و هەڵسوکەوتی زۆربەی پارێزەرانی ئەمریکا بەجێ دەهێشت. نووسەرێک بە ناوی مایکڵ لۆییس کە باوکی لە نیۆئۆرلیاندا نووسینگەیەکی یاسایی هەبوو، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا سەبارەت بە هاوکارانی باوکی، نووسیویەتی: «ژیانی ئەوان لەسەر ئەندێشەیەکی

---

دەنگێکی زۆرتری بەدەست هێنابوو بەڵام دواجار ئەم کۆمیسیۆنە دەنگی بە کاندیدای کۆماریخوازان واتە رادێرفۆرد هیسدا. و.ف

311. Virtual potentially
312. Socialfixative, socialstabilizer
313. Generalbenefit

بە تەواوی دەستەبژێرگەرایانە ڕۆ نرابوو، واتە لەسەر ئەو ئەندێشەیەی وا دەڵێت پارێزەر لە خودی کێشەکە بەرزتر و گرنگترە. پارێزەر خاوەن زانستێکی تاقانەیە. پارێزەر هەڵسوکەوتەکانی خۆی بەپێی دابونەریتێکی سەختگیرانە بەڕێوە دەبات... پارێزەر ناوبانگی باش لە نێو کۆمەڵگادا بە گرنگترین شتی خۆی لە دونیادا دەزانێ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بێگومان پارێزەر لە ئاست ئەم بابەتەدا هیچ جۆرە نیگەرانی و کەڵکەڵەیەکی فیکریی نییە. ناوبانگی چاکە ئایدیال و ئامانجی ئەو نییە بەڵکوو ئاکامی شێوازی ژیانیەتی». ئەم جیهانە پەرژینکراو و پارێزراوەی پارێزەری وردە وردە داڕووخا و لێک ترازا، چونکوو گەلێ پارێزەری نۆمالی تازە هەڵتۆقیو تێکەڵ بەم بەستێنە بوون. دیوانی باڵا لە ١٩٧٧دا ئیجازەی بانگەشە و پڕوپاگەندەی بە پارێزەراندا، ئەمەش وای کرد لە نێوان کۆمپانیا گەورەکانی پارێزەریدا لەسەر پارە کێبەرکێ و ڕەقابەتێکی قووڵ دروست بێت. لۆییس دەڵێت: «پارێزەری نەیتوانی لە بەرانبەر هەردوو غەریزە و ویستی ئەمریکاییەکاندا بۆ دیموکراتیزاسیۆن و بە بازرگانیبوون خۆی رابگرێ (زۆرجار ئەم دووانە هاوواتای یەکدی دێنەوە)»[١٦] تا نەوەیەک لەمەوپێش پیشەی پارێزەری تا رادەیەک وەکوو کارتێلێک بەڕێوە دەبرا. هەژماری کۆمپانیاکانی پارێزەری لە هەموو شارەکاندا زۆر کەم بوون و تێکەڵبوون بەم بازارە، گەلێ سەخت و دژوار بوو. ئەوانەی بەم کارەوە سەرقاڵ بوون داهات و دەرامەتی باشیان هەبوو بەڵام هەوڵی پەرەپێدانی کاروباری خۆیان نەدەدا. پارێزەری پیشەی دەوڵەمەندبوونەوە نەبوو بەڵکوو ڕێگایەک بوو بۆ بەدەستهێنانی داهاتێکی ڕەوا و ئابڕوودارانە. پارێزەران بازاڕی بەسەقام[٣١٤] و داهاتی نەگۆڕ[٣١٥] بەڵام هەمیشەییی خۆیان لا بەرز و بەڕێز بوو. ئەم پێکهاتە کارتێل ئاسایە[٣١٦] دەرفەتێکی گەرەنتیکراوی بۆ پارێزەران دەڕەخساند تاکوو بتوانن بەدوای ویست و داخوازییە سیاسییەکانی خۆیاندا بڕۆن. یەکێک لە بەرپرسانی بەساڵاچووی کۆمپانیایەکی پارێزەریی نیۆیۆرک پێی وتم:

هەموو ئەم لاوانە پێیان خۆشە بزانن چۆناوچۆن دەتوانن وەک دین ئاچسێن و سایرۆس وێنس پارێزەری و خزمەتگوزاریی سیاسی تێکەڵ بە یەکتر بکەن. بێگومان ئەوان ناتوانن ئەم کارە جێبەجێ بکەن. [چونکوو] بە ئاستی یەکەم هەر پارێزەرێک بیەوێ لە پەراوێزی کارە سەرەکییەکەیدا لەم جۆرە چالاکییانە ئەنجام بدات لەگەڵ کەس نابێتە شەریک. بە ئاستی دووەم هیچ یاریدەدەر و شەریکێک نییە کاتێکی هێند گونجاو بۆ ئەم کارە تەرخان بکات کە بە شەریکبوونەکەی بژی. وێنس ئەوکاتەی پارێزەرێکی لاو بوو چەندەها مانگ لەسەر بابەتە سیاسییەکان و سیاسەت دارشتن چڕ دەبوویەوە. ئێوە

314. Stablemarket
315. Stableincome
316. Pseudo cartel

ئیدی قەت ناتوانن ئاوەها کارێک بکەن. پارێزەری ئێستا گۆڕدراوە بۆ جۆرێک بازرگانی و کەسابەت، ئەڵبەت بازرگانییەکی رکابەرانە زۆر قۆڕ و ناشیرین.

## لە سەگی پاسەوانەوە بۆ سەگی باوەش

کەم تا زۆر هەموو ئەو شتانەی سەبارەت بە پارێزەری ئاماژەمان پێ دا لە ئاست زۆربەی پیشەکانیتریشدا دەبینرێت. ئەنجومەنی پزیشکانی ئەمریکا رەنگە سەردەمانێک بەهێزترین سەندیکای پیشەیی ئەو وڵاتە بووبێ، ئەم سەندیکایە پێگە و ئاسایش و دەسەڵاتی پزیشکانی دابین دەکرد، لە بەرانبەریشدا داوای لێ دەکردن سلامەت و تەندروستیی نەخۆشەکانیان لە هەموو شتێ بە گرنگتر بزانن. پیشەی پزیشکی هەمیشە ویستوویەتی نەخۆشەکان دڵنیا بکاتەوە کە نابێ قەت نیگەرانی دەوا و دەرمان یا خود بریاری پزیشکێک بن، چونکوو پزیشک تەنیا بەپێی باشترین هۆکارە پزیشکییەکان بریار وەردەگرێ. (لە سوێندنامەی بوقراتدا هیچ ئاماژەیەک بە پسوڵەی پارە نەکراوە). بەڵام لە چەند دەیەی رابردوودا پزیشکان پێگەی خۆیان لەدەست داوە، چونکوو دەوڵەت بۆتە گەورەترین یاریکەری ناو بەستێنی تەندروستی و دەوا و دەرمان و کۆمپانیاکانی بیمە[317] و رێکخراوی بیمەی لەشساغی[318] هەوڵیان داوە لە رێژەی خەرجەکانیان کەم بکەنەوە، هەروەها پیشەکانیتری بەستێنی تەندروستی و دەوا و دەرمانیش بەهێزتر بوونەتەوە. ئێستە ئیدی پزیشکیش بۆتە بازرگانێکی رووت و کاری رۆژانەی بریتییە لە دابەزاندنی خەرجەکان، بەڕێوەبردنی بڕیارنامە دەوڵەتییەکان، نیگەرانبوون لە ئاست شکاتکردنی نەخۆشەکاندا و، قبووڵکردنی زەخت و گوشاری رەقابەت. هەر بۆیە ئیدی ئەو پێوەندییە بێوێنە و قووڵەی نێوان پزیشک و نەخۆش نابینین مەگەر لە ئاست دەوڵەمەنداندا کە گوێ بە پووڵ و پارە نادەن و لەم بارەیەوە کێشەیەکیان نییە. شێوازی کۆنتری پیشەی پزیشکیش هەروەک پارێزەری تا رادەیەک کاڵفامانە و ساویلکانەیە، بەڵام ئەمە هیچ لەو حەقیقەتە ناگۆڕێ کە لە سی ساڵی رابردوودا پزیشکی گۆڕانێکی زۆر گەورەی بەسەردا هاتووە.

ژمێریاریش چیرۆکێکی هاوشێوە ژیاوە. لەکۆبوونەوەیەکی کۆنگرێس لە ساڵی ١٩٣٣دا ئالێن بارکلی، نوێنەری ئەیالەتی تێنێسی، ئەو پرسیارەی ئاراستەی کۆلۆنێل ئارتۆر کارتێر، سەرۆکی یەک لە گەورەترین کۆمپانیاکانی ژمێریاری لەو سەردەمەدا، کرد کە ئایا دەتوانین دڵنیا بین لەوەی کە ژمێریاران چاودێرییەکی تەواو بەسەر موشتەرییەکانیاندا دەکەن؟ بارکلی [ئینجا] پرسی: «کێ حیسابتان لێ دەخوازێ؟» کارتێر لە وەڵامدا وتی: «ویژدان». ئەڵبەت هەندێ هۆکاری دیکەیش دەوریان دەگێڕا. ئەم

317. Insurance company
318. Health insurance

پیشەیە خاوەن کۆمەڵە پێوەرێکی پێشکەوتوو بوو و وەک پارێزەری باوەڕپێکراوی پێشینەی دارایی[ی هاووڵاتییان] هەوڵی دەدا ناو و ناوبانگی خۆی بپارێزێ. سیمای ژمێریار سیمای مرۆڤێکی رووگرژ بەڵام باوەڕپێکراو بوو و بە هیچ شێوەیەک ئەو سیمایە نەبوو کە لە رووداوی ناشیرینی کۆمپانیای ئێنرۆندا دروست بوو. رۆژنامەی *واڵستریت ژۆرناڵ* بۆ شرۆڤەکردنی هۆکارەکانی داڕووخانی کۆمپانیای مەزنی ژمێریاریی ئارتۆر ئەندێرسۆن لە ساڵی ٢٠٠٢دا، زنجیرە وتووێژێکی لەگەل ژمێریاراندا ئەنجام دا و ئەوانیش لەسەر شیکردنەوەی گۆڕانکارییە گەورەکانی پیشەی ژمێریاری لە بیست ساڵی رابردوودا چڕ بوونەوە. ئەگەر هێمای گۆڕانکارییەکانی بەستێنی پارێزەری بە بڕیارەکەی دیوانی باڵا بۆ ئازادبوونی پڕوپاگەندە کردن بزانین، ئەوا هێمای گۆڕانکارییەکانی ژمێریاری بریتییە لە رێکەوتننامەکەی ١٩٨٩ لە نێوان کۆمیسیۆنی بازرگانیی فیدراڵ و ئەنجومەنی ژمێریارانی رەسمیی ئەمریکادا کە بەپێی ئەو رێکەوتنە ژمێریاران لە باتیی وەرگرتنی مووچەیەکی سەعاتیی دیاریکراو دەیانتوانی لەوە بەدواوە نرخ و مووچەی کارەکانیان بە شێوەی بگۆڕ[319] و نموونەیی[320] وەربگرن. ئەم بڕیارە مانای ئەوەیە ژمێریاران دەیانتوانی لە رێگای راوێژکارییە گشتییەکانەوە[321] داهاتێکی بەرفراوان کۆ بکەنەوە. ئەم رێکەوتننامەیە ئەیویست چاکسای لەم پیشەیەدا بکات و رووبەرێکی کراوەتر و رکابەرانەتری بۆ بئافرێنێ. (دیسان بە بازاڕیکردن و دیموکراتیزاسیۆن پێکەوە و بە یەک ئاراستەدا هەنگاویان هەڵگرت). بەڵام ئاکامێکی گەورەی ئەم ریفۆرمانە ئەوە بوو کە ژمێریاران فێڵ و تەڵەکەی [دەوردانەوەی یاسا و] هەڵاتن لە پیتاکیان بۆ کۆمپانیاکان دەدۆزییەوە و لە بەرانبەر ئەم خزمەتەدا بەشێک لەو پارەیانە کە لە رێگای دەسپێوەگرتنی پیتاکەوە[322] دەگەڕایەوە، بۆ خۆیان هەڵدەگرت. ئانتۆنی رایدێر یەکێک بوو لە ژمێریارانی کۆمپانیای ئێرنێست ئەند یانگ کە بیرەوەرییەکانی خۆی بۆ رۆژنامەی *واڵستریت ژۆرناڵ* گێڕاوەتەوە، رایدێر دەیگێڕێتەوە چۆناوچۆن فێریان دەکرد خزمەتگوزاریی تازە و نوێ بە موشتەرییان و کڕیاران بفرۆشێت، واتە خزمەتگوزاریگەلێکی وەک پارێزەری، بیمە، راوێژکاری، گەڵاڵە دارشتن و [بە کورتی] هەر شتێ کە دۆلاری تێدا بێت. ئەو لە بیرەوەرییەکانیدا وتوویەتی: «[ئەم کارە] وەک ئەوە وابوو رۆژنامەنووسان فێری فرۆشتنی ئابوونەی رۆژنامە[323] بکەن. من نەمدەتوانی ئەم کارە بکەم، چونکوو دەمزانی لە راستیدا موشتەرییەکانم پێویستیان بەم شتانە نییە». رایدێر دەرکرا بەڵام زۆربەی هاوکارانی رایدێر ئەم هەلومەرجە نوێیەیان قبووڵ کرد. وردە وردە وای لێ هات ژمێریاران لە پێناو داخوازییەکانی

319. Changeable
320. Casework
321. Generalconsulting
322. Tax economizing
323. Subscription

موشتەرییاندا ئامادە بوون هەموو کارێک ئەنجام بدەن و، بە واتای *واڵستریت ژورناڵ* ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتییان لە ڕۆڵی خۆیاندا کرد، واتە «لە سەگی پاسەوانەوە بۆ سەگی باوەش».[١٧]

لە واڵستریتدا سڕینەوەی لەم چەشنەی سنوورەکان بە تەواوی تەشەنەی سەندووە و بۆتە شتێکی ڕۆتین و باو. بانکداران و دەڵاڵان [پێشتر] دەبا لە ئاست هەموو سەرمایەگوزاراندا ڕەچاوی هەندێ بەرپرسایەتی و خاڵی دیاریکراویان بکردایەت کە یەکێکیان بریتی بوو لە ئەنجامدانی جیاکارییەکی تەواو و تۆکم لە نێوان نرخێنەران[٣٢٤] و بانکداراندا، نرخێنەران کۆمپانیاکانیان دەنرخاند و بانکداران لەگەڵ ئەو کۆمپانیانەدا دەکەوتنە مامەڵەوە. هێنری کافمەن، سەرۆکی پێشووی نرخێنەرانی کۆمپانیای برایانی سالامۆن، لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت تاکوو ساڵانی دەیەی ١٩٨٠ کۆمپانیاکان ئەم جیاکارییەیان دەپاراست و بە راستی نەیاندەهێشت نرخێنەران و نرخاندنەکان سەربەخۆیی خۆیان لەدەست بدەن. [بەڵام] لە کۆتایی نەوەدەکانەوە ئەم یاسا و ڕێسایانە ئاراستەی مەرگێکی خێرایان گرتە بەر؛ هیستریای ئینتەرنێتیش بە تەواوی شپرزەی کردن و لەناوی بردن. نرخێنەران ڕاپۆرتی سەرانسەر هەڵە و درۆیان بۆ سەهامی کۆمپانیا تازەکانی بواری تەکنۆلۆژیا ئامادە و بڵاو دەکردەوە و بەم شێوەیە بازاڕگەرمییان[٣٢٥] بۆ دەکردن، ئینجا بانکەکان بە بڵاوکردنەوە و پێشکەشکردنی سەهامی ئەو کومپانیانە پارە و پووڵێکی فراوانیان کۆ دەکردەوە. زۆربەی ئەم جۆرە کارانە بە تەواوی لە چوارچێوەی یاسادا بوون، لەڕاستیدا ئەم پرۆسەیە زۆربەی تایبەتمەندی و ئیمتیازە ڕۆتین و باوەکانی ڕێساسڕینەوەی[٣٢٦] پێ بوو، تایبەتمەندیگەلێکی وەک بازاڕێکی ڕکابەرانەتر، هێنانە مەیدانی یاریچی و ئەکتەرانی نوێ و، هاندانی داهێنانی تەکنۆلۆژیکی و بەڕێوەبەری[٣٢٧]. بەڵام ئەم پرۆسەیە کۆمەڵە کێشەیەکی تازەیشی لێ کەوتۆتەوە و بۆتە هۆی سەرهەڵدانی مۆتیڤ و ویستی سەرەڕۆیانە و دژایەتیی بەرژەوەندییەکان کە ئەمەش مەترسییەکی زیاتری بۆ جەماوەری خەڵک بەدواوە بووە، واتە بۆ هەمان ئەو کەسانەی کە وا بڕیار بوو هەموو ئەم گۆڕانکارییانە بە قازانجی ئەواندا بشکێتەوە. [دوای ئەم گۆڕانە] بازاڕە داراییە تازەکان زیندووتر، پڕجووڵەتر و کراوەتر [لە جاران] بوون بەڵام لە هەمان کاتدا مەترسیی بێسەقامی[٣٢٨]، هەڵەبوونی زانیارییەکان، ساختەچێتی و هیستریایش زیاتر [لە جاران] خۆیان دەنواند. دوابەدوای تەقینەوەی ئینتەرنێت وردە وردە هەژمارێکی بەرچاو لە سیاسەتمەداران و کاربەدەستان کردیانە هەرا و داوای چاودێری و کۆنترۆڵی زیاتریان کرد ـ ئەمەش بە مەبەستی ئەوەی هەر شتێ کە پێشتر شاردراوە و

---

324. Appraisers
325. Salestalk/ hawking
326. Seregulation
327. Management
328. Instability

نائەخلاقی بوو ئاشکر بکرێت و بەپێی یاسا قەدەغە بکرێ، ئەگەر ئەم یاسایانە پەسند بکرێن [بێگومان هێمای گۆڕانێکی‌ترە کە رەنگە حاشاهەڵنەگریش بێت، واتە وازهێنان لە مۆدێلی «چاودێریی نارەسمیی» ئەنگلۆ ـ ئەمریکایی و قبووڵکردنی مۆدێلی «چاودێریی رەسمیی» ئەورووپایی. ئەڵبەت رێگایەکی باشتر، نەرمتر[329] و ئاوەزمەندیرشیمان[330] لە بەردەستدایە و دەتوانین بە ژیاندنەوە و زیندوو کردنەوەی هەندێ لەو مەرج و کۆت و بەندانەی کە لەم چەند دەیەی رابردوودا وەلا خراون و سڕدراونەتەوە، وەها دۆخێک بئافرێنین کە پیشەکان خۆیان ئاگایان لە خۆیان بێت و ببنە چاودێری خۆیان. بەڵام ئەم کارە مانای گەڕاندنەوەی تیرێکە کە لە کەمان دەرکراوە و تەقێنراوە.

## خۆکوشتنی دەستەبژێران

لە پشت هەموو ئەم رەوتانەوە کە سەبارەت بە هەندێ لە پیشەکان خستمانە بەر باس، گۆڕانێکی کولتووری رووی داوە کە بریتییە لە [گۆڕدرانی] رۆڵی دەستەبژێران. ئەمریکاییەکان حەز لە تێفکرین یان قسەکردن دەربارەی دەستەبژێران ناکەن. خودی وشەی دەستەبژێر ئەوان بیری خۆبەزلزانین و لووتبەرزی دەخاتەوە و وەک دیاردەیەکی نائەمریکایی دەکەوێتە بەرچاو. ئەمریکا هەمیشە چینێکی دەستەبژێری بووە، واتە هەمان ئەو رێژە کەمەی کە لە راستیدا زۆربەی دامەزراوە گەورەکان بەڕێوە دەبەن. دەستەبژێرانی کۆن لە نێو بازنەیەکی داخراودا دەژیان کە لەسەر بنەمای رەچەڵەک و هۆز و رەگەز رۆنرابوو. سیستەمی نوێ سیستەمێکی دیموکراتیکترە و تاکەکان لەسەر بنەمای پارە و ئاوەز و ناوبانگ پێشکەوتن بەدەست دەهێنن کە بە گشتی پرۆسەی هەڵبژاردنی[331] سیستەمی نوێ گەلێ باشتر و کراوەترە. بەڵام جیاوازیی گەورە لەوەدایە کە دەستەبژێرانی ئەوسا [بە بەراورد لەگەڵ دەستەبژێرانی ئێستادا] زیاتر خۆیان لە قەرەی بەرپرسایەتی و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان دەدا، ئەمەش تا رادەیەک لەبەر ئەوە بوو کە لە [پارێزراوبوونی] پێگەی خۆیان دڵنیا بوون. دەستەبژێرانی ئێستە لە دونیایەکی زۆر کراوەتر و رکابەرانەتردا دەژین و چالاکن. ئێستا بەرپرسیارانی گشتیی[332] کۆمپانیا گەورەکان دەسەڵاتێکی زۆرگەورەیان هەیە بەڵام بێئۆقرەن و لە هەموو لایەکەوە لە ژێر زەخت و گوشاردان، [کەچی] مەجبوورن لەو دۆخە دژوارەدا هەڵکەن و پێشەنگ بن و رێژەی سوود و بەرژەوەندیشیان فراوانتر و گەورەتر بکەنەوە. هەر بۆیە ویستەکانیان بەربڵاو نییە و بەرکورتە، ئاسۆی بەردەمیشیان درێژخایەن نییە و تەنیا تا سبەینێ بڕ دەکات. بە گشتی ئەوان نە بە هزر و نە بە کردەوە وەک

---

329. Flexible
330. Wisely/ intelligent
331. Selectiveprocess
332. Managingdirector

دەستەبژێران نـاجووڵنەوە؛ ئەمە حەقیقەتێکـی رووتە و [بێگومـان] گەلـێ دڵتەزێنیشـە، چونکـوو ئەوان هێشتا هەر دەستەبژێرن.

یەک لە دیـارترین نیشـانەکانی گـۆڕدرانی شـێوە بیرکـردنەوەی دەسـتەبژێران بـریتییە لە [گـۆڕدرانی] جۆری ئایدیالەکانیان. لە سەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا پیـاوانێکی وەک رۆبێـرت برۆکینگز دەسـتیان دایە کـردنەوەی هەنـدێ رێکخـراوی تـوێژینەوەیی[٣٣٣] کە لەسـەر سیاسـەتە دەوڵەتییەکـان چـڕ دەبـوونەوە، رێکخـراوی برۆکینگـز کە لە ١٩١٦دا دامەزرا یەکەم نمـوونەی بەرجەسـتە و دیـاری ئەم جـۆرە رێکخـراوانە بوو. ئەم رێکخراوانە دەیانویسـت لە سـەرووی حیـزب و سیاسـەتبازییە حیزبییەکـانەوە خزمەتـی [گەل و] نیشـتمان بـکەن. برۆکینگـز دەیویسـت رێکخراوێـک ئـاوا بکـات کە «دوور لە هەرچەشـنە گرێـدراوییەکی سیاسی یان دارایی... دەیتا و زانیارییە بنەماییە ئابوورییەکـان کۆ بکـاتەوە، شـرۆڤە و لێکدانەوەیان بـۆ بکات و [دواجار] بیخاتە بەردەم هەموانەوە».[١٨] «ئیدارەی نەتەوەیی بۆ توێژینەوە ئابوورییەکـان»یـش کە لە سـاڵی ١٩٢٠دا دامەزرا، ئامـانجەکەیکی ناحیزبییـانەی هەڵبژاردبـوو. بەڵام پـێچەوانەی بیرکـردنەوەی زۆربەی خەڵک لە سەرەتای سەدەی بیستدا ئایدیۆلۆژیا رۆڵێکی کز و کەمڕەنگی نەبوو. لە راستیدا رەنـگە ململانـێ فراوانەکـانی ئەو سـەردەمە کە لە ئاسـت هەمـوو بابەتێکـدا دەبینـرا ـ بـابەتگەلێکی وەک مـافی دەنگـدانی ژنـان، پیتـاکە گومرگییەکـان[٣٣٤]، یاسـامەندکردنی[٣٣٥] بازرگـانی، جـەنگی یەکەمـی جیهـانی و «یەکێتیی نەتەوەکان»[٣٣٦] ـ وای کردبـێ خەڵک بکەونە دوای ئاواکردنی وەها رێکخراوگەلێک کە بتـوانن لە رێگایانەوە سیاسەتە دەوڵەتییەکان لە دەرەوەی گۆڕەپـانی خوێنـاویی سیاسـەتبازییە حیزبییەکـان بـخەنە بەر شرۆڤە و شیکارییەوە. بۆ وێنە «شۆرای پێوەندییە بیانییەکانی ئـەمریکا» «بە شـێوەی هـاوبەش و لە لایەن هەر دوو حیزبـی کۆمـاریخواز و دیمـوکراتەوە دامەزرا و دەیانویسـت بە دامەزرانـدنی ئەم شـۆرایە پشتیوانیی هەر دوو حیزبەکە بۆ ئامـانج و کەڵـکەڵە جیهانییەکـانی ئـەمریکا رابگـرن. هەمـوو ئەم هەوڵانە هێند بە نرخ و بەرپرسیارانە بوون کە لەم سـەردەمە ئـاوەژوو و پـێچەوانەی ئەوڕۆدا مـرۆڤ باوەڕیـان پـێ ناکات، بەڵام ئەو جۆرە کەسانە بە راستی لەسەر ئەو بـاوەڕە بـوون کە پێویسـتە سیسـتەمی دیموکراسـی هەنـدێ دەرفەت و شـوێن بـۆ کـردنەوەی گوتـارێکی مەدەنـی لەسـەر بـابەتە گـرنگە کۆمەڵایەتییەکـان بخولقێنێ، یەکەم سەرۆکی فەخریی شـۆرای پێوەنـدییە بیانییەکـان کۆمـاریخوازێکی ناسـراو و بەرجەسـتە بوو بە ناوی ئێلیهۆ رۆت و یەکەم سەرۆکیشی جان دەبڵیـو دەیڤیس بـوو کە لە ١٩٢٤دا لە لایەن حیزبـی

---

333. Research institute
334. Customtariff
335. Lawful / law - abiding

٣٣٦ . ئەو رێکخراوەی کە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی دامەزرا و لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە بوو بە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (UN). و.ف.

دیموکراتەوە بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری کاندیدا کرا. ئەم شۆرایە بە شێوەیەکی شێلگیرانە هەوڵی دەدا دەرفەتێک بۆ دیالۆگ و راگۆڕینەوە سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بخولقێنێ، دیالۆگێکی مەدەنی کە لە ژێر کاریگەریی سیاسەتبازییە حیزبییەکاندا نەبێ. جارێکیان سەرنووسەر و دامەزرێنەری گۆڤاری *ڤاریەن ئەفێرز* ـ ئۆرگانی شۆرای پێوەندییەکان ـ بە جێگرەکەی خۆی وت ئەگەر هات و رای گشتی یەکێکمانی بە دیموکرات زانی پێویستە ئەویدی زۆر خێرا بە ئاراستەی قازانج و بەرژەوەندیی کۆماریخوازاندا بکەوێتە کار.

دەستەبژێران ئەگەر ئێستا بەشداری لە کارێکدا دەکەن بەشداریکردنەکەیان ئاراستەی روانگەیەکی حیزبی دەگرێت و ئەو روانگەیەش زۆربەی کات گرێدراوی ئەو بابەتەیە کە لای خۆیان گرنگە. نزیک بە هەموو ئەو رێکخراوە توێژینەوەیی و ناوەندە لێکۆڵینەوەییانەی لەم سی ساڵەی رابردوودا هاتوونەتە چێبوون بە قووڵی ئایدیۆلۆژیکن. هۆکاری ئەم بابەتە تا رادەیەک هەڵئەگەڕێتەوە بۆ هەوڵە دەستەجەمعییەکانی کۆنسێرڤاتیستانی ئەمریکایی بۆ دروستکردنی «دژە رێکخستن[٣٣٧]»ێک لە هەمبەر ئەو جۆرە رێکخستنەدا کە رێکخراوی برۆکینگز و شۆرای پێوەندییە بیانییەکان هێما و سەمبولی بوون. بێگومان کۆنسێرڤاتیستەکان زۆرباش لەو حەقیقەتە گەشتبوون کە ئەم رێکخستنە لە شەست و حەفتاکاندا ئاراستەی چەپگەرایی و بەرەی چەپی گرتۆتە پێش. بەڵام ئەوان لە باتیی ئەوەی بە پێکهێنانی رێکخراوەگەلێکی سەربەخۆتر هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکە بدەن، بڕیاریاندا رێکخراوەگەلێک دروست بکەن کە بەرنامە و مانیفێستی حیزبیی خۆیان پێڕەو بکەن. بێگومان ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەی کۆنەپارێزان دژکردەوەیەکی لیبرالییانەی لێ دەکەوێتەوە و دواجار دونیای سیاسەتە دەوڵەتییەکانی واشینگتۆن دوو جەمسەریتر[٣٣٨] دەکاتەوە. ئێستە لە زۆربەی رێکخراوە توێژینەوەییەکانی بواری سیاسەتە دەوڵەتییەکاندا (جیا لە چەند نموونەیەکی گرنگ) توێژەران بەپێی روانگەکانیان هەڵدەبژێردرێن نەک بەپێی پسپۆڕی و زانستەکانیان، ئەوانیش بە باشی دەزانن دەبێ چ ئاکام و دەرئەنجامێک بخەنە بەردەست. هەرچەند بە ئاشکرا پێیان ناوترێ فڵانە روانگەی دیاریکراو هەڵبژێرن بەڵام ئەوان بۆ خۆیان ئەو راستییەیان دەرک پێ کردووە کە ناوەندەکانی توێژینەوە بۆ ئەوەیان دانەمەزراندوون کە رۆشنبیرێکی ئازادبیر و سەربەست بن. بۆرتێن پینز، بەرپرسیاری لێکۆڵینەوەکانی ناوەندی هەریتێج، بە ئاشکرا دانی بەوەدا ناوە کە «ئێمە کۆمیتەیەکی پێکهاتوو لە کەسانی بێلایەنی خاوەن بەڵگەنامەی دوکتۆرا نین. ئێمە دەبێ لە پێناو بەهێزکردنەوەی بەرەی خۆماندا کۆمەڵێک بەڵگاندن و ئارگیۆمێنت بۆ ئەو کۆنسێرڤاتیستانە بدۆزینەوە کە سیاسەتە دەوڵەتییەکان دادەرێژن».[١٩]

337. Anti - organization
338. Bipolar / dipole

لەم سەردەمەدا کە ئایدیۆلۆژیا کۆنەکان ئیدی ناتوانن کێشە تازەکان چارەسەر بکەن، [تاکە] بەرهەمی ئەم توێژینەوە یەکلایەنانە ورووژاندنی هەندێ باسوخواس و مشتومڕی لە پێشەوە دیاریکراوە کە هەڵگری شیکارییەکی جیدی و بایەخداری ئەوتۆ نین.

[بەمەشەوە] بە بەراورد لەگەڵ ئەو ڕێکخراوانەدا کە بۆ بەدواداچوونی ئایدیۆلۆژیا ڕۆ نەنراون بەڵکوو بە ئاشکرا بۆ بەدواداچوونی بەرژەوەندییەکان ئاوا کراون، لە زۆر لایەنەوە هێشتا ڕێکخراوە حیزبییە توێژینەوەییەکان کەمتر مایەی نیگەرانین. لە ڕاستیدا زۆرێ لە «ڕێکخراوە توێژینەوەیی» و «ناوەند»ە تازەکانی واشینگتۆن بوونەتە باشترین ئامێر و کەرەستەی دەست گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان ـ واتە گرووپگەلێکی وەک کۆمپانیاکان، سەندیکاکانی کرێکاران و تەنانەت دەوڵەتە بیانییەکان. کاری ئەم ناوەندانە بریتییە لە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵە «توێژینەوە»یەکی بەرفراوان بۆ سەلماندنی ئەوەی کەسانێک کە پووڵ و پارە بەمان دەدەن شیاوی وەرگرتنی سۆبسیدە دەوڵەتییەکان یاخود هەموو چەشنە پشتگیرییەکی دیکەن. [باشترە بڵێین] سیاسەتە حیزبییەکان لەلایەکەوە و لەولاوەش دەرکردن و دامەزراندنی سیاسییانە [ی فەرمانبەران]، بە ڕادەیەکی زۆر هیچ دەرفەتێکیان بۆ شیکردنەوە و نرخاندنی بەڕاستی سەربەخۆی سیاسەتە دەوڵەتییەکانی واشینگتۆن نەهێشتۆتەوە. ئەمڕۆکە واشینگتۆن دابەش بووە بەسەر دوو بەرەی ئایدیۆلۆژیکدا و کەم تا زۆر کاروباری هەموو کەسێک دواجار دەبەسترێتەوە بە یەکێک لەم دوو جەمسەرەوە. هیچکات سیاسەتە دەوڵەتییەکان لە بۆشاییدا دانەڕێژراون و سیاسەتبازییە حیزبییەکان و گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان لە سەر ئەم پرۆسەیە کاریگەرییان بووە و دەشێ بشیانبێ، بەڵام هەموو چاودێرانی سی ساڵی ڕابردووی واشینگتۆن لەسەر ئەوە تەبان کە واشینگتۆن ئاڵوگۆڕێکی سەرسامکەر ژیاوە و لایەنگیریکردنی شەڕانگێزانەی ڕۆشنبیران یان نوێنەرانی لۆبییەکان لە گرووپە خاوەن بەرژەوەندییە بچووکەکان بێئەندازە زیادی کردووە. دەستەبژێرە تازەکانی واشینگتۆن لەباتیی ئەوەی واز لە دەمارگرژیی حیزبی بهێنن و بەرەو پێشکەوتن هەنگاو بنێن، یان تەنانەت لەباتیی ئەوەی خودی ئەم وازهێنانە بکەنە تاقە ئامانی خۆیان، تەنیا و تەنیا ئەو دەمارگرژییەیان کردۆتە پردی بەدواداچوونی بەرژەوەندییەکانی خۆیان.

[بەم پێیە] تاکەیەک دامەزراوە ماوەتەوە کە دەتوانێ لە کۆمەڵگای ئەمریکادا ڕۆڵی ناوکۆ[339] و ناوبژیکەر بگێڕێ: میدیاکان. میدیاکان دونیا بۆ بەردەنگەکانیان[340] و بەردەنگەکانیان بۆ دونیا شی دەکەنەوە. لە ئێستای ئەمریکادا میدیاکان زیاتر لە هەموو دامەزراوەکانیتر ڕاستییەکان ڕوون دەکەنەوە و

339. Mediatorinstitutions
340. Addressee

گەلاڵە سیاسییەکان دادەڕێژن. بەڵام بەمەشەوە و بە پێچەوانەی گرووپە ناوکۆکانیتر[341] کە دابەزاندن و دامرکاندنەوەی کەفوکوڵ و هەستە جەماوەرییەکان یەکێک بوو لە ئەرکە[342] مێژووییەکانیان، میدیاکانی ئەمڕۆ زۆرجار پەرە بەم هەستانە دەدەن. میدیاکان هەرا و هەژان دەبەخشنە هەواڵەکان و سەرنجڕاکێشەریان دەکەن، هەندێ جار گەورەیان دەکەنەوە و هەندێ جاریش هەوڵی بچووککردنەوەیان دەدەن. [هەرچەند] تێلەڤیزیۆن و ڕۆژنامە زەردەکان لە هەمووی زیاتر کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەم بابەتەوە، بەڵام ئەم ڕەوتە کاریگەریی لەسەر زۆربەی چاپەمەنییەکان داناوە. ناتوانین بڵێین پاڵنەرێکی شەیتانی لەپشت ئەم کارەوە بووە. دیموکراتیزاسیۆن بە بازاڕیکردن هەروەک چۆن زەبریان گەیاندۆتە هەرهەموو پێشەکانیتر، بە هەمان شێوە دونیای ژۆرنالیزیشیان خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە و زەبریان لێ داوە. بۆ وێنە هەر سێ تێلەڤیزیۆنە سوننەتییەکە دەیانزانی بینەرانیان جیا لەوان هیچ هەڵبژاردنێکی دیکەیان لەبەردەستدا نییە، هەر بۆیە تاکوو دەیەی ١٩٨٠ وەکوو کارتێلێک کاریان دەکرد و دەجووڵانەوە. هەرچەند ئەم تێلەڤیزیۆنانە پێیان وابوو بەشی دەنگوباس و هەواڵەکان بەشێکی زیانکەرە، بەڵام ئەو پێگەوجێگە پتەو و قایمەیان و هەروەها هەندێ یاسای پێوەندیدار بە ناواخنی بەرنامەکانەوە وایان کردبوو ئەوان بەشی دەنگوباس بە مایەی بەها و بایەخی خۆیان لەقەڵەم بدەن و بەرزی ڕابگرن. ئەوان ئامادە بوون لە پێناو دەنگوباسی بیانی، فیلمی دۆکیۆمێنتار[343] و کولتووردا چی پارە پێویستە خەرجی بکەن.

ئینجا شۆڕشی زانیاری[344] سەری هەڵدا و بوو بە مایەی کەمبوونەوە و دابەزینی خەرجەکان، [هەروەها] سەرچاوە و ڕێگای زانیاریی هەرچی زیاتری خستە بەردەست و بوو بە هۆی دروستبوونی هەمەجۆرە ڕکابەری و کێبەرکێیەکی تازە. سەرهەڵدان و لەدایکبوونی تێلەڤیزیۆنی کابلی مانای تەواوبوونی پاوانکاریی[345] ئەو سێ کەناڵە سەرەکییە. ئێستە ئەو سێ کەناڵە سوننەتییە بە کردەوە کەوتوونەتە کێبەرکێیەکی بەردەوام و چرکەبەچرکە لەگەڵ دەیان میدیای هەواڵنێری، ڕابواردن و سەرگەرمی و، وتووێژکاردا. ئەم ململانێیە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی هەندێ سیمای ڕووناک و بەرنامەی ژیرانە و ئاوەزمەندانە، هەندێ جاریش گیانێکی تازەی کردۆتە بەر بەرنامە ماندووکەرەکان. بەڵام کاردانەوەی گشتیی ئەم ململانێیە ئاراستەی لێژ و سەرەوخواری گرتۆتە پێش. ئەگەر نەتوانی بەردەنگ بخلەجێنی یان بە فیلمە ترسێنەرەکان لە بەردەم شاشەی تێلەڤیزیۆندا بهێڵیتەوە، ئەوا ڕوو لە کەناڵێکی

341. Mediatorgroups
342. Function
343. Documentary
344. Informationalrevolution
345. Monopoly

دیکە دەکات. کۆنە بەرهەمهێنەرێکی دەنگوباسی تێلەڤیزیۆنی ئەیوت: «ئەم هەموو کەناڵە پڕ هەژمار و جۆراوجۆرە بۆ ئەوە دامەزران کە بینەر مافی هەڵبژاردنی زیاتری هەبێ و دواجار ئەم شتە دەبا بە سوودی بینەران بشکایەتەوە. بەڵام ئەوی راستییە ئەوەیە کە بە ئاسانی دەتوانین خەڵک بەرەو سەیرکردنی سێکس و توندوتیژی رابکێشین. وەک کتێبی باش، بەرنامەی باشیش داوای شتی زیاتر لە بینەر دەکات. بەڵام ئەمڕۆ هیچ دەرهێنەرێک ئەو ریسکە قبووڵ ناکات تەنانەت بۆ یەک دەقەش چییە بینەر نائومێد بکات. هەموان لەو ئامێری ریمۆت کۆنترۆڵە دەترسن». ئەڵبەت چەند بەرنامەیەکی گرنگی هەواڵ و دەنگوباسیش هەن کە بەرنگاری ئەم رەوتە بوونەتەوە و بەرخۆدان دەکەن، بەڵام بەرِواری دەسپێکردنی زۆربەی ئەم بەرنامانە دەگەڕێتەوە بۆ چەند دەیە لەمەوپێش و وردەوردە و بە درێژاییی ئەو ساڵانە بەردەنگیان بۆ خۆیان کۆ کردۆتەوە.

سەرهەڵدانی سەرچاوەی جۆراوجۆر بۆ وەرگرتنی هەواڵ دونیای چاپەمەنییەکانیشی شپرزە کردووە. زۆرێک لەو رۆژنامانەی وا سەردەمانێک زۆر باش و بەپێز بوون [ئێستە] داخراون و ئەوانیتریش وەک رابردوو نەماونەتەوە. بەڵام میدیا چاپییەکان[346] روو لە گەشە و ژیانەوەن، باشترە بڵێین چەند رۆژنامە و گۆڤارێکی دانسقەی بەپێز و پڕناوەرۆکمان هەیە کە بەردەوامیش بە پێزتر و باشتر دەبنەوە. رۆژنامەکانی *نیۆیۆرک تایمز، واڵستریت ژۆرناڵ و واشینگتۆن پۆست* ئێستە لە هەمیشە باشتر چاپ و بڵاو دەکرێنەوە. هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بە بەراورد لەگەڵ تێلەڤیزیۆندا، رۆژنامەکان کۆمەڵە خەڵکانێکی زۆر کەمتر وەک بەردەنگی خۆیان هەڵدەبژێرن و لەراستیدا رووبەری بەردەنگەکانیان کورت دەکەنەوە بۆ گرووپێکی تا رادەیەک گوڵبژێرکراو. بەڵام ئەم سێ رۆژنامەیە ناتوانن ئەو رۆڵە مەدەنییە بگێڕن کە هەزاران رۆژنامە لە سەرانسەری ئەمریکادا دەیگێڕن. یەکێکیتر لە هۆکارە هەرەگرنگەکانی بەپێزمانەوەی ئەو رۆژنامانە ئەوەیە کە مولکی هەندێ بنەماڵەی خێرخوازن و ئەم خاوەنە خێرخوازانە لەسەر ئەو باوەڕەن کە تەنیا بەڕێوەبەری کۆمپانیایەک نین بەڵکوو بەڕێوەبەری هەندێ دامەزراوەی نەتەوەیی و نیشتمانین. سەرجەم ئەو رۆژنامە بەرجەستانەی لە لایەن بنەماڵە مالکەکانیانەوە بە کۆمپانیا گەورەکان فرۆشراون، لە رۆژنامەی *لۆس ئانجلێس تایمز*ەوە بگرە تا دەگاتە رۆژنامەی *فیلادێلفیا ئەنکوییرەر*، دابەزینێکی زۆر گەورە ژیاون. لە زۆر نموونەشدا رۆژنامەکە هەر لە بنەڕەتەوە داخراوە. لە نێو گۆڤارە جیدییەکانیشدا تەنیا چەند دانەیەکیان تا ئێستایش گەشاوە و جێی سەرنجن، دیارە هۆکاری ئەمەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خاوەنەکانیان ئامادەن لە پێناو ناوەرۆکی باشی گۆڤارەکەیاندا لە گیرفانی خۆیان خەرج بکەن. بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بدەینە *نیۆیۆرکێر* و *ئاتلانتیک مانتلی* کە

346. Printmedia

هەژماری بەردەنگەکانیان تەنانەت لە بەردەنگی ڕۆژنامە باشەکانیش زۆر کەمترە[٣٤٧]. بەڵام ئەم جۆرە مالکانە بەردەوام کەمتر و کەمتر دەبنەوە و ئەم دیاردەیەمان بە تەواوی بینیوە. ئەم دۆخە دڵتەزێنە مرۆڤ دەهەژێنێ؛ ئەگەر چاپەمەنیی بەپێز و پڕخوێنەریشمان نەبێ دەتوانین دیموکراسیی لیبرالیمان هەبێ، بەڵام ئاوەها دۆخێک بە هیچ شێوەیەک دۆخێکی ئایدیال نییە. بیرمان نەچێ تاقە پیشەسازییەک یاسای بنچینەییی ئەمریکا بە ڕوونی بەڵێنی پارێزگاریکردن و پاراستنی داوە پیشەسازیی میدیا گشتییەکانە[٣٤٨]. بەڵام ئەم کێشانە تەنیا تایبەت بەو پیشەسازییە نییە، پیشەسازییەکانیتریش دەورێکی گرنگ لە سەرکەوتنی دیموکراسیدا دەگێڕن و لاواز کەوتنی ئەوانیش مایەی خەم و نیگەرانییە. نووسەرێک بە ناوی جەیمز فالوێز دەڵێت: «هەندێ کاڵا و خزمەتگوزاریمان هەن کە ناتوانین تەنیا بە ڕوانگەیەکی ڕووتی بازرگانییەوە نرخ و بەهایان لە نێو کۆمەڵگادا دیاری بکەین، بۆ وێنە تەندروستی و دەوا و دەرمان، فێرکاری، چاپەمەنییەکان، پارێزەری و، ماف و یاسا. ئەگەر کۆێ ڕێژەی پێشکەشکردن و تایبەتمەندییەکانی ئەم کاڵا و خزمەتگوزارییانە لە لایەن بازاڕی ئازادەوە دیاری بکرێ [بێگومان] کۆمەڵگا ناتوانێ بەختەوەری دەستەبەر بکات. ئێوە ناتانەوێ منداڵەکەتان لە زانکۆیەکدا بخەنە بەر خوێندنەوە کە بەرنامەی وانەکان تەنیا لەسەر بنەمای هێزەکانی بازاڕ[٣٤٩] دادەڕێژرێت. بە هەمان شێوە چاپەمەنییە بەپێز و باشەکانیش کۆمەڵە بەرژەوەندییەک پێشکەش بە کۆمەڵگا دەکەن کە سنووری بەرژەوەندییە مادییەکانیان دەبەزێنێ». مەبەستمان ئەوە نییە کە پاراستنی ئەم پیشەسازییانە پێویستی بە دەستێوەردانی دەوڵەتە. لەڕاستیدا دەستەبژێرانی خێرخواز ڕێگەچارەی مێژوویی و دێرینی [ڕەواندنەوەی هەڕەشەکانی بەردەم] پارێزەری و چاپەمەنییەکان بوون، بەڵام کاتێ ژمارەی ئەم جۆرە دەستەبژێرانە بەردەوام کەمتر و کەمتر دەبێتەوە، ئاخۆ چیمان لە دەست دێت و دەبێ چی بکەین؟

ئەگەر لە جێگە و پێگەی کۆمەڵایەتیتان بێخەم بن خێرخوازبوون ئاسانترە. یەکەم دەستەبژێرانی ئەمریکا، واتە دەستەبژێرانی پرۆتستان، ئاوەها دۆخێک دەژیان. پرۆتستانە ئەنگلۆساکسۆنە سپی پێستەکان(WASP[٣٥٠]) لە سەرەتای دامەزرانی ئەمریکاوە تاکوو دەیەی ١٩٦٠ خاوەن پێگەیەکی بەرزتر و زاڵتر لە کۆمەڵگای ئەمریکادا بوون. سەرۆک کۆمارەکان، وەزیرانی دەرەوە، پارێزگاران، سەرۆکی

---

٣٤٧. گۆڤاری *نیۆزویک* کە خۆم کاری تیا دەکەم، یەک لەو دەگمەن گۆڤارە پڕ تیراژانەیە کە تا ئێستایش بۆ شیکردنەوەی هەواڵ و دەنگوباس میتۆدێکی قووڵ و جیدی پێڕەو دەکات. یەک لە گرنگترین هۆکارەکانی ئەوەی *نیۆزویک* توانیویەتی ئەم کارە بکات ئەوەیە کە ئەم گۆڤارە هی بنەماڵەی گراهامە، ئەم بنەماڵەیە خاوەن ڕۆژنامەی *واشینگتۆن پۆستیشن*.

348. Mass mediaindustry
349. Marketforces
350. White Anglo – Saxon Protestant (WASP)

پیشەسازییەکان، سەرۆکی ئەنجومەنەکانی پارێزەران و سەرۆک زانکۆکان، هەرهەموویان WASP بوون. ئەوان لە ڕێگـای تـۆڕێکی[351] پێکهـاتوو لە بنەماڵەکـان، قوتابخانەکـان، زانکۆکـان و کلوپەکـانەوە پێوەندییەکانی نێوان خۆیان ڕێک دەخست و نەتەنیا کۆلۆکسیۆنێک بوون لە تاکە پایەبەرزەکان بەڵکوو چینێکی کۆمەڵایەتیشیان پێک دەهێنا کە دەتوانین ئەم پێکهاتەیە بە ڤێرژێنە[352] ئـەمریکاییەکەی چینـی ئەشرافی ئەورووپایی ناوزەد بکەین. ئەم کلوپە ئەندامی زۆرکەمی وەردەگرت، مەرجی ئەندامێتی ئەوە بوو کە لە ڕواڵەت و جلوبەرگ و شێوازی قسەکردندا وەک WASP بجوولێتەوە (دروشمی جوولەکەکان بۆ سەرکەوتووبوون ئاوەها بوو: «وەک جوولەکە بیر بکەرەوە، وەک بریتانی جل لەبەر بکە»). پرێستیژی کـۆمەڵایەتی هەڵگـری کـۆمەڵە بەهـایەکی دیـاریکراوە. بەهـا قبووڵکراوەکـانی WASP بەهـاگەلێکی ڕۆشنبیرانە یان ئاکادیمییانە نەبوون. ڕۆژنامەنووسـێکی ڕەسـەن و نەجیبـزادە بە نـاوی جۆزێـف ئالسـۆپ بیرەوەرییەکـانی خـۆیی لە سـەردەمی خـۆ ناونووسـکردن لە قوتابخـانەی گروتۆنـدا گێڕاوەتـەوە، ئەو قوتابخانەیە کە قوتابخانەیەکی پێش زانکۆیی[353] بوو لە نێو ئینگلەندی باکووری ڕۆژهەڵاتـی ئـەمریکادا، لە گەشترین سەردەمی خۆیـدا سـەرەکیترین ناوەنـدی پەروەردەکردنـی دەسـتەبژێرانی WASP بـوو. دایکـی جۆزێف بەڕێوەبەری ئەفسانەیی قوتابخانەکەی، وائە ئەندیکات پیبۆدی، ئاگادار کردبۆوە کە جـۆزێفی لاو گەلـێ هـۆگری کتێـب و ئەندێشـەیە. بەڕێـز پیبـۆدی لە وەڵامـدا وتبـووی: «هەمـوو ئەو شـتانەی لە بیـر دەبەینەوە». گرۆتۆن نەکەوتبووە دوای پەروەردەکردنی قوتابییانێک کە خاوەن بیـر و ئەندێشـەی ڕوون و گەشاوە بن، بەڵکوو دەیویست «مەسیحییانی بەبڕست و تیەو» پەروەردە بکات. ئەم پیـاوە مەسـیحییانە هەڵسـوکەوتێکی تونـدوتۆڵ و پـتەو بەڵام لە هەمـان کاتـدا دادپەروەرانـە[354] دەجـووڵانەوە، پرەنسـیپە ئەخلاقییەکانیان دەپاراست و لەسەر ئەو باوەڕە بوون هەر کە بوویت بە خاوەن دەسـەڵات، بەشـداریکردن لە خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکاندا دەبێتە ئەرکی سەرشـانت. دروشـمی گرۆتـۆن ئەمەیە: «خزمەتکـردن پاشایەتییە»[355].[٢٠] ئەڵبەت زۆرێک مرۆڤی خوێڕی و گەمژەیش هەبـوون کەتەنیـا لەبەر ئەوەی ئەنـدامی

351. Net work
352. Version
353. Pre University
354. Rightful/ justly
355. cui servire est regnare: ئەم ڕستەیە زیاتر بەم شێوەیە وەریدەگێڕن. وەرگێڕانی وشە بە وشە و دەقاودەقتری ئاوایە: «خزمەتکـردن بە حەزرەتـی ئەو، فەرمـانڕەواییە». بەڵام پیبـۆدی هەمیشـە خوازیـاری ئەوە بوو کە ئەم ڕستەیە بە جۆرێک لێـک بـدرێتەوە کە دەلالەت بەسـەر خزمەتگـوزارییە کۆمەڵایەتییەکانـدا بکات. پیبۆدی وەرگێڕانەکەی ناو کتێبی نزای کەلیسای ئەپیسکۆپاڵی هەڵبژارد: «خزمەتکردن بەو، ئازادیی تەواو و ڕەهـایە». ئەو جارێکیـان وتبـووی: «ئەگەر هـات و هەنـدێ لە کـوڕانی گرۆتـۆن لە خزمەتگـوزارییە

عەشیرەتێکی ناسراو بوون، پلەوپایە و پۆستی بەرز و هەموو ئیمتیازەکانی دیکەشیان بە دەست دەهێنا. بەڵام بە گشتی دەستربژێرانی WASP بانگەشەی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکانیان دەکرد و بۆ خۆیشیان بەشدارییان تێدا دەکردن، لە سەرۆک کۆمارییەوە بگرە بۆ دەوڵەتە خۆماڵییەکان.

هەرچی کۆمەڵگای ئەمریکا لە سەدەی بیستەمدا رەنگاورەنگی و کرانەوەی زیاتری بە خۆوە دەبینی و پێشوازیی لە گروپگەلێکی زیاتر دەکرد، دەستەبژێرانی WASP زیاتر دەکەوتنە سەر دووڕیانێکەوە: دەبا یان ئەندامی تازەیان لە ماڵە پارێزراوەکەیاندا وەرنەگرتایە یاکوو ئەندامە تازە و نا WASPەکانی ناو کۆمەڵگایان وەربگرتایە و رێگەیان بۆ بکردنایەتەوە. دواجار ئاوێتەیەکی ئەم دوو شتە رووی‌دا. سەرەتا و لە دەسپێکی سەدەی بیستەمدا ئەشرافییەتی WASP چینێک بوو کە دانووی لەگەڵ گروپەکانی‌تردا نەدەکوڵا، بۆ ئەندامبوون لە کلوپە کۆمەڵایەتییەکانیدا پێشمەرجی سەخت و دژواری دادەنا و ئیجازەی بە جوولەکە شایستە و خاوەن سەلاحییەتەکان[٣٥٦] نەدەدا لە زانکۆ ناسراوەکانی رۆژهەڵاتی ئەمریکادا بخوێنن.[٢١] بەڵام تێپەڕینی زەمەن ئەوەی سەلماند کە ناتوانن درێژە بەم جۆرە بەربەست و بەرگریکردنانە بدەن. لەلایەکەوە بارودۆخی سەردەم ئیجازەی بەم کارە نەدەدا و لەولاوەش شێوە رەقابەتی کاپیتالیستی بە بێ لەبەرچاوگرتنی [عەشیرەت و] ئیتنیکی تاکەکان خوازیاری باشترین و گەشاوەترین کەسەکان بوو. هەربۆیە WASP دواجار دەرگای کلوپەکانی خۆی بۆ هەمووان خستە سەرپشت. لە کۆتاییی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکانەوە هاتوچۆکردنی نزیک بە هەموو دامەزراوەکانی ژێر دەسەڵاتی دەستەبژێرانی پرۆتستان بۆ کەسانی نائەندامیش ئازاد کرا. WASP هەر بەم کارە ستارتی مەرگ و لەناوچوونی خۆی لێدا. ئەوان هەم لە رێگای برژاقی مافە مەدەنییەکان و هەم لە رێگای کردنەوەی زانکۆ ناسراوەکانی رۆژهەڵاتی ئەمریکا یان کۆمپانیا ناسراوەکانی واڵستریتەوە، هەندێ لە پۆستە بەرزە دەوڵەتییەکانیان سپاردە دەست ئەو دەستەبژێرە نوێیانەی شوناسێکی جیاوازیان هەبوو ـ جوولەکەکان، کاتۆلیکە ئیرلەندییەکان، ئیتالیاییەکان و دواجار ژنان، رەش پێستان، بە رەگەز لاتینییەکان و ئاسیاییەکان. (هەندێ گروپی بچووکی ناو دونیای WASP، واتە کلوپە بچووکەکانی پیاوان، تا ئێستایش ئامادە نین خۆیان بەرووی ئێتنیکەکانی‌تردا بکەنەوە، هەر بۆیە زۆربەی پێوەندییەکانیان لەگەڵ کۆمەڵگادا پچڕاوە. کلوپە مۆنۆپۆلکراوەکان[٣٥٧] لە کۆمەڵگای ئەمریکادا هێشتا هەر زیندوو و گەشاوەن، بەڵام لەسەر بنەمای پارە دەجووڵێنەوە نەک لەسەر بنەمای ئێتنیسیتە).

---

کۆمەڵایەتییەکاندا بەشدارییان نەکرد و کارێکیان بۆ نیشتمانەکەیان ئەنجام نەدا لەبەر ئەوە نییە کە بۆ ئاوەها کارێک هان نەدراون».

356. Qualified/ fit
357. Exclusive club

هەرچەند WASPییەکان تـا رادەیەک ناچـار بە ئەنجامـدانی ئەم کـارە بـوون بەڵام بێگومـان بەشێکیشـی لەبەر ئەوە بوو کە لە دروستبوونی ئەم کـارە دڵنیـا بـوون. ئەوان لە دووڕیـانی هەڵبژاردنـی ئیمتیازەکـانی خۆیان و بەهاکانی خۆیاندا، دووەم ڕێگایان هەڵبژارد.

کـۆمەڵێ لە خوێنـدەوارانی ژیـر و زیرەکـی زانکۆکـان چینـی تـازەی دەسـتەبژێرانی ئـەمریکایان پێـک هێناوە. ئەم دەسـتەبژێرانە بە بەراورد لەگەڵ دەسـتەبژێرانی کۆنـدا گەلـێ ناتەبـاتر[358]، شیاوسـالارتر[359] و بزۆزترن[360]، ئەوان ئاگاداری دەستەبژێربوونی خۆیان نین، ئەگەر شتێکیشی لێ بزانن حاشـای لـێ دەکەن. دەڵێن بیل گەیتس چەندین ساڵ پاش ئەوەی بوو بە یەک لە دەوڵەمەندترین پیـاوانی جیهـان، هێشـتاکوو بۆ ناوزەدکردنی خۆی بە چینی سـەرووتر لە مامناوەنـدیش دوودڵ و بەگومـان بـوو. خەڵکـی ئـەمریکایش هەر ئاوا بیریان دەکردەوە و تەنانەت تا ئەم دواییانەش کە سـەروەت و سـامانی بیـل گەیـتس و کەسـانی وەک ئەو هێند گەورە ببوویەوە کە ئیدی نەدەکرا پشتگوێ بخرێت، پێیان وابوو ئەمانە کـۆمەڵە مرۆڤێکـی ئاسـاییین کە بە ڕێـکەوت پـارەیەکی زۆر گەورەیـان دەسـت کەوتـووە. بەڵام ئەمە بۆچـوونێکی درۆ و خەسـارئامێزە گروپێکـی بچـووکی خەڵـک ـ رەنـگە یەک میلیـۆن کەس یـان [بە واتـایەک] نیـو لە سـەدی حەشیمەتی وڵات ـ یان [راستەوخۆ] بەڕێوەبەری زۆربەی دامەزراوە گەورەکـانی وڵاتە یەکگرتووەکـانن یـان بە جۆرێـک لە جۆرەکـان کـاریگەری و نفووزیـان لەسـەر ئەو دامەزراوانە هەیە. ئەم دۆخ و هەلـومەرجە دەتوانێ ئاسەواری سەیروسـەمەر لەسـەر وڵات دابنێـت[361]. ئەم جـۆرە کەسـانە بە بەراورد لەگەڵ تـاکێکی ئاساییی ئەمریکادا دەسـەڵاتێکی ئێجگـار مەزن و گەورەیـان هەیە. جـا ئەگەر نە خۆیـان و نە خەڵـک ئەو

358. In compatible
359. Meritocracy
360. Dynamic

٣٦١. دەسەڵات تەنیا بریتی نییە لە دەسەڵاتی ئابووری یان سیاسی. تیۆریی سەدە ناوەڕاسـتیی چینەکـان و ئەنجومەنەکان لەسەر ئەو ئەندێشەیە دامەزرابوو کە هەرکەس خاوەن توانست و شارەزاییەکی تایبەتی بێت بەرپرسایەتی و ئەرکی تایبەتیشی دەکەوێتە ئەستۆ. زانابوون مانای توانا بـوون. ئەگەر وائەزانـن سـەردەمی ئەم قسانە بەسەر چووە سەیرێکی ئەم بۆچوونانە بکە کە زیندەوەرزانێکی پایەبەرزی ئەمریکای باکوور بۆی باس کردم: «لە ناو ئێمەدا تەنیا چەند دەکەسێک هەیە شێوازی دروستکردنی شتی مەترسیداری راستەقینە بزانێ، مەبەستم شتگەلێکە کە دەتوانن لانیکەم بە دەیان هەزار مرۆڤ بکوژن. ئەم بابەتە هەستێکی سـەیرم تیا دەورووژێنێ، نازانم ئەم دەسەڵاتە چی لێ بکەم». نە خۆی و نە کۆمەڵگا قەت بیریان لەوە نەکـردۆتەوە ئاخۆ ئەو دەبێ چۆنـاوچۆن لەتەک ئەم زانسـتەدا بجووڵێتەوە. هەمـووان پێیـان وایە ئەو تەنیـا تـوێژەرێکی تاقیگەیە نەک کەسێکی ئاریستۆکرات، کەچی هەر ئەو ئێستا خـاوەن دەسـەڵاتێکی قـایرچواڵێ (Virtual) زۆرگەورەیە کە هیچکام لە پاشاکانی ئەورووپایش رۆژێ لە رۆژان نەیانبوو.

راستییە لەبەرچاو نەگرن کە ئەمانە لە هەموو ڕوویەکەوە نوخبە و دەستەبژێرن، [بێگومـان] هیچکامیـان ـ نە خۆیـان و نە خەڵـک ـ [تایبەتمەنـدی و پێداویسـتییەکانی] پـێگەی دەسـتەبژێر لەبەرچـاو نـاگرن. قەت پێمان وا نەبێ ئەگەر کەس ئـاوڕ لە دەسـتەبژێران نەداتەوە ئیـدی ئەوان دەسـەڵاتیان لـێ دادەمـاڵرێ. بە وتەی ڕۆدیـار کیپلینـگ ئەوان دەسـەڵاتیان هەیە بەڵام «دەسـەڵات بە بـێ ئەرک و بەرپرسـایەتی؛ واتە ئیمتیاز و تایبەتمەندیی پاوانکراوی سۆزانییەکان بە درێژاییی مێژوو». [٢٢]

بەکارهێنـانی[٣٦٢] ڕووت و زێـدەڕۆیانە و فیـز و دەمـاری یەکەم *«سـەردەمی زێـڕین»*[٣٦٣] بەقەدەر هەڵسوکەوت و کارەکانی دەوڵەمەنـدانی ئەمـڕۆ دەبـوو، بەڵام دەوڵەمەنـدانی ئەودەم نـیگەران بـوون نەکـا سەروەت و سامانەکەیان ئاسەوارێکی خراپی بەدواوە بێت، ڕەنگە هۆکاری ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئـایین یـا خود پاشماوەکانی پیۆریتانیزم[٣٦٤] لای ئەم مـرۆڤە دەوڵەمەنـدانە. بـۆ تێگەییشـتن لەم بـابەتە باشـتر وایە ئاوڕێک لە شێواز و چۆنیەتیی گوزەرانی هەندێ قوتابخانەی وەک گرۆتۆن لەم سێ چوار دەیەی ڕابـردوودا بـدەینەوە. نووسـتنگە و شـوێنی حەوانەوەی ئەم قوتابخانـانە تـاکوو حەفتاکـان هەنـدێ کـابینی ڕووت و قووت بوون کە نە دەرگایان هەبوو و نە بنمیچ و سەقف، هەروەها کەرەستەیەکی زۆر کەمیان تێدا بـوو و سـتێریۆ و تێلەڤیزیۆنیشـیان نەبـوو. بەیانییـان کـوڕانی قوتـابی بە ڕیـز دەوەسـتان، لە تەشـتی ئاسـنیندا جلوبەرگیان دەشت و حەمـامی ئـاوی سـاردیان دەکـرد. زۆربەی ئەو کـوڕانەی لە قۆنـاغێکی وەک دەیەی ١٩٢٠دا قوتـابیی گرۆتـۆن بـوون ئەنـدامی بنەمـاڵە هەرە دەوڵەمەنـدەکان بـوون و لەو مـاڵە خـانزادەیی و ئەشـرافییانەدا گەورە ببـوون کە بە دەیـان خزمەتکـار و کارەکەریـان هەبـوو. بەڵام ناچـار دەکـران لە هەلومەرجێکی سپارتیی تۆخ و لە قوتابخانەدا بژین. مێژوونووس و ڕۆژنامەوانێک بە ناوی نیکۆلاس لێمـان لەم بارەیەوە دەڵێت مەبەست لەم کارە «ئەوە بوو کە نەهێڵن کوڕە دەوڵەمەندەکان کەسـانێکی ناسـک و نـازدار و خۆشـگوزەرانیان لـێ دەربێـت. مەبەسـت لە پەروەردەکردنیـان دەوڵەمەنـدبوونەوەیان نەبـوو (بێگومـان ئەوان هەر دەوڵەمەنـد دەبـوونەوە) بەڵکـوو دەیانویسـت بیـانکەنە ئینسـانگەلێکی بـاش و سوودمەند». [٢٣] کەچی ئێسـتا قوتابخـانەی وەک گرۆتـۆن و ئەنـدۆویر و زانکۆی وەک هارڤـارد و یەیـل خوێندکارانیان فێری دەوڵەمەند بوونەوە یان لانیکەم سەرکەوتن لە کـار و پیشـەدا دەکەن. ئێسـتە ئەگەر خوێندکاران بە ئاراستەی چاکە و سوودمەندبووندا پەروەردە بکرێن، بە کارێکی دەسـتێوەردەرانەی تـێکەڵ بە داوەری و سـەختگیری لەقەڵەم دەدرێـت. یەک لـە خوێنـدکارانی کـۆنی گرۆتـۆن کە بەم دواییـانە

362. Consumerism.

٣٦٣ . سەردەمێکی مێژووی ئەمریکا لە دەیەی ١٨٧٠دا کە تایبەتمەندییەکانی بریتی بـوون لە پارەپەرستی و ماتریالیزمی هەمەلایەنە و گەندەڵیی تۆخ و ڕووت و قووتی سیاسی.و.ف

٣٦٤ . ئایینزایەکی مەسیحییە. و.ک

سەردانێکی قوتابخانەکەی کردۆتەوە، لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت: «نووسـتنگەکان بە رواڵەت هەر وەک ئەوسا ماونەتەوە، بەڵام ئێستا ستێریۆ و تێلەڤیزیۆنیان هەیە و هەر کەرەستەیەکت بوێت لەوێندەر دەیدۆزیتەوە. بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی ئێمەدا ئێستە گرۆتۆن وەک کێڵگەیەکی بەرهەمهێنانی مریشک وایە کە قوتابییان چاخ و قەڵەو دەکاتەوە. لۆکسگەرایی و ئەشرافیگەرییان[٣٦٥] بۆ ئێمە قەدەغە دەکرد بەڵام قوتابییانی ئەورۆ نوقمی ئەشرافیگەری کراون». من ناڵێم چۆنێتی و ئاستی قوتابخانەگەلێکی وەک گرۆتۆن دابەزینی بە خۆوە دیوە بەڵام وەک هەموو [رووبەرەکانی دیکەی] کۆمەڵگا، ئەوانیش زیاتر جەخت لەسەر سەرکەوتن دەکەن و کەمتر لەسەر کەسایەتی دەوەستن[٣٦٦].

گاڵتەکردن و پێکەنین بە دەستەبژێرانی ئەنگلۆ ـ ئەمریکایی زۆر ئاسانە، هەڵسوکەوتی ئەوان جۆرە فیز و دەمارێکی خۆبەسەرپەرشتزانینی[٣٦٧] تێدایە کە زادەی هەستی سەروەربوونی کولتوورییە. ئەوان هاوکات هێمای کۆمەڵە بەهایەکی دیاریکراویش بوون کە لە دیاریکردنی پێوەرەکانی کۆمەڵگادا کاریگەر و خاوەن دەور بوون، بەهای وەک وێژدان[٣٦٨]، نەرم و نیانی[٣٦٩] و ئازادی و، هەروەها هەستی بەرپرسیارێتی کە لە پرۆتستانیزمەوە سەرچاوەی گرتبوو. ئەڵبەت ئەم دابونەریتە دەستکردانە لەسەر بنەمای جیاوازیی رەگەزی رۆنرابوون و زۆرجار فۆرمالیتە بوون، ئەم دابونەریتانە کە زۆربەشیان بێهوودە و بێکەڵک بوون تەنیا بۆ پیشاندان و نمایشکردن بوون نەک بۆ رەچاوکردن و بەڕێوەبردن. کەوابوو ئەی بە کەڵکی چی دێن؟ هەروەها کە جان لۆکاکسی مێژوونووس نووسیویەتی: «رواڵەتسازی[٣٧٠] ئەو چەسپەیە کە ناهێڵێ شارستانییەت دابڕووخێ. پێوەرەکان نیشاندەری بەرزترین ئامانجەکانی کۆمەڵگان نەک نیشاندەری حەقیقەتە تاڵ و دڵتەزێنەکانی. کاتێ مرۆڤە بەهێزەکان دان بە بوونی هەندێ پێوەری دیاریکراو بۆ نرخاندنی کردار و هەڵسوکەوتدا دەنێن، مانای ئەوەیە هەر ئەندازەش ناڕاستەوخۆ بێ، قاییل بە هەندێ مەرج و سنوور بۆ دەسەڵاتی خۆیان هەن و بە کۆمەڵگا دەڵێن ئەو شتەی ئێمە داوای دەکەین و هەوڵی بۆ دەدەین، ئائەمەیە».

---

365. Luxury

٣٦٦ . رەنگە ئەم دیاردەیە لە دواناوەندییە باشەکاندا گەلێ گەورەتریش رووی دابێ، بەڵام وازهێنانی پێش زانکۆییەکانی ناوچەی نیوئینگلەند لە میتۆدی رابردووی خۆیان زۆر بەرچاوترە و بە ئاشکرا دەیبینین. ئەوسا پێچەوانەی ئێستا دەجووڵانەوە و زیاتر لەسەر کەسایەتی دەوەستان و زۆرکەم جەختیان لەسەر سەرکەوتن دەکرد.

367. Keeperized
368. Fairness
369. Dignity
370. Simulation

ڕەنگە ئەم دوانموونەیە بتوانێ گۆڕانی ڕوانگەی ئێمە لە ئاست پرسی دەستەبژێراندا شی بکاتەوە.[٢٤] لە نێوان فیلمی پڕفرۆشی *تایتانیک* و حەقیقەتە مێژووییەکانی ئەو ڕووداوەدا جیاوازی زۆرە، بەڵام یەکێکیان زۆر گرنگە. بەپێی فیلمەکە ئەوکاتەی کەشتییەکە لە ڕۆچوون و خنکاندایە موسافیرانی بەشی پلە یەک هەوڵ دەدەن خۆیان بە پاپۆڕە کەمەکانی نەجاتدان بگەیەنن. ژنان و منداڵان بە یارمەتی و هەوڵی بێوچانی مەلەوانە کەڵەگەتەکان نەبێ ناتوانن سواری پاپۆڕەکان بن، مەلەوانەکان بۆ دوورکردنەوەی دەوڵەمەندە چاوبرسییەکان چەک بەکار دێنن. بەڵام لە ڕاستیدا بەپێی گێڕانەوەی ئەوانەی لەو کارەساتە ڕزگاریان بووە، نزیک بە هەموو ئەوانەی لە چینە سەرەکانی کۆمەڵگا بوون بەتەواوی و بەبێ هیچ جۆرە جیاوازی و ئاوارتەکردنێک نەریتی «سەرەتا ژنان و منداڵان»یان ڕەچاو دەکرد. ئامارەکانی بەردەست ئەم حەقیقەتە پشتڕاست دەکەنەوە: لە بەشی پلەی یەکەمدا لە کۆی ١٤٤ ژن پێنجیان نەبێ هەموویان ڕزگار بوون، سێ کەس لەو پێنج ژنەش خۆیان دەیانویست لەگەڵ مێردەکانیاندا بمرن. لە بەرانبەردا لە سەدا حەفتای پیاوانی ئەو بەشە گیانیان لەدەست دا. لە بەشی پلەی دووەمیشدا کە شوێنی دەوڵەمەندە پرۆفیشناڵەکان بوو، لە سەدا هەشتای ژنان ڕزگار بوون و لە سەدا نەوەدی پیاوان خنکان. پیاوانی بەشی پلەی یەک تەقریبەن کۆی پێرستە چوارسەد کەسییەکەی گۆڤاری *فۆربزیان*[٣٧١] لەو سەردەمەدا پێک دەهێنا.دەڵێن جان جاکوب ئاستێر کە بە دەوڵەمەندترین کەسی ئەمریکای ئەودەم ناسرابوو، دوای تەقالایەکی زۆر خۆی گەیاندە پاپۆڕێک، ژنەکەی سەرخست و ئامادە نەبوو خۆی سەرکەوێ، [تەنیا] گەڕایەوە و ماڵئاوایی لە هاوسەرەکەی کرد. هەروەها بێنجامین گوگێنهایمیش ئامادە نەبوو سواری پاپۆڕەکە بێت و جێگاکەی خۆی بەخشییە ژنێک، تەنیا داوای لێ کرد ئەو پەیامە بە بنەماڵەکەی ڕابگەیەنێ: «بڵێ بە هاوسەرەکەم... تا دواسات ڕاستگۆ بووم. نابێ هیچ ژنێک لەبەر ئەوەی گوگێنهایم مرۆڤێکی ترسنۆکە لەم کەشتییەدا بە جێ بمێنێ». بە واتایەکیتر چەندین کەس لە بەهێزترین پیاوانی جیهان [تا دواسات] لەسەر نەریتێکی بەشەرەفانە مانەوە، هەرچەند لەسەر ئەو نەریتە گیانیشیان بەخت کرد.

بەرهەمهێنەرانی ئەم فیلمە هۆکارێکی باشیان بۆ دەسکاریکردنی چیرۆکەکە پێ بوو: کەس ئێستا باوەڕ بەم چیرۆکە ناکات. ئێمە چینە سەرەکانی کۆمەڵگامان لە هەموو جۆرە هەستێکی بەرپرسایەتی داماڵیوە و ئەوانیش بە خۆشحاڵییەوە قبووڵیان کردووە. لە گوتاری مۆدێرندا ئەوانیش ڕێک وەکوو هەموو تاکێکی وەک ئێمە وان، واتە کەسانێکی ئاساییـن. ئێمە جۆرێک دەجووڵێینەوە گوایە کۆمەڵگاکەمان هێند دیموکراتیک و بزۆزە کە لە ڕاستیدا هیچ دەستەبژێرێکی دەسەڵاتدار و حاکمی تێدا

---

٣٧١ . گۆڤاری *فۆربزی* ئەمریکا هەموو ساڵێ پێرستی ٤٠٠ دەوڵەمەندی یەکەمی ئەو وڵاتە بڵاو دەکاتەوە.و.ف

نییە. بەڵام دەستەبژێری حاکم نەمردووە، دەوڵەمەندان و دەسەڵاتداران هەمیشە و هەمووکات زیندوون و هەر دەمێننەوە. ئێمە تەنیا دەتوانین ئەو داواکارییە بخەینە بەردەمیان کە ئەو حەقیقەتە قبووڵ بکەن کە ئیمتیازەکانیان بەرپرسایەتیشیان دەخاتە ئەستۆ. نەریتە کۆمەڵایەتییەکان، ڕێکخراوە پرۆفیشناڵەکان، مەرجە ئەخلاقییەکان، فێرگە پێش زانکۆییەکان، دابونەریتی نەجیبزادەکان، ڕێکخراوە پرۆفیشناڵەکان، مەرجە ئەخلاقییەکان، فێرگە پێشزانکۆییەکان، دابونەریتی نەجینرادەکان، هەرهەموویان کۆمەڵە هەوڵێک بوون بە ئاراستەی پەروەردەی کۆمەڵایەتیی دەسەڵاتداراندا. پێشتر کۆمەڵگای ئەمریکا داوای لەم پیاوان و ژنانە دەکرد هەڵسوکەوتێکی جوان و ڕێکوپێک بژین و تا ڕادەیەک لە ژیانی سیاسیی نیشتماندا بەشداری بکەن.

لە نزیک پارکی پێتۆمەکی ڕۆژهەڵات لە شاری واشینگتۆن، پەیکەرەیەکی هەستبزوێن دانراوە، پەیکەرەکە پیاوێکە وەک مەسیح دەستەکانی کردۆتەوە، لەسەر کەتیبەی سەر ئەستوونەکەیدا نووسراوە: «بۆ هەموو پیاوانی نەترسی تایتانیک کە گیانی خۆیان لە پێناو ڕزگارکردنی ژنان و منداڵاندا بەخت کرد». ئەم پەیکەرەیە بە پارەی پێشکەشیی ٢٥٠٠ ژنی سەرانسەری ئەمریکا دروست کراوە. هەرکات گەورە پیاوانی کۆمەڵگا لەسەر ئامانجەکانیان پێداگر و وەفادار بوایەن کۆمەڵگایش ڕێزی لێ دەگرتن، هەرکاتیش وەفادار نەمایەنەوە کۆمەڵگا بە قووڵی پەشێو و نائومێد دەبوو. لەمڕۆدا چاوەڕوانییەکانی ئێمە لە دەسەڵاتداران زۆر کەمە و ئەوانیش زۆر کەم نائومێدمان دەکەن.

# دەرئەنجام

## ڕێگەچارە

سەرەکیترین تایبەتمەندییەکانی سەدەی بیستەم بریتی بوو لە دوو ڕەوتی گەورە و بەربڵاو: بە ڕێسایینکردنەوەی[372] سەرمایەداری و ریساسرینەوە[373] لە دیموکراسی. لە هەردووکیشیاندا زێدەڕۆیی کرا. ئەم دوو ڕەوتە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەو سەردەمە، واتە بۆ سەرمایەداریی کۆنترۆڵنەکراو و ئۆلیگارشی، ڕێگەچارەی گونجاو و لۆژیکاڵ بوون. بەڵام وەک چۆن ئۆلین وو لە ڕۆمانە کۆمێدییەکەیدا بە ناوی *مەلاقە* وتوویەتی، هەموو هزرێکی باش تەنیا «تا ڕادەیەک» جێی متمانەیە.

لە ساڵانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا مرۆڤ وایدەزانی بازاڕی ئازاد[374] و بازرگانیی ئازاد[375] ئاسۆی حەتمی و بێچەندوچوونی بەردەم داهاتووی جیهانە. لەملا و ئەولای دونیادا وڵاتانی جۆراوجۆر کەوتبوونە بازرگانی و مامەڵەوە و بۆ ئەم مەبەستەش بازاڕەکانی خۆیان و لە ڕاستیدا هەرهەموو ڕووبەری کۆمەڵگایان بە ڕووی دونیادا کردبووە. بازاڕەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەگەشانەوە. بەڵام لە ساڵانی پێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا ئاوسانی قورس[376] و «قەیرانی گەورە» بوون بە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژووی ئابووریی ئازاددا. لەو سەردەمە بەدواوە ئەگەر کێشەیەک ڕووی دابا ـ کێشەی ئابووری، کۆمەڵایەتی یان سیاسی ـ تاقە ڕێگەچارەیەک دەیاندۆزییەوە تەنیا و تەنیا دەستێوەردانی دەوڵەت بوو. هەموو قەیرانێک کۆمەڵە ڕێسایەکی تازەی لێ دەکەوتەوە و ڕێسای تازەیش بۆرۆکراسی و دابونەریتی ئیداریی تازەی بەرهەم دەهێنا. هەر بۆیە لە زۆربەی ساڵانی سەدەی بیستەمدا سەرمایەداری وەک تۆمەتبارێک لەقەڵەم دەدرا و چاودێری و

---

372. Regularization
373. Deregulation
374. Free market
375. Free trade
376. Galloping inflation

کۆنترۆڵی لەسەر دادەنرا، دەبەسترایەوە بە ئیجازە و مۆڵەتنامەی رەسمیەوە و تەنانەت بە دەوڵەتی دەکرا و دەخرایە ژێر رکێفی دەوڵەتەوە. ئەم بابەتە بە شێوەیەک رەگی داکوتا کە مێژوونووسی ناسراوی بریتانیایی، ئەی.جی.پی.تەیلۆر، لە ١٩٤٥دا تەنانەت ئەوەشی راگەیاند کە «کەس باوەڕی بە شێوە ژیانی ئەمریکایی، واتە کار و کەسابەتی ئازاد، نەماوە». ئێلیزابێتی دووەم مەلەکەی بریتانیا کاتێ کە لە ١٩٦١دا سەردانی وڵاتی غەنای کرد وەک «گەورەترین مەلەکەی سۆسیالیستی جیهان» پێشوازیی لێ کرا و تەنانەت دەوڵەتی کۆنەپارێزی ئەودەمی بریتانیایش ئەم نازناوەی وەک ستایشێک لەقەڵەم دا. ریچارد نیکسۆن، سەرۆکی کۆماریخواز و کۆنەپارێزی وڵاتە یەکگرتووەکان گەڵاڵەی کۆنترۆڵکردنی مووچە و نرخەکانی لە ساڵی ١٩٧١دا بەسەر ئابووریی ئەو وڵاتەدا سەپاند و رایگەیاند «ئێستە ئێمە هەموومان کەنیزین[٣٧٧]»، ئەم کارەی نیکسۆن رەنگدانەوەی ئەو روانگە باوە بوو کە پێویستە دەوڵەت دەستێوەردانی سەرمایەداری بکات و لە شپرزەیی دەری بهێنێ و رێکوپێکی بکات، روانگەیەک کە تەنانەت ئەمریکایشی گرتبۆوە.

دیموکراسی ئاراستەیەکی پێچەوانەی ئەم رێگایەی گرتبووە بەر. جان دیویی، فەیلەسوفی بەرجەستە و کاریگەری ئەمریکایی، ساڵی ١٩٢٧ وتی: «رێگەچارەی برینە قووڵەکانی دیموکراسی، دیموکراسیی فرەترە». دیویی پێشگۆیەکی باش بوو. بەشی هەرەزۆری کێشەکانی بەردەم زۆربەی دیموکراسییەکانی سەدەی بیستەم بە رێگەچارەی وەک پەرەپێدانی مافی دەنگدان، لابردنی هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆ، کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دەستەبژێران و بەخشینی بە ژمارەیەکی زیاتر و زیاتر و زیاتری خەڵک لە رێگاگەلێکی زیاتر و زیاترەوە، هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدرا. ئەم هەوڵانە گەلێ دەرئەنجامی وروژێنەر و هەست بزوێنیان لێ کەوتەوە. لە ئەمریکادا دیموکراسیی فرەتر مانای ئەوەی رەشپێستان و ژنان مافی دەنگدانیان بەدەست دەهێنا، سێناتۆرەکان راستەوخۆ هەڵدەبژێردران، کاندیداتۆری حیزبەکان بە دەنگی خەڵک دیاری دەکران و، کلوپەکان گۆڕانکارییان لە خەسڵەت و رێساکانی خۆیاندا دەکرد. مێژووی سیاسیی سەدەی بیستەم چیرۆکی بەشداریکردنی سیاسیی راستەوخۆی زیاتر و زیاتر بوو و سەرکەوتنی ئەم رەوتە بوو بە هۆی

---

٣٧٧. John m Keynes: ئابووریزانی بریتانیایی (١٨٨٣ـ١٩٤٦) کە تیۆرییە ئابوورییەکانی لە سەردەمی قەیرانە گەورەکەی ئەمریکادا کەوتە رۆژەڤەوە. ئەو پێی وابوو لە کاتی قەیرانی ئابووریدا دەبێ دەوڵەت بەپرسایەتیی کەمبوونەوەی بوودجە بگرێتە ئەستۆ و بۆ پاراستنی ئاستی کار ( Level of employement) لە کۆمەڵگادا تەنانەت زیاتر لە رێژەی داهاتی خۆی سەرمایەگوزاری بکات، چونکوو لە ئاوەها دۆخێکدا کەرتی تایبەت خۆی لە قەرەی سەرمایەگوزاری نادات.و.ف

پەرەسەندنی هەرچی زیاتری رووبەری دیموکراسی. نەخۆشینەکە هەرچی بوایە، تەنیا بە دیموکراسیی فرەتر هەوڵی سارێژکردنی دەدرا.

لە حەفتاکانی سەدەی بیستەم بەملاوە خواستێکی گەورە بۆ بەرێساییکردنی سەرمایەداری دروست بووبوو کە بوو بە هۆی دیاریکردنی پیتاکی قورس و بە شێوەیەکی بیزانسی کۆنترۆڵە دەوڵەتییەکانیشی پەرە پێدا. لە بیست ساڵی رابردوودا دەوڵەتانی سەرانسەری جیهان، لە ئەمریکاوە بگرە بۆ فەرەنسا و هێندستان و برێزیل، سەرقاڵی رێسا سڕینەوە لە پیشەسازی، بەتایبەتیکردنی[378] کۆمپانیاکان و کەمکردنەوەی پیتاکە بازرگانییەکان[379] بوون. ئێستا کە وردە وردە گەشەی ئابووریی دوایین ساڵەکانی دەیەی ١٩٩٠ روو لە کۆتاییە، پێویستە زنجیرە رێسایەکی تازە دابڕێژرێ و جارێکیتر گرنگایەتیی رۆڵی دەوڵەت لە سەرمایەداریدا پێناسە بکرێتەوە. بەڵام رەنگە کەمتر وڵاتێک میتۆد و رەوتە زێدەڕۆیانەکانی ئەم نەوەی رابردووە بگرێتەوە بەر. ئیدی دەوڵەت هەمەکارەی بەستێنی ئابووری نییە.

بە هەمان شێوە رێساسڕینەوە لە دیموکراسیش تووشی زێدەڕۆییەکی قورس بووە و بۆتە هۆی پێکهاتنی سیستەمێکی گران و پڕ لەمپەر کە لای خەڵک هیچ رێز و حورمەتێکی نییە و بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگایش ناشێ. هەرچەند کەس ناوێرێ خراپەی دیموکراسیی ئەورۆ بڵێت بەڵام زۆربەی خەڵک بەپێی غەریزەی خۆیان هەست بە کێشەیەک دەکەن. لە هەرهەموو دیموکراسییە پێشکەوتووەکاندا رێزدانانی گشتی بۆ سیاسەت و سیستەمە سیاسییەکان لە خوارترین ئاست و پلەی خۆیدایە. لە هەمووی سەیرتر و سەرنجڕاکێشتر ئاکامی راپرسییەکانە، بەپێی وەڵامەکانی خەڵکی ئەمریکا، لە هەرهەموو راپرسییە یەک لەدوای یەکەکاندا کاتێ ئەو پرسیارە ئاراستە دەکرێ کە لە نێو دامەزراوە دەوڵەتییەکاندا کامیانت لە هەموو خۆشتر دەوێ، هەمیشە سێ رێکخراو زیاترین دەنگەکان بەدەست دەهێنن: دیوانی باڵای وڵات، هێزە چەکدارەکان و بانکی ناوەندی. هەر سێ رێکخراوەکە لە یەک شتدا هاوبەشن: زەخت و گوشاری گشتی و جەماوەرییان لەسەر نییە و بە میتۆدێکی نادیموکراتیک کار دەکەن. وا دیارە ئەمریکاییەکان رێک لەبەر ئەوە ستایشی ئەم رێکخراوانە دەکەن کە شوێنکەوتوو[ی کەس] نین بەڵکوو پێشەنگن. کەچی کۆنگرێس کە هەڵبژێردراوانەترین[380] دامەزراوەی سیاسییە و زیاتر لە هەموو دامەزراوەکانیتر رەنگدانەوەی دەنگ و بیروبۆچوونی خەڵکە، لە زۆربەی راپرسییەکاندا خوارترین پلەی بەدەست هێناوە. خەڵک بە

---

378. Privatization
379. Trade tariff
380. Elective

نیگەرانی و تەنانەت رقەوە سەیری ماستاوچێتی و بەرهەمەکەی، واتە بێتوانایی، دەکەن. ئەڵبەت ئەمە بەو مانایە نایەتەوە کە وازیان لە ستایشکردنی ئەو پرۆسانە هێناوە کە ماستاوچێتی بەرهەمی بێچەندوچوونیانە.

## دیموکراسیی نوێنەرایەتی[381]

ئێمە لە دۆخە هەستیارەکاندا قەت بەرپرسایەتیی سیاسەتی رۆژانە ناگرینە ئەستۆ. هیچ سیستەمێکی دیموکراسی قەت لە رێگای دەنگدانی حەفتانەوە شەڕێکی بەڕێوە نەبردووە. تەنیا ئەو دەوڵەتانە دەتوانن شەڕی دژە تیرۆر بەڕێوە بەرن کە کۆمەڵگاکەیان ئازادییەکی فراوانی پێ بەخشیون. ئێستە ئێمە بەرەورووی هەندێ هەڕەشەی تازە بووینەتەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا دەوڵەتەکانیش کۆمەڵێ زەحتی قورس و تازە لە بەردەم خۆیاندا دەبینن. دەبێ سیستەمە دیموکراسییەکان بیسەلمێنن کە بە باشی دەرەقەتی تیرۆریزم دێن، ئەگینا لە زۆرێ لە وڵاتانی روو لە گەشەدا رژێمی ئۆتۆریتەخوازی تازە جڵەوی دەسەڵات دەگرنەوە دەست. پێویستە وڵاتانی روو لە گەشە، بەتایبەت وڵاتانی دونیای ئیسلام، هاوسەنگییەکی دژوار پێک بهێنن. لەلایەکەوە پێویستە هێند بەهێز بمێننەوە کە دەرەقەتی هەڕەشە نوێیەکانی تیرۆریزم بێن و لەلایەکیتریشەوە هێند کراوە و دیموکراتیک بن کە نەبنە هۆی کەوتنەوەی ئەو جۆرە نارەزایەتییە سیاسییانەی کە وردەوردە بەرەو زێدەڕۆیی و رادیکالیزم دەڕۆن. بە واتایەکیتر دەبێ ئەوان بەبێ ئەوەی ببنە هۆی دروستبوون [و بەرهەمهێنانەوەی] تیرۆریزم تیرۆریستەکان بکوژن. بەم شێوەیە هەر سێ فاکتەرەکەی دەوڵەت واتە «دەسەڵات و شەرعییەت و لێهاتوویی[382]» پێکەوە دەتوانن سەرکەوتن مسۆگەر بکەن و لە دووتوێی سیکلێکی[383] کارامە و رێکخەردا هەرکامەو بێتە هۆی بەهێزبوونەوەی ئەویتریان. بەڵام ئەگەر دۆخەکە بەرەو خراپە و شپرزەیی بچێ ئەم سیکلە کارامەیە دەگۆڕدرێ بۆ سیکلێکی رووخێنەر - و شەڕانگێز. سەرکوتکردن رادیکالیزم بەرهەم دەهێنێ و رادیکالیزمیش سەرکوتکردنی زیاتری لێ دەکەوێتەوە. شێوازی هەڵسوکەوتی رووسیا لە چیچان نموونەیەکی دڵتەزێنە لەم گێژاوە نوقمکەر و چەقێنەرە.

بەجیهانیبوون[384] هەندێ کێشەی تایبەتی بەرهەم هێناوە. ئابووریی جیهانی رۆژ لەدوای رۆژ کرانەوەی زیاتر بەخۆوە دەبینێ و ئەمەش دەوڵەتەکانی ناچار کردووە لە پێناو پاراستنی

---

381. Representative democracy
382. Power , legality, efficient
383. cycle
384. Globalization

درێژخایەنی سەقامی داراییدا کۆمەڵە سیاسەتێکی سەختگیرانە بگرنە بەر. ئەگەر بێت و ئەم کارە نەکەن بازاڕەکان گەلێ قورستر و خێراتر لە هەمیشە بەرهەڵستی وڵاتان دەبنەوە و پارە و پووڵ و بازاڕەکانی بوورسیان بەرەو هەڵکشان و داڕووخان دەبەن. بەڵام سیاسەتی درێژخایەن هەندێ کێشەی کورتخایەنیش لەگەڵ خۆیدا دێنێ: کێشەی دەنگدەران. ئاڵوگۆڕە دیموگرافیکەکان[٣٨٥] دەوڵەتانی رۆژئاوا مەجبور دەکا لە سیستەمی دابینکردنی کۆمەڵایەتیی[٣٨٦] خۆیاندا ریفۆرم و هاوسەنگی[٣٨٧] بکەن، بەتایبەت دەبێ ئەم ریفۆرمانە لە ئاستی ماف و مووچەی بەساڵاچوواندا جێبەجێ بکەن. دیارە ئەم کارە تا رادەیەکی زۆر کارێکی نەکردە و مەحاڵە، چونکوو بەساڵاچووان لە رووی سیاسییەوە بەهێزن: ئەوان خاوەن یەکگرتوویی و رێکخستنن، یارمەتیی ماڵی پێشکەش دەکەن، زنجیرە لۆبییەکی کاریگەر و بەهێزیان هەیە و، هەمیشە لە هەڵبژاردنەکاندا بەشداری دەکەن. بەڵام بێگومان ئەگەر بمانەوێ ریفۆرمێکی راستەقینە بکەین پێویستە هەندێ لە مووچە و ئیمتیازەکانی ئەوان کەم بکەینەوە. دەوڵەتەکان ناچارن [لە نێوان رێگا و خاڵە جیاواز و دژ بە یەکەکاندا] هەندێ هەڵبژاردنی سەخت و دژوار ئەنجام بدەن، [هەروەها] لە بەرانبەر وەسوەسەی ماستاوچێتی و خۆش خزمەتیدا بوەستن و سیاسەتگەلی درێژخایەن بگرنە بەر. لە دیموکراسییەکی مۆدێرندا تاکە رێگا بۆ دەستەبەرکردنی ئەم ئامانجانە ئەوەیە نەهێڵین دەستەیەک لە بڕیاردەران بکەونە ژێر زەخت و گوشارە قورسەکانەوە، واتە ئەو کۆمەڵە بڕیاردەرە لە گوشارە قورسەکانی گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان، لۆبییەکان و ململانێ سیاسییەکان یان بە دەربڕینێکی تر لە گوشارە قورسەکانی دیموکراسی بپارێزین.

ئەم دیاردەیە هەر لە ئێستاشەوە خەریکە خۆی دەسەپێنێ. بەرچاوترین نموونەی ئەم رەوتە بریتییە لە دروستبوونی بانکە ناوەندییە سەربەخۆکانی وەک بانکی ناوەندیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لەم سی ساڵەی دواییدا سەریان هەڵداوە. هەنووکە لە زۆربەی سیستەمە دیموکراسییە پێشکەوتووەکاندا رێکخراوێکی هەڵنەبژێردراو[٣٨٨] کۆنترۆڵی بەهێزترین کاراکتەرە ئابوورییەکانی دەوڵەت دەکات و ئەم میتۆدە میتۆدێکی سەرکەوتوو بووە. هەرچەند سەربەخۆیی بانکە ناوەندییەکانیش هەڵگری کۆمەڵە کێشەیەکی تایبەت بە خۆیەتی بەڵام بۆتە هۆی ئەوەی سیاسەتە پووڵییەکان[٣٨٩] گەلێ بەرپرسیارانەتر دابڕێژرێن. لە ئاکامی ئەم دیسیپلینەدا سیکلی هەڵچوون و

385. Demographic changes
386. Social security
387. adjustment
388. Non - elective
389. Monetarypolicy

داچوونەکانی ئابووری کە سەردەمانێ زۆر توند و گران بوو هەنووکە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تا ڕادەیەک هێورتر و نەرمتر دەبێتەوە. قەیرانە ئابوورییەکەی ٢٠٠٠ ـ ٢٠٠٢ کە دوای درێژخایەنترین قۆناغی گەشانەوەی ئابووریی نیو سەدەی رابردوو رووی داوە، هێشتا (واتە تا کاتی نووسینی ئەم کتێبە) گەلێ لەوی زۆرکەس پێشبینیان دەکرد و لێی دەترسان، هێورتر و کەم خەسارترە.

بانکە ناوەندییەکان تاکە نموونەی ئەم دیاردەیە نین: ڕێکخراوی یەکێتیی ئەورووپا لەبەر ئەوەی سروشتێکی نادیموکراتییانەی هەیە دڵەخورپە و نیگەرانییەکی زۆری لە نێو خەڵکی ئەو ناوچەیەدا دروست کردووە. ئەم ڕێکخراوە بە گەورەترین نموونەی سیاسەت دارشتنی نادیموکراتییانە لەقەڵەم دەدرێت، هەر بۆیە دەیخەنە بەر هێرش و رەخنەوە. هەرچەند ناخۆشە بەڵام لە راستیدا هۆکاری راستەقینەی لێهاتوویی و کارامەبوونی یەکێتیی ئەورووپا دەگەڕێتەوە بۆ پارێزراوبوونی ئەو ڕێکخراوەیە لە گوشارە سیاسییەکان. لە حەفتاکانەوە ئابوورییە دەوڵەتییەکانی ئەورووپا دوچاری کێشە هاتبوون و گرووپە خاوەن بەرژەوەندییە بەهێزەکان کە زۆربەیان لایەنگری سیاسەتی پشتیوانیکردن لە پیشەسازییە ناوخۆییەکان بوون و هەرهەموویان بەرنگاری گۆڕان و ئاڵوگۆڕ دەبوونەوە، ببوونە هۆی فەلەجبوون و پەککەوتنی دەوڵەتەکان. ئەگەر لەم دە ساڵەی رابردوودا ئەورووپا توانیویەتی لە رووبەرە ماڵی و پوولی و یاساییەکاندا کۆمەڵە چاکسازییەکی گەورە و بەرچاو ئەنجام بدات، بێگومان هۆکارەکەی تەنیا و تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ هێز و دەسەڵاتی یەکێتیی ئەورووپا. ئەگەریش لە هەندێ بابەتدا نەیتوانیبێ سیاسەتەکانی خۆی بگۆڕێ دەوڵەتە دیموکراتیکەکانی ئەندامی ئەو ڕێکخراوەیە هۆکاری ئەم کەموکورتییە بوون. تەنانەت تاکە یەک حیزبی گەورەی سیاسیشمان لە ئەورووپادا نەبووە بوێرێ پشتیوانی لە ریفۆرمە پێکهاتەییەکان[٣٩٠] بکات، ئەمە لە حاڵێکدایە کە هەموان لە زەروورەت و پێویستبوونی ئەم ریفۆرمانە بۆ گەشانەوەی درێژخایەنی ئابووریی ئەورووپا ئاگادارن. یۆزێف یۆفە، سەرنووسەری گۆڤاری دای تسایتی ئەڵمانیا، پێی وایە: «یەکێتیی ئەورووپا سەرەکیترین و لە راستیدا تاکە هۆکاری ریفۆرمەکانی بازاڕی ئازادی ئەورووپایە. ئەگەر برۆکسێل نەبایە نەماندەتوانی [پرۆسەی] ڕێساسڕینەوە لە هیچکام لە پیشەسازییە گەورەکانماندا جێبەجێ بکەین». ئەگەر ئەورووپاییەکان ترسی دواکەوتن لە ئامانجە بوودجەییەکانی یەکێتیی ئەورووپایان نەبایە قەت وڵاتێکی وەک ئیتالیا هەوڵی دابەزاندنی رێژەی کەمبوونی بوودجەکەی[٣٩١] خۆیی نەدەدا. ئەگەر برۆکسێل نەبێ کەس هەوڵی ریفۆرمکردن لە سۆبسیدە بێکەڵک و بێهوودەکانی ئەورووپادا نادات.

---

390. Structuralreforms
391. Budget deficit

دونیای ئەنگلۆ ـ ئەمریکایی سیمایەکی گاڵتەجاڕ و کۆمێدیی بۆ یەکێتیی ئەورووپا دروست کردووە. ئەمریکاییەکان و بریتانییەکان ـ واتە ئەو خەڵکانەی هەنووکە لە دووڕیانی تێکەڵبوون یان تێکەڵنەبوون بە پارەی یەکگرتووی ئەورووپا، یۆرۆ، تووشی دڵەخورپە و دوو دڵیی فیکری بوون ـ بۆچوونێکی کۆنکرێت و سادەیان هەیە: یەکێتیی ئەورووپا ڕێکخراوێکی گەورە و بۆش و نادیموکراتیکە و خەریکە ڕەنگاوڕەنگیی سیحرئامێزی ژیانی ئەورووپایی لەناو دەبات. ((«کاربەدەستە هەڵنەبژێردراوەکانی برۆکسێل چۆنییەتیی دروستکردنی بیرە فێری بیرەسازە بریتانییەکان دەکەن!» ئیدی گوێ نادەن بەو حەقیقەتە کە زۆربەی ئەم نەریتە کۆنە خۆماڵییانە لەمپەرگەلێکی پشتگیرییانەن[392] لە بەردەم [دروستبوونی] ڕکابەریدا). زۆربەی ئەوانەی لە بریتانیا و ئەمریکادا ڕەخنە لە ئەورووپا دەگرن لایەنگرە پڕ تین و بەگوڕەکانی بازرگانیی ئازادن. بەڵام نەیارانی ئەم ڕێکخراوەیە لە خودی ئەورووپادا ـ واتە لەو شوێنەدا کە یەکێتیی ئەورووپا بە تەواوی ئەکتیڤ و کارایە ـ پێچەوانەی ئەوان بیر دەکەنەوە. هەموومان لە بەدگومانیی دانمارک بەرانبەر بە یەکێتیی ئەورووپا و یۆرۆ ئاگادارین. بەڵام پۆل نایرۆپ ڕاسمۆسێن، سەرۆک وەزیرانی پێشووی دانمارک کە لە زانستی ئابووریدا خوێندوویەتی، پێی وایە زۆربەی نەیارانی یەکێتیی ئەورووپا لەو وڵاتەدا «ئەو کەسانەن کە لە بەجیهانیبوون دەترسن: کرێکارانی ئاماتۆر، ژنان و فەرمانبەرانی دەوڵەت. ئەوان پێیان وایە یەکێتیی ئەورووپایش تەنیا لایەنێکە لە لایەنەکانی دونیای تازەی سەرمایەداریی جیهانی و بازاڕە ئازادەکان». هەر لەبەر ئەمەشە کە یەکێتیی ئەورووپا و ڕێکخراوە هاوشێوەکانی دەیانەوێ بمێننەوە و درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن. سەرەڕای هەموو ئەو ڕەخنانەی کە ئاراستەی ئەم ڕێکخراوانە دەکرێت، لە ڕاستیدا هیچ وڵاتێک لە دونیای ئەوڕۆدا ناتوانێ لە ڕێگای ڕیفراندۆمەوە نرخی سوودەکان[393] دیاری بکات یاکوو سیاسەتی دژەپاوان[394] دابڕێژێ. زۆربەی ئەو کارانەی کەوتوونەتە ئەستۆی برۆکسێل، وەک سیاسەتگەلی یاسایی، بازرگانی، پووڵی و دژە پاوانکاری، لە زۆربەی وڵاتانی دیکە و لە خودی وڵاتە یەکگرتووەکان و بریتانیایشدا دوور لە هەر چەشنە زەخت و گوشارێکی سیاسی جێبەجێ دەکرێن.

زۆرجار ڕێکخراوەگەلی وەک یەکێتیی ئەورووپا تاوانبار دەکرێن بەوەی کە دەسەڵاتێکی ڕەهایان هەیە و کەس ناتوانێ چاودێرییان بەسەردا بکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم تۆمەتانە هیچکامیان ڕەوا و دروست نین. بە ئاستی یەکەم دەسەڵاتی یەکێتیی ئەورووپا زۆر گەورەتر لەقەڵەم دراوە و لە

392. Protectiveobstacles
393. Interestrate
394. Anti -monopoly

راستیدا گەلێ لەوە بچووکترە کە مەزەندەی بۆ دەکرێت. کۆی بوودجەی برۆکسێل تەنیا تۆسقاڵێک لە یەک لە سەدی سەراپای بەرهەمی نەتەوەییی وڵاتانی ئەندامی یەکێتیی ئەورووپا فرەترە. یەک لە شارەزاترین توێژەرانی ئەمریکا لە بواری کاروباری ئەورووپادا، واتە ئەندرۆ مۆراوسیک، ئەڵێ کۆمیسیۆنی ئەورووپایی جیا لە وەرگێڕەکان و کارمەندانی ئیداری[395] تەنیا ٢٥٠٠ فەرمانبەری هەیە، واتە «کەمتر لە هەموو شارێکی مامناوەندیی ئەورووپا و کەمتر لە یەک لە سەدی فەرمانبەرانی دەوڵەتی فەرەنسا». سەبارەت بە سروشتی نادیموکراتیکی ئەو رێکخراوەش پێویستە بڵێین کە پەسندکردنی هەر یاسایەک بەستراوەتەوە بە لە سەدا ٧١ی دەنگی دەوڵەتانی نەتەوەییەوە (بە لەبەرچاوگرتنی ژمارەی ئەو دەنگانەی بە هەر دەوڵەتێک دراوە)، کە «ئەم رێژەیە فرەترە لەو رێژەیەی بۆ گۆڕینی دەستووری ئەمریکا پێویستە». مۆراوسیک لە درێژەی قسەکانیدا بە بەڵگاندنێکی بەهێز قەناعەتمان پێ دەکا و دەڵێ نابێ یەکێتیی ئەورووپا بە رێکخراوێکی سۆپەردەوڵەتی[396] بزانین بەڵکوو دەبێ وەک رێکخراوێکی نێونەتەوەیی پێناسەی بکەین. یەکێتیی ئەورووپاش وەک زۆربەی رێکخراوە هاوشێوەکانی رەنگدانەوەی خواست و داوای دەوڵەتانی ئەندامیەتی. یەکێتیی ئەورووپا بەرەو گەورەکردنەوەی دەسەڵاتی خۆی هەنگاوی نەناوە بەڵکوو بە پێچەوانەوە لە زۆربەی بابەتەکاندا خەریکی هاوسەنگی و خۆبچووککردنەوەیە؛ [ئەو خەریکە] ئۆتۆریتەی خۆی بە ئەقڵانی دەکات و پێوەندییەکانی لەگەڵ ئەندامانیدا شەفاف و روون دەکاتەوە. سەرکردەکانی ئەورووپا دەیانەوێ یەکێتییەکی گەورەتری ئەورووپایی بەڵام بە سنوور و چوارچێوەی دیاریکراوتر و روونترەوە دروست بکەن تاکوو توانای رێکوپێککردنی ئەو ئەرکانەی هەبێ کە تا ئێستا گرتوونیەتە ئەستۆ.

## کێشەی شەرعییەت

بەڵام کێشەکانی بەردەم یەکێتیی ئەورووپا دەتوانێ کێشە بنەڕەتییەکانی رژێمە دیموکراسییە پێشکەوتووەکانیشمان زیاتر بۆ شی بکاتەوە. داواکارییەکان بۆ دەسەڵاتداریی باش رۆژبەرۆژ زیاتر تەشەنە دەسێنێ، بەڵام ئەو رێکخراوانەی کە وا لەم سەردەمە دیموکراتیکەدا بۆ بەدیهێنانی ئەم بابەتە گرنگە ئاوا کراون، خاوەن شەرعییەت و رەوایی نین. هەندێ پۆپۆلیستی وەک ژان ماری لۆپەن لە فەرەنسا، پەت بوچانان لە ئەمریکا و یۆرگ هایدێر لە نەمسا دەسەڵاتی سارد و بێگوێی ئەم دامەزراوانە وەبەر جنێو دەدەن. ئەوان ئەم دامەزراوانە دەبەستنەوە بە نامۆییەوە کە هەستێکی

---

395. Clerk / white - collarworkers
396. Super governmental

راستەقینە و هەستپێکراوە. ئەگەر نرخی سوود بەرز بکرێتەوە، یان ڕێکەوتننامەیەکی بازرگانی ئیمزا بکرێ، یاکوو پرۆسەی ڕێساسڕینەوە لە ئاست پیشەسازییەکاندا بەڕێوە ببرێ، یەکسەر پۆپۆلیستەکان دەیکەنە هەرا و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هەموو ئەم کارانە لە لایەن ئەو ڕێکخراوە درێو و چەپەڵانەوە بەڕێوە براوە کە بە شێوەی نهێنی کار دەکەن. بەڵام هۆکاری راستەقینەی لێهاتوویی ئەم دامەزراوانە دوور بوونیانە لە سیاسەتی رۆژانە. ئەوان گەلێ دەستکەوتی بەپێزیان بۆ هاووڵاتییانی ئاسایی دەستەبەر کردووە، کە لە فۆرمگەلێکی وەک گەشەسەندنی تۆختر و بەبرستتری ئابووری، کاردانەوەی زیاتری بەستێنی بەرهەمهێنان، دۆخی بەسەقامی ماڵی و دەرفەتی زۆر گەورەتر و زیاتری ئابووریدا رەنگی داوەتەوە. ئاخۆ چۆناوچۆن دەتوانین ئەم کێشەیە چارەسەر بکەین و هاوکات لەگەڵ دروستکردنی دەوڵەتێکی لێهاتووتردا شەرعییەتیش بۆ دەوڵەت دابین بکەین؟

چاوەڕێی یارمەتیدانی تیۆریسیەنەکانی دیموکراسی مەبن. سەرەڕای ئامادەبوونی سەدان ڕێکخراوی هەڵنەبژێردراو کە لەکاتی بریاروەرگرتندا یارمەتیی دەوڵەتەکان دەدەن، کەچی زۆربەی ئەو فەیلەسوفە سیاسییانەی ئەورۆ لە دیموکراسی دەکۆڵنەوە و لەسەری دەنووسن کۆمەڵە کەسانێکی توندڕەو و رادیکاڵن کە داوای دیموکراسییەکی رەها و بێسنوور دەکەن. وادیارە ئەم تیۆریسیەنانە ئاگاداری ئەو کێشانە نین کە زەرووڕەتی دروستبوونی ئەم جۆرە ڕێکخراوانەیان پێک هێناوە و لەو حەقیقەتەش بێخەبەرن کە ئەو ڕێکخراوانە دەبێ لە بەرانبەر سەرکردە هەڵبژێردراوەکانیاندا بەرپرسیار و وەڵامدەر بن، هەر بۆیە گەلێ بە خۆشحاڵی و سەرمەستییەوە تەقلی ئەو نارەزایەتییانەی سەر شەقامەکان دەبن کە بۆ دژایەتیکردنی دەوڵەتی جیهانی دێنە سازدان. ئەوان لەگەڵ جەماوەردا سروودی سەرکەوتن دەڵێنەوە و لەسەر بەشداریکردنی هەرچی راستەوخۆتر پێ دادەگرن. (ئەڵبەت بەڕێوەبردنی زانکۆکانی لێ بەدەر کە تا ئێستایش وەک رژێمە پاشایەتییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بەڕێوە دەبرێن). هەر بۆیە لە دونیای ئەمڕۆدا فەلسەفە و دونیای راستەقینە پێوەندییەکی ئەوتۆیان پێکەوە نییە.

سیاسەتمەدارانیش تا رادەیەک لە قووڵتربوونەوەی کێشەی شەرعییەتی دیموکراتیکدا دەوریان گێڕاوە. ئەوان کێشە ئاڵۆزەکان راپێچی بەردەم ڕێکخراوە هەڵنەبژێردراوەکان دەکەن و گەلێ بەم کارەش خۆشحاڵن، جا ئینجا بە هێرشکردنە سەر خودی ئەو ڕێکخراوانە ماستاوچێتی بۆ خەڵک دەکەن. بۆ وێنە سیاسەتمەدارانی فەرەنسی حەز دەکەن هەرهەموو دەستکەوتەکانی دابەزینی رێژەی کەمبوونی بوودجە بۆ خۆیان هەڵبگرن، بەڵام ئەگەر بۆ دەستەبەرکردنی ئەم مەبەستە ـ واتە دابەزاندنی رێژەی کەمبوونی بوودجە ـ ناچار بن لە خەرجەکان بگرنەوە و پارەیەکی کەمتر خەرج

بکەن، یەکێتیی ئەورووپا بە تاوانبار دەردەکەن و بە دەنگدەرانیان دەڵێن ئۆباڵی هەموو ئەم گێرەوکێشانە لە ئەستۆی ئەو ڕێکخراوە دزێوەدایە. لە نێو سیاسەتمەدارانی ئەورووپادا ئەم رستەیە بۆتە بیانوویەکی باو: «لۆمەی من مەکەن، بڕۆکسێل ناچاری کردم ئەم کارە بکەم». جا ئەگەر دەبینین ئەم کارە بۆتە هۆی دروستبوونی قەیرانی روو لە پەرەی شەرعییەت بۆ یەکێتیی ئەورووپا، ئایا سەرسووڕمان هیچ مانایەکی هەیە؟

ئەم کێشەیە خەریکە زیاتر پەرە دەسێنێ. ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی[397] تازەترین نموونەی ئەم جۆرە ڕێکخراوە بەهێزانەیە کە ئۆتۆریتەیەکی بەربڵاوی هەیە و دوورە لە دەسەڵاتی جەماوەر و بۆتە هۆی وروژاندنی شەپۆلێکی تازەی رەخنە و ناڕەزایەتی. هەرچەند گروپگەلی دژ بە گلۆبالیزەیشن گەلاڵەی جیاواز و زۆرجار دژبەیەکی فراوانیان هەیە، بەڵام هەموویان لەسەر نەهامەتی و قۆشمەبوونی ڕێکخراوگەلێکی وەک WTO تەبا و یەکرەنگن. هەندێ لە نیگەرانییەکانی ئەم لایەنانە راست و رەوایە، بۆ وێنە پێویستە راپۆرتی کۆبوونەوەکانی ئەم جۆرە ڕێکخراوانە زیاتر بکەوێتە بەردەست خەڵکەوە. بەڵام با بیرمان نەچێ کە رەمزی سەرکەوتووبوونی WTO دەقاودەق دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گوشار و زەختە جەماوەری و گشتییەکانی لەسەر نییە. وەک پێشتر بینیمان کرانەوە بە رووی «خەڵک»دا بە کردەوە بە واتای کرانەوە بە رووی گروپە خاوەن بەرژەوەندییە سیاسییەکاندا کەوتۆتەوە و بەزۆریش کرانەوەیەک بووە بە رووی ئەو گروپانەدا کە نوێنەری کەمایەتییەکی بچووکن. ئەگەر لە دانوستانە بازرگانییەکاندا دیدوبۆچوونی سەرتابەر دیموکراتیک لە بەرچاو گیرابا، ئەوا [دەقی ڕێکەوتننامەکان] پڕ دەبوون لە ئاوارتەکردن، تێبینیکردن و بەندگەلێک کە هەموویان بە ئاراستەی پاراستنی بەرژەوەندیی گروپە سیاسییە بەهێزەکاندا دەشکانەوە. بەستێنی وەرزێڕی و کشتوکاڵ یەکێکە لەو بەستێنە گرنگانەی کە ڕێکەوتننامەکانی بازرگانیی ئازاد نەیانتوانیوە پێشی بخەن و پێشکەوتنێکی تێدا بکەن، هۆکاری پڕخەرجبوون و نابەرهەمهێنەربوون و روو لە رووخانبوونی ئەم بەستێنە دەقاودەق دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کۆمەڵە گروپێکی بچووک لە وەرزێڕانی دەوڵەمەند سیستەمی دیموکراتیکیان کردۆتە پردێک بۆ بەدواداچوونی بەرژەوەندییەکانی خۆیان. لە سیاسەتە بازرگانییەکاندا دیموکراسیی فرەتر بە مانای پەرەسەندنی سیاسەتگەلێکی وەک سۆبسیدبڕینەوە بۆ کشتوکاڵ و وەرزێڕییە.

ئەم سیستەمەی ئێستا، واتە WTO، هەروەها ڕێکخراوەکەی پێش ئەم سیستەمە، واتە «ڕێکەوتننامەی گشتی بۆ پیتاک و بازرگانی»، گەلێ دەستکەوتی زۆر گەورە و سەرنجڕاکێشیان لێ کەوتۆتەوە. لەم پەنجا ساڵەی رابردوودا پەرەسەندنی بازرگانی گەورەترین و تاقانەترین دەستکەوتی ئابووریی جیهان بوو کە بۆتە هۆی دابەزینی بەرچاوی هەژاری و نەخۆشی لە هەرهەموو جیهاندا.

397. Worldtradeorganization (WTO)

پێشکەوتنەکانی ئابووریی جیهان لەم پەنجا ساڵەی رابردوودا لە سەرجەم پێشکەوتنە ئابوورییەکانی پێنسەد ساڵی پێش ئەو بەرِوارە گەورەتر و فراوانتر بووە. ئایا بەڕاست دەمانەوێ ئەو سیستەمەی بۆتە هۆی بەدیهاتنی ئەم پێشکەوتنە وەک پەرلەمانی کالیفۆرنیا بجووڵێتەوە و تووشی داڕووخان بێ؟

پێویستە سیاسەتمەدارانی رۆژئاوا لەباتیی رووخاندن یان خۆدزینەوە لەم سیستەمە، لە قووڵایی دڵیانەوە پێشوازی لە رۆحی زاڵ بەسەر WTO، یەکێتیی ئەورووپا، بانکی ناوەندیی ئەمریکا و هەموو رێکخراوە هاوشێوەکانیاندا بکەن. پێویستە ئەوان لە بەرانبەر هێرشبەراندا بەرگری لەم رێکخراوانە بکەن و بەردەوام پێ لەسەر ئەو حەقیقەتە دابگرن کە بە پێناسە و لێکدانەوەی مەدیسۆنی، ئەم رێکخراوانە بەتەواوی دیموکراتیکن. بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رێگە چارەکەی مەدیسۆنمان قبووڵە یان نا، [دەبێ دان بەو راستیەدا بنێین] کە هەر لە هەمان ساڵی ١٨٧٩دا ئەو و هاورێکانی لە حیزبی فێدراڵیستدا توانیبوویان ئەوە پێشبینی بکەن کە کێشەیەکی هاوبەشمان هەیە کە زیاتر لە هەموو کێشەیەکیتر بەرۆکی دەوڵەتە خەڵکییەکان دەگرێت: کێشەی گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان. مەدیسۆن دانی بەوەدا دەنا کە دواجار ئامادەبوونی «گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان» بە جۆرێک لە جۆرەکان بەشێکە لە ئازادیی رادەربڕین، هەر بۆیە رێگایەکی سادەمان بۆ قەدەغەکردنی یاسایی ئەو گرووپانە لە بەردەستدا نییە. مەدیسۆن دواجار بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە زیاتر لە هەموو شتێکیتر هیوای بە خودی پێکهاتی دەوڵەتی ئەمریکا بەستبوو، ئەو پێیوابوو گەورەترین تایبەتمەندیی ئەمریکا ئەوەیە کە دیموکراسییەکی رووت نییە بەڵکوو [سیستەمێکی] کۆمارییە. ئەم خەسڵەتە مانای ئەوەیە هەست و سۆزە [جەماوەرییە]کان یاخود دیدوبۆچوونی بەرتەسک و بەرچاوتەنگانە بە شێوەی راستەوخۆ لە دارشتنی سیاسەتەکانی دەوڵەتدا دەور ناگێرِن. لە رێگای «وەکالەتدانی[398] دەوڵەت»ەوە بە دەستەیەک لە هاووڵاتییان کە لە لایەن هاووڵاتییانی دیکەوە هەڵبژێردراون، دەرفەتی ئەوە دەرەخسێ کە «لە رێگای ناوکۆیەکەوە کە پێک هاتووە لە دەستەیەک لە هاووڵاتییانی هەڵبژێردراو، چاکسازی لە روانگە گشتی و جەماوەرییەکاندا[399] بکرێ و پەرەیان پێ بدرێ[400]. ئەم هاووڵاتییە هەڵبژێردراوانە دەتوانن بە کەڵکوەرگرتن لە ئەندێشە و ئاوەزی خۆیان بەرژەوەندییە راستەقینەکانی وڵات بە باشترین شێوە دیاری بکەن، گەلێ ئەستەم و دژوارە هەستی نیشتمانپەرستی و دادپەروەرییان ئیجازەیان پێ بدات بەرژەوەندییەکانی وڵات فیدای خواستگەلی کاتی و بەرچاوتەنگانە بکەن».

---

398. Delegate
399. Public standpoint
400. Toexpand

ڕەنگە وتەکانی مەدیسۆن بە ڕواڵەت کۆنە بن، بەڵام نیشاندەری ئەندێشەیەکی زۆر مۆدێرنە: ئەندێشەی نوێنەرایەتیدان. ژیان هەرچی تایبەتیتر و پسپۆڕانەتر[401] بێتەوە ئێمە زیاتر نوینەرایەتی دەدەین. لانیکەم بازرگانیی مۆدێرن بەم میتۆدە بەڕێوە دەچێ. سەهامداران[402] خاوەن کۆمپانیاکانن، بەڵام ئەرکی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکانیان دەسپێرنە دەست کۆمەڵە کەسانێک کە کات و توانای پێویستی بۆ تەرخان دەکەن و لەو بوارەدا پسپۆڕ و لێهاتوون. سەهامداران مافی دواکۆنترۆڵ دەهێڵنەوە بۆ خۆیان بەڵام چاک دەزانن خۆیان ناتوانن کۆمپانیاکان بەڕێوە بەرن. مەبەستم لەم باسانە ئەوە نییە کە هەندێ لە بەڕێوەبەران ئەو دەسەڵاتەی پێیان دراوە بە ئاراستەی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا بەکاری ناهێنن، بەڵام ئەگەر بێت و ئەم کارەش بکەن، وەک چۆن لە زۆر نموونەدا دیتوومانە سەهامداران دەتوانن ئێخەیان پێ بگرن و سزایان بدەن.

زۆربەی دامەزرێنەرانی ئەمریکا لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە دیموکراسیی نوێنەرایەتی حکوومەتێکی باشتری لێ دەکەوێتەوە، چونکوو لەم مۆدێلە حکوومەتییەدا جڵەوەی دەسەڵات دەکەوێتە دەست کەسانێکەوە کە حەز لە کاروباری دەوڵەتی دەکەن و تێیدا شارەزا و پسپۆڕن و لە هەمانکاتدا لەبەرانبەر خەڵکیشدا وەڵامدەر و بەرپرسیارن. ئەوەی لای مەدیسۆن لە هەمووی گرنگتر بوو ئەوەبوو کە دیموکراسیی نوێنەرایەتی میکانیزمێکە بۆ کەمکردنەوە و دابەزاندنی[403] بەرژەوەندییە بەرتەسکەکان و ڕوانگە کاتی و کورتماوەکان ـ واتە ڕێک ئەو کێشانە کە هەنووکە بەرۆکی ئێمەیان گرتووە. هەرچەند لە ڕووبەرەکانی دیکەی ژیاندا پسپۆڕایەتی و نوێنەرایەتیدان ڕوو لە زیادبوونە کەچی لە ڕووبەری سیاسەتدا ئەم ڕەوتە ئاراستەیەکی پێچەوانەی گرتۆتەبەر. ئەگەر لە دونیای بازرگانیدا بڵێی هەموو نۆماڵ و تازەکارێک توانای بەڕێوەبردنی کۆمپانیایەکی گەورەی هەیە [بێگومان] دەبێتە مایەی گاڵتە و پێکەنینی هەموان، چونکوو لە دونیای بازرگانیدا ئەزموون هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ تواناکانی مرۆڤدا بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی خۆی نییە. بەڵام ئەگەر دەقاودەق ئەم قسەیە لەئاست دەوڵەتدا بکەیت وەک مرۆڤێکی زانا و بلیمەت دێیتە ئەژمار. ئێمە گەشتووینەتە ئەو قەناعەتە کە هەرچەند ناتوانین پسوڵەکانی پیتاکمان پڕ بکەینەوە، وەسیەتنامەکانمان بنووسین یان کێشەی کۆمپیتەرەکانمان چارەسەر بکەین، بەڵام دەتوانین یاساکانمان دابڕێژین و پەسندیان بکەین.

401. specialty
402. Shareholders.
403. adjustment

## کەمتر بە واتای فرەترە

ئەوەی لەمرۆی دونیا سیاسەتدا پێویستمانە دیموکراسیی فرەتر نییە بەڵکوو دیموکراسیی کەمترە. مەبەستم ئەوە نییە کە بە دڵخوازی خۆمان پێشوازی لە پیاوانی بەهێز و دیکتاتۆرەکان بکەین، بەڵکوو مەبەستم ئەوەیە کە با ئەو پرسیارە ئاراستەی خۆمان بکەین کە بۆچی هەندێ لە دامەزراوە تایبەت و دیاریکراوەکانی کۆمەڵگای ئێمە - وەک بانکی ناوەندی و دیوانی باڵا - کاردانەوەیەکی زۆر باشیان هەیە و دامەزراوەکانیتر - وەک ئەنجومەنەکانی یاسادانان - کاردانەوەیەکی هێند لاوازیان هەیە؟ ئالێن بلایندێر، مامۆستای زانکۆی پرینستۆن، ساڵی ۱۹۹۷ و لە دووتوێی وتارێکی زۆر بەپێزدا لە گۆڤاری *فازیەن ئەفێرز*، دەقاودەق ئەم پرسیارەی خستۆتە بەردەست و لێی کۆڵاوەتەوە.[۱] بلایندێر دوو جار لە دەوڵەتدا کاری کردووە، جارێک لە کۆشکی سپیدا و وەک ئەندامی شۆرای راوێژکارانی ئابووری و جارێکیش وەک جێگری بانگی ناوەندی. ئەو لە وتارەکەیدا دەڵێت لە دارشتنی سیاسەتەکانی کۆشکی سپیدا تێبینی و بۆچوونە کورتماوەکانی پەیوەست بە سیاسەت و هەڵبژاردنەوە گرنگترین دەوریان دەگێرا، بەڵام زۆربەی سیاسەتەکانی بانکی ناوەندی لەبەر رۆشنایی بەرژەوەندی و دەستکەوتە کۆمەڵایەتی، ئابووری و یاساییەکاندا دادەرێژران. ئەم جیاوازییە تا رادەیەکی زۆر هۆکاری دروستبوون و درێژەداربوونی سیاسەتەکانی بانکی ناوەندیمان بۆ روون دەکاتەوە.

بلایندێر پێی وابوو [پرۆسەی] بریاردان لە بانکی ناوەندیدا لەبەر سێ هۆکاری باش پارێزراو بوو لە [دەستێوەردانی] سیاسەت. بە ئاستی یەکەم دیاریکردنی نرخی سوود بابەتێکی تەکنیکییە و کەسانی لێزان و پسپۆر باشتر لە تازەکاران دەتوانن ئەم ئەرکە راپەرێنن. بە ئاستی دووەم ماوەیەکی دوورودرێژ دەخایەنێ تاکوو سیاسەتە پووڵییەکان بگەنە ئەنجام، هەر بۆیە [ئەم کارە] پێوستی بە پشوودرێژی و پێداگربوون هەیە. بە ئاستی سێیەمیش خەسارەکانی بەگژاچوونەوەی ئاوسان و گرانی (بێکاریی فرەتر) گەلێد زووتر لە دەستکەوتەکانی (خەرجێکی کەمتر و بەسەقامتر بۆ کاڵاکان، نرخی سوودی کەمتر و هتد) خۆیان دەخەنە روو، هەر بۆیە دیاریکردنی نرخی سوودەکان لە کەشوهەوایەکدا کە تێبینی و ویستە کورتخایەن و کاتییەکان زاڵن، کارێکی نەکردە و مەحاڵە. بەڵام بلایندێر پاشان دان بەو راستییەدا دەنێ کە «ئەندێشەیەک بە قووڵی ئازاری دەدام: چەندەها رووبەری دەوڵەتیی دیکەیش هەرووک بانکی ناوەندی پێویستیان بە سەربەخۆیی هەیە، [چونکوو] بەشێکی زۆر لە سیاسەتدارشتنەکان پێویستیان بە بریارگەلێکی دژوار و ئاڵۆزی تەکنیکییە و ئاکام و دەرئەنجامەکانیان لە داهاتوویەکی دووردا دەردەکەون و دێنە بەرهەم». بۆ نموونە ئاماژە بە چەند بوارێکی وەک تەندروستی و دەوا و دەرمان، سیاسەتی ژینگەپارێزی و

سیاسەتی پیتاک دەکات کە تەنیا چەند نموونەیەکی ئەو جۆرە بوارانەن و بە دەیان بواری دیکەشمان هەیە.

بۆ نموونە ئاوڕێک لە پیتاکی فیدراڵی داهاتەکان[٤٠٤] لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا بدەنەوە. ساڵی ١٩١٤ کە یاساکانی پیتاک بۆ یەکەمجار بەڕێوە چوون، کۆی یاساکان چواردە لاپەڕە و فۆرمی ڕاگەیاندننامەی تاکیی پیتاک[٤٠٥] تەنیا یەک لاپەڕە بوو. ئێستا یاساکانی پیتاک سنووری دووهەزار لاپەڕەی تێپەڕاندووە کە شەش هەزار لاپەڕە پێڕەو و پرۆگرام و بە دەیان هەزار لاپەڕە بڕیار و لێکدانەوەیشی لەگەڵدایە. ئیدارەی داهاتەکانی پیتاک ٤٨٠ جۆر فۆرمی پیتاک و ٢٨٠ جۆر فۆرمیش بۆ شیکردنەوەی ئەو فۆرمانە چاپ و بڵاو دەکاتەوە. دیار نییە خەرجی بەڕێوەبردنی ئەم دابونەریتە بیزانسییە بۆ ئەمریکاییەکان تا چەند دەگات؛ بەپێی هەندێ لە مەزەندەکان تەنانەت تا ٦٠٠ ملیارد دۆلار لە ساڵدا دەگات، بەڵام زۆربەی توێژەران پێیان وایە نزیکەی ١٠٠ ملیارد دۆلار لە ساڵدا پڕ دەکاتەوە کە دەکاتە نزیکەی لە سەددا ١٥ی کۆی پیتاکی داهاتەکان (ساڵانە نزیکەی ٣٧٥ تا ٤٥٠ دۆلار بۆ هەرکەسێک). بەپێی لێکدانەوەکانی دەل جۆرگێنسۆن، سەرۆکی کۆلیژی ئابووریی زانکۆی هارڤارد، بەڕێوەبردنی سیستەمی پیتاکی بەکارهێنان[٤٠٦] بە نرخێکی نەگۆڕ، بە ئەندازەی سیستەمی ئێستای پیتاکی داهاتەکان سوود و دەرامەتی دەبێ و لە هەمانکاتدا گەشەی ئابووریش تا ٢٠٠ ملیارد دۆلار پەرە پێ دەدات.

هۆکارێکی سادە بۆتە هۆی ئەوەی یاساکانی پیتاک زەمانبەر و ئاڵۆز و پڕخەرج بن: سیاسەتی دیموکراتیک. ئەم یاسایانە دەرفەتێکی زێڕینیان بۆ سیاسەتمەداران خولقاندووە تاکوو بە بێ ئەوەی بکەونە بەر سەرنجەوە و پێیان بزانن پارەی پێویست بۆ بەرنامە و گرووپ و کۆمپانیا خۆشەویستەکانیان کۆ بکەنەوە. ئەگەر بە ئاشکرا بوودجەیەکیان بۆ تەرخان بکەن بێگومان سەرنجی خەڵک بۆ لای خۆیان رادەکێشن، بەڵام گۆڕانکارییەکی بچووک لە یاساکانی پیتاکدا سەرنجی کەس راناکێشێ. ڕەنگە چەند کۆمپانیایەکمان هەبێ کە هەرچەند باڵانسنامەی داراییان[٤٠٧] زۆر لێکدی دەچێ بەڵام ڕێژەی پیتاکەکانیان دەشێ زۆر جیاواز لە یەکتر بێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئایا لۆبییەکی هێند ئەکتیڤ و بەکاریان هەیە کە بە ملهوڕی یاساکانی کۆنگرێس بە قازانجی ئەوان بگۆڕێ یاکوو نییانە. زۆرجار یاسایەکی نوێ هێند تایبەت و ورد دادەڕێژرێ کە لە مەیدانی کردەوەدا دەبێتە یاسای سۆبسیدی تاقەیەک کۆمپانیای تایبەت. ڕەنگە کاتێ بیر لە یەک

404. Income tax
405. Taxreturn
406. Consumption tax
407. Financial balancesheet

نموونە لەو دابەزاندن و کەمکردنەوانە لە ڕێژەی یەک جۆر پیتاکدا دەکەینەوە پیمان وابێ ڕێژەیەکی کەم و بچووکە بەڵام ئەگەر هەموویان لەسەریەک کۆکەینەوە ئەوکات بێگومان بەو هەموو پارەیە سەرسام دەبین. ئەم جۆرە سیاسەتە لە ساڵی ٢٠٠١دا بوو بە هۆی لەکیسچوونی ٥٥٠ میلیارد دۆلار لە داهاتەکانی دەوڵەتی فیدراڵ. بەشێک لەم «خەرجە پیتاکییانە» تەرخان دەکرێ بۆ ئەو گەڵاڵە و بەرنامانەی کە لای جەماوەر بە شێوەیەکی دیار و بەربڵاو جێی سەرنج و خۆشەویستن، بەڵام پاشماوەکەی تەنیا ئاسانکارییەکی ڕووتی دەوڵەتە بۆ کۆمپانیاکان، بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بدەینە ئەو جۆرانە لە کەمکردنەوەی ڕێژەی پیتاک کە تەنیا کۆمەڵە پیشەسازییەکی تایبەت دەگرێتەوە.

هەموو چین و توێژە سیاسییەکانی ئەمریکا یاساکانی پیتاک بە کۆمەڵە یاسایەکی ڕەق و بێکەڵک و ناعادڵانە لەقەڵەم دەدەن، بەڵام کەسیش لەسەر ئەو قەناعەتە نییە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان پیاچوونەوەی پێدا بکرێتەوە، چونکوو [بەتەواوی] لەگەڵ سیاسەتی دیموکراتیکدا ئاوێتە بووە. بلایندێر پێی وایە هەمان ئەو سێ هۆکارەی وایان کردووە سەربەخۆبوونی بانکی ناوەندی بە پێویست و زەرووری بزانین، هەر ئەو هۆکارانە وامان لێ دەکەن ئەم بابەتە بەتایبەت بۆ سیاسەتی پیتاکیش[408] بە پێویست و زەرووری بزانین. بلایندێر پێشنیاری دامەزراندنی ئیدارەیەکی سەربەخۆ بۆ پیتاکی فیدراڵ ئەخاتە بەردەست کە زۆر لە بانکی ناوەندی دەچێت. بەپێی ئەم پێشنیارە کۆنگرێس پێڕەو و پرۆگرام و سیاسەتە گشتییەکان دیاری دەکات و ئەو ئیدارەیەش لەسەر بنەمای ئەو سیاسەتانە یاساکانی پیتاک دادەڕێژێ. پاشان کۆنگرێس ئەو یاسایانە دەخاتە بەر دەنگدەرانەوە بەڵام بۆی نییە دەسکارییان تێدا بکات. هەرچەند ئاوەها سیستەمێک فرەیش بێکێشە و تەواو نییە بەڵام بێگومان ئەو یاسایانەی لە نێو ئەم سیستەمەدا دەنووسرێن و دێنە بەرهەم، لە یاساکانی ئێستامان گەلێ باشتر و ڕێکوپێکتر دەبن.

دەوڵەتی ئەمریکا پێشتر و لە هەندێ بواری دیکەشدا ئەم جۆرە نوێنەرایەتیدانەی تاقی کردۆتەوە. زۆرجار سەرۆک کۆمار مافی ئەوەی پێ دراوە وتووێژ لەسەر ڕێکەوتننامە بازرگانییەکان بکا و ئیمزایان بکات، دواتر ئەم ڕێکەوتنە لە دووتوێی گەڵاڵەیەکی تۆکمە و ڕێکوپێکدا پێشکەش بە کۆنگرێس دەکرێت. کۆنگرێس کۆی گەڵاڵەکە دەخاتە بەر دەنگدانەوە و بۆی نییە هیچ دەسکارییەکی تێدا بکات. لە سەرەتای دەیەی ١٩٩٠ و دوای تەواوبوونی شەڕی سارد ئەمریکا دەیویست هێزە نیزامییەکانی کەم بکاتەوە و بۆ ئەم کارەش دەبا دەیان کامپی نیزامیی دابخستایە، ئەودەم کۆنگرێس لە میتۆدێکی هاوشێوەی ئەوەی سەرەوە کەڵکی وەرگرت. نوێنەرانی کۆنگرێس لە

408. Tax policy

نێو قەیرانێکدا دەژیان، ئەوان دەیانزانی ئەگەر بیانەوێ ئاکامێکی عادڵانە و گونجاو دەستەبەر بکەن تاکە ڕێگا ئەوەیە کە پرۆسەی لێکۆڵینەوە لە [پرسی] سیاسەت جیا بکەنەوە. ئەگەر ئەم کارەیان نەکردایە بێگومان هەموو نوێنەرەکان بە شێوەیەکی جیدی داوای داخستنی هەموو ئەو کامپانەیان دەکرد، ئەڵبەت جگە لەو کامپانەی کە دەکەوتنە نێو ناوچەکانی خۆیانەوە لە هەڵبژاردنەکاندا. ئەوان کۆمیتەیەکی هاوبەشیان بۆ دیاریکردنی ئەو کامپانەی کە دەبا دابخرایەن دروست کرد کە پێک هاتبوو لە ئەندامانی هەر دوو حیزبەکە. کاتێک دواپێرستی ئامادەکراوی ئەو کۆمیتەیە پێشکەش بە کۆنگرێس کرا نوێنەرانی کۆنگرێس تەنیا دەیانتوانی دەنگی بەڵێ یان نەخێری پێ بدەن و مافی دەستێوەردان و دەسکاریکردنی پێرستەکەیان نەبوو. لەم جۆرە پرۆسانەدا دەسەڵاتداریی کاریگەر و بەکەڵک لەگەڵ کۆنترۆڵی دیموکراتیکدا تێکەڵ بە یەکتر دەکرێن، هەر بۆیە سەرجەم نموونەکانی ئەم جۆرە پرۆسانە نموونەگەلێکی سەرکەوتوو بوون.

دەتوانین نوێنەرایەتیدانی ئەورۆ بە ستراتیژەکەی ئۆدۆسیۆس، پاڵەوانە ئاوارەکەی هومێر، لەکاتی پەڕینەوە بەناو سیرێنەکاندا بشوبهێنن. سیرێنەکان کۆمەڵە ژنێکی زۆر دەنگخۆش بوون کە هەر پیاوێک دەنگیانی گوێ لێ بوایە هێند شەیدایان دەبوو کە خۆی پێ ڕانەدەگیرا و خۆی لە دەریا دەهاوێشت [و دەخنکا]. ئۆدۆسیۆس دەستووری بە دەریاوانەکانیدا گوێی خۆیان پڕ لە مۆم بکەن تاکوو دەنگی سێرێنەکان نەبیسن، بەڵام دەیویست خۆی ئاوازەکەیان ببیسێ و گوێی بۆ رادێرێ، هەر بۆیە بە مەلەوانەکانی سپارد توند بیبەستن بە ئەستوونی کەشتییەکەوە و هەرچی هاواری کرد نەیکەنەوە. ئۆدۆسیۆس لە کاتی پەڕینەوە لەو دەریا مەترسیدارە شەیدای ئاوازی ژنە دەنگخۆشەکان بوو و دەپاڕایەوە بەڵکوو ئازادی بکەن، بەڵام پڕۆژەکەی خۆی گرتی و مەلەوانەکان هەمان دەستووری یەکەمیان بەڕێوە برد و نەیانکردەوە. هەر بۆیە ئۆدۆسیۆس و دەریاوانەکانی لەم ئەزموونەدا سەربەرز و سەرکەوتوو بوون. سیاسەتمەداری ئەورۆ دەبێ لە کاتی پەڕینەوە بە دەریا پڕ شەپۆلەکانی سیاسەتدا زیاتر [لە جاران] خۆیان بە کەشتیی دەوڵەتەوە ببەستنەوە.

## زیاترین مەترسییەکان

وڵاتانی روو لە گەشە گەلێ زیاتر پێویستیان بە نوێنەرایەتیدانە، چونکوو زۆرجار لەگەڵ مەترسیی زیاتر و گەورەتردا ڕووبەڕوو دەبنەوە. دەبێ دەوڵەتەکان لە سیاسەتەکانی خۆیاندا بەتەواوی بەڵێنەکان و دیسیپلینەکان بپارێزن، ئەگینا بازاڕەکان زۆر خێرا متمانەیان لێ دەسێننەوە. ئەوان دەبێ بە لەبەرچاوگرتنی گەشەسەندنی شاری، فێرکاری و تەندروستی، لەسەر

سیاسەتە درێژخایەنەکان چڕ ببنەوە، ئەگینا وردەوردە کۆمەڵگاکانیان بەرەو مەندی و راوەستان[٤٠٩] و تەنانەت ئانارشی[٤١٠] دەڕۆن. سیاسەتی دووربین[٤١١] و درێژخایەن دەستکەوتی زۆرگەورەی بەدواوەیە بەڵام سیاسەتی کورتخایەن کە لەسەر بنەمای کۆکردنەوەی پشتیوانیی دەنگدەران ڕۆ نرابێ خەساری زۆر گەورەی لێ دەکەوێتەوە.

بەگشتی دەتوانین بڵێین لەم سیاسەتانەدا دیکتاتۆرەکان بە هیچ شێوەیەک باشتر لە دیموکراتەکان نەبوون. زۆربەی دیکتاتۆرەکان لەپێناو بەرژەوەندییە تاکییەکانی خۆیاندا وڵاتەکەیان وێران و خاپوور کردووە. لێکۆڵەران ئەو پرسیارەیان خستۆتە بەردەست کە ئایا دیموکراسی یارمەتیدەری گەشەسەندن و بووژانەوەی ئابووریی وڵاتانی هەژارە یاخود [بە پێچەوانەوە] زەبر و خەساری لێ دەدات؟ بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو شیکاری و توێژینەوانە هێشتا وەڵامێکی کۆنکرێت و تەواویان بۆ نەدۆزیوەتەوە.[٢] بەڵام لە پەنجا ساڵی ڕابردوودا نزیک بە هەموو نموونە سەرکەوتووەکانی وڵاتانی روولەگەشە ئەو وڵاتانە بوون کە خاوەن سیستەمێکی ئۆتۆریتەخوازی لیبرالی بوون. لە تایوان، کۆریای باشوور، سەنگاپوور، شیلی، ئەندەنۆسیا و تەنانەت لە چیندا، دەوڵەتانی دەسەڵاتدار بە گرتنەبەری کۆمەڵە سیاسەتێکی ژیرانەی درێژخایەن بوونە هۆکاری گەشە و بووژانەوەی بەرچاوی ئابووری و هەروەها بەرزبوونەوەی ئاستی خوێنەواری، هیوادار بوون بە ژیان و خوێندن [ی باڵا]. دۆزینەوەی دیموکراسییەکی جیهان سێهەمی کە توانیبێتی وەک ئەو وڵاتانە ڕێژەی گەشەسەندنی[٤١٢] بەسەقام و بەردەوامی دەستەبەر کردبێ کارێکی سەخت و دژوارە. ئەوانەی دەستیان دایە ریفۆرم و چاکسازی زۆر خێرا شکستیان خوارد، چونکوو مەجبوور بوون سۆبسیدەکانی ئەو گروپانەی وا لە رووی سیاسییەوە بەهێز و خاوەن دەسەڵات بوون درێژە پێ بدەن. هیندستان نەیتوانیوە ریفۆرمیزاسیۆنێکی بەردەوام بەڕێوە ببات، سەرەکیترین هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سیاسەتمەدارانی هێندی نایانەوێ هیچ جۆرە رەنج و گوشارێک، تەنانەت ئەگەر بەشێوەی کاتیش بووبێ، بەسەر دەنگدەراندا بسەپێنن. هەر بۆیە ئەم وڵاتە سەرەڕای ئەوەی شانازی بە دیموکراسییەکەیەوە ئەکات لە زۆربەی هەرەزۆری پارامێترەکانی گەشەی مرۆییدا[٤١٣] تووشی پاشەکشێ و دابەزین بووە کە ئەتوانین ئاماژە بە هەندێ پارامێتری وەک هیوادار بوون بە ژیان، مردن و لەبارچوونی منداڵان، تەندروستی، ڕێژەی خوێنەواری و فێرکاری بکەین. بەپێی

409. Stagnation
410. anarchy
411. provident
412. Rate of growth
413. Humangrowth index

پێوەرەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ گەشەی مرۆیی، هیندستان لە ساڵی ٢٠٠٢ و لە نێوان ١٧٣ وڵاتدا پلەی هەژێنەر و دڵتەزێنی ١٢٤ی بەدەست هێناوە. دیارە ئەم پلەیە لە پلەی چین خوارترە، بەڵام نەتەنیا لە چین بەڵکوو لە گواتمالا و بولیڤیا و سووریایش خوارترە، تەنانەت لە کووبایش زۆر خوارترە. بێگومان کاتی ئەو هاتووە بپرسین ئایا سیستەمە دیموکراتیکەکانی وەک هێندستان کە ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا زۆری پێدا هەڵ دەدەن، بەکەڵکی هاووڵاتییانیان دێن یان نە؟

رووخاندن و سڕینەوەی دیموکراسی لە جیهانی سێیەمدا قەت چارەسەری ناهێنێ. بەبێ لەبەرچاوگرتنی کاریگەرییەکانی لەسەر گەشەسەندن و پێشکەوتن، دیموکراسی گەلێ دەستکەوتی گەورەگەورەی پێوەیە. [ئەڵبەت] گەلێ دەستکەوتی ئابووریی بەرچاویشی هەیە. هەرچەند دیموکراسی هەمیشە باشترین دەرئەنجام و ئاکامەکان ناپێکێ بەڵام زۆرجار ناهێڵێ خراپترین ئاکامەکانیش بێنە دی. ڕەنگە نەتوانین لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە بگەینە لی کوانیوو[٤١٤]، بەڵام بێگومان ناگەینە مۆبۆتۆ سێسێسێکۆیش[٤١٥]. بێگومان بە دروشمدان و هووراکێشان و چەپڵەلێدان ناتوانین کێشەکانی دیموکراسی چارەسەر بکەین، دەبێ ڕێگایەک بۆ سەرکەوتنی سیستەمە دیموکراتیکەکان بدۆزینەوە، نەوەک هەمیشە و هەمووجار لەبەر گرتنەبەری کۆمەڵە سیاسەتێکی کاتی و کورتخایەن ئاکام و دەرئەنجامی نەگونجاو و نیگەرانکەر بخولقێنن. بەڵام پێویستە هەمیشە ئەو ڕاستییەمان لەبەرچاو بێت کە لە وڵاتانی هەژاردا مەترسییەکان زۆر زیاترن.

نوێنەرایەتیدان دەشێ یەک لەو ڕێگایانە بێت. دەبێ بانکە ناوەندییەکان ببنە خاوەن دەسەڵاتێکی فرەتر [لەوەی ئێستایان]، ئەم پرۆسەیە هەر ئێستاش خەریکە ڕوو دەدات. بەهەمان شێوە دەبێ دادوەرانیش پێگە و جێگەیەکی سەربەخۆیان هەبێ. لەپێناو بەهێزترکردنەوەی دەزگای دادوەری و بەگژاچوونەوەی گەندەڵیدا، پێویستە وەزارەتخانەکانی داد و [هەموو] سەرچاوەکانی بەڕێوەبردنی یاسایش سەربەخۆییەکی زیاتریان پێ بدرێ. سەرۆکی زۆرێ لە دامەزراوە ئەمریکاییەکانی وەک بانکی ناوەندی، ئیدارەی قەواڵە بایەخدارەکان و مامەڵە و بازرگانی و، ئیدارەی لێپرسینەوەی فیدراڵ[٤١٦]، بۆ قۆناخێکی درێژخایەن (لە ٧ ساڵەوە تا ١٠ ساڵ) دیاری

---

٤١٤ . سەرۆک وەزیرانی سەنگاپوور لە نێوان ساڵانی ١٩٥٩ تا ١٩٩٠دا، لە سەردەمی دووروودرێژی دەسەڵاتداریی ئەودا ئابووریی ئەو وڵاتە بوو بە دەوڵەمەندترین ئابووریی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.و.ف

٤١٥ . دیکتاتۆری پێشووی زەییر (کۆنگۆ کیشازای ئێستا) کە ساڵی ١٩٦٥ و لە کوودەتایەکدا دەسەڵاتی گرتەدەست و ٣٢ ساڵ بەشێوەیەکی دیکتاتۆرانە حوکمی ئەو وڵاتەی کرد. لە ١٩٩٧ و لە شۆڕشێکدا لەسەرکار لابرا.و.ف

416. FBI

دەکرێن، بە ئەنقەست خولی سەرۆکایەتیی ئەو دامەزراوانە لەگەڵ خولەکانی هەڵبژاردندا یەکانگیر نەکراون و لە دوو زەمەنی جیاوازدا بەڕێوە دەچن، ئەمەش بەو مەبەستەیە کە ئەو دامەزراوانە تا رادەیەک لە [کاریگەرییەکانی] سیاسەت دوور و پارێزراو بن.

یەکێک لەو بەستێنە زۆر کرنگانە کە دەتوانین دابونەریتی تازە و داهێنەرانەی بۆ دیاری بکەین بەستێنی ئابوورییە. لەم بەستێنەدا دەبێ [پرۆسەی] بریاردان لە [کاریگەرییەکانی] سیاسەتی رۆژانە پارێزراو بێت. لە ولاتانی جیهانی سێهەمدا پێویستە وەزیری دارایی دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ کە بوودجەی ساڵانە لە دووتوێی گەڵاڵەیەکی یەکگرتوودا پێشکەش بکات و کەس مافی دەسکاریکردنی نەبێت و کۆی گەڵاڵەکە بۆ پەسندکردن یان رەتکردنەوە بخرێتە دەنگدانەوە. (بریتانیا لەبەر رۆشنایی سیستەمی پەرلەمانی و دیسیپلینی توندوتۆڵی حیزبییدا بەشێوەی نارەسمی ئەم میتۆدە پێڕەو دەکات، هەر بۆیە بەوە ناسراوە کە خاوەن سیاسەتێکی دارایی[417] بەکەڵک و کارامەیە). تەنانەت دەتوانین لەمەش بەرزەفڕتر بین و بڵێین با وەزیری ئابووری بۆ قۆناغێکی درێژتر لە قۆناغی باو و ئاسایی لەسەر کار بێت، وەک سەرۆکی بانکی ناوەندیی ئەمریکا، بەم شێوەیە ئەگەر دەوڵەت لە ئاکامی قەیرانێکی سیاسیدا برووخێ، ئەم رووخانە بەشێوەی ئۆتۆماتیک نابێتە هۆی رووخان و راوەستانی ریفۆرمە ئابوورییەکانیش. هیچکام لەم کارانە نابنە هۆی ئەوەی چیدی سیاسەت بەتەواوی نەتوانێ دەستێوەردان لە پرۆسەی بریارداندا بکات، لە راستیدا نابێ وەهایش بێت و ئاوا ئاکامێکیان بەدوادا بێت. سیاسەت پاک و خاوێنە؛ لە سیستەمێکی دیموکراسیدا خەڵک لە رێگای سیاسەتەوە هێز و دەسەڵاتی خۆیان ئاراستە دەکەن. هەموو جۆرە سیاسەتێک، هەم سیاسەتی ریفۆرمخوازانە و هەم سیاسەتەکانیتر، پێویستیان بە پشتگیری و پشتیوانیی سیاسییە. لە بەرانبەردا تاکە ئامانج [لەم کارە] ئەوەیە کە لە هەلومەرجی پڕئاژاوەی جیهانی سێیەمدا زەخت و گوشاری قورسی سیاسەت لەسەر بەرنامە و رێبازە دەوڵەتییەکان کەم بکەینەوە و لە رێگای گۆڕینی رێژەییی[418] هاوسەنگی و باڵانسەکانەوە سیستەم بەرەو کارکردنی باشتر بەرین. ئەڵبەت ناتوانین بڵێین ئەم سیستەمە هەمیشەیش ئاکامێکی باشی لێ دەکەوێتەوە. [بێگومان] هەندێ وەزیر و کاربەدەستیشمان هەن کە بەشێوەی خراپ و ناڕەوا لەو دەسەڵاتە زۆرەی پێیان دراوە کەڵک وەردەگرن، کەسانێکیش دەبن کە سیاسەتی دڵسۆزانە بەڵام لە هەمانکاتدا گەمژانە دەگرنە بەر. بەڵام بە بەراورد لەگەڵ سیستەمی ئێستای رژێمە دیموکراسییەکانی ولاتانی روو لە گەشەدا کە نەیتوانیوە دەسکەوتێکی ئەوتۆ بۆ هاوولاتییانی ئەو ولاتانە دەستەبەر بکات، رەنگە ئەو سیستەمەی ئامارەمان پێکرد گەلێ باشتر و جوانتر بجووڵێتەوە.

---

417. Financial policy
418. Relativechange

پێویستە جەخت لەسەر ئەو حەقیقەتە بکەین کە ئەم ئاڵوگۆڕانە لەگەڵ دیموکراسیشدا بەتەواوی تەبا دێنەوە. ئەم گۆڕانە دەسەڵات دەگوێزێتەوە بۆ دامەزراوەکان، بەڵام دوادەسەڵات لە رێگای نوێنەرانی هەڵبژێردراوەوە لەدەستی خەڵکدا دەمێنێتەوە، پێویستە ئەم چاودێریکردنە بەهێزتر و پتەوتر بکرێتەوە. ئەگەر لە پەرلەماندا زۆرینەیەکی دوو بە سێمان هەبێ، دەبێ توانای لەکارخستنی زۆربەی ئەو دابونەریتە تایبەتییانەمان هەبێ کە لە سەرەوەڕا ئاماژەمان پێکردن. کۆمیتەکانی پەرلەمان دەبێ بەشێوەیەکی بەردەوام هەرهەموو رێکخراوە هەڵنەبژێردراوەکان بخەنە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێرییەوە. ئەم شێوازە تازانە لە روویەکەوە تەنیا و تەنیا گرتنە بەر و درێژەپێدانی هەمان ئەو میتۆدەیە کە هەندێ ئیدارەی بەڕێوەبەری[419] وەک وەزارەتی تەندروستی و ئاسوودەیی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کاری پێ دەکەن. ئەم ئیدارانە لەسەر بنەمای ئەو رێبازە گشتییانەی کە کۆنگرێس رایدەگەیەنێ، سیاسەتەکانی خۆیان دادەڕێژن و بەڕێوەیان دەبەن. دواکۆنترۆل لەدەستی ئەنجومەنی یاسادانانداىە بەڵام بەشی زۆری سیاسەتداڕشتنەکان دەسپێردرێتە دەست کاربەدەستە هەڵنەبژێردراوەکان. ئەگەر ئاوەها میتۆدێک لە سیاسەتی ئاسوودەییدا[420] توانیویەتی سەرکەوتوو بێ ئایا لە ئاست پیتاکەکانیشدا ناتوانێ سەرکەوتوو بێ؟ پێویستە سیاسەتمەداران ئەم جۆرە سیاسەتانە بۆ خەڵک شی بکەنەوە و پێیان بڵێن نوێنەرایەتیدان دەتوانێ هاوسەنگییەکی لۆژیکاڵ لە نێوان حکوومەتی باش و کۆنترۆڵی دیموکراتیکدا پێک بهێنێ. جەماوەری خەڵک (لانیکەم لە دونیای رۆژئاوادا) لە بایەخ و گرنگایەتیی دادگاکان و بانکە ناوەندییەکان ئاگادارن، هەربۆیە لەم بەڵگاندنەش بەباشی تێ دەگەن.

دیاردەی نوێنەرایەتیدان تەنیا لە بەستێنی سیاسەتدا تاقی نەکراوەتەوە، لە زۆر بەستێنی دیکەشدا لە بەردەم دووڕیانێکداین؛ ئایا ئێمە - بۆ وێنە لە بەستێنەکانی کولتوور و ئابووریدا - خوازیاری لاوازکەوتنی کۆنترۆڵەکان، قەدبڕکردنی ناوکۆ و ناوبژییەکان و لەناوچوونی پێوەرە کۆن و مێژووییەکانین، یاخود بەپێچەوانەوە ئەمانەوێ هەندێ لە رێنوێنەکان و ناوکۆکان کە بەشێکی سوننەتیی ئەم کۆمەڵگایەن، بپارێزین و رواڵەتێکی تازەیان پێ بدەین؟ تەکنۆلۆژیا ئاوێتەی ئایدیۆلۆژیا بووە و ئەم ئاوێتە بوونە بۆتە هۆی دروستبوونی ئاسۆی دونیایەکی سەرنجڕاکێش کە هیچجۆرە ناوکۆ و ناوبژییەکی تێدا نامێنێ. ئێوە دەتوانن خۆتان دەڵاڵی سەهام[421] و سەرنووسەری رۆژنامە و پارێزەر و پزیشکی خۆتان بن، بەڵام ئایا دەتانەوێ ئاوا دەورێک بگێڕن؟ بە بەراورد

419. Executive agency
420. Welfarepolicy
421. Stockbroker

لەگەڵ ساڵە گەشاوەکانی دەیەی ١٩٩٠دا ئێستا خەڵک کەمتر دوودڵ و سەرلێشێواون. ئەوان وردەوردە دانیان بەوەدا ناوە کە ئامادەبوونی درێژماوەی ناوکۆکان لە زۆربەی بەستێنە جۆراوجۆرەکاندا بێگومان لەخۆڕا نەبووە. زۆربەی سەرمایەگوزاران ئامادەن بە دڵخوازی خۆیان و لەپێناو بەڕێوەچوونی دروستی مامەڵەی سەهام، راوێژکاریی دارای و سەرمایەگوزاریدا خەرجەکانیان لەوەی کە هەیە کەمێک زیاتریش بێت. ئەوانەی داوا و شکایەتنامەی یاسایی یان کێشەی پزیشکییان بووە باش دەزانن کە دیاریکردنی سەرەڕۆیانە[٤٢٢] لە رێگای خوێندنەوەی سایتە ئینتەرنێتییەکان و چاتکردنەوە، تەنیاوتەنیا هەر بەکەڵکی خودی دیاریکردنی سەرەڕۆیانە دێت و هیچیتر. لە دونیای میدیادا هەراوزەنایەکی گەورەیان ناوەتەوە گوایە وێبسایتە شەخسییەکان («بلاگ») بکوژی میدیا سوننەتییەکانن، بەڵام لە راستیدا بلاگەکان بوونەتە شتێکی تەواو جیاواز و نەتەنیا جێی رۆژنامە و گۆڤارەکانیان نەگرتۆتەوە بەڵکوو باشترین بلاگەکان ـ کە زۆر ژیر و زیرەکیشن ـ سەرچاوە سوننەتییە بەپێزەکان دەکەنە رێفرێنس و سەرچاوەی خۆیان، ئەوان بوونەتە شیکار و راڤەکاری ئەو سەرچاوە سوننەتییانەی کە زیاتر دیار و ناسراون و بەم شێوەیە خەڵک بەرەو خوێندنەوەی ئەو سەرچاوانە هان دەدەن. بلاگەکان بۆ خەڵکانی زانا و تێگەیشتوو رۆڵی ناوکۆ و ناوبژیگەلێکی تازە دەگێڕن. هەرچەند وێبلاگنووسەکان خۆیان بە دیموکراتی رادیکاڵ دەزانن بەڵام لە راستیدا ئەوان پێناسەیەکی نوێن بۆ دەستەبژێرانی تۆکڤیلی. بەشێکی زۆر گەورەی دونیای وێب بەم ئاقارەدا چووە، چونکوو وێب هەرچی بێهەوسارتر و گەورەتر و ئانارشیکتر دەبێتەوە، خەڵک بۆ گەڕان بەناو ئەو دونیایەدا زیاتر پێویستیان بە یارمەتیدان دەبێ.

## پێشکەوتن و دواکەوتن

بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم هێما و نیشانە دلخۆشکەرانە، هێشتا رەوتە گشتییەکان هەر بە ئاراستەی دیموکراتیزاسیۆنی نەسپاو و بەردەوامی کۆمەڵگادا هەنگاو دەنێن. رۆژ لەدوای رۆژ سیاسەت زیاتر درزی تێ دەکەوێت و دەکەوێتە بەردەم کاریگەری و نفووزەوە، کۆمەڵگا ئەورووپاییەکان زیاتر بەرەو «بەئەمریکاییبوون»[٤٢٣] دەچن، دامەزراوە کۆنەکان زیاتر دەکرێنەوە، پیشەکان و ئەنجومەنەکان زیاتر لەناو دەچن و تەکنۆلۆژیایش هێشتا هەر هەڕەشە لە زۆربەی ناوکۆکان دەکات. هەروەک چۆن لە رابردوویشدا دیومانە دواجار هەموو ئەم شتانە دەبێتە مایەی خێر و بەختەوەری، بەڵام لەهەمانکاتدا بەشێک لە تانوپۆی کولتوورەکەیشمان هەڵدەوەشێنێتەوە.

---

٤٢٢ . مەبەست دیاریکردنی هەڕەمەکی و نەزانکارانەی جۆری نەخۆشین یاخود داوای یاساییە .و.ک

423. Americanized

دروســـتبوون و پێگەیشـــتنی ئەو روانـــگە و دامەزراوانەی لە دونیـــای رۆژئـــاوادا پارێزگـــاری لە سەرمایەداریی دیموکراتیکی لیبرالی دەکەن، سەدان ساڵی خایاندووە، بەڵام لە چەند دەیەیەکی کورتدا خەریکە لەناو دەچن. ئەگەر بێت و لەناویش بچن بێگومان ناتوانین بە ئاسانی دروستیان بکەینەوە. ئێمە هەموو رۆژێ ئەم داڕووخان و لەناوچوونە دەبینین کەچی ناتوانین بەشیوەیەکی جیدی بەری پێ بگرین، چونکوو کارەکەمان بە نادیموکراتیک لەقەڵەم دەدرێ. بەڵام ئاسەوارەکانی ئەم داڕووخانە بەرۆکی سیاسەت و ئابووری و کولتووری کۆمەڵگاکەمان دەگرێ و بەرژەوەندییە کورتخانەیەنەکان و دەمارگرژییەکان هەموو رۆژێ زیاتر لە رۆژی پێشوو جڵەوی ئەو بەستێنانە دەگرنە دەست خۆیان. ئێدمۆند بوورک جارێکیان وتی کۆمەڵگا بریتییە لە بەشداریکردنێک لە نیوان مردووان، زیندووان و ئەوانەدا کە هێشتا لەدایک نەبوون. لەم سیستەمەدا کە خەریکە لەدایک دەبێ، دیارنییە کێ دەبێتە نوێنەری ئەوانەی هێشتا لەدایک نەبوون یان بە واتایەکیتر نوێنەری داهاتوو.

لەم نێوانەدا نارەزایەتییە گشتی و جەماوەرییەکان لەبەرانبەر ئاسەوارەکانی هەموو ئەم گۆڕانکارییانەدا، بێگومان هەر پەرە دەسێنێ. دواجار ئەگەر بێت و ئەم کێشانە کەڵەکە ببنە سەر یەکتر، ئەوسا پێناسەی خەڵک بۆ دیموکراسی دەگۆڕدرێ بۆ هەمان ئەو شتەی لە راستی و مەیدانی کردەوەدا هەیە: سیستەمێک کە بە تیۆری کراوەیە و لەبەردەستماندایە، بەڵام بە کردەوە کەوتۆتە ژێر رکێفی هەندێ کەمینەی رێکخراو یان دەوڵەمەند یان دەمارگرژەوە کە جارێ بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەپارێزن و داهاتوویش فیدای ئەو بەرژەوەندییانە دەکەن. ئەم دیمەنە زۆر دوورە لەو ئاسۆ ئایدیالەی لایەنگرە بەگوڕەکانی دیموکراسیی راستەوخۆ بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەو کەسانەی دەڵێن ئەو دونیا سەربەست و رزگارەی بڕیارە تێیدا بژین دەوڵەت ـ شارەکانی یۆنانی کەونارامان بیر دەخاتەوە. بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە ئایا سیاسەتی ئەورۆی کالیفۆرنیا لە سەردەمی گەشاوە و تەشقی دیموکراسیی ئەسینایی دەچێ یان نا دەهێڵمەوە بۆ خوێنەر، بەڵام با ئەوەشمان بیر نەچێ کە دیموکراسیی راستەوخۆ تەنیا لە چەند شارێکی بچووکی یۆنانی کەونارادا تاقی کرایەوە، لەو شارە بچووکانەدا کە تەنیا چەندهەزار پیاوێک مافی دەنگدانیان هەبوو. خاڵێکی گرنگی دیکەیش کە نابێ فەرامۆشی بکەین ئەوەیە کە هەرهەموو ئەو دیموکراسییانە تەنیا لە سەدساڵدا دوچاری دیکتاتۆری یان ئانارشیزم و هەندێجار هەردوو چارەنووسەکە، بوون.

رەنگە پێمان وابێ سەختە ئاوەها دۆخێکی لێڵ و پێڵ بقەومێ، بەڵام بێگومان ئەگەر ئەم رەوتانەی ئێستا بەردەوام بن دیموکراسی تووشی قەیرانی شەرعییەت دەبێ، ئەم قەیرانە دەتوانێ دیموکراسی ئیفلیج بکات. شەرعییەت پێداویستیی ژیانبەخشی دەسەڵاتی سیاسییە. ژان ژاک رۆسۆ

دەڵێت: «بەهێزترینیش قەت ئەوەندە بەهێز نییە ببێتە حاکم، مەگەر ئەوەی دەسەڵات بە ماف و، گوێڕایەڵیش بە ئەرک پێناسە بکات». لە دونیای ئەمڕۆدا تەنیا دیموکراسی ئاوەها ئۆتۆریتەیەکی هەیە، بەڵام ئەگەری ئەوەش دەچێ کە وەفاداربوونمان بۆ دیموکراسی روو لە کزی بدات و کەم بێتەوە. گەورەترین مەترسیی دیموکراسیی بێمەرج و سنوور و شێواو ئەوەیە کە خودی دیموکراسی بێبایەخ دەکا و دواجار هەموو شێوازەکانی بەڕێوەبردنی خەڵکیش[424] دەخاتە ژێر پرسیار و گومانەوە. ئەم دیاردەیە دیاردەیەکی بێوێنە و تاقانە نییە، هەموو شەپۆلێکی دیموکراسی کۆمەڵە کێشەیەکی بەدوای خۆیدا هێناوە؛ [هەمیشە] خەڵک رژێمی دەسەڵاتداریان بە سیستەمێکی بێتوانا و بێقابڵ لەقەڵەم داوە و سەرکردە زێدەخوازەکانیش هەندێ ئەڵتەرناتیڤی تازەیان خستۆتە بەردەست و خەڵکی داماو و پەککەوتەیش پێشوازییان لێوە کردوون. ئەورووپای نێوان هەردوو جەنگیجیهانی دوایین قۆناغی ئەم چەشنە نائومێدییە بوو، لەم قۆناغەدا سیاسەتمەدارانی دیماگۆژ گەلێ بەو نائومێدبوونەی خەڵک لە دیموکراسی سەرمەست و خۆشحاڵ بوون، هەر بۆیە بەشێکی زۆر لەو سیاسەتمەدارانە توانییان بە باشترین شێوە ئەو هەلە بە قازانجی خۆیان بقۆزنەوە. بیرمان نەچێ قبووڵکردنی دڵخوازانەی کۆمۆنیزم و فاشیزم لە ئەورووپای دەیەی ١٩٣٠دا وەک ئەمڕۆ بە کارێکی گەمژانە لەقەڵەم نەدەدرا. ئەودەم سیستەمە دیموکراسییەکان لە دڵساردی و گەندەڵیدا نخرۆ بووبوون، بەڵام دەوڵەتانی ئۆتۆریتەخواز کۆمەڵگاکانی خۆیان تەیار کردبوو و روو لە گەشە و پێشکەوتن بوون.

دیموکراسییە مۆدێرنەکان بەرەورووی کۆمەڵە کێشەیەکی تازە و قووڵ دەبنەوە - بەگژاچوونەوەی تیرۆریزم، خۆگونجاندن لەگەڵ بەجیهانیبووندا و خۆگونجاندن لەگەڵ کۆمەڵگایەکی پیری پەککەوتەدا - هەر بۆیە ناچارن بەجۆرێک خۆیان بگۆڕن کە سیستەمەکەیان گەلێ باشتر لە ئێستە بجووڵێتەوە. ئەمە بە مانای ئەوەیە کە دەبێ بڕیاردانی دیموکراتیک کارامە و پتەو بکەینەوە، سەرلەنوێ لیبرالیزمی یاساخواز تێکەڵ بە دیموکراسی بکەینەوە و، دامەزراوە سیاسی و ئەنجومەنە مەدەنییە رووخاوەکان سەرلەنوێ دروست بکەینەوە. رەنگە گەورەترین کێشەی کۆمەڵگای ئێمە هەڵگەڕێتەوە بۆ هەڵسوکەوتی خاوەن دەسەڵاتە مەزن و گەورەکان، پێویستە ئەوان لەوپەڕی خۆشحاڵی و بەدڵخوازی خۆیان ئەرک و بەرپرسایەتییەکانیان قبووڵ بکەن، پێشەنگ [ی کۆمەڵگا] بن و کۆمەڵە پێوەرێک [بۆ کۆمەڵگا] دیاری بکەن کە هەم یاسایی بێ و هەم ئەخلاقی. ئەگەر دیموکراسی لەم ناوەرۆکە بێبەش بێت لە ناو خۆیدا کرمۆڵ دەبێ و نەتەنیا دەگۆڕدرێ بۆ

---

424. Democraticadministration

سیستەمێکی بێقابل بەڵکوو دەبێتە خاوەن پۆتانسییەلێکی مەترسیدار کە هەڕەشە لە ماف و ئازادییەکان دەکا و دەبێتە هۆی زیانلێکەوتنی ئازادی و کرمۆڵی و گەندەڵبوونی ژیانی ئاسایی.

ئەمە کارەساتێکی گەورەیە، چونکوو سەرەڕای هەموو کەموکورتییەکانی، تا ئێستاش بۆ مرۆڤەکانی سەرانسەری جیهان دیموکراسی هەر هێشتا هێمای «باشترین دواهەمین هیوا»یە. بەڵام دەبێ هەڕەشە و مەترسییەکانی دیموکراسی لەسەر ئەم سەردەمەی خۆمان بڕەوێنینەوە و دیموکراسی پتەو و بەهێز بکەینەوە. هەشتا ساڵ لەمەوپێش وۆدرۆ ڤیلسۆن لەحاڵێکدا ئەمریکای بەرەو پێشوازی سەدەی بیستەم دەبرد کە کێشەی ئەمنکردن و بێمەترسیکردنی دونیا بۆ دیموکراسی بەرۆکی پێ گرتبوو، ئێستاکە ئێمە بەرەو سەدەی بیست و یەک هەنگاومان هاوێشتووە، ئەرکی سەرشانمان ئەوەیە کە دیموکراسی بۆ دونیا ئەمن و بێمەترسی بکەین.

# پاشکۆ

## ئاماژەیەکی کورت

«بەهاری عەرەبی» یان باشترە بڵێین «بەهاری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست» کە لە زستانی ٢٠١١وە دەستی پێ کردووە، سەلمێنەری زۆربەی بۆچوون و شیکاری و تەنانەت پێشبینییەکانی نووسەری ئەم کتێبە بوو. «موحەممەد بووعەزیزی» تەنیا تاکەکەسێک نەبوو بەڵکوو هێمای چینی مامناوەندیی شاریی وڵاتانی دەڤەری ڕۆژهەڵاتی ناوین بوو؛ ئەو چینە خوێندەوارەی دونیای تازە دەناسن و داخوازیی مۆدێرنیان هەیە و لە هەمان کاتدا ئامادەن بۆ دەستەبەرکردنی خولیاکانیان شەقامەکانی شارەکانیان بگرنە ئاپۆڕەی خۆیان و لەوێوە بە کردەوە ژیانێکی ئازاد و ئاسوودە بئافرێنن.

فەزای سیاسیی میسر و توونیس ـ وەک دوو وڵاتی دەسپێکەری ڕاپەڕینەکان ـ فەزایەکی داخراو و تاکدەنگی بوو، بێنعەلی و موبارەک هەریەکەو چارەکە سەدەیەک حکوومەتیان کرد و وەک بەناوبانگە لە «کۆماری پاشایەتی»ی ئەواندا تەنیا دەنگی خۆیان و ستایشکەرانیان دەبیسترا. بەڵام هەر خۆیان گۆڕی خۆیان کەند؛ لە ساڵانی دواییی دەسەڵاتداریدا دەستیان دایە ریفۆرمیزاسیۆنی ئابووری و بەم شێوەیە بنەما مادییەکانی گۆڕانخوازی و دیموکراسیخوازییان پێشکەش بە هاووڵاتییان کرد. پاوانی دەوڵەت لە ئابووریدا درزی تێکەوت و وردەوردە کەرتی تایبەت لە دایک بوو، ئیدی سەرمایە بە تەنیا لە دەست دەوڵەتدا نەبوو و دیارە بڵاوبوونەوەی سەرمایە و پارە مانای بڵاوبوونەوەی هێز و دەسەڵات. ئەوەی ریفۆرمی ئابووری لە میسر و توونیسدا کردی ریفۆرمی سیاسی لە ئێراندا ـ ئێرانی سەردەمی سەرۆککۆماریی موحەممەدی خاتەمی ـ نەیکرد، ڕەنگە ئەمە گەورەترین بەڵگە بێت کە دەبێ پێش ریفۆرمی سیاسی دەست بە ریفۆرمی ئابووری بکەین.

هەرچەند چاپی ئەم وەرگێڕانە لەبەر زۆر هۆکار و گرنگترینیـان زینـدانیبوونی منـی وەرگێـڕ زۆر کەوتە دواوە، بەڵام ئەگەر تەنیا ئەم دوو پاشکۆ کورتەیشی پێ زیـاد بـووبێ پـێم وا نیـیە زیـانێکی زۆرم کردبـێ! شۆڕشـی ٢٠١١ی ڕۆژهەڵاتـی نـاوین کە تـا سـاتەوەختی نووسـینی ئەم یادداشـتەیش هێشتا بەردەوامە، پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ و نەپچڕاوی بە نـاوەڕۆکی ئەم کتێـبەوە هەیـە. «فەریـد زەکەریا» لەم دوو وتارە کـورتەدا ئـاوڕی لەم شۆڕشـانە داوەتەوە، هەرچەنـد وتارەکـان زۆر کـورتن بەڵام بێگومان تا ڕادەیەکی زۆر لە تێڕوانینی فەرید زەکەریا بۆ ئێستای ناوچەکە دەگەین. هەر بۆیە بە پێویستم زانی هەر دوو وتارەکە وەربگێڕم و وەک پاشکۆی کتێبەکە بڵاوبێـتەوە. مـاوەتەوە بڵـێم ئەو وتارانە لە گۆڤاری مانگانەی «مهرنامه»دا کە گۆڤارێکی بەپێزی فارسییە و تایبەتە بە زانسـتە مرۆییەکان، لە ژمارەکانی ٩ و ١٠دا، بڵاو کراونەتەوە و هەردووکیان لە لایەن «کاوە شوجاعی»یەوە وەرگێڕدراون.

ع. ح

ژوەنی ٢٠١١

بەندیخانەی سنە

## پاشکۆی (١)

## بنەماکانی شۆڕشی میسر

دیمەنی دیدارەکەی نێوان فرانک ویزنێر، کۆنە دیپلۆماتی شارەزای ئەمریکایی و نوێنەری پرێزیدێنت ئۆباما، و حوسنی موبارەکی سەرۆکی میسر لە رۆژی سێشەممە یەکەمی فوورییە[ی ٢٠١١]، بۆ هەردوولا ئاشنا بوو. بە درێژایی سی ساڵ دیدارەکانی نێوان دیپلۆماتانی ئەمریکا و حوسنی موبارەک لە یەکێک لە کۆشکە رازاوە و شاهانەکانی موبارەک لە گەڕەکی هیلیۆپۆلیسی قاهیرە بەڕێوە دەچوو. سەرۆککۆماری میسر زۆر بەگەرمی پێشوازیی لە دیپلۆماتەکان دەکرد و ئینجا لەسەر پێوەندییەکانی نێوان واشینگتۆن ـ قاهیرە و سەرئەنجامی [پرۆسەی] ئاشتیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکەوتنە وتووێژەوە. دواتر رەنگە هەندێ لەو دیپلۆماتانە بە نەرمونیانی باسی پێویستبوونی ریفۆرمی سیاسییان [لە میسردا] بکردایە، بەڵام وادیارە سەرۆککۆمار زۆر خێرا دەگۆڕدرا و زۆر جیدی دەیوت: «ئەگەر ئەوەی ئێوە داوای دەکەن من ئەنجامی بدەم دەسەڵات دەکەوێتە دەست بونیادگەرایانی ئیسلامی». ئیتر رەوتی وتووێژەکە دیسان دەگەڕایەوە سەر هەمان بابەتی پێشوو؛ پرۆسەی ئاشتی.

پێدەچێ هاوشێوەی ئاوا وتووێژێک لە دیالۆگی یەکی فوورییەی نێوان موبارەک و ئەو دیپلۆماتە ئەمریکاییەشدا دووپات بووبێتەوە؛ بێگومان موبارەک ویزنێری ئاگادار کردۆتەوە کە لە نەبوونی ئەودا میسر دەکەوێتە ژێر چەپۆکی ئیخوانولموسلیمینەوە کە بزووتنەوەیەکی ئیسلامخوازی بەهێزی ئەو وڵاتەیە. هەروەها پێدەچێ ئاماژەی بە شێوازی هەڵسوکەوتی ئەمریکا لەگەڵ شای ئێرانیشدا کردبێ کە بۆچی پشتیوانییەکی زیاتریان لێ نەکرد و دەرفەتێکی لەباریان بۆ ئیسلامییانی دژەئەمریکا رەخساند تاکوو کۆنترۆڵی دەسەڵاتی تاران بگرنە دەست. بەڵام وەڵامی ئەمجارەی دیپلۆماتی ئەمریکایی بو سەرکۆماری میسر جیاواز بوو: ساتەوەختی گواستنەوەی دەسەڵات گەیشتووە.

دوای ئەو رۆژە هەرچی رووی داوە و هەر شتێکی دیکەیش لە داهاتوودا روو بدات، رەوتێکی گرنگ هەیە قەت جارێکیتر ناگەڕێتەوە: مێژوونووسان رۆژی ٢٥ی ژانوییەی ٢٠١١ وەک رۆژی سەرەتای کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی ٣٠ ساڵەی موبارەک پێناسە دەکەن. ساڵەهای ساڵ سیاسەتمەداران و مامۆستایانی زانکۆ لە هەموو جیهاندا لەوە دەکۆڵانەوە کە ئایا میسرێکی دیموکراتیک بەرەو رادیکالیزم دەچێ یان نا، ئێستا ئیتر هەموویان دەتوانن لە درووست یان

هەڵەبوونی پێشبینییەکانیان بگەن. بەڵام هەمیشە پرسیارێکی گرنگتریش لە ئارادا بووە: چ شتێک وای کرد چیرۆکەکە بەم بارەدا بشکێتەوە؟

**دواکەوتوو، گەندەڵ، هێمن**

کەسانێکی کەم پێشبینیی ئاوا رۆژێکیان دەکرد. بە درێژاییی ساڵان کۆمەڵگای میسر بە کۆمەڵگایەک پێناسە دەکرا کە رێزی دەسەڵات دەگرێ و، هەرچەند دەوڵەتێکی بەهێز و بۆرۆکراسییەتی دواکەوتوو و گەندەڵ جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستە، بەڵام توانیویەتی هێمنایەتی [ی وڵات] بپارێزێت. «فواد عەجەمی» ساڵی ١٩٩٥ لە وتارێکدا نووسیبووی: «وڵاتی میسر لە بواری سەقامگیربوون و هێمنایەتیی سیاسیدا خاوەن مێژوویەکی بەرچاو و سەرنجراکێشە». بە درێژاییی دوو سەدەی پێشوو [تەنیا] دوو رژێم لە میسردا هاتوونەتە سەر کار، یەکەمیان رژێمێکی پاشایەتی کە لە ١٨٠٥دا سەری هەڵدا و دووەمیان حکوومەتی ئێستا کە لە ساڵی ١٩٥٢ و لەلایەن جەمال عەبدولناسرەوە دامەزراوە. (هەر لەم قۆناغەدا لە فەرەنسا شۆرشێک رووی دا، دوو رژێمی ئیمپراتۆری، پێنج رژێمی کۆماری و دیکتاتۆرییەکی نیوە فاشیستی هاتنە سەرکار). خەڵکی وایاندەزانی میسرییەکان خەڵکانێکی پاسیڤ و ناچالاکن و [لەوپەڕی] دانبەخۆگرتندا ملکەچی حەز و ویستی کاربەدەستانی سیاسی و مەزهەبیی وڵاتەکەیانن. بەڵام لە دوارۆژانی ژانوییەی ئەمساڵدا - ٢٠١١ - شەقامەکانی قاهیرە و ئەسکەندەرییە و شارەکانیتر لە ئاپۆڕەی خەڵکانێکی جیاوازدا بوون: خەڵکانێکی پڕ وزە و چالاک و پێداگر کە لە هەموو گرووپێکی کۆمەڵایەتی و تەمەن جۆراوجۆریان تێدا دەبینرا. تەنانەت ژنانیش ئامادەی ئەم گۆڕەپانە بوون.

چ شتێک گۆڕدراوە؟ وادیارە پێچەوانەی بیرکردنەوەی ئێمە، میسرییەکان هێندەش خەڵکانێکی گوێڕایەڵ و تەسلیمکار نەبوون. کۆمەڵگای میسر هەڵگری چەندەها رەوتی سیاسیی جۆراوجۆر بووە، لە ئیسلامخوازە توندڕەوەکانەوە بگرە بۆ مارکسیستەکان و لە ناسیۆنالیستە عەرەبەکانەوە بۆ لیبرالەکان. بەڵام لە کۆتاییی پەنجاکان (١٩٥٠) بەملاوە دەوڵەتی میسر کەوتە سەرکوتکردنی کۆمەڵگای مەدەنی، [دەوڵەت] حیزبە سیاسییەکانی هەڵدەپێچا، رۆژنامەکانی دادەخست، سیاسەتمەدارانی توندی بەندیخانە دەکرد، بەرتیلی بە دادوەران دەدا و قروقاپی بە رۆشنبیران دەکرد. بە درێژاییی چەند دەیەی رابردووی میسر، زۆر کەم کتێبی جیدی و بەپێز نووسراوە، زانکۆکان بە تەواوی لە ژێر چاودێریدا بوون، رۆژنامەکان ملکەچی بەرنامەی راگەیەندراوی حیزبی دەسەڵاتدار بوون و، خەڵکیش لە کۆڵان و شەقامەکاندا ئاگایان لە دەمی خۆیان بوو. لەم بیست

ساڵەی دواییدا دەوڵەتی موبارەک شەڕی دژەتیرۆری کردبووە بیانوویەک بۆ زەوتکردنی هەرچی زیاتری ئازادییە مەدەنییەکانی خەڵک لە ژێر ناوی پاراستنی ئاسایشی وڵاتدا.

## ریفۆرم و شۆڕش

ئەڵبەت دەوڵەتی میسر هەندێ دەسکەوتیشی تۆمار کردووە و سەیر ئەوەیە هەریەکێک لەم دەسکەوتانە بوو بە هۆی دەسپێکردنی راپەڕینی ئەم دواییە. لەم دەساڵەی رابردوودا میسر دەستی دایە ریفۆرمی ئابووری. لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا بوو کە دەوڵەت تێگەیشت ئەگەر بیهەوێ لە پارە و وامەکانی بانکی جیهانی بەهرەمەند بێت دەبێ دەست بە ساغکردنەوە و نوێکردنەوەی فەشەلترین لایەنەکانی ئابوورییە نیوە سۆسیالیستییەکەی بکات. لەم ساڵانەی دواییدا موبارەک لە ژێر کاریگەری و هاندانی جەمالی کوڕیدا کە بانکدارێکی دەرسخوێندووی [زانکۆکانی] رۆژئاوایە، کۆمەڵێک ریفۆرمخوازی پڕ وزە و توانای هێنایە نێو کابینەکەیەوە تاکوو هەوڵێکی بەرزەفڕانە بە ئاراستەی نۆژەنکردنەوەی ئابووریی میسردا دەست پێ بکەن. ئەوان رێژەی پیتاک و تاریفە (Tariff) گومرکییەکانیان کەم کردەوە. سنوورێکیان بۆ دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووریدا دیاری کرد و رێژەی سوبسیدە دەوڵەتییەکانیان دابەزاند [بەم شێوەیە] ئابووریی میسر کە ماوەیەکی زۆر بوو رووی لە مەرگ کردبوو، وردە وردە بووژایەوە. لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٦ تا ٢٠٠٨دا ئابووریی میسر هەموو ساڵێک بە رێژەی (٧%) گەشەسەندنی بەخۆوە بینی و تەنانەت ساڵی ٢٠١٠ و دوای قەیرانە ئابوورییەکەی جیهان بە رێژەی (٦%) درێژەی بەم گەشەسەندنە دا. گەشەسەندنی دۆخی ئابووری یەکانگیر بوو لەگەڵ گەشەسەندنی ئامێرە نوێیەکانی پێوەندایەتیدا و لەوێوەش وریابوونەوەی هەرچی زیاتری خەڵک لە دونیای دەرەوە.

## بۆچی پێشکەوتنی ئابووری ناڕەزایی لێ کەوتەوە؟

پەرەسەندنی ئابووری دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕی بارودۆخ و سیستەمە کۆنەکان دەگۆڕێت، [هەروەها] دەبێتە هۆی دروستبوونی جیاوازی و نایەکسانی و، پەرەسەندنی گومان و دوودڵی سەبارەت بە بارودۆخی داهاتوو. ئەلێکسی دۆتۆکڤیل جارێکیان وتبووی «مەترسیدارترین سەردەم بۆ حکوومەتێکی خراپ ئەو ساتەوەختەیە کە دەست بە ریفۆرم و چاکسازی دەکات». گۆڕدرانی هەلومەرجی کۆمەڵگا بۆ رژێمی دیکتاتۆری خراپترین شتە، چونکوو ئەو پێکهاتی دەسەڵاتەی رۆی ناوە ناتوانێ وەڵامی داخوازییە تازە و برۆزەکانی جەماوەر بداتەوە. دەشێت بێکاریی لاوان یاخود هەژاری لە رووداوی شۆڕشدا کاریگەر بن، بەڵام [لە شۆڕشی میسردا] ئەو رەوتە سەرەکییەی

شۆڕشی لێ کەوتەوە حەشیمەتی نائارام و ڕوو لە پەرەی میسر بوو کە هەستی بە دۆخی باشتر و لەبارتری ئابووریی کردبوو و پێوەندیشی لەگەڵ دونیای دەرەوەدا ڕێک خستبوو.

موبارەک لەم دوا ساڵانەدا لە ڕووی ئابوورییەوە بەرەو پێشەوە هەنگاوی دەنا، بەڵام لە ڕووی سیاسییەوە پاشەکشێیەکی تەواوی کردبوو. چینی مامناوەندیی میسر کە تازە گیانێکی بە لەشدا هاتبۆوە نەیدەتوانی ئەم دۆخە قبووڵ بکات. پێشبینیکردنی داهاتوو گەلێ ئەستەمە، هەرکەسێکیش بە دڵنیایی و یەقینەوە باسی داهاتوویەکی دیاریکراوی تایبەت بکات [تەنیا] کەمئەزموونبوونی سیاسیی خۆی دەسەلمێنێ. کۆمەڵگای میسر کۆمەڵگایەکی گەورە و ئاڵۆزە و ئێستا کەوتۆتە بەردەم گۆڕانێکی بێوێنەوە. ناتوانین هەڵسوکەوتی کۆمەڵگاکان پێشبینی بکەین، بەڵام دەتوانین لە ڕێگەی زانیاریی ورد و دروستەوە مەزەندەی هەندێ شت بکەین. کە وا بوو باشتر وایە بەدەر لە هەرچەشنە داوەرییەکی پێشوەخت پێکەوە ئاوڕێک بدەینەوە لە ڕاپرسییەکەی ئاوریلی نیسان ڕابردووی ڕێکخراوی ناسراو و جێمتمانەی pew تاکوو کەمێک قووڵتر لە خەڵکی میسر بگەین.
بەپێی ئەم ڕاپرسییە لە سەدا ٨٢ی خەڵکی میسر پشتیوانی لە ڕەجمکردنی (بەرد بارانکردن) زیناکاران دەکەن و لە ململانێی نێوان «مۆدێڕن»ەکان و «بونیادگەرا»کاندا لە سەدا ٥٩ی خەڵک لایەنگری لە بونیادگەراکان دەکەن. لە سەدا ٨٤ی خەڵک ئێعدامکردنی مورتەد و لە دین دەرچووانیان قبووڵە. لە هەمان حاڵدا لە سەدا ٩٠ی میسرییەکان باوەڕیان بە ئازادیی ئایینی هەیە، ٨٨ لە سەدیان پشتگیری لە سیستەمی سەربەخۆی دادوەری دەکەن، لە سەدا ٨٠ لایەنگری ئازادیی ڕادەربڕینن و لە سەدا ٧٥یش دژی سانسۆڕن. کاتێک سەیری ئەو خەڵکە دەکەم وا هەست دەکەم دەوڵەتی داهاتووی میسر «دیموکراسییەکی نالیبرالی» دەبێ کە تیایدا هەڵبژاردن تا ڕادەیەکی زۆر ئازاد و دادپەروەرانە بەڕێوە دەچێ بەڵام زۆرینەی هەڵبژێردراو هەندێ لە ماف و ئازادییە تاکییەکان ـ مەبەست مۆدێلی ڕۆژئاواییە ـ بەرکورت دەکاتەوە.

پێشبینیکردنی داهاتوو سەختە بەڵام دەتوانین مەزەندەی ئەوە بکەین کە دەسەڵاتدارانی داهاتووی میسر و توونێس ـ بە پێچەوانەی پێشبینیی توندڕەوەکانی ئیسراییل ـ زۆریش دژە ڕۆژئاوا نەبن (چونکوو ئەورووپا و ئەمریکا ئیتر سەنتەر و ناوەندی جیهان نین). ڕەنگە ئەم شۆڕشانە یەکەم شۆڕشەکانی دونیای سەروو ئەمریکایی (Post-American) بن.

**سەرچاوەی سەرەکی: تایم TIME**

سەرچاوەی فارسی: گۆڤاری مانگانەی (مهرنامە)، ژمارەی ٩، ڕەشەمەی ١٣٨٩ (مارسی٢٠١١)، ل ٣٢و٣٣. وەرگێڕانی کاوەی شوجاعی

## پاشكۆی (٢)
## ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پاشەكشێ ناكات
## لاوان و تەكنۆلۆژیا، دوو هۆكاری گۆڕانكارییەكانی ناوچە

ڕووداوەكانی ئەم دواییانەی میسر و توونیس مرۆڤ بیری ڕاپەڕینە جەماوەرییەكانی ١٦٢ ساڵ لەمەوپێش دەخاتەوە كە لە سیسیل و فەرەنساوە دەستی پێكرد. شۆڕشەكانی ١٨٤٨ لە كەفوكوڵدا هاوشێوەی هەمان ئەو شتە بوو كە هەنووكە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەقەومێت. (لەو سەردەمەیشدا مێژوونووسان ئەو ڕووداوانەیان بە سەرەتای وەرزێكی نوێ لە ژیانی خەڵكدا پێناسە دەكرد). لەو سەردەمەیشدا قەیرانێكی ئابووری و بەرزبوونەوەی نرخی خواردەمەنی بوونە هۆكاری دەسپێكرانی شۆڕش. سیستەمە پاشایەتییەكان لە خشتە چووبوون و لە بەرانبەر دونیای ڕوو لە گۆڕاندا بەرگرییان دەنواند. لە هەڵمەتی بەرنگاربوونەوەی ئەو ڕژێمانەدا لاوان لە یەكەم ڕیزدا بوون. تەكنۆلۆژیای نوێی زانیاری ـ ڕۆژنامەی فرەتیراژ! ـ جەماوەری پێكەوە گرێ دابوو. تەنیا یەک كێشە مایەوە؛ ئەنجامی چیرۆكەكە ناخۆش بوو. ناڕازییان و ڕاپەڕیوان دەسەڵاتیان گرتە دەست، بەڵام دوای ماوەیەک ناكۆكییان تێكەوت، كەوتنە شەڕ و یەكتریان لاواز كرد. هێشتا ئارتەش لایەنگری تەكووزییە (order) كۆنەكە بوو و نارەزایەتییەكانی سەركوت دەكرد. پادشاكان بە خۆشحاڵییەوە لەو دۆخە ورد دەبوونەوە و چاوەڕێ بوون. دوای چەندساڵ ڕژێمەكانی پێشوو دیسان گەڕانەوە سەر دەسەڵات. «ئەی.جی.پی تەیلۆر» مێژوونووسی بریتانی دەڵێت: «مێژوو گەیشتە خاڵی وەرچەرخان بەڵام نەیتوانی دەربازی بكات و لاپەڕەكە بگۆڕێ».

ئایا لەمڕۆی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا مێژوو توانای گۆڕینی لاپەڕەكەی نییە؟ ئایا ڕاپەڕینەكانی ئێستای یەمەن، بەحرەین، ئەردەن و وڵاتانی‌تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش وردە وردە دادەمركێ و ئەگەر چەندساڵی‌تر ئاوڕ لە ساڵی ٢٠١١ بدەینەوە بەو ئەنجامە دەگەین كە لە ڕاستیدا گۆڕانێكی ئەوتۆ ڕووی نەداوە؟ ئاوا ئەگەرێک لە ئارادایە، بەڵام زۆر پێدەچێ دوو هۆكاری بنەمایی لە هۆكارە پێكهێنەرەكانی ململانێی ئێستای ڕۆژهەڵاتی ناوین [قەت] لەناو نەچن، دوو فاكتەری زۆر بەهێز كە خەریكی گۆڕینی دونیای ئەوڕۆن: لاوان و تەكنۆلوژیا.

تایبەتمەندیی سەرەکی و ناوەندیی قەیرانی ئەمڕۆی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بریتییە لە لاوبوونی لەڕادەبەدەر و نائاسایی ئەم ناوچەیە. نزیکەی لە سەدا ٦٠ی حەشیمەتی ناوچەکە لە تەمەنی ژێر سی ساڵدان. ئەمە میلیۆنان لاوە خولیا و ئاواتی جۆراوجۆریان هەیە و دەیانەوێ - و دەبێ - بەو ئاواتانە بگەن، بەڵام حکوومەتەکانی ناوچە ئەوەیان سەلماندووە کە نەتەنیا توانایان بۆ یارمەتیدانی لاوان کەم و سنووردارە، بەڵکو زۆرجار دەشبنە لەمپەر لە بەردەمیاندا. دەوڵەتانی عەرەبی ئەم دەڤەرە [هۆکاری] ڕاپەڕین و نارەزایەتیی لاوان دەگێڕنەوە بۆ بونیادگەرایی ئیسلامی، یاخود بە ئاکامی دەستێوەردانی ڕۆژئاوای دەزانن. بەڵام هەموو لێکۆڵەرێکی بێلایەن دان بەوەدا دەنێ کە سەرچاوەی ئەم نارەزایەتییانە یەکسەر ناوخۆییە و تەنانەت مایەی نیگەرانیی ڕۆژئاوایشە، چونکوو هاوپەیمانی و ڕیزبەندییە کۆنەکان تووشی ئاڵوگۆڕ دەکات. یەکەم داخوازیی ڕاپەڕیوان ئەوەیە کە حسێبی «هاووڵاتی»یان بۆ بکرێ نەک «ڕەعیەت». بەپێی ڕاپرسییەک کە لە نێوان لاوانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەنجام دراوە، یەکەم ئاواتی ئەم لاوانە لە نێو ولاتدا «ژیانکردن لە ولاتێکی ئازاد»دایە، لە هەمانکاتدا «کار و پیشەی باش» و «ژیانکردن لە کۆمەڵگایەکی مۆدێرن و کارامە»شدا لە ڕیزی خولیا و ئاواتە گرنگەکانی ئەواندایە. لاوان هەمیشە سەرچاوەی توندوتیژی نین. دوای تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانی لەپڕ ڕۆژئاوا ڕووبەڕووی پەرەسەندنی ژمارەی لاوان بوویەوە، [بەڵام] ئەمەی کردە هۆکارێک بۆ خێراکردنەوەی گەشەی ئابووریی خۆی. چین و هیندستانیش هەر لەڕێی ئەم کرێکارە لاوانەوە بوونەتە زلهێزێکی ئابووری. بەڵام ئەگەر پەرەسەندنی ئابووری و دەرفەتی یەکسانی کار و پیشە [لەم جۆرە ولاتانەدا] نەیەتە دی و مرۆڤەکان لە ولاتی خۆیاندا لە ڕێز و حورمەت بێبەش بن، ئەوسا لاوان - بەتایبەت پیاوانی لاو - نارەزایەتیی قووڵی خۆیان نیشانی دەسەڵاتداران دەدەن و پێدەچێ شێوازی دەربڕینی نارەزایەتییەکان هێندەیش دڵخواز و ئیدیال نەبێت. ئەمە هەمان ئەو ڕەوتەیە کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەستی پێ کردووە، ئەو دەڤەرەی پێدەچێ هەڵگری زیاترین ڕێژەی لاوان لە هەموو جیهاندا بێت. لە نێوان ساڵانی ١٩٧٠ تا ٢٠٠٧دا لە سەدا ٨٠ی کێشە و ناکۆکییەکان لەو ولاتانەدا ڕوویان داوە کە لە سەدا ٦٠ یاخود زۆرینەی دانیشتووانیان لاوانی ژێر سی ساڵ بوون. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە تەنانەت لەو ولاتانەشدا کە لاوان هۆکاری گەشەی خێرای ئابووری بوون هێشتا هەر هەندێ کێشە و ناکۆکی ڕووی داوە. ڕۆژئاوا لە کۆتاییی شەستەکاندا (١٩٦٠) گەیشتە سەرترۆپکی لاوی و جێی سەرسووڕمان نییە کە ڕاپەڕینەکانی لاوان و نارەزایەتییە بەربڵاوەکان بوونەتە پێناسەی ئەو سەردەمە.

له رابردوودا جارەهای جار رۆژنامەنووسان، سیاسەتمەداران و مامۆستایانی زانکۆ ئاماژەیان بە کێشەی لاوان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کردبوو، بەڵام حکوومەتەکانی ئەم ناوچەیە هەوڵێکی ئەوتۆیان بۆ سڕینەوەی کێشەکان و باشترکردنی بارودۆخەکە نەدا. رێژی بێکاری لە نێو لاوانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆر زۆرە - بەپێی هەندێ لە لێکۆڵینەوەکان تەنانەت تا لە سەدا ٢٥یش بەرز بۆتەوە. بێگومان بەرزبوونەوەی نرخی نەوت یارمەتیدەری وڵاتانی ناوچەکە بووە بۆ چەورکردنی سمێڵی هاووڵاتییانیان بەڵام بیرمان نەچێ کە نیوەی حەشیمەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دانیشتووی وڵاتانی نەوتی نین. لەوەش گرنگتر، خودی وڵاتە نەوتییەکانیش گیرۆدەی «لەعنەتی نەوت» بوون؛ واتە ئابووریی ئەو وڵاتانە تەنیا وابەستەی فرۆشتنی نەوت و گازە و [کۆمپانیا] بیانییەکان هەموو کارە سەخت و ئاسانەکان بەڕێوە دەبەن و دەوڵەتیش تەنیا و تەنیا بەیەک شێوە لەگەڵ هاووڵاتیاندا دەجووڵێتەوە: تا ئەو کاتەی ملکەچی دەسەڵاتی ئێمە بن ئێمەیش یارمەتی و «کۆمەک خەرج»تان دەدەینێ؛ سۆبسید لە بەرانبەر گوێڕایەڵبووندا. دەوڵەتەکانی کوێت و بەحرەین کە زراوریان لە گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییە تۆقیوە، لەپڕ بڕیاریان دا ئەمساڵ «یارمەتی / ئەنعام» بەخەڵکی بدەن. (کوێت ٣٠٠٠ دۆلار و بەحرەین ٢٧٠٠ دۆلار). ئەم مووچە و پاداشتە تازانە سەلمێنەری ئەو حەقیقەتە تاڵەن کە حاکمانی رۆژهەڵاتی ناوین بە دوو شێوە جەماوەر کونترۆڵ دەکەن: سەرکووتکردنی بەربڵاو و بەرتیلدانی بەربڵاو. رەنگە رێگای دووەم، کە زیاتر لە وڵاتانی عەرەبی دەوروبەری کەنداودا باوە، رێگەیەکی کاریگەرتر بێت. (ئەڵبەت دەوڵەتی بەحرەین کێشەیەکی جیدیتر لە بەردەم خۆیدا دەبینێ، چونکوو کەمایەتییەکی سوننە بەسەر زۆرینەی شیعەدا حوکم دەکات). بەڵام ئەمێستاکە هەردوو گرووپی دەسەڵاتدار - سەرکوتکەران و بەرتیلدەران - بە راستی لە کێشەوە گلاون، چونکوو خەڵک رۆژ لەدوای رۆژ وریاتر، وشیارتر و یەکگرتووتر دەبنەوە. گەڕاندنەوەی هۆکاری رووداوەکانی توونێس و میسر بۆ «فەیسبووک» [گەلێ] ساویلکانە و کاڵفامانەیە. بەڵام تەکنۆلۆژیا - کەناڵە تێلەڤیزیۆنە ئاسمانییەکان، کۆمپیوتەرەکان، مۆبایل و ئینتەرنێت - رۆڵێکی زۆر بەهێزی لە وریاکردنەوە و فێرکردن و پێکەوە گرێدانی خەڵکی ناوچەکەدا گێڕاوە. ئەم گۆڕانکارییانە «تاکەکان»یان بەهێزتر و «دەوڵەتەکان»یان لاوازتر کردووە. لە رابردوودا تەکنۆلۆژیای زانیاری بە ئاراستەی بەرژەوەندیی حاکماندا هەڵدەسووڕا، چوونکوو نەدەکەوتە بەردەست «هەمووکەسێک»ەوە. هەواڵ لەلایەن «یەک کەس»ەوە بۆ «هەموان» بڵاو دەکرایەوە. هەر ئەمەش وای لە شۆڕشگێڕانی دەیەی ١٩٣٠ دەکرد هەوڵی دەستبەسەرداگرتنی ئێزگەکانی رادیۆ بدەن تاکوو زانیاری و هەواڵەکان بە خەڵک رابگەیەنن. تەکنۆلۆژیای پێوەندایەتیی ئەمڕۆ ئەو مۆنۆپۆلەی هەڵوەشاندۆتەوە. [ئێستا] هەواڵ لەلایەن «هەموان»ەوە بۆ «هەموان» بڵاو

دەبێتەوە. هەموان لە زنجیرە تۆڕێکدا پێکەوە بەستراونەتەوە و هیچکەس سەرۆک نییە، دیارە ئەم هەواڵە بۆ هەرکەسێک خوازیاری «دەستبەسەرداگرتن»ی هەواڵ و زانیاری بێت هەواڵێکی ناخوشە. ئەڵبەت دەوڵەتەکان دەتوانن «دژەهێرش» ئەنجام بدەن؛ دەوڵەتی میسر پێنج رۆژ ئینتەرنێتی بەسەر میسرییەکاندا داخست. دەوڵەتانی دیکەیش هەوڵ دەدەن لە رۆژانی راپەڕین و ناڕەزاییدا بواری ئینتەرنێت و مۆبایل بەرکورت بکەنەوە. بەڵام بیر لە زیانەکانی ئەم جۆرە کارانە بکەنەوە. ئەگەر ئینتەرنێت نەبێ ئایا بانکەکان دەتوانن درێژە بە کارەکانیان بدەن؟ ئەگەر سیستەمی مۆبایل دابخرێ ئاخۆ بازرگانی رووبەڕووی چ گێچەڵ و گێژاوێک دەبێتەوە؟

سووریا دوای پەرەسەندنی راپەڕینی خەڵکی رۆژهەڵاتی ناوین ئیجازەی بە هاووڵاتییانی دا دوای چەندساڵ دیسان دەستیان بە فەیسبووک بگات؛ بەڵام روانین و میتۆدی بنەماییی دەوڵەتی دیمەشق هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە: نابێ تێکەڵی دونیای دەرەوە بین، دیارە ئەم جۆرە تێروانینە لەمپەرێکی زۆر جیدییە لە بەردەم گەشەی ئابووریدا. تا ئەم سیاسەتە حاکم بێت کێشەی بێکاریی لاوان چارەسەر نابێ. کۆریای باکوور تا ئەوکاتە هێمن و بەسەقامە کە هەر لەم دۆخە داخراوە قووڵەی ئێستایدا بمێنێتەوە (و بێگومان ئەم هێمنایەتی و سەقامگیربوونە هەر کورتخایەن دەبێ). هەر رژێم و دەوڵەتێک پێویستی بە وەڵامدانەوەی کەڵکەڵە و داخوازیی هاووڵاتییانی بێ، [بێگومان] دەبێ لیراڵیزاسیۆنی سیاسی و ئابووری بەڕێوە بات.

پێداویستییەکانی مۆدێرنیزاسیۆن ـ کۆمەڵگاکان بو دەستەبەرکردنی پێشکەوتن و گەشەسەندن دەبێ مل بە ئازادیی سیاسی / ئابووریی فرەتر بدەن ـ وام لێ دەکا ئیجازە بە خۆم بدەم بەرانبەر بە راپەڕینی لاوانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەشبین بم. هەرکات ئاوڕ لە مێژووی هاوچەرخی رۆژهەڵاتی ناوین دەدەینەوە بە ئاسانی دەتوانین [بەرانبەر بە داهاتوو] رەشبین و بێ هیوا بین. سەرمایەدارێکی ئەمریکایی، وارێن باخت، جارێکیان وتبووی هەرکات کەسێک پێم ئەڵێ «ئەم جارە جیاوازە» خێرا جانتای پارەکەم دەگرمە قولی مستم، چونکوو وا هەست دەکەم دەیەوێ فریوم بدات. بەڵام بەمەشەوە وا هەست دەکەم رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئەم جارە جیاوازە. ئەڵبەت منیش جانتای پارەکەمم لە مست گرتووە. ئایا ئەم جارە خەڵک بە راستی رزگار دەبن؟

**سەرچاوە**: گۆڤاری مانگانەی (مهرنامە)، ژمارەی ١٠، خاکەلێوەی ١٣٩٠ (ئاوریلی ٢٠١١)، ل ٣٨.

وەرگێڕ: کاوە شوجاعی

# یادداشتەکان

ئەم کتێبە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی نییە، ئەگەر ئەم کتێبە دەورێکی لەو بابەتەدا هەبێ ئەوا ئەو دەورە دەگەڕێتەوە بۆ ئەندێشە و بەڵگاندنەکانی. کە وا بوو مەبەست لە یادداشتەکانی کۆتایی ئەم کتێبە زیاتر ئاماژەکردنە بە کۆمەڵە زانیارییەکی سەرنجڕاکێش یان خستنە بەردەستی سەرچاوەی گێڕانەوە بەپێزەکان [ی نێو کتێبەکە]، لەم بوارەدا بە شێوەیەکی ئەزموونکرد بەو قەناعەتە گەشتم کە ئەگەر خوێنەرێکی گشتی ئەو پرسیارەی کرد کە «ئەم بابەتە لەکوێوە هاتووە؟»، دەبێ وەڵامێکی پێ بدەمەوە. زۆرجار ئەگەر بۆ شیکردنەوەی گشتیی بابەتێک کەڵکم لە سەرچاوەیەکی لاوەکی وەرگرتبێ لە ناو دەقی کتێبەکەدا ئاماژەم بە سەرچاوەکە کردووە، ئەڵبەت رەنگە دیسان لێرەشدا ئاماژەم پێ دابێتەوە.

زۆربەی ئەو تەفسیرە مێژووییانەی کەڵکم لێ وەرگرتوون بریتین لەوانەی کە هەندێجار بە «تەفسیری سوننەتی»ی رووداوەکان یان لێکدانەوەیەکی سەرپێیی و سەرەتایی بۆ دیاردەیەکی ئاڵۆزی مێژوویی؛ ناویان دەرکردووە. بۆ وێنە سەبارەت بە [رەوتی] پێشکەوتنی گشتیی لیبرالیزمی بریتانی و بەتایبەت دەسەڵاتی پەرلەمانی، پشتم بەو روانگەیە بەستووە کە هەندێجار ناوی «تەفسیری ویگ»[425]ی لەسەر دادەنێن. مەبەستم لەم هەڵبژاردنە رەتکردنەوەی ئیدیعاکانی پیاچوونەوەخوازان[426] نەبوو، بە پێچەوانەوە لەم لێکۆڵینەوەیەدا کتێبەکەی ئەی.جی.هابسباوم گەلێ یارمەتیدەرم بوو، بەڵام ئەو ئیدیعایانە هەر تەنیا ئەوەندە کارم تێدەکەن کە پیاچوونەوە بە شێوە تەفسیری سوننەتیدا بکەم نەک ئەوەی ئەو شێوە تەفسیرە [سەرلەنوێ] بنووسمەوە. وەک چۆن ریچارد پاییس گەورە توێژەری زانکۆی هارڤارد لە بواری مێژووی رووسیادا نووسیویەتی: «کێشەی پیاچوونەوەخوازی ئەوەیە کە نارێکییەکان و [نموونە] ئاوارتەکان بە گۆڕانکاریی ورد و بچووکی ناو دیاردەکان نازانێ بەڵکوو وەک جەوهەر و زاتی دیاردەکان پێناسەیان دەکات». کە وا بوو بەپێی بۆچوونی مێژوونووسی پیاچوونەوەخواز، جی.پی.کەینۆن، هەرچەند رەنگە تەفسیری ویگ بۆ مێژووی بریتانیا هەڵگری هەندێ کەموکورتی بێت بەڵام هیچ تەفسیرێکی گشتی و جێی باوەڕی دیکەمان نییە توانیبێتی جێی ئەو تەفسیرە بگرێتەوە. پاییس ئەوەشمان بۆ شی دەکاتەوە کە زۆرجار پیاچوونەوەخوازان لەبەر خەسڵەتی پیشەپەرستیی خۆیان لە ئیدیعاکانیاندا تووشی زێدەبێژی و گەورەکردنەوە دەبن: «لە نێو مێژوونووساندا هەموو نەوەیەک هەوڵ دەدا لە رێگای گومان خستنەسەر کارەکانی مێژوونووسانی پێش خۆی و جەختکردن لەسەر ئاوارتەکان و وردەکارییەکان، تیۆری و بۆچوونەکانی خۆی بە تیۆریگەلێکی تازە و رەسەن لەقەڵەم بدا، ئەمەش دەبێتە هۆی ناوبانگ دەرکردنیان لەوڕۆدا... هەر ئەمەش وای کردووە لە ئاست بابەتە مێژووییەکاندا زۆرجار دوورترین ئەگەر پێش هەموو شتێکیتر و بابەتێکیتر بکەوێتە بەرباس».

**بەشی یەکەم**

1. Jacob burckhardt, *The Age of Constantine the Great*, tr. Moses Hadas (Berkeley: University of California Press, 1983), 351.

---

٤٢٥ . حیزبی ویگ (Whig) یەک لە دوو حیزبە سەرەکییەکەی بریتانیای سەدەی هەژدە بوو کە دوای ١٨١٥ گۆڕدرا بۆ حیزبی لیبرال. تۆماس بابینگتۆن، سیاسەتمەدار و مێژوونووسی بریتانی کە لە سەدەی هەژدەدا ئەندامی حیزبی ویگ بوو، کتێبێکی پێنج بەرگیی لەژێر ناوی *مێژووی بریتانیا*دا نووسیوە. بابینگتۆن لەو بەرهەمە بەپێزەدا مێژووی بریتانیای لەسەر بنەمای شێوە تەفسیری ویگ نووسیوەتەوە. و.ف
426. Revisionists

2. Benjamin Constant, «The Liberty of the Ancients Compared with That of the Moderns» (1819), in *Benjamin Constant: Political Writings*, Biancamaria Fontana, ed. (New York: Cambridge University Press, 1988).
3. Herbert Asquith, «Introduction» in Ernest Barker, *The Legacy of Rome* (Oxford, Clarendon Perss, 1923), vii.
4. Quoted in David Gress, *From Plato to NATO: The Idea of the West and Its Opponents* (New York: Free Press, 1998), 125.

له [شیکردنەوەی] پرسی ڕۆم و کلێسای کاتۆلیکدا زۆر قەرزداری ئەم کتێبە سەرنجڕاکێش و گرنگەم.

5. Edward Gibbon, *The Decline and Fall of the Roman Empire*, Vol. 3, chapter 27, part 4.

دیسان سپاسی دەیڤید گرێس دەکەم بۆ ئەم بابەتە و هەروەها سەرچاوەکەی.

6. E. L. Jones, *The European Miracle: Environments, Economies, and Geopolitics in the History of Europe and Asia* (New York: Cambridge University Press, 1981).

ئەم کتێبە گەلێ بەربڵاو و جێی وردبوونەوە و تێڕامانە، بەڵام جۆنز گرنگایەتییەکی زیاتر لە من بە کولتوور دەدات.

7. Guido de Ruggiero, *The History of European Liberalism* (Oxford: Oxford University press, 1927).

بەرهەمێکی جوان و بەپێز کە شایانی ئەوەیە ببێتە بەرهەمێکی کلاسیک.

8. Daniel A. Baugh, ed., *Aristocratic Government and Society in Eighteenth Century England* (New York: New Viewpoints, 1975).

9. Paul Johnson, «Laying Down the Law», *Wall Street Journal*, March 10, 1999.

10. In the historian j. H. Plumb's words, «the Revolution of 1688 was a monument raised by the gentry to is own *sense* of independence». J. H. Plumb, *The Growth of Political Stability in England, 1675-1725* (London: Macmillan, 1967), 29-30.

11. Jacques Barzun, *From Dawn to Decadence: 1500 to the Present* (New York: HarperCollins, 2000), 287-89.

12. Jundith Shklar, *Montesquieu* (New York: Oxford University Press, 1987), 121.

13. Douglass North and Robert Thomas, *The Rise of the Western World: A New Economic History* (Cambridge: Cambridge University Press, 1973), x.

14. Richard Pipes, *Property and Freedom* (New York: Knopf, 1999), 111.

15. Mildred Campbell, *The English Yeomen under Elizabeth and the Early Stuarts* (New York: A. M. Kelley, 1968), cited in Barrington Moore, *Social Origins of Dictatorship and Democracy: Lond and Peasant in the Making of the Modem World* (Boston: Beacon Press, 1966).

16. Moore, *Social Origins*, 418.

لە دەقە ئەسڵییەکەدا وشەی «بۆرژوا» بەکار هێنراوە نەک «بۆرژوازی»، بەڵام لە گێڕانەوەی قسەکاندا بەزۆری وشەی دووەم بەکار هێنراوە و منیش هەر ئەم شتەم پێڕەو کردووە.

17. J. M. Roberts, *The Penguin History of the World* (New York: Penguin, 1997), 553.

18. E. J. Hobsbawm, *Industry and Empire* (New York: Penguin, 1969), 26.
19. Hobsbawm, *Industry*, 48.
20. Richard Hofstadter, *America at 1750: A Social Portrait* (New York: Knopf, 1971), 131.
21. Gordon Wood, *The Radicalism of the American Revolution* (New York: Random House, 1993), p. 348.

22. Voting percentages calculated using B. R. Mitchell, *Abstract of British Historical Statistics* (Cambridge: Cambridge University Perss, 1962); The Great Britain Historical G.I.S., University of Essex, available at www.Geog.port.uk/gblgis/db; and E. J. Evans, *The forging of the modern industrial state: Early Industrial Britain, 1783-1870* (New York: Longman, 1983). Also see Gertude Himmelfarb, «The Politics of Democracy: The English Reform Act of 1876». *Journal of British Studies* 6 (1966).

23. Max Weber, *The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism* (New York: Scribner's, 1958).

24. Minxin Pei, «Constructing the Political Foundations for Rapid Economic Growth», in Henry Rowen, ed., *Behind East Asia's Growth: The Political and Social Foundations of an Economic Miracle* (London: Routledge, 1997), 39-59.

25. Myron Weiner, «Empirical Democratic Theory», in Myron Weiner and Ergun Ozbudun, eds., *Competitive Elections in Developing countries* (Durham, N. C.: Duke University Press, 1987), 20.

## بەشی دووەم

١. زۆربەی ئەم گێڕانەوەیە و هەروەها بابەتەکەی لوگێر کە دوابەدوای گێڕانەوەکە خراوەتە بەرباس، لەم کتێبە بەرجەستە و گرنگەوە وەرگیراوە:

Carl Schorske's Brilliant book *Fin-de-siecle Vienna: Politics and Culture* (New York: Vintage, 1981).

٢. هەڵبژاردنەکەی ١٩٣٣ لە کەشوهەوایەکی ناسیۆنالیستیی پڕهەرا و بزوێنەردا بەڕێوەچوو، حیزبی نازیش لە دروستکردنی ئەو کەشوهەوایەدا تا رادەیەک دەوری هەبوو و بە باشترین شێوەیش بە قازانجی خۆی قۆستییەوە. بەڵام دیسان ناتوانین حاشا لە پشتیوانیکردنی خەڵک لە حیزبی نازی بکەین.

ئاکامی هەڵبژاردنەکان بەم شێوەیە بوو:

| حیزب | ١٩٣٠ | ١٩٣٢ (جولای) | ١٩٣٢ (تشرینی دووەم) | ١٩٣٣ |
|---|---|---|---|---|
| سۆسیالیستی نەتەوەیی | ١٠٧ | ٢٣٠ | ١٩٦ | ٢٨٨ |
| سۆسیال دیموکرات | ١٤٣ | ١٣٣ | ١٢١ | ١٢٠ |
| کۆمۆنیست | ٧٧ | ٨٩ | ١٠٠ | ٨١ |
| میانەڕەو (کاتۆلیک) | ٦٨ | ٩٧ | ٧٠ | ٧٣ |

3. Jack Snyder, *From Voting to Violence: Democratization and Nationalist Conflict* (New York: Norton, 2000), 118. Also on the Weimar Republic, *See* sheri Berman's fine essay «Civil Society and the Collapse of the Weimar Republic», *World Politics* 49, no. 3 (April 1997).

4. On France see Philip Nord. *The Republican Moment: Struggles for Democracy in Nineteenth-Century France* (Cambridge, Mass: Harvard University Press, 1995). On the United Kingdom, few accounts surpass George Dangerfield's classic *The Strange death of Liberal England* (New York: Capricorn Books, 1961). But also see Eric Hobsbawm, *The Age of Empire* (New York: Vintage, 1989).

5. Sheri Berman, «Modernization in Historical perspective: The Case of Imperial Germany», *World Politics* 53, no. 3. (April 2001). A very persuasive essay.

6. Ralf Dahrendorf, *Society and Democracy in Germany* (New York: Double day, 1969).

گەشەی سیاسیی ئەڵمانیا بابەتێکی ئێجگار بەربڵاو و ئاڵۆزە بەڵام وەڵامەکەی دارێندۆرف بۆ ئەم پرسیارە کە وەڵامەکەی منیش دەقاودەق هەر ئەوەیە، لە نێو وەڵامە سادەکاندا باشترین وەڵامە. ئەگەر دەتەوێ شیکارییەکی قووڵتر بۆ ئەم بابەتە بخوێنیتەوە بڕوانە بۆ

David Blackbourne. and Geoff Eley, *The Peculiarities of German History* (New York: oxford university Press, 1984).

7. Karl Marx, «The Bourgeosie and the Counter-Revolution», *Neue Rheinische Zeitung*, December 1848 reprinted in Marx and Engels, Collected Works, Volume 8 154-79, available at www.marx.org/archive/marx/works/cw/volume08/.

8. Blackbourne and Eley, *Peculiarities*, 244.

9. E. E. Rich and C. H. Wilson, dirs., *Cambridge Economic History of Europe*, Vol. 5, *The Economic Organization of Early Modern Europe* (Cambridge: Cambridge University Press, 1977), 583.

10. Jacob L. Talmon, *The origins of Totalitarian democracy* (London: Secker and Warburg, 1955).

11. Woodrow Wilson «The study of Administration», in Arthur S. Link, ed., *The Papers of Woodrow Wilson*, Vol. 5 (Princeton: Princeton University Press, 1968), 365-67.

12. Mark Lilla, «The Other Velvet Revolution: Continental Liberalism and Its Discontents», *Daedalus 123*, no. 2 (spring 1994).

13. Seymour Martin Lipset, «Some Social Requisites of Democracy: Economic Development and political legitimacy», *American Political Science Review 53* (March 1959).

14. Adam Przeworski and Fernando Limongi, «modernization: Theories and Facts», *World Politics*, 49, no. 2 (January 1997).

ئەو ئامارانە بەپێی ئاستی ڕێژەییی ئاوسان ئابدەیت کردۆتەوە تاکوو بتوانم هاوتای «یەکسانێتیی توانای کڕین» (PPP) ـ Purchasing Power par ـ بەپێی دۆلاری ئەمریکای ساڵی ٢٠٠٠ بەدەست بهێنم. ئەمڕۆکە سیستەمی «یەکسانێتیی

توانای کڕین» بە شێوەیەکی بەربڵاو کەڵکی لێ وەردەگیرێ، لەم سیستەمەدا نرخاندنی پارەی وڵاتەکان لەسەر بنەمای توانای کڕینی ناوخۆ ئەنجام دەدرێ نەک بەپێی نرخی گۆڕینەوەی ئەو پارەیە بە دراوەکانیتر. هەر بۆیە لێکدانەوەی ئەم سیستەمە بۆ جیاوازییەکانی ستانداردی ژیان گەلێ وردتر و ڕێکوپێکترە. زانیارییەکانی توێژەرانی ئاماژەپێکراو لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای دۆلاری ئەمریکای ساڵی ١٩٨٥ دامەزرابوو

15. Angus Maddison «The World Economy: A Millennial Perspective», Organization for Economic Co-operation and Development, 2001.

ئامارەکانی مەدیسۆنم لەسەر بنەمای ئاستی ڕێژەیی ئاوسان دابەزاندووە تاکوو لەتەک دۆلاری ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٠٠دا تەبا بێتەوە و بگاتە ئەو ڕێژەیە.

16. Robert Kagan, «What korea Teaches», *New Republic*, March 9, 1998.

17. Minxin Pei, «Constructing the Political Foundations for rapid Economic Growth», in Henrty Rowen, ed., *Behind East Asia's Growth: The Political and Social Foundations of an Economic Miracle* (London Routledge, 1997), 39-59.

18. Philip Nord, *The Republican Moment: Struggles for Democracy in Nineteenth Century France* (Cambridge, Mass: Harvard University Press, 1995), 8.

19. Jeffrey D. Sachs and Andrew D. Warner, «Natural Resource Abundance and Economic Growth», working paper no. W5398, National Bureau of Economic Research.

20. Quoted in Bernard Lewis, *A Middle Eastern Mosaic* (New York: Random House, 2000), 225.

٢١. ریفۆرمیزاسیۆنی زەوی و زار بابەتێکی ئێجگار بەربڵاوە، بەڵام ئەگەر دەتەوێ پێشەکییەکی بزوێنەر و دۆگمییانە لەم بارەیەوە بخوێنیتەوە بڕوانە بۆ:

Tony Smith. *America's Mission. The United States and the World wide Struggle for Democracy in the Twentieth Century* (Princton: Princton University Press: 1995).

سمیت لە ڕێگای بەڵگاندنێکی قەناعەتپێکەرەوە دەڵێ هۆکاری ئەوەی ئەمریکا توانیویەتی لە هەندێ وڵاتدا دیموکراسی دەوڵەمەند و بەهێز بکاتەوە بەزۆری دەگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی ریفۆرمیزاسیۆنی زەوی و زار. کتێبەکەی دی سۆتۆ ئەمەی خوارەوەیە:

Hernando de Soto, *The Mystery of Capital* (New York: Basic Books, 2000).

## بەشی سێهەم

١. See Christian Caryal's articles in *Newsweek International*: «Stiching to the Party Line», April 16, 2001; «All Putin All the Time», April 16, 2001; and «Comrade Putin's New Russia», May 7, 2001.

2. Conversation with the author, 1999.

3. Quoted in Joseph Contreras, «Playing Hardball», *Newsweek International*, December 27, 1999, 18.

4. Rachel L. Swarns with Norimitsu Onishi, «Africa Creeps along Path to Democracy», *New York Times*, June 2, 2002.

5. Michael Chege, «Between Africa's Extremes», *Journal of Democracy* 6, no. 1 (1995). Also see Larry Diamond, «Developing Democracy in Africa», Stanford University, available at democracy. Stanford. Edu/ Seminar/ DiamondAfrica.htm.
6. Carlotta Gall, «Challenge to Azeri's Iron Ruler», *Financial Times*, February 3, 1998.
7. «A survey of the New Geopolitics», *Economist*, julay 31, 1999.
8. Reprinted in *Asian Age*, January 3, 1998, 12.
9. Arthur Schlesinger, *New Viewpoints in American History* (New York: Macmillan, 1922), 220-40.
10. *Outlook*, November 17, 1997, 22-23.
11. Alvin Rabushka and Kenneth Shepsle, *Politics in Plural Societies: A Theory of Democratic Instability* (Columbus, Ohio: Charles E. Merill, 1972) 62-92.
12. Donald Horowitz, «Democracy in Divided Societies», in Larry Diamond and Mark E Plattner, eds., *Nationalism, Ethnic Conflict, and Democracy* (Baltimore: Johns Hopkins University Press, 1994), 35-55.
13. Jack Snyder and Edward Mansfield, «Democratization and the Danger of War», *International Security* 20, no. 1 (Summer 1995).


### بەشی چوارەم


1. Elie Kedourie, *Democracy and Arab Plitical Culture* (Washington, D. C.: Washington Institute for Near East Studies, 1992), 5.
2. Bernard Lewis, *What Went Wrong: Western Impact and Middle Eastern Response* (Oxford: Oxford University Press, 2002), 97.
3. *Sahih Muslim*, Book 20, hadith 4533.
4. Quoted in Bernard Lewis, *A Middle East Mosaic* (New York: Random House, 2000), 246.
5. T. E. Lawrence, *Seven Pillars of Wisdom*.
6. Quoted in Edward Said, *Orientalism* (New York: Random House, 1978), 38.
7. Bahgat Kornay, «Arab Democratization: A Poor Cousin?» *PS: Political Science and Politics* 27, no. 3 (September 1994), 511.
8. Halim Barakat, *The Arab World: Society, Culture, and State* (Berkeley: University of California Press, 1993), 23.
9. Mohammed Heikal, *The Cairo Documents* (Garden City, N. Y.: Doubleday, 1973).
10. Fouad Ajami, «The Sorrows of Egypt», *Foreign Affairs* 74, no. 5 (September/ October 1995).
11. World Development Indicators, 2002, World Bank.


١٢. بەپێی روونکردنەوەکانی جان واتێربێری، ڕێژەی پیتاک لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا نەتەنیا بە هیچ شێوەیەک کەم نییە بەڵکوو «لە نێو ناوچە روو لە گەشەکاندا قورسترین ڕێژەی پیتاک هی ئەم دەڤەرەیە». واتێربێری بە پشتبەستن بە ئامارەکانی بانکی جیهانی لە نێوان ساڵانی ١٩٧٥ تا ١٩٨٥ پەردەی لەسەر ئەو بابەتە هەڵماڵیوە کە «بە شێوەی ناوین لە سەددا ٢٥ی سەراپای بەرهەمی نەتەوەیی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕێگای داهاتی پیتاکییەوە دێتە دەستەبەرکردن، لە حاڵێکدا کە

لە ئـەمریکای لاتینـدا ئەم ڕێـژەیە نـزیکەی لە سـەدا دوازدەیە. سـەروەت و سـامانی بێئەنـدازە گەورەی کۆمپانیـا نەوتیـیە بە ڕواڵەت سەربەخۆکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە بە ئاسانی دەتوانن پیتاکێکی قورسیان بۆ ببـڕنەوە، نـاتوانێ تـاقە هۆکـاری ئەم شـتە بێت. بە شێوەی ناوین لە سەددا ١٩ی کۆی داهاتەکـانی پیتـاکی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت بەرهەمـی پیتـاک لەسـەر سـوودی ( Profit tax) کۆمپانیاکانە، ئەم ڕێژەیە لە ئافریقادا لە سەدا ٢٠، لە ئاسیادا لە سەدا ١٩ و لە ئـەمریکای لاتینـدا لە سـەدا ١٠یە». بەڵام واتێـر بێـری لەوەدا تووشـی هەڵە بـووە کە وڵاتـانی عەرەب لەسـەر بنەمـای جـۆر و ڕێـژەی داهـاتە خـۆڕایی و باهاوردەکانیـان پۆلێنبەنـدی ناکات، ئەگەر ئەم کـارەی کردبـا دەیزانـی کە وڵاتە نەوتییەکـانی وەک عەرەبسـتانی سـعوودی و کوێـت یـان بـڕە پیتـاکێکی زۆر کەم وەردەگرن یان هیچ وەرناگرن، لە بەرانبەردا وڵاتانی گەورەتر و بێ نەوتـی وەک میسـر و سـووریا پیتـاکی راسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆی قورس قورس وەردەگرن. هەرچەنـد داهـاتی خـۆڕایی و باهـاوردەی وڵاتـانی بـێ نەوت گەورە و بەرچـاوە بەڵام هێنـد گەورەیـش نییـە بتـوانن پشـتی پـێ ببەسـتن. بەشـێکی هەرەزۆری ئەم جـۆرە داهـاتە ڕاسـتەوخۆ بـۆ کاروبـاری نیزامـی تەرخـان دەکـرێ. کە وا بـوو دەتوانین نەبوونی دیموکراسیخوازی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا ببەسـتینەوە بە دوو هۆکـارەوە: بەرتیلـدان بە جەمـاوەری خەڵـک لە وڵاتـانی بەڕاسـتی دەوڵەمەنـدا (بە وەرنەگرتنـی پیتـاک)، هەروەهـا سـەرکوتکردنی جەمـاوەر لە وڵاتـانی هەژارتـردا. بەڵام هەردوو هۆکـارەکە گرێدراوی ئەو داهاتە خۆڕاییانەن کە بەبێ ئەوەی پێویستیان بە هەڵسـووڕانێکی ئـابووریی ڕاسـتەقینەی ئەوتـۆ بـێ دەچـنە خەزێنەی دەوڵەتەوە.

١٣. ئەبـووعەلا مەودوودی، تـوێژەری ئیسـلامگەرای پاکسـتانی، دەڵـێ دەتـوانین وڵاتـانی کۆلۆنیالیسـت بە عەشـیرەتە کافرەکـانی سـەرەتای ئیسـلام بشـوبهێنین، وەک چـۆن پێغەمـبەری ئیسـلام بەگـژ کافرانـدا چـوویەوە و شـەڕی لەگەڵ کـردن دەبـێ ئێمەیش دژ بە ستەمکارانی کۆلۆنیالیست جیهاد بکەین. سەید قوتبیش کە هەر ئەم بۆچوونەی مەودوودیـی بەکار دەهێنا، لە ڕێگای پەرەپێدانی ئەو بۆچوونەوە پێشنیاری جیهادکردن لەدژی دەوڵەتە بێدینەکانی وڵاتانی موسوڵمانی خستە بەردەست. بڕوانە بۆ:
Sayyid Qutb, *Milestones* (Indianapolis, Ind.: American Trust Publcations, 1990).

باشترین پێشەکی سەبارەت بە سەیدقوتب لەم سەرچاوەدایە:
Cilles Kepel, *Muslim Extremism in Egypt: The Prophet and Pharaoh* (Berkeley: University of California Press, 1985).

١٤. On the power of the medieval *Ulama*, see Richard W. Bulliet, *Islam: The View from the Edge* (New York: Columbia University Press, 1994).

١٥. Bernard Lewis, «Islam and Liberal Democracy: A Historical Overview», *Journal of Democracy* 7, no. 2 (1996) 62.

## بەشی پێنجەم

1. Bureau of Economic Analysis.
2. Gallup poll data available at www.gallup.com; Harris poll no. 4, January 17,2001. available at www.pollingreport.com.

٣. لە ١٩٧٤ەوە تـا ٢٠٠٠ ژمـارەی ئەوانەی بـۆ دەنگـدان ناونووسـی دەکەن لە لەسـەدا ٦٥ی حەشـیمەتی خـاوەن سەڵاحییەتەوە بەرز بوویەوە بۆ لە سەدا ٧٦. هەر لەم ماوەیەدا هەژماری ئەوانەی دەیانتوانی لە هەڵبژاردنـدا دەنـگ بـدەن لە لەسـەدا ٦٣ەوە دابەزی بۆ لە سەدا ٥١. لە ساڵی ١٩٦٤دا ڕێژەی سەرسووڕهێنەری لە سـەدا ٩٥/٨ی ئەوانەی بـۆ بەشـداریکردن لە هەڵبژاردنـدا ناویان نووسیبوو لە دەنگداندا بەشدارییان کرد، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٠دا ئەم ڕێژەیە دابەزی بۆ لە سەدا ٦٧/٥.

4. Robert D. Putnam, *Bowling Alone: The Collapse and Revival of American Community* (New York: Simon and Schuster, 2000), 46.
5. Joseph S. Nye, Jr., Philip D. Zelikow, and David C. King, *Why People Don't Trust Government* (Cambridge, Mass.: Harvard University Press, 1997).
6. Edmund Burke, «Speech to the Electors of Bristol», March 11, 1774, in *Select Works of Edmund Burke*, E. J. Payne, ed., Vol. 4, (Indianapolis, Ind.: Liberty Fund, 1999).
7. Dale Bumpers, «How the Sunshine Harmed Congress», *New York Times*, January 3, 1999.
8. Glenn Kessler, «2003 Budget Completes Big Jump in Spending», *Washington Post*, April 15, 2002.
9. Quoted in Jonathan Rauch, *Demosclerosis* (New York: Random House, 1994). 135. A new edition of his book is titled *Government's End: Why Washington Stopped Working* (New York: Public Affairs, 1999).

١٠. یەک لەو پێشبینییانەی زۆر زوو مەزەندەی فەشەلهێنانی حیزبەکانی کردبوو لەم سەرچاوەی ژێرەوەدایە:

David Broder. *The Party's Over: The Failure of Politics in America* (New York: Harper and Row, 1972).

11. Adam Nagourney and Janet Elder, «Poll of Delegates Shows Convention Solidly on Right», *New York Times*, July 31, 2000; Adam Clymer and Marjorie Connelly, «Poll Finds Delegates to the Left of Both Party and Public», *New York Times*, August 14, 2000.
12. David Frum, «The Elite Primary», *Atlantic Monthly*, November 1995.
13. Anthony King, «Running Scared», *Atlantic Monthly*, January 1997; also see Anthony King, *Running Scared: Why America's Politicians Campaign Too Much and Govern Too Little* (New York: Free Press, 1999).

**کتێبەکەی کینگ سەبارەت بە سیاسەت لە ئەمریکادا گەلێ بەپێز و پڕپایەخە و لەسەر بنەمای چوارچێوەیەکی بەراوردکارانە نووسراوە، زۆربەی توێژینەوە سیاسییەکانی ئەمریکا ئەم تایبەتمەندییەیان نییە.**

14. «The People's Revoloution», *San Francisco Chronicle*, May 20, 1998.
15. An exhaustive account of modern-day referendums is David Broder's *Democracy Derailed: Initiative Campaigns and the Power of money* (New York: Harcourt, 2000).
16. Fred Barnes, «California Doesn't Matter», *Weekly Standard*, July 31, 2000.
17. Susan Fraker, «The Politics of Taxes», *Newsweek*, November 25, 1978.
18. Barnes, «California Doesn't Matter».
19. Peter Schrag, «California's Elected Anarchy: A Government Destroyed by Popular Referendum», *Harper's* 289, no. 1734 (November 1994). Also see his excellent book – *Paradise Lost: California's Experience, America's Future* (Berkeley: University of California Press, 1999) - Which should be assigned in political science classes across the country.
20. «Voters' Keep Rejecting Their Towns' Budgets», *New York Times*, September 30, 1990.

### بەشی شەشەم

1. Jean Strouse, *Morgan: American Financier* (New York, Random House), 8.
2. Saul Hansell, «Banking's Big Deal», *New York Times*, September 13, 2000.

٣. بۆ نووسینی ئەم بەشە و سەبارەت بە گۆڕانی بازاڕە داراییەکان سوودێکی فراوانم لە وتووێژەکەم لەگەڵ دۆناڵد مارۆندا وەرگرتووە کە تا ئەم دواییانە بەڕێوەبەری گشتیی کۆمپانیای پین وێبێر بوو.

4. Thomas Friedman, *The Lexus and the Olive Tree* (New York: Farrar, Straus and Giroux, 2000), 50.
5. Jerry Falwell, «Our Next Century Vision», July 12, 1998, Available at www.trbc.org/sermons.
6. Nicholas Dawidoff, «No Sex, No Drugs, but Rock'N Roll (Kind Of)», *New York Times Magazine*, February 5, 1995.
7. William E. Schmidt, «TV Minister Calls His Resort ″Bait″ for Christianity», *New York Times*, December 24, 1995.
8. Susan Friend Harding, *The Book of jerry Falwell: Fundamentalist Language and Politics* (Princeton: Princeton University Press, 2000), 260.
9. Jerry Falwell, «Ministers and Marches», March 21, 1963, Quoted in Harding, *The Book of Jerry Falwell*, 22.
10. Kimon Howland Sargeant, *Seeker Churches: Promoting Traditional Religion in a Non-Traditional Way* (New Brunswich, NJ.: Rutgers University Press, 2000), 1, 4-5.
11. Janice Radway, *A Feeling for Books: The Book-of-the-Month Club, Literary Taste, and Middle-Class Desire* (Chapel Hill: University of North Carolina Press, 1997), 161.
12. John Seabrook, *Nobrow* (New York: Knopf, 2000), 30.

سیبرۆک بۆ تەکوزیی کۆن «ویلیام شارۆن»ی سەرنووسەری گۆڤاری نیۆیۆرکێر و بۆ تەکووزیی نوێیش «تینا براون» واتە لووتبەرزترین و خۆپەرستترین جێگری شارۆن بە نموونە دەهێنێتەوە. من ئەم نموونانەم بەکار هێناوە کە ئاسانتر پێوەندییان لەگەڵدا دروست دەکەم. من بەقەدەر سیبرۆک شاون بە باش نازانم و براونیش بەقەدەر ئەو بە خراپ نازانم.

١٣. Jed Perl, «Welcome to the Funhouse», *New Republic*, june 19, 2000.

١٤. R. H. Tawney, *The Acquisitive Society* (New York: Harcourt Brace, 1920), 92.

١٥. See Robert Gordan, «The Ideal and the Actual in Law: Fantasies of New York Lawyers, 1870-1920», in *The New High Priests: Lawyers in Post-Civil War America*, Gerard W. Gawalt, ed. (Westport, Conn.: Greenwood Press, 1984); and Gordan, «Legal Thought and Legal Parctice in the Age of American Enterprise, 1870-1920», in *Professions and professional Ideologies in America*, Gerald L. Geison, ed. (Chapel Hill: University of North Carolina Press; 1983). Also see Anthony T. Kronman, *The Lost Lawyer: Failing Ideals of the Legal Profession* (Cambridge, Mass: Harvard University Press, 1993).

١٦. Michael Lewis, *Next: The Future Just Happened* (New York: Norton, 2002), 5.

شیکارییەکەی لۆییس دەربارەی ئاسەوارە دیموکراتیکەکانی ئینتەرنێت، بەتایبەت ئاسەوارەکانی لەسەر پارێزەری و کاروباری دارایی، گەلێ پوختە و سەرنجڕاکێشە.

١٧. Ianthe Jeanne Dugan, «Did You Hear the One about the Accountant?» *Wall Street Journal*, March 14, 2002.

١٨. John Judis, *The Paradox of American Democracy: Elites, Special Interests, and the Betrayal of the Public Trust* (New York: Random House, 2000), 21.

١٩. Greg Easterbrook, «Ideas Move Nations», *Atlantic Monthly*, January 1986.

